د. ئەفراسیاو هەورامی

# ڕۆژهەڵاتی کوردستان

## لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا

(بەپێی بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی یەکێتی سۆڤیەت)

پێداچوونەوە و ئامادەکردنی
سدیق ساڵح

دکتۆر ئەفراسیاو هەورامی

# ڕۆژهەڵاتی کوردستان
## لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا

(بەپێی بەڵگەنامەکانی
ئەرشیفی یەکێتیی سۆڤیەت)

پێداچوونەوەو ئامادەکردنی
سدیق ساڵح

بنکەی ژین
سلێمانی ٢٠٠٨

٩٥٥,٠٥٣

ﻫ ٩٣٢ هەورامی، ئەفراسیاو

ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا (بەپێی بەڵگەنامەکانی ئەرشیڤی یەکێتیی سۆڤیەت/ دانانی ئەفراسیاو هەورامی؛

پێداچوونەوەو ئامادەکردنی سدیق ساڵح.-

سلێمانی: بنکەی ژین، ٢٠٠٨.

٤٢٤ل: ١٦,٥×٢٣ سم، وێنە، بەڵگەنامە.- (زنجیرە؛ ٧٨).

١- کوردستان (ڕۆژهەڵات)- مێژوو (دووەم جەنگی جیهانی)

٢- سدیق ساڵح (ئامادەکار). ٣- ناونیشان ٤- زنجیرە؛ ٧٨

کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتاییی پۆلێن و پێڕستی ئامادە کردووە

**سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح**

زنجیرە: ٧٨

کتێب: ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا
(بەپێی بەڵگەنامەکانی ئەرشیڤی یەکێتیی سۆڤییەت)

دانەر: دکتۆر ئەفراسیاو هەورامی

پێداچوونەوەو ئامادەکردن: سدیق ساڵح

تایپ: سیروان خەلیل، بەیان محەمەد

ڕووبەرگ: سەرخێڵ مەهدی عەزیز

خەتی بەرگ: ئەحمەد سەعید

تیراژ: ١٠٠٠

نرخی دانە: ٥٥٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن: ٤٧٢ی ساڵی ٢٠٠٦

شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان

له بڵاوکراوەکانی

**بنکەی ژین**

بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی

هەرێمی کوردستان: سلێمانی، ئەندازیاران، گەڕەکی ١٠٥، کۆڵانی ٥، خانووی ٢٣

نۆرماڵ: ٣١٢٩١٠٢ ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ یا ٠٧٧٠١٤٦٤٨٣٣ سانا: ١١٢٨٣٠٩

E-mail: bnkaizhin@yahoo.com

## پێڕست

## سیناریۆی ڕووداوەکانی
## ڕۆژهەلاتی کوردستان
## دوای خەرمانانی ۱۳۲۰ (ئابی ۱۹٤۱)

لێرەدا باسی سەرەتای دەستپێکردنی پیلانی دەسەلاتدارانی تاران و کۆنەپەرستانی ناوچەی ورمێ و خۆی و ماکۆ دەکەین، کە درێغییان نەکردووە لە هیچ شتێك بۆ بەدناوکردنی کوردو خەباتە ڕەواکەی. ئەم پیلانانە بۆ هاندانی هێزە سەرکوتکارەکانی سوپای ئێران و لەپێش چاوخستنی گەلی کورد لەلایەن دانیشتوانی ئێرانەوە ئامادەکراون. ئەنجام بەردەوامبوونی داگیرکردنی کوردستان و گەلەکەی بووە. جگە لە کاربەدەستانی دەولەتی ئێران، کونسولی تورکیاو جاسووسەکانی بۆ جێبەجێکردنی ئەم پیلانانە بەشدارییان کردووە، ئەمەش لە بەلگەنامەکاندا دەردەکەوێ؛ وەك: کۆکردنەوەی خەلك لە پۆست و تەلگراف، مانگرتن و ناردنی تلیگرام بۆ تاران و شکاتکردنیان لە کوردان و داوای یارمەتی و ناردنی سوپای ئێران بۆ ناوچەکە بۆ دووبارە قەلاچۆکردنی کورد، دروستکردنی کۆمیسیۆنی یارمەتی بۆ لێقەوماوانی ورمێ و ناوچەکە. ئەمانەو بەشداریکردنی شای ئێران لە پێکهێنانی ئەم کۆمسیۆنەدا و هەراو هوریای ڕۆژنامەکان لەم بارەیەوەو بەدناوکردنی کوردەکان لە چاوپێکەوتن لەگەل کاربەدەستانی سوپایی و دیپلۆماتی سۆڤیەت... پەردەکانی ئەم سیناریۆیە پیشان دەدەن.

ڕووداوی ئـەوتۆیش لـە ناوچـەکانی هـەورامان و مـەریوان و کرماشـان و لوڕستان ڕوویان داوە، کە بەداخەوە تائێستا هیچ بایەخێکیان پـێ نـەدراوە، تـەنیا لە چوارچێوەی مەهابادو دەوروبەریدا و یەکلایەنە ئەویش نێوان ساڵانی ١٩٤٥-١٩٤٦ بـاس کـراوە، لەکاتێکـدا دەسـتپێکردنی ڕاپـەڕینی کـورد هـەر لـە ئـابی (١٩٤١)ەوە لە ناوچەکانی (ورمێ و خۆی و ماکۆو شاپوورو مەریوان و کرماشـان) بووە. لە ئەنجامدا زۆر ناوچە ڕزگارکران و دەسـەڵاتی ئێران تێك و پێك درا و وای لێ هـات کۆنەپەرستانی ئێـران زۆر جـار پـەنایان بـردە بـەر سـۆڤیەتیەکان و داوای هاوکارییان لێ کردن. لێرەدا مەبەست لێکۆڵینـەوەی ڕووداوەکان و هەڵسەنگاندنی ڕاپـەڕینی کـوردان نییـە، بـەڵکوو گێڕانـەوەی ڕووداوەکانـە لـە زمـانی بەشێك لـە کاربەدەسـتانی سـۆڤیەتەوە، هـەروەها لـە چاپەمەنیەکانی ئـەو سـەردەمەدا، کـە شاهیدی پەرەگرتنی ڕووداو و پیلانەکانی کاربەدەستانی ئێران بوون دژی کورد.

وەك لـە گێڕانـەوەی ڕووداوەکانـدا دەردەکـەوێ، کوردەکـان لایـەنگری شـەڕ نـەبوون و لـە وتووێژەکانـدا هـەوڵی زۆریـان داوە پێـشی شـەڕ بگـرن. لـە هـەموو پێکهاتنەکاندا ئەوە ڕژێمی تاران بووە کـە بەڵێنـەکانی خـۆی جێبـەجێ نـەکردووە، گەرچی زۆربەی کاربەدەستانی سۆڤیەت لە سەرەتادا هاودەنگ و هـاودەردی کورد بوون و هەوڵی زۆریان داوە شەڕو ئاژاوە لە ناوچەکەدا نەمێنێ. بەڵام خۆشباوەڕی کـوردان و فریوخواردنیـان، بوونـە هـۆی ئـەوەی کـە دوژمـن خـۆی بـەهێز بکـات و سـۆڤیەتەکانیش لەگـەڵ ئـەوەدا نـەبوون کـە شارەکانی (ورمـێ و خـۆی و مـاکۆ) لـە سایەی ئەو دەسەڵاتەدا کە پێشمەرگە کوردەکـان هـەیانبوو، لـە دەسـتی موڵکدار و دەرەبەگەکان ئاسوودە بن و موڵکانـە نـەدەن. لـە نووسـراوەکاندا ڕژێمـی ئێـران زۆر هـەوڵی داوە کوردەکـان بـە دز و ڕاوڕووتکـار بناسێنێ و لایـەنی سیاسیی خـەباتی گـەلی کـورد بـشارێتەوە، بـۆ بەڵگـەش زۆرجـار ژاندارمـەکان و نۆکـەرەکانی ڕژێـم جلوبـەرگی کوردییـان پۆشیوەو خـەڵکیان تـاڵان کـردووە، هـەروا چـەند دەسـتەیەك کوردی بەکرێگیراویش بۆ ئەم مەبەستە خراونەتـە کـار. کاربەدەسـتانی ڕژێم زۆریـان هەوڵ داوە کوردەکان لەپێش چاوی سۆڤیەتیەکان و سۆڤیەتیەکانیش لەپێش چاوی کوردەکان بخەن، بەڵام سوودێکی نەبوە.

**توركیاو ڕووداوەكانی ڕۆژهەڵاتی كوردستان**

**لە ئینگلیزییەوە كراوە بە ڕووسی:**

**١٩٤١/١٢/٢٠**

**لەلایەن ئیدنەوە وەرگیراوە**

**پەرۆشیی توركیا سەبارەت بە ڕووداوەكانی كوردستانی ئێران**

**وەزیـری دەرەوەی توركیـا بیرخەرەوەیـەكی لـە ١٩٤١/١٢/٢دا نـاردووە بـۆ باڵوێزی خاوەن شكۆی بریتانیا، سكاڵای تێدا لەسەر ئەوە كردوە كە كوردەكان نیازیانە دەوڵەتێكی سەربەخۆی كوردی دابمەزرێنن، هێزی داگیركەرەكانیش لە ئێران لەم ڕووەوە پاڵپشتیانن. هەروەها ئەوانە [كوردەكان، هەورامی] دەستدرێژی دەكەنە سەر خاكی توركیا. سكرتێری گشتیی وەزارەتی دەرەوەی توركیا لە ١٩٤١/١٢/٥دا زۆر شێلگیرانە لەم بارەیەوە دووا و وتی: لەوانەیە دەوڵەتی توركیا ناچار بێ هێزی عەسكەری بنێرێتە سەر سنوورەكانی خۆی.**

**سێر ڕ. بۆلارد لە چاوپێكەوتنێكیدا لەگەڵ هاوتا سۆڤیەتیەكەیدا پێشنیاری بۆ كردووە كە هاوتا توركیەكەی لەم لایەنەوە هێور بكاتەوە. سێر ڕ. بۆلارد پێی وایە ڕەنگە یەكێك لەو هۆیانەی وا بوونەتە مایەی گومانی توركیا، دەنگۆو واتەواتی سەر دیدار و گەشتی سەرانی كورد و سەرۆك هۆزەكانی تری كورد بێ بۆ باكۆ، كە دامودەزگاكانی سۆڤیەتی ئەم سەفەرەیان بۆ ڕێك خستوون. باڵوێزی سۆڤیەت ڕایگەیاند ئەم دیدارە تەنیا ناوەڕۆكێكی كولتووریی هەبوە، بە وتەی خۆی پێشتر لەم ڕووەوە ئاگادار نەكراوەتەوەو ئاگایی لەم سەفەرە نەبوە.**

**دەوڵەتی توركیا ١٩٤٧/١٢/١١ بە ناردنی دووەم بیرخەنەوە سكاڵای خۆی بەرامبەر بە چالاكیی كوردەكان دەربڕی، كە هێزە داگیركەرەكانی سۆڤیەتیش یارمەتیی بەرچاوی ئەو كوردە شۆڕشگێڕانەیان داوەو ئەمە بووەتە هۆی هەم نائارامی و مەترسیی بارودۆخەكە، هەم لە ئەنجامدا پچڕانی یەكجارەكیی پەیوەندیی توركیا بە تارانەوە.**

گەرچی ڕاگەیاندنەکەی دەوڵەتی تورکیا لەم لایەنەوە گەورە کراوە، بەڵام مەترسییەکی ڕاستەقینەیش لەئارادایە، ئەویش ئەوەیە کە لەوانەیە ئەم ڕووداوانە ببنە هۆی دوورکەوتنەوەی پەیوەندییەکانی نێوان تورکیا و ڕووسیا و لەگەڵ ئێمەشدا [واتە بریتانیا، هەورامی]. لەبەر ئەوە قازانج لەوەدایە کە دەوڵەتی سۆڤیەت شتێك یا کارێك بۆ هێمنکردنەوەی دەوڵەتی تورکیا بکات.

گیروگرفتی گەورە لەم بارەیەوە، بە بۆچوونی سێر ڕ. بۆلارد، ئەوەیە کە سیاسەتی سۆڤیەت لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا دامودەزگایەك بەڕێوەی ئەبات کە نوێنەرانی سۆڤیەت لە تاران کاریگەرییەکی کەمیان لەسەری هەیە[1].

لەلایەن پاڤلۆڤەوە کراوەتە ڕووسی

## کۆپیی نامەی هاوڕێ مۆلۆتۆڤ
## کە ۱۹٤۱/۱۲/۲۸ دراوە بە کریپس

لەبارەی بیرخەرەوەی ((پەرۆشیی دەوڵەتی تورکیا سەبارەت بە ڕووداوەکانی کوردستانی ئێران))ـەوە کە بەڕێز ئیدن لە ۱۹٤۱/۱۲/۲۰ داویە، دەکرێ بەم چەشنەی خوارەوە ڕابگەیەنرێ:

تەنیا بە بیرخەرەوەی ناوبراو کە پشتی تێدا بە ڕاگەیاندنی وەزیری دەرەوەی تورکیا بەستراوە، ئاگادار کراینەوە، لەوەی وا کوردەکان نیازیانە دەوڵەتێکی سەربەخۆ پێك بێنن و دەستدرێژیش بکەنە سەر خاکی تورکیا. پێویستە لەم ڕووەوە بوترێ: ئەم بەشەی خاکی ئێران، واتە ئەو شوێنەی کە هێزەکانی سوپای سۆڤیەتی لێ جێگیر کراوە، ڕووداوی ئەوتۆ نەقەوماوە و دامودەزگاکانی سۆڤیەتیش بەگشتی هیچ پەیوەندییەکیان بەو نیاز و هەڵسوکەوتانەی کوردانەوە نییە.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠، ٤١.

تێبینی: ئیدن نێوان ساڵانی ۱۹۳۵–۱۹۳۸ و ۱۹٤٠–۱۹٤٥ وەزیری دەرەوەی بریتانیا بووە.

ئێمە وەك لە بیرخەرەوەی ئاماژەبۆکراودا هاتووە، هیچ ئاگامان لە نائارامیی ناو هۆزو خێڵەکانی کورد نییە، کە -گوایە- ئەنجامی پشتیوانیی کوردەکانە لەلایەن سوپای سۆڤیەتەوە لە ئێران. سوپای سۆڤیەت کە لە ئێرانە، بەپێچەوانەی بیرخەرەوەیەکی متمانەپێکراوی تری تورکیاوە، نەك هەر هیچ پشتگیرییەکی ئەم کوردانە و کوردانی تر لە نائارامی و ئاژاوە نانەوەدا ناکات، بەڵکوو ڕێوشوێنی داناوە بۆ چەك وەرگرتنەوە لە کوردەکان، ئەو چەکانەی وا دەگەنە دەستیان لەو ناوچانەوە بۆیان دێت کە هێزەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی لێ نین. کەرتەکانی سوپای سۆڤیەت کە هاتوونەتە باکووری ئێران، دەستبەجێ هەنگاویان ناوە بۆ بەرگریکردن لە تێکهەڵچوونی نێوان کوردەکان و ئێران" ئەو ناوچانەی وا هێزەکانی سوپای سۆڤیەتیان لێیە، تائێستا هیچ پێکداهەڵپڕژان و ئاژاوەیەکیان لەناو کوردەکاندا تێدا بەدی نەکراوە.

پێویستە ئەوەیش بوترێ کە دەوڵەتی ئێران هیچ ناڕەزایییەکی بەرامبەر بە هەڵسوکەوتی سوپای سۆڤیەت لە ئاستی کوردەکاندا دەرنەبڕیوە و هیچ لێدوانێکیشی لەم بارەیەوە نەداوەتە باڵوێزی سۆڤیەت لە ئێران.

لەم ڕووەوە دەتوانین تەنیا ئاماژە بە لێدوانی ڕێکەوتی ١٩٤١/١٢/١١ی باڵوێزمان لە تاران بدەین کە بەڕێز "فەرووغی"ی سەرۆك وەزیرانی ئێران بە ئامادەبوونی باڵوێزی سۆڤیەت بە باڵوێزی بریتانیای وتووە: گوایە ئینگلیزەکان پشتی کوردەکان دەگرن دژی ئێرانیەکان. بەڵام ئێمە هیچ زانیارییەکی ترمان لەم بارەیەوە نییە. بەم چەشنە، وەك پەرۆشی و نیگەرانیی دەوڵەتی تورکیا سەبارەت بەوەی وا سوپای سۆڤیەت بواری دانیشتوانی کوردی ئازەربایجانی ئێرانی داوەو کوردەکان ئاژاوەیان ناوەتەوە هیچ بناغەیەکیان نییە و ناتوانن هەیانبێ، ئاوایش هیچ پاساوێك بۆ ناردنی سوپای خۆی بۆ سەر سنوورەکانی ئێران و تورکیا بەدی ناکرێ. کەواتە دەتوانین ئەوە بە ئەنجام بهێنین کە هیچ هۆیەکی مایەی دوورکەوتنەوەی پەیوەندیەکانی ئێمە و تورکەکان لەئارادا نییە.

بەڵام ئەوەی پەیوەندیی بە سەردانی هێندێ ناوداری کوردەوە هەیە بۆ شاری باکۆ، دەبێ بوترێ ئەم سەردانە تەنیا بۆ مەبەستێکی کولتووری بووە، هیچ مەرامێکی سیاسیی تێدا نەبوە.

بەڕێز بۆلارد لەو ڕووەوە پێی وایە سیاسەتی سۆڤیەت لەو ناوچانەی ئێران کەوا سوپای سۆڤیەتیان تێدا جێگیر بووەو دامودەزگایەك بەڕێوەیان دەبات کاریگەریی باڵوێزی ئێمەیان لەسەر کەمە، ئەو وتانەیش هیچ بنچینەیەکیان نییە.

دەکرێ دەوڵەتی تورکیا لە تەواوی وتەکانی سەرەوە ئاگادار بکرێتەوە (ئەگەر پێویست بێ ئارام و هێور بکرێتەوە). بەڵام ئێمە پێمان پێمان وایە و لەجێی خۆشیدایە ئەوە دەستنیشان بکەین کە تائێستا نە دەوڵەتی تورکیا و نە دەوڵەتی ئێران لەسەر ئەم کێشەیەی وا بەڕێز ئیدن لە یاداشتنامەکەیدا باسی کردووە، هیچ ئاگادارییەکیان نەداوەتە دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەت[1].

مۆسکۆ

١٩٤١/١٢/٢٨

وێنەی بۆ:

هاوڕێیان ستالین

مۆڵەتۆڤ

دیکاترۆڤ

ویشنیسکی

باڵوێزەکان لە لەندەن و ئەنکەرە و تاران

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢، ٤٣..

تێبینی: کریپس، نێوانی ١٩٤٠-١٩٤٢ باڵوێزی بریتانیا بووە لە مۆسکۆ.

**دەربارەی ڕووداوەکانی ورمێ (ڕەزائیە):**

لەمێژبوو پیلانی ڕژێمی ئێران ئەوەی دانابوو کە چۆن بیروڕای گشتیی خەڵك لەسەر ڕووداوەکانی ناوچەکە بە پێچەوانەوە ڕاکێشێ. یەکەمین هەوڵدانیان لەم بارەیەوە بۆ مانگی مارتی ١٩٤٢ دەگەڕێتەوە، کاتێك نوێنەری مەجلیسی ئێران "نەوبەخت" لە پەرلەمانی ئێراندا هێندێ قسەی هیچ‌وپووچ و درۆی لەسەر ڕووداوەکانی ڕەزائیە (ورمێ) دەربڕی، هۆکەشی هەمووی هێنایە سەر ڕووداوەکانی ئابی ١٩٤١ (ڕۆژی هاتنی سوپای هاوپەیمانان بۆ ئێران). ئەم قسانەی نەوبەخت لە چاپەمەنیەکانی ئێراندا بڵاو کراونەوە. ڕۆژی ١٩٢٤/٣/٢٨ ڕۆژنامەی "ئیتیلاعات" نووسینێکی بەناوی (ئەوپەڕی نائارامی لە ڕەزائیە)وە بڵاو کردوەتەوە، باسی ١٥ ڕووداو و دزی و تاڵانکردن و کوشتنی تێدا کردووە، گوایە لە مانگی کانوونی یەکەم و شوباتدا ڕوویان داوە. لە کۆتاییدا ئیتلاعات نووسیویە ((سەرەك وەزیر ئاگاداری ئەم ڕاگەیاندنە دەکەینەوەو داوای لێ دەکەین ئەوپەڕی هەنگاو هەڵبگرێ بۆ هێمنایەتیی ناوچەکە و ناوەندی کڵپەو هەراو هوریاو فیتنە لەم ناوچەیەدا بەزووترین کات بکوژێنێتەوە. دەوڵەت دەبێ خەڵکی بێتاوان و دانیشتوانی زەحمەتکێشی ئەم ناوچەیە لە تاڵان و هێرشی تر بپارێزێ. چاوەڕێی هەڵگرتنی هەنگاوین بۆ جێبەجێکردنی ئەم کێشەیە)).

ڕۆژنامەی "ستارە" لە ڕێکەوتی یەکی نیسانی ١٩٤٢دا لە وتارێکی دوورودرێژدا بە بەڵگەوە دژی درۆو دەلەسەکانی نەوبەخت سەبارەت بە ڕووداوەکانی (ورمێ) هاتە دەنگ، چەندان تەلگرامی بڵاو کردوەتەوە کە لە ناوچەی ڕەزائیەوە نێردراون و باسی هێمنیی تەواوی ناوچەکە دەکەن. وتارەکەی ڕۆژنامەی ستارە لە ڕادیۆی تارانیشەوە خوێندرایەوەو بەم چەشنە بەرپەرچی نەوبەخت درایەوە. بەدوای ڕۆژنامەی "ستارە"دا ڕۆژنامەکانی "مهر ایران" و "صدای ایران" و... هتد، وتەکانی نەوبەختیان بەدرۆ خستەوە.

"سوهێلی" سەرەك وەزیرانی ئێرانیش لە چاوپێکەوتنیدا لەگەڵ باڵوێزی سۆڤیەتدا گوتبووی: ئەو هەراو هوریایەی کە لە ڕۆژنامەکاندا سەبارەت بە (ورمێ) نووسراون، درۆ بوو. بۆیە ئەویش وەك سەرەك وەزیر، کە داوایان لێ کردبوو لەم

بارەیەوە هەنگاو هەڵگرێ، نەیوێرا هیچ بکات. ڕۆژنامەی ئیتیلاعات ڕۆژی ١٩٤٢/٤/٢٢ئەم ڕاگەیاندنەی خوارەوەی بڵاو کردوەتەوە:

((پاڵکۆنیك هاشمی لەگەڵ کەرتەکانی سوپای ئێران گەیشتوونە ڕەزائیە، لە یەکەم ڕۆژی هاتنیدا چالاکانە دەستی بە پاکتاوکردنی چەتەکان کردووە. پێگەکانی ژاندارمری لە دەوروبەری شار دامەزراون و بانگی سەرەك هۆزەکانی کوردیان کردووە بۆ چەکدانان و وتووێژ.

ڕۆژنامەی ئیتلاعات لە وتارێکی تریدا بەناوی (ڕووداوە تراژیدیەکانی ڕەزائیە)وە نووسیویە: ((دانیشتوانی ڕەزائیە بە تەلەفۆن داوای وتووێژیان لەگەڵ نوێنەرانی مەجلیس و بازرگان و کاربەدەستانی دەوڵەتدا کردووەو ڕایانگەیاندووە دانیشتوانی ڕەزائیە لە مەترسییەکی ڕاستەوخۆی باندە کوردەکاندان و چاوەڕێی ئەوە لە دەوڵەت دەکەن بە زووترین کات هێمنایەتیی ناوچەکە بپارێزێ. درەنگ کەوتنی هەنگاوی دەوڵەت کارەساتێکی قورسی بەدواوە دەبێ. ڕۆژنامەی ئیتیلاعات داوا لە دەوڵەت دەکات بە فرۆکە چەك بۆ دانیشتوانی ئەوێ بنێرێ، بۆ ئەوەی بتوانن خۆیان لە باندەکان بپارێزن. سوهێلی سەعات ٧,٥ی ئێوارە هەنگاوی کاریگەر هەڵدەگرێ، بە تەلەفۆن بەڵێنی بە دانیشتوان دا کە لە ماوەی ٤٨ سەعاتدا هەنگاوی چالاکانە دەنێ بۆ سەپاندنی هێمنی و پاراستنی ژیانی ئاسایی خەڵك)).

ڕۆژی ٢ی ئایار لە مەجلیسی ئێران "ئەفشار"ی نوێنەری ڕەزائیە قسەی کردو گوتی: ((ئەمە چەند ڕۆژە هەموو دەقیقەیەك هەواڵی ترسناك و دڵتەزێنم بەدەست دەگات. بۆ ئاگاداریی نوێنەران، هەروەها هەموو گەلی ئێران، ناوەڕۆکەکانیان بە کورتی بەم چەشنەی خوارەوە پێشکەش دەکرێ:

بەپێی ئەو تەلگرام و هەواڵانەی کە پێمان گەیشتوون، هەشت ڕۆژە هێندێ تاوانبار، کە لە کۆتایی شەڕی جیهانیی پێشووەوە ناوچەی ورمێیان وێران و تالان کردووە، دووبارە یەکیان گرتوەتەوەو هەموو چەشنە شێوازێك بەکاردەهێنن بۆ کوشتن و سەرکوتکردنی خەڵك. سێسەد گوندی ڕەزائیە کە دانیشتوانی ئەفشارن، لەلایەن ئەم باندانەوە تالان دەکرێن. بەپێی ئەو تەلگرامانەی کە لەم

هەفتەیەی دواییدا وەرگیراون، تەواوی مەڕومالاًت و شتومەکی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە تالاًن کراوەو شەست هەزار نەفەر لە دانیشتوانی ئەم گوندانە کە زۆربەیان منداڵ بوون، لەکاتی ڕاکردندا نوقمی ڕووبار کراون و بەشێکیان بە ڕووتی ڕایانکردوەتە شارو نازانن چی بکەن؟ شاریش بۆ خۆی لە هەموو لایەکەوە گەمارۆ دراوەو هەموو دەقیقەیەك مەترسیی ئەوە هەیە کە باندەکان بێنە ناو شار. گریان و هاواری ژن و منداڵ دەگاتە ئاسمان. تائێستا تەنیا بەربەرەکانیی ژاندارمەکان توانیویە پێش لە باندەکان بگرێ.

گوندەکان کە لە ماوەی چەند سەدەدا بە کارو زەحمەتی جووتیاران و کرێکارانی ئەفشار دروست کرابوون و وەك ناوچەکانی ئەورووپا دەهاتنە بەرچاو، وێران کراون و تەواوی ئەم زەحمەتە بەفیڕۆ چووەو ئێستا دانیشتوانیان بۆ پاراستنی ژیانی خۆیان هەڵدێن. ئێستا کە لە بەشداربوونی سەرەك وەزیران کەڵك وەردەگرم، دەمەوێ ئیجازە بە خۆم بدەم و پرسیاری لێ بکەم و بڵێم چ هەنگاوێکتان بۆ ئەم کوێرەوەرییەو پاراستنی ژیانی دانیشتوانی ڕەزائیەو ناوچەکە ناوە؟)).

ڕۆژنامەکانی تاران لە نووسینی وتارو هەواڵ لەسەر بارودۆخی ناخۆشی ڕەزائیەو ناوچەکە بەردەوامن و داوای ناردنی سوپایەکی زۆر بۆ ئەوێ دەکەن، تاکوو کورد و ئەرمەن و ئاسووریەکان، کە هێرشیان کردوەتە سەر دانیشتوان سەرکوت بکەن. ڕۆژنامەی "امید" بە کێشانی وێنەیەك نیشانی دەدات ئاسووری و ئەرمەنە چەکدارەکان کە سوارەن، هێرش دەکەنە سەر دانیشتوانی بێدەسەلاًت، ئەوانیش پێخاوس داوای یارمەتی لە دایکی نیشتمان دەکەن. لە وێنەیەکی تردا شمشێربەدەستانی دایکی نیشتمان بە سوپاو تانکەوە بەرەو ڕووی ئەرمەن و ئاسووریەکان دەبنەوە و تێکیان دەشکێنن و ڕاویان دەنێن. لەگەڵ وێنەکەشدا نووسراوە ((دایکی نیشتمان لە مەترسیدایە)). ڕۆژنامەی "ناهد" بە شان وباڵی ڕەزا شادا هەڵدەڵێ و وتارو وێنەیەك بلاًو دەکاتەوە: لەلای ڕاستەوە بۆ خواری ڕەزائیەی ڕازاوە پیشان دەدات کە ڕەزا شای تێدا سواری ئەسپەو بەناو شاردا دەگەڕێ. مەبەستی وێنەکە ئەوەیە بڵێت لە زەمانی ڕەزا شادا هەست بە هێزو

توانایەك دەکرا و ڕەزائیەش باخی بەهەشت و بێچەتە بوو؛ لای چەپیشەوە وێنەی نەخۆشێك، واتا ڕەزائیە پیشان دەدات کە وەزیری جەنگ دەستی گرتووە و بە نەخۆشەکە دەڵێ: بەو زووانە چاکت دەکەمەوە.

ڕۆژنامەی "پەرچەم" زیاتر لە هەموو هاوارو دەنگی بەرز کردوەتەوە بۆ لەناوبردنی کوردەکان و داوای تاوانبارکردنی ئەرمەن و ئاسووریەکان دەکات. ڕۆژنامەی "کوشش" بە خوێنەرانی ڕادەگەیەنێ کە ئاسووریەکان لەمێژە بە تالانکردن و کوشتار ناسراون و ئێستاش هەر خەریکی ئەو کارانەن و بە هیچ شتێك ناسرەون. ڕۆژنامەکە پێشنیاری ئەوە دەکات کە ئاسووریەکان ڕاگوێزرێن بۆ ناوەندی وڵات.

ڕۆژنامەی "سیاست" نووسیویە: تەنیا ئەوکاتە دەتوانرێ هێمنایەتی لە ناوچەی ڕەزائیە دابین بکرێ، کە شوێنەواری دیکتاتۆری بە تەواوی لەناو ببرێ. واتە ئەوکاتەی کە یاسای بنەڕەتی (دەستوور) جێبەجێ دەکرێ و ئەوانەی کە ئازاری خەڵکیان داوەو دەستدرێژییان کردوەتە سەر خەڵك و بەرتیلیان خواردووە، هەر کەس بن چ موچەخۆرو ئاسایش، یا فەرمانبەرو وەزیر، دادگایی بکرێن و سزا بدرێن. هەر کاتێك ئەمانە جێبەجێ کران، ئەوکاتە هەست بە ئارامی و هێمنایەتی دەکرێ.

بەڵام سەرەڕای ئەمانە دەسەڵاتدارانی ئێران توانییان ئەو پیلانەی کە پێشتر دایانڕشتبوو، لەسەر هەراو هوریای بەناو ڕووداوەکانی ڕەزائیە بەردەوام بن:

١- کۆمیسیۆنێك لە مەجلیسی ئێران بۆ یارمەتیدانی لێقەوماوان، بە سەرۆکایەتیی "بەیات"ی جێگری سەرۆکی مەجلیسی ئێران دروست بوو. ئەو کۆمیسیۆنە داوای لە تەواوی دانیشتوان کرد یارمەتیی لێقەوماوانی ڕەزائیە بدەن و ژمارەیەکی تایبەتی بۆ ئەم مەبەستە لە بانك کردووەتەوە.

٢- لە وەڵامی بانگەوازی کۆمیسیۆنی ناوبراودا هێندێ پارە کۆکرایەوەو چەند سینەما و تیاترۆ و شوێنێکیان بۆ ئەم مەبەستە بۆ بلیتی یارمەتیدان دانابوو. هەروەها لە دەزگاو کارخانەکانیشدا پارەیان بۆ لێقەوماوانی ڕەزائیە کۆکردەوە.

٣- دوای ئەوەی کە شا یەك ملیۆن ڕیاڵی بۆ لێقەوماوانی ڕەزائیە دیاری کرد، هەراو هوریایەکی نوێ لە چاپەمەنیەکانی ئێراندا بەڕێ خرا. یارمەتیدانیان لە

١٠-٥٠ ڕیاڵ دیاری کردبوو، ڕۆژنامەکانیش بە نیشانەی سوپاسەوە ناوی ئەوانەیان بڵاوکردەوە کە بەشداری ئەم شاڵاوە بوون.

٤- کۆمیسیۆنی ناوبراو بڕیاری دا (پوول)ی تایبەت بۆ ئەم مەبەستە دەربکات و نرخی تەلگرامیان بردە سەر، تاکوو ئەم هەموو پارەیە بدرێتە سندووقی لێقەوماوانی ڕەزائیە.

٥- هەواڵێکی تایبەت بڵاو بوەتەوە کە دەوڵەت ٢٨٠ تۆن گەنمی ناردووە بۆ ڕەزائیەو شاپوور.

٦- ڕۆژنامەکانی تاران ڕاگەیاندنێکی زۆریان بڵاو کردوەتەوە، گوایە ((لەبەر ئەوەی لە ڕەزائیە هەست بە کەمیی دکتۆر دەکریٚ، چەند دکتۆرێك لە تارانەوە نێردراون بۆ ئەویٚ)). ئەمە جگە لە گەیاندنی دەرمانێکی زۆر. بەڵام پاشتر ڕوون دەبێتەوە کە هەمووی دوو دکتۆر و دوو برینپێچ و بڕێك دەرمان نێردراون. لەمەدا مەبەست ئەوە بوو کە لێقەوماوان هێندە زۆرن، دەبیٚ دکتۆر و دەرمانی زۆرتر بنێردریٚ.

٧- بۆ ئەوەی شتەکە گەورەتر بکریٚ و لەپێش چاو بیٚ، دەستوور بە فەرمانداره‌کان درا، لە ناوچەکانی خۆیاندا کۆمیتەی یارمەتیدان بۆ لێقەوماوانی ڕەزائیە پێك بێنن و خەریکی کۆکردنەوەی یارمەتی بن، ناوی ئەو ناوچانەش کە یارمەتییان دەنارد لە ڕۆژنامەکانی تاراندا بڵاو دەکرانەوە. بۆ ئەوەی ئەم هەڵڵاو هاوارە هەرچی زیاتر درێژە بکێشیٚ، هەر ڕۆژنامەیەك ٥-٦ ڕاگەیاندنیان سەبارەت بە یارمەتیدان بڵاو کردەوە. بۆ ئەوەی ئەم ڕاگەیاندنانە کاریگەرتر بن، ڕۆژنامەکان هەواڵیان ((لەسەر کوشتاری دڕندانەی باندە کوردەکان)) بڵاو دەکردەوە. هەواڵەکانیشیان وا لە چاپ دەدا کە گوایە سەدان منداڵ و ژن لەکاتی هەڵاتندا دەستدرێژیان لیٚ کراوە و کوژراون. ئاماژەشیان بەوە دەکرد کە گوایە سەرچاوەی هەواڵەکانیان ئەو تەلگرامانەن کە لە ڕەزائیەوە بەدەستیان دەگەن. ئەمەی خوارەوە یەکێك لەو تەلگرامانەیە: ((کوردەکان دووبارە شاری ڕەزائیەیان گەمارۆ داوە و کەشتیەکان ناتوانن هەموو هەڵاتوەکان هەڵگرن. لە گوندەکاندا هیچ شتێك لە ماڵاندا نەماوە و خانوەکانیش کاول کراون)) - ڕۆژنامەی "ایران"، ١٩٤٢/٥/١٣ .

ڕۆژی ۱۹٤۲/٤/۳ وەزیری جەنگ "جەهانبانی" چووەتە ڕەزائیە. بەدوای ڕۆیشتنەکەی ئەودا، ڕۆژنامەی "پرچم" لە وتاری سەرەکیی خۆیدا سەبارەت بە ڕووداوەکانی ڕەزائیە نووسیویە: نابێ خۆ سووك بکرێ بەرامبەر بە کوردەکان، ئەگەر بێتو وتووێژ لەگەڵ سەرکردەی باندە کوردەکاندا بکرێ، بەدوای ئەم کردەوەیەدا هیچ کارێکی باش ڕوونادات، جگە لەوەی کە ئەوانی پێ بەهێز دەبێ. تاقیکردنەوەکانی ساڵانی ڕابردوو ئەوە نیشان دەدەن کە ئەم هۆزانە تەنیا بە شمشێر و زەبروزەنگ دەکرێ ئارام بکرێنەوە، هەر بۆیە دەبێ سوپایەکی زۆر بنێردرێ بۆ ڕەزائیە، ئەوسا دەکرێ هێمنایەتی لە ناوچەکەدا بپارێزرێ، ئەگەنا نابێ هیچ ڕێگەیەکی تر لەئارادا بێ.

وادیارە ئەو کوردانەی کە لە تاران دەژین، نامەیان بۆ ڕۆژنامەی "پرچم" نووسیوەو ڕەخنەیان لە وتارەکانی گرتووە، ڕۆژنامەکەش ناچار بووە چەند نامەیەك لەوانە بلاو بکاتەوە. ڕۆژی ۱۱ی مایسی ۱۹٤۲، ڕۆژنامەی "پرچم" نامەی حوسێن ئەکبەری بلاو کردوەتەوە کە تێیدا نووسیویە: لە ڕۆژنامەکەتاندا لەسەر گرووپێکی باند، کە مەبەستتان کوردەکانە، کوردو لوڕەکان بە وەحشی ناودەبەن، پێویستە بڵێم کە من کوردم و باوەڕم بە پیاوچاکی و ئازایی و نەترسی و نیشتیمانپەروەریی ئەوان هەیە. مێژوو شاهیدە کە کوردەکان دەورێکی گەورەیان لە پێکهێنانی کولتووری ئێراندا هەبوە، ئەوان پارێزەری ڕەسەنی کولتووری ئێرانن. نووسراوی "أسرار الإستنتاج"، نیشاندەری ئەو ڕاستیەیە کە بەرپەرچی نووسراوەکانی ئێوە دەداتەوە. بەڵام سەبارەت بەئێوە کە سووکایەتی بە گەلی کورد دەکەن، پێم وایە ئەگەر کەسێك تووشی هەڵەیەك بووە، جا هەر کەسێك بێ و زمانی هەرچییەك بێ، دەبێ ناوی خۆی لێ بنرێ، نەك سووکایەتی بە گەلێکی نیشتیمانپەروەرو ڕەسەن بکرێ. ڕۆژنامەی "پرچم"یش تێبینییەکی لەسەر ئەم نامەیە نووسیوە و وتوویە: ((ئێمە نەمانویستووە بە بەکارهێنانی وشەی کورد خەت بەسەر هەموو کورددا بێنین. ئەگەر ئێمە باندەکان بە وشەی کوردەکان ناو دەبەین، تەنیا لەبەر ئەوەیە کە ناوێکی تر نازانین. پێویستە بگوترێ دەستە کوردەکان بە چەتەگەری ناسراون. بۆ وێنە، ڕووداوەکانی ڕەزائیە یەکەم جارو

دوایەمین جار نین، کوردەکان دەبێ خۆیان ئەم کردەوانە پەسند نەکەن و دژیان ڕاوەستن. بە کورتی، کوردەکان دەبێ هەوڵ لەگەڵ دەوڵەتدا بدەن بۆ لەڕەگەوە هەڵکێشانی چەتەگەری)).

ڕۆژی ١٢ی مەی ١٩٤٢ ڕۆژنامەی "پرچم" نامەی خوێندەوارێکی بە ناسناوی (خ. ف.)ەوە بەم چەشنە بڵاو کردوەتەوە: ((کوردەکان هیچ تاوانیان نییە، دەبێ تاوانبارانی سەرەکی کە لە نانەوەی ئاژاوەکاندا دەستیان هەبوە، بدۆزرێنەوەو بەتوندی سزا بدرێن. ئەوانە ئێستا لە تاران دادەنیشن و بە پێکەنینی ژەهراویانەوە سەیری ڕووداوەکان دەکەن. ڕاستە کوردەکان لە ڕابردوودا زوڵم و ستەمیان لێ کراوەو دەیانەوێ شکات لە ڕژێمی پێشوو بکەن و تۆڵەی خۆیان بسێننەوە، بەڵام بەداخەوە تاوانباری ڕاستەقینە نادۆزنەوە. ئەوانەی کە زوڵمیان لێ کردوون و پارەیان لێ وەرگرتوون، سەرۆکەکانی ژاندارمری و فەرمانبەرانی دارایی و ژەنەڕاڵ و ئەفسەرانی سوپای ئێرانن ... هتد. ئەوانن ئەم تاوانەیان دەکرد و ئێستا لە تاران دانیشتوون. ژەنەڕاڵ موعینی کە لە ڕەزائیە بوو، بە هۆی خوێنڕێژییەوە ڕای کرد. هەروا فەرماندەی پۆلیسی ئاسایش کە بە کردەوە پیسەکانی ناوبانگی دەرکردووە، لەگەڵ بنەماڵەکەیدا ڕایکردە تاران و ئێستاش لە ژیانێکی زۆر باشدا لە تاران دەژی. کوا ئەو دەستەی کە بتوانێ کەلەپچەیان بکات و بە تاوانی ئاژاوەنانەوەو ئاگر هەڵگیرساندن سزایان بدات؟! ئەم دەستە دەبێ دەستی دەوڵەت بێ کە ئەو تاوانکارانە دادگایی بکات)).

ڕۆژنامەی "پرچم" لە وەڵامی ئەم نامەیەدا نووسیویە: ((ئەم گەنجە ڕاست نالێ کاتێك دەڵێ کوردەکان تاوانبار نین. ئەگەر ئەفسەرانی ناوبراو تاوانبار بن، کوردەکانیش تاوانبارن. جەهانبانی کە لە ڕەزائیە گەڕاوەتەوە، ڕێکەوتی ١٩٤٢/٥/١٥ لە ڕادیۆوە قسەی کرد و هیچ باسی ڕەزائیەی نەکرد، زیاتر لەسەر پێویستیی یەکێتیی خەڵك و ڕێزنان لە یاسا و بڕیارەکانی دەوڵەتی ئێران و یارمەتیدانی سوپای ئێران بۆ سەقامگیربوونی هێمنایەتی و... هتد، دووا)).

زۆری پێنەچوو جەهانبانی لەگەڵ ڕۆژنامەنووسەکاندا چاوپێکەوتنێکی هەبوو، کە لەسەر ئەنجامی سەفەرەکەی بۆ ڕەزائیە پرسیاریان لێ کردبوو.

جەهانبانی گوتبووی هەنگاو نراوە بۆ دابینکردنی هێمنایەتی، پۆستەکانی ئاسایش دامەزراونەتەوەو قەرەبووی زیانی دانیشتوان دەکرێتەوە. پاشان جەهانبانی بەتایبەتی ئەوەی دەستنیشان کرد کە کوردەکان هەموویان چەتە نین و تاوانبارکردنیان ڕاست نییە. هەروەها تاوانبارکردنی ئەرمەن و ئاسووریەکان بە تۆمەتی بەشداریکردنیان لەو چەتەگەریەدا ڕاست نییە. بەم چەشنە لە قسەکانی وەزیری جەنگ "جەهانبانی"دا کە بۆ خۆی چووەتە ئەوێ و لەنزیکەوە ئاشنای ڕووداوەکان بووە، وا دەردەکەوێ کە شتێکی ئەوتۆی گرنگ لەوناوە ڕووی نەداوە.

ڕۆژنامەی "ئیتیلاعات" و "پرچم" پشتیوانییان لە ناردنی سوپا بۆ ناوچەی ڕەزائیە کردووە، پرچم نووسیویە: ((ئێمە لەمێژبوو داوای ئەو شتەمان دەکرد)). ڕۆژنامەکانی تر باسی پێشوازیی گەرموگوڕی خەڵکی تەورێزو ڕەزائیەیان لە سوپای ئێران کردووە. ڕۆژنامەی "مهر ایران" کە ئۆرگانی پارتی عەدالەتە، لە ژمارەی ڕۆژی ١٩٤٢/٥/٢یدا باسی پێشوازیی خەڵکی لە هاتنی سوپای ئێران بۆ ناوچەکە کردووە و گوتوویە ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە ((ئێران هێشتا زیندووە و ئێرانێتیی ورمێ هەر ماوە و ئەگەر ببێتە خاوەنی دەوڵەتێکی خاوێن و شایستە، ئامادەی هەموو گیانبازی و فیداکارییە، بەڵام بەداخەوە)).

ڕۆژنامەی "کوشش" لە کۆتایی سەروتارەکەیدا باسی پێشوازیی سوپای سووری لە سوپای ئێران کردووە و بە سوپاسێکی زۆرەوە نووسیویە: ئەم هەستە دۆستانەیە بۆ هەمیشە لای ئێرانیەکان دەمێنێتەوە)).

"سوهێلی"ی سەرەك وەزیرانی ئێران ڕێکەوتی ١٩٤٢/٦/٢ سەبارەت بە قسەکانی نوێنەری مەجلیس "تەباتەبایی" لە کۆبوونەوەی مەجلیسی ئێراندا ڕۆژی ١٩٤٢/٥/٣١ قسەی کرد کە پشتگیری لە کوردەکان کردبوو و داوای کردبوو چەند نوێنەرێکی مەجلیس بۆ لێکۆڵینەوە لە بارودۆخی ناوچەی ڕەزائیە بڕۆنە ئەوێ، چونکە لەوێ هێمنایەتییەکی تەواو هەیە، وتەی ڕۆژنامەکان درۆیە. لەم کاتەدا "ئەفشار"ی نوێنەری مەجلیس لە جێی خۆی ڕابووە، بەدوای ئەویشدا نوێنەرانی تر بە دەنگی بەرز دژی "تەباتەبایی" قسەیان کرد و هاواریان دەکرد بۆچی ئێوە پشتیوانی لە کوردەکان دەکەن. پاشان ئەفشار لەسەر بارودۆخی

نالەباری ڕەزائیە قسەی کردو وتی ۲۳۰ گوند وێران کراون. پاشان وەزیری داد گوتی سەبارەت بەوەی کە گوایە لە بازاڕی ڕەزائیە ۳۳ نەفەر کوژراون، هیچ بەڵگەیەك نییەو ئەمە ناڕاستە، بەڵام بارودۆخی ڕەزائیە تا ئەو جێگەیە کە دەزانرێ، دەکرێ بڵێم لە مەترسیدایە.

سوهێلی لە مەجلیسدا ڕایگەیاند: ((نوێنەری مەجلیس تەباتەبایی لە کۆبوونەوەی ڕابردووی مەجلیسدا بە قسەکانی سەبارەت بە ڕەزائیە نوێنەرانی مەجلیسی ئێران و دانیشتوانی ئازەربایجانی خەمگین کرد)).

(نوێنەران: ڕاستە وایە)

لە هۆڵەکەوە هاوار کرا: ((ئەو قسانە هەمووی درۆی بێشەرمانە بوون)).

خراپتر لە هەموو، ئەوە بوو کە لە زمانی "فەهیمی"ی ئوستاندارەوە وەك سەرچاوەیەك کەڵکی وەردەگرت، بەڵام فەهیمی لە نامەیەکدا کە بۆ منی نووسیوە گوتوویە قسەکانی تەباتەبایی هیچ بنچینەیەکیان نییە. نازانم و تێناگەم چ شتێك پاڵی بە تەباتەباییەوە ناوە ئەم قسانە بکات.

(ئەفشار:خیانەت)

بەڵام پێم وایە تەباتەبایی مەبەستی ئەوە بوو تووڕەیی و نیگەرانیی نوێنەرانی مەجلیس لەمەڕ ڕووداوەکانی ڕەزائیە کەم بکاتەوە. بەپێی ڕاپۆرتی فەهیمی کە بۆ وەزیری ناوخۆی ناردووە، ژمارەی کوژراوەکان زۆر زیاترە لەوەی کە تەباتەبایی باسی کردووە. هەروەها دەبێ ژمارەی بریندار و ئەو زیانەی کە لە خەڵك کەوتووە، زیاتر بێ. مایەی ئازارە ئەگەر ئێستا لێرە باسی هەموو ئەم شتانە بکرێ.

(ژمارەیەك لە نوێنەرانی مەجلیس: بمرێ خائین) .

دەبێ بڵێم کوردەکان دانیشتووی ئێرانن، بەڵام بەداخەوە هەندێ گرووپ لەناویاندا هەن هێمنایەتی و نائارامیی چەند ناوچەیەکی ئێران تێك دەدەن. لەبەر ئەوە پێویستە بگوترێ، لێرە نابێ قسەی وا بکرێ کە چاوپۆشی لە تاوان و کردەوەی ئەوانە بکرێ.

(بەڵێ ڕاستە)

ئاشکرایە ئەو کەسانەی کە لە ڕێگەی ڕاست لایان داوە، بەتوندی سزا دەدرێن.

(بەڵێ ڕاستە)

نوێنەرانی مەجلیس باش دەزانن هەنگاوەکانی دەوڵەت بۆ سەرکوتکردنی باندەکان زۆر سەرکەوتوانە بووە. نابێ پەرۆشی ئەو بریندارو نەخۆش و لێقەوماوانەی ڕەزائیە بن. پێویستە بگوترێ ئاغای تەباتەبایی تێگەیشتنی لەسەر ئەم ڕووداوانە نییە. سەبارەت بە ژمارەی کوژراوان و بریندارانی ڕەزائیە ئەگەر پێویست بێ پێشکەش دەکرێ.

دوای سوهێلی، "دەشتی"ی نوێنەری مەجلیس قسەی کرد، ناوبراو ڕێبەری پارتی عەدالەت و سەرۆکی فراکسیۆنی ئەو پارتەیە لە مەجلیسی ئێراندا. پارتی عەدالەت هەر ئەو پارتەیە کە تەباتەبایی ئەندامێتی. "دەشتی" گوتی: ماوەی مانگێکی تەواوە تاقمێکی باند زیانێکی زۆر دەگەیەننە ناوچەی ورمێ. پێم وایە لەکاتێکدا ئێستا دانیشتوانی ڕەزائیە ڕژاونەتە ناو پۆست و تێلگراف و داوا لە دەوڵەت دەکەن فریایان کەون، دەبێ دەوڵەت بە زووترین کات هەنگاو هەڵگرێ.

(نوێنەرانی مەجلیس: ڕاستە)

ئێران ئێستا پێویستی بە هێمنایەتی هەیە، دەبێ هەر ڕاپەڕینێك بە تاوان لە قەڵەم بدرێ. ناوچەی ڕەزائیەش هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ناوچەی فارسدا نییە. بیروڕای من ئەوەیە کە دەبێ کوردەکان بێڕەحمانە سزا بدرێن. دۆستی من تەباتەبایی لەگەڵ "فەهیمی"دا لەم بارەوە قسەی کردووە، ناوەڕۆکی ئەم وتووێژەی لە کۆبوونەوەی پێشووی مەجلیسدا پێشکەش کردووە. من بەوپەڕی ئیمانەوە دەڵێم ئەو هیچ مەبەستێکی خراپی نەبوە.

(ئەفشار: قسەکانی تەباتەبایی خیانەتیان لێ دەبارێ)

پێویستە بڵێم تەباتەبایی بیرو بۆچوونی فراکسیۆنی پارتی ئێمەی دەرنەبڕیوە، بەڵکوو هەڵوێستی خۆی دەربڕیوە. ئێمە لەم بارەیەوە پشتیوانی لە هەنگاوەکانی دەوڵەت دەکەین.

پاشان تەباتەبایی کە دەیویست ڕوونکردنەوەیەك لەسەر قسەکانی خۆی بخاتە ڕوو، وتی ((من هەمیشە لایەنگری ئارامی و ڕێکوپێکی بووم لە ولأتدا)).

(ژمارەیەك لە نوێنەرانی مەجلیس کۆبوونەوەکەیان بەجێهێشت)

مـن لـە کۆبوونـەوەی ڕابـردوودا قـسەکانی "فـەهیمی"ی ئوسـتانداری ئازەربایجانم گێڕایـەوە کـە بـەپێی قسەکانی وی هـیچ شـتێك لـە شـاری ڕەزائیـە نەقـەوماوە، هـەموو تێکهەڵچوون و خراپەکارییـەك لـە دەوروبـەری ڕەزائیـە ڕووی داوە. تەباتەبایی لە قسەکردندا بەردەوام بوو.

(بەشـێکی تـری نوێنـەرانی مـەجلیس چـوونە دەرەوەو "بـەیات" کۆتـایی کۆبوونەوەکەی ڕاگەیاند، بەو پێیە کە زۆربەی نوێنەران چوونە دەرەوە)

کاتێك تەباتەبایی تریبوونەکەی بەجێهێشت، ئەو نوێنەرانەی کە چووبوونە دەرەوە، یەکسەر گەڕانەوە و کۆبوونەوەی مەجلیس دەستی پێکردەوە. ڕۆژنامـەی "ناهید" لـە وتارێکـدا نووسیویە، ئەگـەر دەوڵـەت ئیجازەمـان پـێ بدات، ئێمـە بـە نـاوی خەڵکـەوە خائینـەکانمان (کوردەکـان) دادگـایی دەکـرد و تەنانـەت شـەڕی جیهادمان ڕادەگەیاند.

گرووپێکی خەڵکی ڕەزائیە کە لە تاران دەژین، لەنزیکی دەرگای مەجلیسەوە کۆببوونەوە، چاوەڕوانی ئەوە بوون کۆبوونەوەکە تـەواو بـێ و خۆپیشاندان دژی تەباتەبایی ڕێك بخەن و لێی بدەن. بەڵام سەرەك وەزیر سوهێلی و وەزیرەکانی تـر "تەباتـەبایی"یـان تـا نـاو ئۆتۆمبێلەکـەی بـەڕێ کـرد، بـەم چەشـنە بـە سـەلامەتی گەڕایەوە ماڵێ.

دەکرێ لەسەر ڕووداوەکانی ڕەزائیە، بەم ئەنجامەی خوارەوە بگەین:

١- پێکهێنـانی کۆمیـسیۆنی ئەرمـەنی و گـەورەکردنی لـە چاپەمەنیەکاندا بـە دەستووری کاربەدەستانی بەرزی ئێران بووە، نیشانەی ئەوەیە کە پێشتر پیلانـی بۆ دانراوە، هەم مەجلیس و هەم چاپەمەنیەکان زۆر ژیرانـە و بـە میتـۆدەوە کاریـان لەسـەر کـردووە. جگـە لـەوە، "سـوهێلی"ی سـەرەك وەزیـران و "موعتەمـەدی"ی جێگـری سـەرەك وەزیـران و "بـەیات"ی جێگـری سـەرۆکی پەرلـەمانی ئێـران و "هومـایۆنجی"ی سـەرۆکی کۆمیـسیۆن و جێگـری وەزیـری دەرەوەی ئێـران لەگـەڵ

کاربەدەستانی تری گەورەی ئێراندا بەشدارییان لە ئیش‌وکاری کۆمیسیۆنەکەدا کردووە.

٢- دەوڵەتی ئێران دەیەوێ ڕووداوەکانی ڕەزائیە وا لێ بکات کە لە بەرژەوەندی یەکێتیی سۆڤیەتدا نەبێ، سۆڤیەت لەپێش چاوی ئێرانیەکان و بێگانەکان بەدناو بکات.

٣- بۆچی دەوڵەتی ئێران هەوڵی داوە لەسەر ڕووداوەکانی ڕەزائیە ساز بکات:

ئ) هەوڵ دەدات سوپا بۆ ناوچەکە بنێرێ.

ب) نیشانی بدات وەك دایك ئاگادار و خەمخۆری خەڵکە، بەم چەشنە دەیەوێ دانیشتوانی ناوچەکە لە لایەنگرانی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا لە ئێمە دووربخاتەوە.

پ) هەستی نەتەوایەتی لەناو دانیشتوانی ئێراندا، بەتایبەت لە ئازەربایجان و ڕەزائیە و تاران، بورووژێنێ.

ت) جارێکی تر ئەوە نیشان بداتەوە کە ئەرمەن و ئاسووری و کوردەکان دوژمنی ئێرانیەکانن. تەواوی ئەمانە -دەکرێ بڵێین- بە دەستی ئەڵمانیای فاشی و نۆکەرەکانی لە ئێران و وڵاتانی دراوسێی ئێران، بە پلەی یەکەم تورکیا، ساز دەکرێن.

کۆمیسارۆڤ

باڵوێزی سۆڤیەت لە ئێران

**لەسەر ڕووداوەکانی ڕەزائیە:**

هێمنایەتی لە ناوچەکەدا بەرقەرارەو خەڵك خەریکی ئیش‌وکاری خۆیانن و خەلە و خەرمان کۆکراوەتەوە، بە قسەی جووتیاران، بەرهەمی ئەمساڵیان لە ساڵی ڕابردوو زیاترە. ئەمەش وا دەگەیەنێ کە قسەکانی ڕژێم لەوبارەیەوەی وا گوایە خەلە و خەرمان کۆنەکراوەتەوەو خەڵکەکە هەمووی ڕای کردووە، درۆن.

فیوداڵ و خاوەن زەوی‌وزارەکان کە ڕایانکردبوو، خەریکی گەڕانەوەن و داوای بەش و موڵکانەی خۆیان لە جووتیاران دەکەن. بەشێکیان سەرکارەکانیان

بۆ وەرگرتنی موڵکانە ناردوەتە ناوچەکان. جووتیارەکان کە نیو ساڵە چاویان بە موڵکدارەکان نەکەوتووە، نایانەوێ موڵکانەیان پێبدەن. دووبارە پەیوەندی لەنێوان کوردەکان و جووتیارەکان و تەنانەت ئازەریەکانیشدا بەستراوەتەوە. بەشێکی زۆر لە جووتیاران کە نایانەوێ موڵکانە بە دەرەبەگەکان بدەن، بە دەرەبەگەکان دەڵێن: بەشی ئێوە کوردەکان بردوویانە؛ لە هەندێ شوێن تەنانەت خۆیان پێشنیار بۆ کوردەکان دەکەن بێن و بەشە موڵکانەی زەویدارەکان ببەن و گوندەکانیان لە دەستدرێژیی ژاندارمەکان کە بە زۆر شتیان لێ دەستێنن، بپارێزن. پێشنیاری زۆری لەم چەشنە بە نووسین و گوتن بە کوردەکان دەگات. لە گەشتەکەمدا بۆ بەشێك لە گوندەکان، لەگەڵ ژمارەیەکی جووتیاراندا قسەم کرد و ڕاستەوخۆ ڕایانگەیاند:

((با کوردەکان بێنە لامان باشترە، موڵکانەی خاوەن زەویەکان دەبەن و دەمانپارێزن)). بەشێك لە فیۆداڵەکانیش وەك جووتیارەکان داوا لە کوردەکان دەکەن یارمەتییان بدەن بۆ وەرگرتنی موڵکانە لە جووتیارەکان، پێشنیاری ئەوە دەکەن بەشێکی موڵکانەکە بەوان بدرێ (بۆ وێنە، "نەخشین"ی موڵکدار نامەی بۆ تاهیر ئاغا نووسیوە). ئەم شتانە لە نامەی ئوستانداری ڕەزائیەشدا کە ڕێکەوتی ٢٢ی حوزەیران (جوون)ی ١٩٤٢ بۆ منی نووسیوە، ڕەنگ دەدەنەوە. ئوستاندار دەڵێ: ((... ئێستا جووتیارەکان بۆ خۆیان تالآن دەکەن. گەنمەمان پێ نافرۆشن و بە قسەی کوردەکان دەجووڵێنەوە .... جووتیارەکان لە بەشێکی گوندەکاندا نوێنەری فیۆداڵەکان دەردەکەن- لە گوندی بابار و ڕۆشکان ڕایانگەیاندووە: ((ئێمە کە گەنمەمان چاندووە، هەر خۆشمان دەزانین چیی لێ بکەین. زۆربەی سەرکردەکانی کورد (جگە لە عومەر خان و سەرتیپ ئاغا و تاهیر ئاغا) ڕێکەوتی ١١ی ئەیلوولی ١٩٤٢ لە باخی ئوستانداری کۆبوونەوە و ئوستاندار ئەم پێشنیارانەی بۆ کوردەکان کردووە:

١- نوێنەرانیان لە گوندەکان لابەرن و داوای موڵکانەی زەویدارەکان لە جووتیاران نەکەن.

٢- بە چەکەوە نەیەنە ناو شار.

٣- واز بهێنن لە قاچاغچێتیکردن بە مەڕومالاّت و دەغلّودان و بە تورکیاو عیراقی نەفرۆشن.

ئوستاندار هەڕەشەی لێ کردوون ئەگەر بێتو ئەو داواکاریانە جێبەجێ نەکرێن، بەزۆر جێبەجێیان دەکات. سەرکردە کوردەکان بەڵێن دەدەن و داوا دەکەن بە دەمانچەوە هاتوچۆی شار بکەن.

دەوڵەتی ئێران لەلایەکی ترەوە هەوڵدەدات کوردەکان دژی ئێمە بەکار بهێنێ، نێوانی ئێمە و کوردەکان تێک بدات. بۆ نموونە: ئەفسەرێکی ئێرانی بەناوی "مەهدی خان ئەشرەفی"یەوە، ١٣ی ئەیلوول کاتی قسەکردنی لەگەڵ برای ڕەشید بەگدا، باسی بێخودایی سۆڤیەتیەکانی بۆ کردووە. یان فەرماندارى ئازەربایجان "خەدیو" لەگەڵ کاربەدەستانی تری ئێرانیدا میوانداریی سەرکردە کوردەکان دەکەن و قسەیان بۆ دەکەن دژی ئێمە بجووڵێنەوە؛ بۆ نموونە، پێیان گوتوون سۆڤیەتیەکان تەواوی دەوڵەمەندەکانیان لەناو بردووە و دەستیان بەسەر سەروەت و سامانیاندا گرتووە؛ باسی تاوان و کردەوەکانی کۆمیساری گەل بۆ کاروباری ناوخۆ (وەزیری ناوخۆ)ی سۆڤیەتیان بۆ کردوون کە چۆن کۆلاکەکانیان لەناو بردووە و لەم بارەیەوە کتێب و نووسراوەکانیان پێداون و پێیان گوتوون ئەم چارەنووسە چاوەڕوانی بەگە کوردەکانیش دەکات؛ هەروەها پێیان گوتوون لە سۆڤیەت دین نەماوە و لەناویان بردووە، پێیان گوتوون بەو زووانە سۆڤیەت تێک دەشکێ و ئەڵمانەکان و ئێمەی موسڵمان یەك دەگرینەوە و ئێمە بەرنامەمان بۆ چاری کێشەی کورد هەیە؛ پێیان گوتوون کورد لە ڕابردوودا چەوسێندراوەتەوە، دەوڵەتی ئێستای ئێران دەوڵەتێکی دیموکراتەو کوردەکان دەتوانن نوێنەری خۆیان بۆ مەجلیس بنێرن و دەوڵەتی ئێران ئامادەیە بەخشدار و فەرماندارەکانی کوردستان لە کوردەکان خۆیان دیاری بکات و خودموختارییان بداتێ، بەلاّم جێبەجێکردنی ئەم کارانە بۆ دوای سەرکەوتن بەسەر دوژمنانی ئێراندا دەمێنێتەوە. دواتر گوتوویانە دەبێ ئێمە پەیوەندییەکی باشمان لەگەڵ تورکیادا هەبێ. ڕۆژنامەی "پرچم" لە ژمارە ١٤٢یدا تەلگرامی ئوستانداری ئوستانی

چوارەم "مەرزەبان"ی بڵاو کردوەتەوە، کە ناوەڕۆکەکەی ئەوەیە ((ناوچەکە هێمنە و قسەکانی ئەو ڕۆژنامانە کە لەسەر ڕەزائیە نووسیویانە، بە درۆ دەخەمەوە)).

کاتی گرتنی سیواستوپول لەلایەن ئەڵمانەکانەوە، پروپاگەندەی فاشیستەکان لە ئێران زۆر بووە و بڵاویان کردووەتەوە کە بەو زووانە مۆسکۆ و لینینگرادیش دەگیرێن، قەوقاز بە سەرکەوتنی ئەڵمان لەنێوان ئێران و تورکیادا دابەش دەکرێ. ئەم پروپاگەندانە لە ناوچە بێلایەنەکاندا، واتە لە ڕەزائیە و مەهاباد، بڵاو دەبنەوە. هەروەها گوتراوە بەشێك لە سوپای سوور لە ئێران چووەتە دەرێ و دەبێ موسڵمانەکان (کوردو ئازەری) یادی ساڵی ١٩١٨ بکەنەوە، واتە ڕووسەکان چەك بکەن و هەر بە چەکەکانی خۆشیان لەناویان بەرن. دەوری ئینگلیز لە ناوچەکە و ناو کوردو ئاسووریەکاندا هەست پێ دەکرێ و خۆی دەنوێنێ. ئێستا هاتوچۆی ئازاد بۆ عیراق هەیە و گەنجە ئاسووریەکان یا بۆ ئیشکردن یان بۆ سەربازی لە ڕیزەکانی سوپای ئینگلیزدا دەچنە عیراق. ئەوانەی کە لە عیراقەوە دێن بۆ ئێرە، ئاژەڵ و گەنم بە گران دەکڕن، تەنانەت بە هەر نرخێك بووە، دەیبەن بۆ عیراق. ئەگەر ڕەوشەکە هەروا بەردەوام بێ، خواردەمەنی لە ناوچەکەدا کەم دەبێتەوە. داواکردنی خەڵکی ئێرە بۆ بەشدارییان لە شەڕدا شان بەشانی سوپای سوور زۆرە و دوو تۆن دیاری و شتومەك کە بۆ سوپای سوور هێنراون، وەرگیراون.

ماکسیمۆڤ

کونسوڵی سۆڤیەت لە ڕەزائیە

ڕۆژنامەی "مهر ایران" ڕۆژی ١٩٤٢/٣/١٨ لە زمانی "ئاغای نەبیشتە"ی نوێنەری شیرازەوە نووسیویە: ڕەزائیە لە مەترسیدایە و دانیشتوانی لەوپەڕی ناخۆشیدان. خەڵکی ٥٠٠ گوند تالان کراون، ١٥ هەزار موسڵمان شار و ناوچەکانیان بەجێهێشتووە و هاتوونەتە تاران و تەورێز و... سەرگەردان بەسەر شەقامەکانەوە دەخولێنەوە. کورد و ئاسووریەکان هەر لەکۆنەوە هەوڵیان داوە ئەم ناوچەیە لە ئێران جیابکەنەوە.

ڕۆژنامەی "پرچم" ڕێکەوتی ۱۹٤۲/٥/۲۷ لە ژمارە ۱۰٥ی خۆیدا، کورد و ئاسوریەکانی بە گەورەترین تاوان مەحکوم کردووە و نووسیویە: تەنانەت منداڵانی تازە لەدایکبووشیان کوشتووە.

ڕۆژنامەی "کوشش" لە ژمارەی ۱۹ی ڕێکەوتی ۱۹٤۲/٥/۳۰دا نووسیویە: دوای شەهریوەر کوردەکان و ئاسووریەکان پێکەوە دەستیان بە تالان کرد و منداڵی شیرەخۆرەیان لە دایك دابڕی و منداڵی بچووکیان خستە ئاوەوە، دەستدرێژییان کردە سەر ژنان. ئەگەر دەوڵەت هەنگاوێك بۆ پێشگرتن لەم تاوانە نەنێ، ئەوا خوێنی هەزاران نەفەر دەڕێژرێ. دەتوانین لەگەڵ کوردەکاندا پێك بێین، بەڵام لەگەڵ ئاسووریەکاندا نا. ئێمە داوای پێکهێنانی کۆمیسیۆنێك دەکەین بۆ کڕینی شتومەکی ئاسووریەکان هەنگاو هەڵگرێ و پاش کڕینی شتەکانیان دوور بخرێنەوە بۆ ناوچە ناوەندیەکانی ئێران، یان بە پێچەوانەوە ئەوان شتەکانی ئێمە بکڕن و ئێمە وڵات بەجێ دەهێڵین. ڕۆژنامەی "پرچم" لە ژمارە ۱۲۳ی ڕێکەوتی ۱۱ی حوزەیرانی ۱۹٤۲یدا ئەم تەلگرامەی چاپ کردووە: ((تەلگرامێکی تر لە ڕەزائیەوە بۆ وەزیری جەنگ، مەجلیسی ئێران، ڕۆژنامەی پەرچەم، سادقی ئەفشاری نوێنەری ڕەزائیە لە مەجلیسی ئێران نێردراوە- ئێمەی جووتیارانی هەژار هیوادارین دوای هاتنی سوپا بۆ ئێرە هێمنایەتی بۆ ناوچەکە بگەڕێتەوە، ئێمە بەو هیوایە بڕیارمان داوە بگەڕێینەوە بۆ شوێن و ماڵی خۆمان کە سوپای ئێران بمانپارێزێ. بەڵام بەداخەوە تائێستا هیچ هەنگاوێك بۆ گەڕانەوەی هێمنایەتی لەلایەن سوپای ئێرانەوە هەڵنەگیراوە. کوردەکان، بەتایبەتی ئاسووریەکان، تالان دەکەن و ئازاری خەڵك دەدەن. لەبەر ئەوە ناچار بووین جارێکی تر بەرەو شاری ڕەزائیە هەڵبێین. ئێستا لەبەر نەبوونی ئاو و نەمانی خەڵك لە ناوچەکەدا کشتوکاڵ ناکرێ و هەست بە سەرەتای سەرهەڵدانی برسێتی لە شارەکەدا دەکرێ. ئەگەر دەوڵەت لەم بارەیەوە ناتوانێ یارمەتیمان بدات، لانی کەم ڕێگەی ئەوەمان پێشان بدات کە چۆن خۆمان بگەیەنینە ناوچەکانی تر، تا لە مەترسی فەوتان ڕزگارمان بێ. ئێمە تەنانەت ئامادەین هەرچی سامانمان هەیە بەجێی بهێڵین. تێلگرامەکە ئەم ناوانەی خوارەوە ئیمزایان کردووە:

سەوڵەت، محەمەد عیلانی یا (ئیلانی)، عەزیزی، جەعفەری، عەلی باقری، سەداقی، هاشم ڕەزایی، کەلامی، فەرزانی و... هتد.

هەروەها لە وتارێکی تردا نووسراوە: ئاسووریەکان، بە ڕابەڕایەتیی مەملووك کە دکتۆری دانە، تاوانبار دەکرێن بە تالآن و کوشتنی خەڵك؛ گوایە لە ماڵی ئەسکەندەر ئاسووری و ئەرمەن و کوردەکان کۆبوونەوەیەکیان بووە، سەرکردەکانی کورد "زیرۆ بەگ و کەمال بەگ" لەم کۆبوونەوەدا بەشدار بوون، کە پلان و بەرنامەیان تێدا بۆ خۆیان داناوە و هێزی چەکداریان دروست کردووە.

سەرۆکی بەڕێوبەرایەتیی ئاسایشی ڕەزائیە کە ناوی "باقری والی زادە"یە بە دەستی پینەچییەکی ئەرمەنی بەناوی "هاراتون"ەوە کوژراوە. کوردەکان دەستیان بە هێرشکردنە سەر پۆستەکانی ژاندارمری لە دەرەوەی شار کردووە، ژاندارمرەکانیش بە هۆی نەبوونی تەقەمەنییەوە پاشەکشەیان کردووە بەرەو شار. ئەو گوندانەی کە کەوتوونەتە دەستی کوردەکان، تالآن کراون. جووتیارەکان بەدەستی بەتاڵەوە هاتوونەتە شار. ئەو شتانەی کە جووتیارەکان بۆیان دەرباز نەبوە، ئاسووریەکان بەتالآن بردوویانە و چەند جووتیارێکیشیان کوشتووە. "مەلایك" کە خەڵکی (بوز ئورادیف) بووە، لەگەڵ کوڕەکانیدا بە بیست و پێنج نەفەری چەکدارەوە لە گوندی (بارانلوو) پشتیوانی لە ژاندارمرەکان دەکات. بەڵام ئەمانیش لەبەر نەبوونی تەقەمەنی و زۆربوونی کوردەکان، واز لە بەرەنگاری دێنن و بۆ شار دێن.

دوای چەند ڕۆژێك ژاندارمرەکان لەگەڵ کوردەکاندا لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە پێك هاتن:

١- کوردەکان پاراستنی ژیانی ژاندارمرەکان بە ئەستۆ دەگرن و تا شار بەڕێیان دەکەن.

٢- کوردەکان بڕیار دەدەن سووکایەتی بە ژاندارمرەکان نەکەن.

٣- ئەو پێگە و پۆستانەی کە ژاندارمرەکان دروستیان کردوون، لەلایەن کوردەکانەوە ناپووخێنرێن.

ژاندارمەکان دوای ئەم پێکهاتنە خۆیان تەسلیمی کوردەکان دەکەن و بەم چەشنە دەگەنە شار. کوردەکان بەرەو شار بەڕێیان دەکەن و پاشان گەمارۆی شاری ڕەزائیە دەدەن.

•

**ڕاپۆرتی "ماکسیمۆڤ"ی کونسولی سۆڤیەت لە ورمێ:**

ڕێکەوتی ١٠ی حوزەیرانی ١٩٤٢ چاوم بە مەرزەبان ئوستانداری ئوستانی چوار کەوت. مەرزەبان پرسیاری ئەو شێخە کوردەی کرد کە ناوی عەبدوڵڵایە و لە عیراقەوە هاتووە بۆ ئێرە، ئایا شتێك لەم بارەیەوە دەزانم. لە وەڵامدا گوتم شێخ عەبدوڵڵا و قازی محەمەد لەگەڵ وەزیری جەنگی ئێراندا لەسەر داخوازی دەوڵەتی ئێران هاتوونەتە ئێرە، بۆ ئەوەی پێشگیری لە تێکهەڵچوونی نێوان کوردەکان و کاربەدەستانی ئێران بکەن. هەروەها بۆ ئەوەیە کە قازی و شێخ عەبدوڵڵا بانگەواز بکەن هێمنایەتی لە ناوچەکەدا بپارێزن. مەرزەبان گوتی: ((هاتنی شێخ عەبدوڵڵا لە عیراقەوە بۆ ناوچەی ڕەزائیە بۆ وەرگرتنەوەی ئەو گوندانەیە کە پێشتر هی ئەو بوون و دەوڵەتی ئێران دەستی بەسەردا گرتوون. شێخ عەبدوڵڵا دژی دەوڵەتی ئێران و دۆستی ئینگلیزە.

مەرزەبان گوتی: ((کاتێك ئەو لە ئەستەمبووڵ بووە، دوای ساڵی ١٩١٢ بۆی دەرکەوتووە ئینگلیز چۆن دەیەوێ کوردستانی سەربەخۆ دروست بکات، دەیویست بڵێ ئێستاش وازی لەم پیلانە نەهێناوە. مەرزەبان لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: ئەفسەرێکی ئینگلیز کە ناوەکەی لەبیر چووە، چەند ساڵێك بۆ ئەم مەبەستە بە نهێنی لەناو کورد و لوڕەکاندا خەریکی ئیش‌وکار و دروستکردنی ڕیکخراو بووە. مەرزەبان دەیویست ئەوە بە من بسەلمێنێ کە کوردەکان ئێستاش هەر ئەو نیازەیان هەیە و ئینگلیزیش لەپشت سەریانەوە ڕاوەستاوە. لە وەڵامی پرسیاری مندا کە بۆچی دەبێ کوردەکانی ڕەزائیەی شوێنێکی دووری ئێران دژی دەوڵەتی ئێران بن؟ مەرزەبان گوتی: کوردەکانی مەهاباد و سەقز گوێڕایەڵی ئێرانن و تەسلیم بە سوپای ئێران بوون [لەڕاستیدا وا نییە- ماکسیمۆڤ]. هەروەها باسی ئازایەتی کوردەکان و شەڕکردنەکانیانی کرد و گوتی، چەکیان زۆرەو لە

سەرانسەری کوردستاندا دەوریان هەیە. منیش گوتم ئێمەو ئینگلیز لەگەڵ ئێران پەیمانمان هەیە و کێشەی سەربەخۆیی کوردستان [کە مەبەستی ئەو ئەمە بوو] هیچ پەیوەندییەکمان پێوەی نییە و سەربەخۆیی کوردستان شتێکی یۆتۆپیایە.

پاشان گوتی سۆڤیەتیەکان دوو نەفەری ئازەرییان بە بیانووی چەکداربوونەوە دەستگیر کردووە، گوتی: گەر وابێ، دەبێ دەیان هەزار کوردیش دەستگیر بکەن، واتە دەبێ تەواوی کوردەکان بگرن، چونکە هەموویان چەکدارن.

لە وەڵامدا گوتم ئاگام لە شتی وانییە، ئەگەر کرابێتیش ئێمە یارمەتیی دەوڵەتی ئێرانمان داوە. مەرزەبان گوتی، لە تاران وا بڵاوە و منیش نامەم پێگەیشتووە کە گوایە ئێوە [سۆڤیەتیەکان] یارمەتی کوردەکان دەدەن. لە مەرزەبانم پرسی بیروڕای خۆتان لەم ڕووەوە چییە؟

مەرزەبان گوتی، درۆیە بەڵام خەڵکی وا هەن باوەڕ دەکەن. منیش گوتم ئەم دەنگوباسانە لەلایەن نۆکەرانی نازییەوە بڵاو دەکرێنەوە. ئەویش گوتی ئەڵمان لە ئێران دوورە و دەنگوباسی وا دوور لە ڕاستییە. منیش گوتم ئەمریکا دوورترە لە ئەڵمانیاوە، بەڵام نۆکەر و لایەنگیری فاشیست لەوێش زۆرن.

تێبینی: شێخ عەبدوڵڵا یەکێکە لە شێخە گەورەکانی بنەماڵەی شەمدینان، لەناو کوردەکانی عیراق و ناوچەی مەهابادو باشووردا لایەنگری زۆرە، لەناو هۆزەکانی هەرکی و شکاك و... ناوچەی ورمێش لایەنگری یەکجار زۆرە، لەوێش پێشوازی گەرمیان لێ کردووە و دەست و جلوبەرگی ماچ دەکەن؛ چەند گوندێکیشی لە عیراق هەیە، لەلایەن دەوڵەتی عیراقەوە زەوت کراوە. هاتنی وی بۆ ڕەزائیە بە دەستووری "فەهیمی"ی ئوستاندار بووە. ئێمە هیچ زانیارییەکمان لەسەر وتووێژەکان و مەبەستی هاتنی وی نییە. بەڵام شێخ عەبدوڵڵا لەلایەن وەزیری جەنگی ئێرانەوە بەرەو تاران بەڕێ کراوە.

ماکسیمۆڤ

کونسوڵی سۆڤیەت لە ڕەزائیە

**چاوپێکەوتن لەگەڵ "مەرزەبان"دا**

١٣ی حوزەیرانی ١٩٤٢:

پرسیاری لەسەر بارودۆخی ناوچەی شاپوور کردو گوتی لەلایەن فەرماندارى شاپوورەوە تەلگرامی وەرگرتووە کە تێیدا دەڵێ کوردەکان دەیانەوێ شارەکە بگرن و لەم بارەیەوە زۆر پەرۆشە. هاورێ "شموراتۆڤ" گوتی: من چەند سەعاتێك لەمەوپێش لەوێ گەڕاومەتەوە. بارودۆخی تێدا زۆر ئارامە. "شێخ قادر"ی سەرۆکی خێڵی جەلالی چاوی بە فەرماندار کەوتووە و قسەو باسیان لەسەر هاتوچۆی کوردەکان لە شاپوورەوە بۆ ماکوان کردووە.

مەرزەبان باسی هاتنی کوردە کۆچەریەکانی عیراقی بۆ ناوچە سنووریەکانی ئێران کرد، گوتی ئاژەڵیان پێیە و ژمارەیان زۆر زۆرە، سەرۆکی ئەو کوردانە فەتاح بەگە ماوەیەکە هاتوەتە ڕەزائیە.

ڕێکەوتی ١٦ی حوزەیرانی ١٩٤٢، من و هاوڕێ گۆگۆل لەسەر داخوازیی ئوستاندار چووینە لای، لەسەر گەڕاندنەوە و سەقامگیربوونی دووبارەی پۆستەکانی ژاندارمری لە ناوچەی ڕەزائیە قسەمان کرد و ئەمانەی خوارەوە لە کۆبوونەوەکەدا بەشدار بوون: "سەرهەنگ موعینی" فەرماندەی کەرتەکانی سوپای ئێران لە ڕەزائیە، "سەرگورد هاشمی" جێگری فەرماندەی ژاندارمری.

وا تێگەیشتم مەرزەبان دەیەوێ بڕواتە تاران تا ئەو دەنگوباسە درۆیانەی وا لەسەر ڕەزائیە لەلایەن فەهیمی ئوستانداری تەورێزەوە بڵاو کراونەتەوە، بە درۆ بخاتەوە. بەڵام فەهیمی دەیەوێ بەم چەشنە (بە دروستکردنی درۆو دەلەسە لەسەر ئازەربایجان) نیشانی بدات کە مەرزەبان لێهاتوو نییە، تا خۆی ببێتە ئوستانداری هەردوو ئازەربایجان و کۆنترۆڵی هەردوولا بکات. منیش لەگەڵ مەرزەبان هاودەردم و دەمەوێ بۆ سەقامگیرکردنی هێمنایەتی لە ناوچەکەدا یارمەتیی بدەم. بڕیار دراوە پۆستەکانی ژاندارمری دیسانەوە لە ناوچە ئازەرنشینەکاندا دابمەزرێندرێنەوە و بەبێ ئاگاداری فەرماندەی سوپای سوور لە ناوچەکەدا نەجووڵێنەوە. هەروەها بڕیار دراوە پشتگیری لە فرۆشتنی بە قاچاغی گەنم و ئاژەڵ بە عیراق و تورکیا نەکرێ. ئینگلیزەکان زۆربەی گەنمی ئێرەیان

کرپیوەو بردویانە بۆ عیراق. ئێستا لە ناوچەکەدا هەست بە برسێتی دەکرێ. منیش بەڵێنی یارمەتیم بە مەرزەبان داوە.

ماکسیمۆڤ

کونسوڵی سۆڤیەت لە ڕەزائیە

ڕێکەوتی ۱۷ی حوزەیرانی ۱۹٤۲ چاوم بە حاجی ئەمیر نازمی ئەفشار کەوت کە کابرایەکی زۆر دەوڵەمەندە، گلەیی دەکرد کە ئێمە بایەخێکی زۆر بە کوردەکان دەدەین و خۆمان لە ئازەریەکان ناگەیەنین. بۆ سەلماندنی ئەم قسانەش باسی سەفەری نوێنەرانی کوردی بۆ باکۆ کرد، گوتی کورد زۆربەی دانیشتوانی ئازەربایجان پێك ناهێنن. داوای کرد ئازەریەکان فەرامۆش نەکرێن.

ماکسیمۆڤ

کونسولی سۆڤیەت لە ڕەزائیە

**چاوپێکەوتن لەگەڵ جێگری فەرماندەی ژاندارمریی ئازەربایجانی ئێران "سەرگورد تەیموورچی"دا**
**ڕێکەوتی ۳۰ی حوزەیرانی ۱۹٤۲:**

ئەو کە گوایە لە تەورێزەوە بۆ لێکۆڵینەوەی بارودۆخی ژاندارمری و بەهێزکردنی، هەروەها گێڕانەوەی هێمنایەتی هاتووە بۆ ئێرە، گوتی کاتی هاتنی لە ڕێگای شاپوورەوە بۆ ئێرە، چاوی بە دێنشینەکان کەوتووە بەرەو شار هەڵهاتوون؛ گوایە دەترسن کوردەکان هێرش بکەنە سەریان. داوای یارمەتیی لە ئێمە کردو گوتی پێویستە سوپای سوور یارمەتیی ئێران بدات. هەروەها گوتی کوردەکان مەڕوماڵات دەدزن و تالان دەکەن و بە تورکیای دەفرۆشن و تورکیاش بە نازیەکانی دەفرۆشێ. لەبەر ئەوە تورکەکان هێندە دەوڵەمەند نین بزنێك بە سەد لیرە بکڕن. ئەگەر ئێمە دژی کوردەکان نەجووڵێینەوە، ئەڵمانەکان بەخێو دەکەین کە زیان بە ئێمە و بە ئێوەش دەگەیەنێ. هەروەها گوتی کوردەکان لە کۆتایی

١٩١٧دا دژی سوپای ڕووسیا شەڕیان کردووە. منیش بەڵێنم پێ دا کە سوپای ئێمە یارمەتیی دەوڵەتی ئێران دەدات بۆ داسەپاندنی هێمنایەتی.

**وتوویژ لەگەڵ ئوستانداری ئوستانی چوار "دکتۆر مەرزەبان"دا**

ڕێکەوتی ٢٤ی حوزەیرانی ١٩٤٢:

... باسی ئەوەم بۆ کرد لەکاتی گەشتەکەمدا بۆ گوندەکانی ناوچەی نازلوو، ئارامییەکی تەواوم بینی. جووتیارەکان خەریکی ئیش‌وکاری خۆیانن، لە هیچ شوێنێك کوردەکانم نەبینی. بەڵام زۆربەی خەڵکی گوندەکانی زورگئاواو قەرەلەر هێشتا نەگەڕاونەتەوە جێی خۆیان و لە شار دەژین. نازانم بۆچی ناگەڕێنەوە و لە چی دەترسن؟ ئوستاندار گوتی منیش نازانم هۆکەی چییە و فەرمانی داوە بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان. پاشان مەرزەبان باسی ئەو درۆودەلەسانەی ڕۆژنامەی "پەرچەم"ی کرد کە سەبارەت بە ڕەزائیە نووسیونی. ئوستاندار گوتی: وتارەکانی ڕۆژنامەی ناوبراوی خوێندۆتەوە و زۆر سەری سوڕماوە، بانگی یەکێك لە نووسەرانی ئەو وتارانەی بەناوی "فەوزانی ئیسماعیلی"یەوە کردووە، بە نووسین بەڵێنی لێ وەرگرتووە کە چیتر لەو وتارانە نەنووسێ.

ماکسیمۆڤ

کونسوڵی سۆڤیەت لە ڕەزائیە

**لە دەفتەری ڕۆژانەی "ئیڤانۆڤ"ی سەرکونسوڵی سۆڤیەت لە ڕەزائیە**

١٦ی شوبات (فێبروەری)ی ١٩٤٢:

... چاوم بە ئوستاندار کەوت، وەك جاری پێشوو باسی یارمەتیی سوپای ئێمەی بەوان کرد، دەستنیشانی ئەوەی کرد کە دەسەڵاتدارانی خۆجێیی ئێران، بەتایبەتی ئەو وەك ئوستاندار، بەرامبەر بە کوردەکان زۆر بێدەسەڵاتن؛ باسی کرد پۆلیسی ئێران لەو جێگایانەی کە سوپای سۆڤیەتیان تێدا نەبێ، ناتوانن بڕۆن و دەترسن.

ژمارەیەك لە موڵكدارانی ئازەری كە لە سوڵدوزەوە هاتبوونە ئێرە، پێیان گوتم ١٨ گوندیان تالأن كراوە، كێشەی نێوان كورد و ئاسووریەكان بە سەرۆكایەتیی مەلا بورهان و ئازەری و فارسەكان بە سەرۆكایەتیی خەسرەو خانی قەرەپاپاخ بۆ دەستبەسەرداگرتنی ناوچەكە بەردەوامە. خەڵك ئاژەڵ و دانەوێڵەی خۆیان دەفرۆشن بۆ ئەوەی تفەنگی پێبكڕن. نرخی تفەنگێك گەیشتوەتە ٣٥٠٠ ڕیاڵ و دانەی فیشەك بە ٧ ڕیاڵە. ئەوان داوایان دەكرد سوپای سووریش بنێرن بۆ ئەوێ. هەروەها گوتیان ئەگەر سێ نەفەریش بنێرن، بەسە. منیش لە وەڵامدا گوتم: لەبەرئەوەی ناوچەی ناوبراو ناوچەیەكی بێلایەنەو ئێمە پەیمانمان لەگەڵ ئێران و ئینگلیزدا هەیە، ناتوانین ئەم كارە بكەین. یەك سەعاتی پێنەچوو ئوستاندار هات و ئەویش شكاتی لە كوردەكان هەبوو؛ باسی دوژمنایەتیی نەتەوایەتیی نێوان ئازەری و ئەرمەنی و ئاسووری و فارسی كرد لە ناوچەكەدا كە ڕیشەیەكی مێژوویی هەیە. هەروەها گوتی دەوڵەتی ناوەندی توانیویەتی تەواوی ڕاپەڕینەكانیان سەركوت بكات، ئێمە توانیمان بە زووترین كات هێمنایەتی دامەزرێنین و ژمارەیەكی زۆر لە ئەرمەن و ئاسووری و كوردەكان هەڵوەدای عیراق بكەین. هاتنی كوردەكانمان بۆ شار قەدەغە كرد. ئێستا كوردەكان دووبارە موسڵمانەكان ئازار دەدەن. بەشێك لەوانە كە بە تاوانی ئاژاوەنانەوە لە ناوچەكە دوور خرابوونەوە، دووبارە گەڕاونەتەوە بۆ ناوچەكانی خۆیان. ئەرمەنەكان و ئاسووری و كوردەكان دەچنە لای فەرماندەی سوپای سوور و دەنگوباسی موسڵمانەكان دەبەن، بەتایبەتی لەسەر برینداره‌كانیان. لەبەر ئەوە پێویستە بەر لە هەموو شتێك ئەوان (ئەرمەن و ئاسووری و كورد) چەك بكرێن. ئەوكاتە موسڵمانەكان بۆ خۆیان چەك دادەنێن و ئۆقرە دەگرن. ئەگەر ئەم كارە جێبەجێ بكرێ، من موسڵمانەكان ناچار دەكەم لە ماوەی سێ ڕۆژدا چەكەكانیان تەسلیم بكەنەوە.

لە وەڵامدا گوتم لای ئێمە هەموو نەتەوەكان مافیان وەك یەكە و ڕێزیان لێ دەگیرێ. بۆیە فەرماندەی هێزەكانی ئێمە بە یەك چاو دەڕواننە كوردەكان و ئەوانی ترو بۆ چەككردنیش هەموویان بە یەك چاو سەیر دەكرێن. پێم گوت: زۆر سوپاست دەكەم جەنابی ئوستاندار ئەگەر دوو نموونەم سەبارەت بە چەككردنی

موسڵمانەکان لەلایەن سوپای سوورەوە بۆ بهێنێتەوە، ئوستاندار گوتی لەبەر هێندێك شت ناوێرێ نموونە باس بکات. ئوستاندار جگە لەوەی کە داوا دەکات ئێمە کوردەکان چەك بکەین، دەیەوێ ئێمە فەرمانی دەرکردنی کوردەکان لە شار بڵاو بکەینەوە. ئەو بۆ خۆی ناتوانێ نە چەکیان بکات و نە فەرمان بدات شار بەجێ بهێڵێن، لەبەر ئەوە کوردەکان گوێ نادەنە دەسەڵاتدارانی ئێران. من لە وەڵامدا گوتم: تەنیا دەسەڵاتدارانی ئێران دەتوانن فەرمانێکی ئەوتۆ بدەن. فەرمانی وا ئەگەر لەلایەن ئێمەوە بدرێ، بە دەستتێوەردان لە کاروباری ئێران لەقەڵەم دەدرێ. ئەمەش دژی پەیمانی سێ قۆڵیی نێوان ئێران و ئینگلیز و سۆڤیەتە. پاشان گوتی ئەی چی بکەن؟ کوردەکان لە شار ئاژاوە دروست دەکەن و دەبنە هۆی نائارامیی ناو شار. ئوستاندار گوتی: پەیدابوونی کوردەکان لەناو جادەکانی شاری ڕەزائیەدا، بووەتە هۆی ئەوەی کە هێندێ لە بازرگانەکان ناچاربن شار جێ بهێڵن. بۆ نموونە میرزا خانی ئەفشار دەرمانخانەکەی بەستووەو چووەتە تەورێز.

ئوستاندار گوتی: لە تارانەوە فەرمانمان پێ دراوە کشتوکاڵ زیاتر بکەین و دەبێ گەنم و دانەوێڵە بۆ تەورێزو تاران و خۆراسان بنێرین. جووتیارەکانماڵیان نادەنە ئێمە و گیروگرفتێکی گەورەیان بۆ ئێمە دروست کردووە، زەویی موڵکدارەکانیان زەوت کردووە و تەنانەت کرێشیان نادەن و زۆربەیان ئەرمەن و ئاسوورین. موڵکدارە بچووکەکان ناتوانن قەرز لە بانك وەرگرن، لەبەر ئەوەی قەرزی کۆنیان نەداوەتەوە، چونکە نییانە. هەروا گوتی: داوات لێ دەکەم ئەگەر فەرماندەی سوپای سوور ڕۆیشت بۆ ناو گوندەکان، داوا لە جووتیارەکان بکات ماڵیات بدەن، کۆماندێر مستەفاییێڤ پێیان بڵێ هێشتا دەوڵەت ماوە. من لە وەڵامدا گوتم کۆکردنەوەی ماڵیات لە ئەستۆی خۆتانە و کارێکی ناوخۆیە، ئێمە دەستی تێ وەرنادەین و فەرماندەکانی سوپای سوور ناتوانن بە خەڵك بڵێن ماڵیات بدەن یا نەدەن. ئەوان ئەرك و کاری تر جێبەجێ دەکەن و داواکاریەکانی ئێوە ئیشی ئەوان نییە. ئوستاندار گوتی، ئێمە سێ هەزار تۆن گەنممان لە ناوچەی سوڵدز کڕیوە، بەڵام کوردەکان ناهێڵن بیگوازینەوە. ئەگەر ئێوە ٣-٤

سەربازی خۆتمان پێ بدەی، ئێمە دەتوانین بیگوازینەوە، پێشەکیش زۆر سوپاستان دەکەم. لە وەڵامدا پێم گوت: ئەمەشیان ئەرکی ئێمە نییە، بەڵام باڵوێزمان لە تاران سەبارەت بەم شتانە ئاگادار دەکەینەوە.

ماکسیۆڤ

بۆ باڵوێزی یەکێتیی سۆڤیەت هاوڕێ "سیمیرنۆڤ. ئا. ئا"
٢٥ی شوباتی ١٩٤٢:
دەوڵەتی ئێران هەر لەکۆنەوە سیاسەتی هەڵگیرساندنی دوژمنایەتیی نێوان گەلانی گرتوەتە بەر، بەتایبەت لە ناوچەی ڕەزائیە. بە قسەی ئوستاندار "ئەحمەدی ئاراستە" لێرە کوشتاری بەکۆمەڵ ڕووی داوە، بیست هەزار کوژراون. لە ئەنجامی ئەمەشدا ژمارەیەکی زۆر لە کورد و ئەرمەن و ئاسووریەکان بۆ عیراق هەڵاتوون. بزووتنەوەی کوردەکان بە ڕێبەرایەتیی سمکۆ بە کوشتنی وی لەلایەن ڕێبەرانی خۆفرۆشی ئێرانەوە کۆتایی پێ هاتووە. هاتنی کوردەکان بۆ شاری ڕەزائیە و شاپوور و تەورێز قەدەغە کراوە. تەواوی ئەم سیاسەتانە میتۆدێکی فاشستین، ئەمانە هەمووی پێش هاتنی سوپای سوور بۆ ئێران ڕوویان داوە. ئێستا خەڵك بە هاتنی سوپای سوور شادن. گەلانی ئەم ناوچەیە، هەر کام بەپێی ناسیۆنالی خۆی، ڕێکخراوی خۆیان دروست کردووە و بۆ ڕزگاریی نەتەوایەتیی خۆیان تێدەکۆشن. بەگشتی، دانیشتوانی ئەم ناوچەیە لە فەرمان و گوێڕایەڵیدا بۆ دەوڵەتی ئێران، سەرپێچی دەکەن. دامودەزگاکانی دەوڵەتی لە زۆربەی ناوچەکاندا نەماون، بۆ نموونە، لە سوڵدز و سەقز و بانە ... .

به هاتنی سوپای سوور بۆ ئێران، کوردەکان ئەوکاتە هەستیان بەوە کرد وەك دانیشتوانی تری وڵاتی خۆیان ئێرانین. بۆیە ئەوان لایەنگیری لە ئێمە دەکەن و خۆیان بە نزیکی ئێمە دادەنێن. سەفەری ژمارەیەکی نوێنەرانی کورد بۆ باکۆ ڕۆڵێکی زۆری لەم بارەیەوە هەبوە. ئەوان لە نزیکەوە شتی زۆر و چارەسەرکردنی

کێشەی نەتەوایەتییان بە کردەوە بینیوە، پاش گەڕانەوەیان دەستیان بە پڕوپاگەندە کردووە و لەناو خەڵکدا بڵاویان کردوەتەوە کە سۆڤیەتەکان بەڵێنی خودموختارییان پێداون.

ئوستانداری پێشوو لە یەکێك لە چاوپێکەوتنەکانیدا لەگەڵ من، گوتی کوردەکان وەحشی و پیاوکوژ و تالانکەرن، لە ڕابردوودا نەیاندەهێشت بێنە شار، لەبەر ئەوە موسڵمانەکانیان دەکوشت. ئەوان ئێستا هەست بە ئازادی دەکەن و ئێوە چەکداریان دەکەن. ئوستانداری ئێستە ئەحمەدی ئاڕاستە، لەگەڵ سەرۆکی شارەوانی دەیانگوت: ((کوردەکان گوێڕایەڵی ئێمە نابن، تەنانەت ئەگەر ئێمە هێزێکی زۆریشمان هەبێ، بەڵام ئێوە ئەگەر بە بێ چەکیش بن. ڕێزتان دەگرن)).

ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان دێنە باڵوێزخانەی ئێمە و داوای پەنابەری و ڕۆیشتن بۆ سۆڤیەت دەکەن. بۆ وێنە، ڕۆژی ٢٢ی شوباتی ١٩٤٢ کەمال بەگ و عەلی میر حاج بەگ (باوك و کوڕ) هاتنە لامان، هەشتا گوندیان بە ٤-٥ هەزار دانیشتوانەوە هەیە و لەسەر سنووری ئێران- تورکیا لە ناوچەی تولیاکی، تەرگەوەر و مەرگەوەر و گاجار دەژین. ئەوان هاتبوون بپرسن، ئایا سۆڤیەت ئامادەیە هەموویان وەرگرێ. هەروەها پێشنیاری ئەوەیان پێ کردین کە یارمەتی (مەڕو مالات و ئەسپ) پێشکەش دەکەن بە سوپای سوور. دانیشتوانی گوندە کوردنشینەکان کە لە ٣٥-٤٠ کیلۆمەتری ڕەزائیەدا دەژین، پێشنیاری یارمەتیی ماڵییان بە سوپای سوور کرد. وێنەیەکی تر کە کوردەکان پشتیوانی لە ئێمە دەکەن، ئەوەیە کاتێك کەرتەکانی سوپای سوور دەچنە ناوچەی سوڵدوز، یەکێك لە فەرماندەکانی سوپای سوور داوا لە مەلا بورهان دەکات هێمنایەتیی ناوچەکە بپارێزێ. لەوکاتەوە تائێستا مەلا بورهان بە دەست نیشانی سوپای سوور دادەنێن. کاتێك لەلایەن دەوڵەتەوە نوێنەرێك بە ناوی "خوسرەو خانی قەرەپاپاخ" دیاری کرابوو، خەڵکەکە پێی دەڵێن نوێنەری ئێمە مەلا بورهانە و تەنیا سوپای سوور دەتوانێ ئەو لابەرێ. سەرەڕای ئەوەی کە کوردەکان لایەنگری لە ئێمە دەکەن، دەبێ ئاگادار بین، چونکە ئینگلیزەکان و تورکەکان و ئێرانیەکان دەیانەوێ کەڵکیان لێ وەرگرن و بەرەو لای خۆیان ڕایانکێشین. کارکردن لەناو

کوردەکاندا باشترە بدرێتە دەستی گرووپەکانی هاوڕێ عەلییێڤ و ئاتاکشییێف.
تکایە کەس لەم دوو گرووپە نەنێردرێن بۆ ئەملا و ئەولا، تا لەناو کوردەکاندا خەریکی ئیش بن.

م. ئیڤانۆڤ
سەرکونسوڵی سۆڤیەت لە ڕەزائیە

**لە یاداشتەکانی "ئیڤانۆڤ م. ی":**

ئوستاندار لە ١٩ی مارتی ١٩٤٣دا هاتە لام، کەوتە گلەییکردن لەوەی کە گوندەکان نائارامن؛ دەیگوت: پێشتر ئێوە (سۆڤیەت) یارمەتیی ئێمەتان دەدا تا ئارامی و هێمنی لە شارەکاندا بەرقەرار بکرێنەوە، ئێمە توانیمان بەو کارە ڕابگەین، بەڵام ئێستا فەرماندەی سوپای ئێوە هیچ هاوکارییەکمان ناکات، تاڵان و بڕۆ دەستی پێ کردوەتەوە. باندێکی زۆری چەکداری کورد کەوتوونەتە تاڵانکردنی جووتیاران. منیش گوتم: ئێوە ئەوەندە هێزتان هەیە بەبێ یارمەتیی سوپای سوور کۆنترۆڵی ناوچەکە بکەن. ڕاستیەکەیشی هەروایە، بەڵام ئەوان دەترسن بەبێ سەربازانی ئێمە لە شار دەرکەون؛ گەر کەسێکی ئێمەیان لەگەڵدا بێ، کەس گوێیان پێ نادات و فەرمانی کاربەدەستان بەڕێوە دەبەن، بۆیە داوای یارمەتیتان لێ دەکەین)). منیش پێم گوت: ئاگاداری کاربەدەستانی سەرووی خۆم دەکەمەوە، هەر ئەو ڕۆژە فەرماندەی ژاندارمری هاتە لام، ئەویش وەك ئوستاندار کەوتە گلەییکردن و زۆر بە پەرۆشی ناوچەکەوە بوو، داوای هاوکاریی لێ کردین، منیش پێم گوت: ئێوە هێزێکی زۆرتان بە دەستەوەیە، دەتوانن بەبێ یارمەتی هێمنایەتیی ناوچەکە بپارێزن. لەوەڵامدا گوتی: ئەوە ڕاستە، بەڵام بێ چەك و تەقەمەنین، ٣١٠ تفەنگ و چەند دەمانچەیان لە تارانەوە بۆ ناردووین، ئێمە ناتوانین وەریان بگرین، کونسوڵی ئێوە لە شەرەفخان ئەو چەکانەی گاڵ داوەتەوە. لەبەرئەوە داوای هاوکاریتان لێ دەکەین، تا ئەو چەکانە وەربگرینەوە. جگە لەوە، چەکدارەکانی

ئێمە لە داهاتوویشدا بێ یارمەتیی ئێوە ناتوانن هێمنی و ئارامی بۆ ناوچەکە بگێڕنەوە. ئەوانە لەوە دەترسن بە تەنیا بچنە گوندەکانەوە، لەبەر ئەوە جارێکی دیکە داواتان لێ دەکەمەوە یارمەتیمان بدەن تا ئەو دەستە و تاقمانە لەناو بەرین.

لە وەڵامدا پێیم گوت: ئەوەندەی پێویست بێ هاوکاریتان دەکەین. بەڵێنم دایێ چەکەکانیان پێ بدەینەوە، چونکە ئاگادار کرابوومەوە و ئەو دەسەڵاتەیان پێ دابووم تا چەکەکانیان بدەمەوە. ئێستا ئەو چەکانە لە گۆتەیە (غوتەیە). سەرۆکی ژاندارمری بەردەوام بەجۆرێ قسەی دەکرد کە خۆی بە دۆستی سۆڤیەت پێشان دەدا.

ئوستاندار لە نیسانی ١٩٤٢دا جارێکی دیکە هاتەوە لام، وەك هەمیشە بە خراپە باسی کوردەکانی دەکرد، گوتی: بە یارمەتیی ئێوە توانیمان ناوچەکە ئارام بکەینەوە. کاتێ کوردەکان بەناو شاردا دەگەڕێن، کاربەدەستانی سوپای ئێوە چەکیان دەکەن. لەم ڕۆژانەدا چەند چەکداری کوردی خەڵکی مەهاباد لە ڕێستوارنتی ئازەربایجان دادەنیشن، هێزە گەڕۆکەکانی ئێوە هەموویان دەگرن و دەیانبەنە بارەگا و دواتر ئازادیان دەکەن. خەڵك ترسی کوردەکانیان هەیە، بۆیە خەریکن ڕەزائیە بەجێ دەهێڵن. لەبەر ئەوە داوا لە ئێوە و فەرماندەی سوپاکەتان دەکەم، هاوکاریمان بکەن. منیش گوتم: فەرماندەی سوپای سوور یارمەتیی کاربەدەستانی ئێرانی داوە و ئارامی و هێمنی بۆ شار و گوندەکان گەڕاندوەتەوە، باندەکانمان لەناو بردوون. ئێستا کاربەدەستانی ئێران بۆ خۆیان دەتوانن پاشماوەکانیان تەفروتوونا بکەن. لە ڕەزائیە هێندە پۆلیس و ژاندارمری هەن (چەکی باشیان پێیە)، بەڵام دەبێ چالاکانە بجووڵێنەوە. سوپای سوور ئەرکی پۆلیسی ئێران ناگرێتە ئەستۆی خۆی و ئەوە کاری ئەوان نییە. ئوستاندار گوتی: پۆلیس بە تەنها دەرەقەتی کارێکی ئاوها نایەت و کاربەدەستانی خۆجێیی، بەتایبەت لای کوردەکان، هیچ بایەخێکیان نییە. پۆلیس دەترسێ خۆی لە کوردەکان بگەیەنێ، یا دەستیان بۆ بەرێ. گەر کوردێك دەستگیر بکرێ، بەکۆمەڵ لەسەری دێنە وەڵام و دەبێتە مایەی خوێن ڕشتن. ئێوە دەزانن دە پۆلیسی ئێمە دەرۆستی یەك کوردی چەکدار نایەن. بەمجۆرە ئێمە ناتوانین خەڵە و خەرمان

کۆبکەینەوە، لەم بارەیەوە خەڵك سوپای سوور بە تاوانبار دەزانێ. دووبارەم کردەوە، ئەوە کاری سوپای سوور نییە و خۆی لە کاروباری ناوخۆ ناگەیەنێ.

ئیڤانۆڤ. م. ی.

رایۆرت دەربارەی ڕووداوەکانی ڕەزائیە
٢٣ی ئایار (مەی)ی ١٩٤٣:

پاش ڕووداوەکانی یانوور لە ڕەزائیە تا نیوەی یەکەمی نیسان، ناوچەکانی ڕەزائیە ئارامییان بەخۆوە بینی، لەو ماوەیەدا بۆمان ڕوون بووەوە کە دەزگا سیخوڕیەکانی تورکیا پەیوەندییان بە تاقمە کۆنەپەرستەکان و موڵکداری دژ بە سۆڤیەت و کاربەدەستانی خۆماڵیی ئێران کردووە و چالاکانە کەوتوونەتە جووڵانەوە. جەلال سوڵتان یەکێ لە موڵکدارە بەناوبانگەکان کە بەخشداریشە و زیاتر لە ٣٠ گوندی هەن، لە کۆتایی مانگی مارتی ئەمساڵدا بەناو گوندە ئازەرنشینەکاندا گەڕاوە و خەڵکی چەکدار کردووە، داوای لێ کردوون دژ بە ڕووسەکان و هاوکارانیان بجەنگێن؛ گوتوویە: بەم زوانە تورکیا دژ بە سۆڤیەت دەکەوێتە شەڕەوە و دەبێ ئێمە ئامادەبین لە پشتی بەرەوە هاوکاریی تورکیا بکەین و دژ بە سوپای سوور بین. بەدوای ئەوەدا، لە ٣٠ی نیسانی ١٩٤٣دا سەرهەنگ میر حسێن خانی هاشمی کە لە ناو خەڵکدا بە "سەرهەنگ مانی" ناسراوە و فەرماندەی ژاندارمری ئوستانی (٣و ٤)ەو هاتووەتە ڕەزائیە، سەرهەنگ هاشمی تا هاتنی سوپای سوور بۆ ئێران فەرماندەی هەنگی پیادە بووە کە سەر بە تیپی سیی ڕۆژئاوای ئێرانە، ناوەندەکەیشی لە تەورێزە. لای ئێمە ڕوون و ئاشکرایە کە هاشمی یەکێکە لە ڕێبەرانی ڕێکخراوێکی نهێنیی ئیسلامی- تورکی لە تەورێز. دیاریکردنی هاشمی بۆ ئەم پۆستە لە ڕۆژنامەکانی ئێراندا پێشوازیی لێ کراوە. بە هاتنی بۆ ڕەزائیە، لەلایەن دانیشتوانی ئازەرییەوە پێشوازیی لێ کراوە، وا تێ گەیشتوون کە هاتنەکەی هێنانی سوپای ئێرانە و سەقامگیربوونی تەواوی دەسەلاتی ئێرانە لە ناوچەکەدا.

هاشمی هەر لەڕێگەوە هەوڵی داوە چاوی بە هێندێ لە سەرکردەکانی کورد بکەوێ، بەڵکە بەلای دەوڵەتی ئێراندا ڕایان بکێشێتەوە، تەنانەت هێرشیش کراوەتە سەر سۆڤیەت. بۆ نموونە، بەقسەی یەکێك لە سەرکردەکانی هۆزی شکاك لە دارودەستەی قوتاس ئاغا بە ناوی "ماهۆ میرۆ"وە، هاشمی ٣٠ی نیسان لە گوندی (کولبخە) چاوی بە کوردەکان کەوتووە و پێی گوتوون: یەکێتیی سۆڤیەت دۆستی ئێوە نین، بەڵکوو هی ئێرانیەکانن، ڕووسەکان دەڕۆن و هەر ئێمە دەمێنینەوە. ((یەکێتیی سۆڤیەت پارتێکی لە ئاسووری و ئەرمەنی و کورد پێك هێناوە، بەلام ئێوە نابێ ئومێدتان پێیان هەبێ. من ئەو پارتە دەدۆزمەوە و لە ناوی دەبەم)) هەروەها گوتوویە: ((ڕۆژنامەکان نووسیویانە: تەواوی کوردەکانی تورکیا و عیراق و تەنانەت ئێرانیش بۆ پشتیوانیی ئەڵمان یەك دەگرن، تەنیا هۆزی شکاك نەبێ کە لێیان بەجێ ماون. ئێوە لە هیچ و بەخۆڕایی هیواتان بە دەوڵەتی سۆڤیەت هەیە. کاتی خۆتان لەدەست مەدەن، ببنە سەرمەشقی هەموو کوردەکان)).

ئەم چاوپێکەوتنەی هاشمی هیچ دەستکەوتێکی نەبوو، بە سەرشۆڕی گەڕایەوە، بەرێوە بەرەو ڕەزائیە چاوی بە دانیشتوانی ناوچەکە و خەڵکی ڕەزائیەش کەوت. هاشمی داوای لە خەڵك کرد لە کاتی هەر تێکهەڵچوونێکدا پشتگیریی ژاندارمری بکەن، گەرچی لەو ماوەیەدا هیچ چەشنە هەنگاوێك دژی دەوڵەت و ژاندارمری لەلایەن کوردەکانەوە هەڵنەگیرابوو، ئاغا خان مەدپوور یەکێ لە کوردانی داروەدستەی سەرتیپ ئاغای شکاك کە لەکاتی قسەکردنی هاشمیدا بۆ خەڵکی ورمێ لەوێ بەشدار بووە، ڕایگەیاندووە هاشمی گوتوویە: ((ئەگەر کوردەکان چەکەکانیان تەسلیم بە دەوڵەت نەکەنەوە، دەبێ ژاندارمری بدەن)).

هاشمی پاش هاتنی بۆ ناوچە ئازەریەکان، بە ئاشکرا دەکەوێتە چەکدارکردنی خەڵك و بەشینەوەی تەقەمەنی. هاوکات لەگەڵ ئەم هەنگاوانەیدا ئاگاداری کردوونەتەوە کە کوردەکان بۆیان نییە چەك هەڵبگرن، تەنانەت پۆشینی جلوبەرگی کوردیش قەدەغەیە. ئەم هەنگاوانەی هاشمی و کاربەدەستانی دەوڵەت، لەلایەن کوردەکانەوە وا لێك دراوەتەوە کە دەوڵەت خۆی بۆ

سەرکوتکردنیان ئامادە دەکات، هەروەها بەردەوامیی سیاسەتی ڕەزا شایە بەرامبەریان. بەم چەشنە بارودۆخی ناوچەکە ئالۆز بووە. ڕۆژی ۲۰ی نیسان دوو کورد بەچەکەوە دێنە ناو شار و ژاندارمری هەوڵی چەککردنیان دەدات، ئەوانیش ئامادە نابن چەك دابنێن. پۆلیس دەیەوێ بەزۆر چەکەکانیان بفڕێنن. خەڵك لێیان کۆدەبێتەوە. کوردێك بەناوی م. فیرووزی خەڵکی مەهاباد و خزمی قازی محەمەد لەناو خەڵکەکەدا دەبێ، بە دەمانچە دەکەوێتە تەقەکردن و کابرایەك بریندار دەبێ. هێزێکی زۆری پۆلیس و ژاندارمە و ئازەری خۆیان دەگەیەننە شوێنەکە و هەرسێکیان چەك دەکەن و زۆریان لێ دەدەن. پاشان ڕاپێچیان دەکەن بۆ پۆلیسخانە. هەر لەو ڕۆژەدا چەند کوردی دیکە بە بیانووی جۆراوجۆرەوە چەك دەکرێن. هاشمی ڕۆژی ۲۰-۲۳ی نیسان دەنێرێ بەشوێن هێندێ سەرۆك هۆزی کورددا، تا بۆ وتوویژ بێنە ورمێ. بەڵام لە ترسی گرتن و کوشتنیان (لە ڕابردوودا بەسەرهاتی لەو جۆرە زۆر ڕووی داوە)، کەسیان نەچووبوونە لای هاشمی. کامیل بەگی برای نووری بەگ یەکێ لە سەرکردەکانی هۆزی هەرکی، هاشمی سووکایەتی پێ دەکات (گوایە کێشاویەتی بە پشتەملیدا)، تەنانەت ویستوویەتی بیگرێ، بەڵام کامیل بەگ توانیویەتی خۆی ڕزگار بکات.

ڕۆژی ۲۳ی نیسانی ۱۹٤۳ پۆستی ژاندارمری کە ژمارەیان ۳۰-٤۰ کەسێك دەبوو، بە بڕیاری هاشمی لە گوندەکانی بالانوش و سەر ڕێگای ڕەزائیە- شنۆ و مەهاباد دامەزران. هاوکات ژاندارمەکان و موڵکدارەکان داوایان لە ئازەریەکانی ناوچەکە کرد یارمەتییان بدەن بۆ چەککردنی کوردەکان. هەر لەو ڕۆژەدا شەش کورد لە خێڵی شێخ جەلال، کاتی گەڕانەوەیان لە ڕەزائیە، بڕێك کەلوپەل و پارەیان پێ بووە، لەنزیك گوندی (زۆرگ ئاباد) لەلایەن دەستەیەکی ئازەری و دوو ژاندارمەوە بە فەرماندەیی کوێخای گوندی حەسەنی خان هێرش کراوەتە سەریان و دەستبەجێ یەکێکیان دەکوژن. کوردەکان کەوتوونە بەرهەڵستی و ژاندارم و جووتیاری دیکەی ئازەریی چەکدار خۆیان گەیاندوەتە شوێنی ڕووداوەکە، لە ئەنجامدا سێ کورد کوژراون و یەکێکیان دەستگیر کراوەو دوانیان توانیویانە بە برینداری خۆیان قوتار بکەن. ژاندارم و ئازەریە چەکدارەکان بێزیان بوون، تەنیا

دوو ئەسپیان بریندار کراوە. دوای ئەم ڕووداوە کاربەدەستانی ئێران کەوتوونە بڵاوکردنەوەی دەنگوباسی ئاژاوەگێڕانە، گوایە کوردەکان خۆیان سازوتەیار کردووە و هێرش دەکەنە سەر پۆستەکانی ژاندارمری و گوندە ئازەری‌نشینەکان. ئێوارەی ٢٣ی نیسان ٤٠ ژاندارم و ئازەری لە گوندەکانی دەوروبەر گەیشتوونە گوندی بالانوش. ئەو چەکانە کە پێشتر شاردبوویانەوە، هەڵیانگرتوون و لە دەوروبەری پۆستی ژاندارمری ڕاوەستاون.

بەم چەشنە تا هاتنی کوردەکان بۆ گوندی بالانوش ٥٠٠ تا ٨٠٠ ژاندارم و ئازەریی چەکدار کۆبوونەتەوە، دانیشتوانی گوندی زۆرگ ئاباد ٣-٤ موسەلسەلی دەستی کە کاتی هەڵاتنی سوپای ئێران بەجیٚ مابوو، تەسلیم بە ژاندارمەکانیان کردوەتەوە. بەو بیانووەی کە گوایە ئەرمەنیەکانی گوندی بالانۆش هاوکاریی کوردەکانیان کردووە، پاسەوانیشیان بۆ ماڵە ئاسوریەکان داناوە، ئەرمەنی و ئاسووریەکان لەترساندا بەرەو شار ماڵوحاڵیان بەجیٚ هێشتووە. هەر ئەو ڕۆژە ماشێنێکی پڕ لە تەقەمەنی لە ڕەزائیەوە گەیشتوەتە بالانۆش. لە ڕووداوێکی دیکەدا، هەر لەم ڕۆژەدا ماشێنێکی سواری کە لە ڕەزائیەوە بەرەو مەهاباد چووە، لەلایەن ژاندارم و ئازەریە چەکدارەکانەوە دراوەتە بەر تەقە، ئەنجام بازرگانێکی خەڵکی مەهاباد و شۆفێری ماشینەکە کوژراون. نیوەڕۆی ٢٤ی نیسان هاشمی لە ڕەزائیەوە بەرەو مەهاباد کەوتوەتە ڕیٚ و لە گوندی بالانوش لای داوە، داوای لە خەڵك کردووە هاوکاریی ژاندارمەکان بکەن بۆ چەککردنی کوردەکان.

دانیشتوانی کوردی گوندەکانی کوکیا و مەحموودۆۋ و حەسار و ئاغبلاغ و گوندەکانی دەوروبەری بالانۆش و زۆرگ ئاباد، هانایان بردوەتە بەر زیرۆ بەگی سەرکردەی بەناوبانگی کوردی خێڵی هەرکی. زیرۆ بەگ و چەند سەرکردەی دیکەی کورد بە چەکدارەکانیانەوە گەیشتوونەتە ئەو گوندانە. زیرۆبەگ هەوڵی داوە بە ئاشتییانە چارەسەری کێشەکە بکات، نامەی بۆ کاربەدەستانی ئێران و فەرماندەی سوپای ئێران لە ڕەزائیە ناردووەو داوای لیٚ کردوون نوێنەری خۆیان بنێرنە ئەویٚ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەو لێکۆڵینەوە لە ڕووداوەکە. هاوکات زیرۆ بەگ فەرمانی بە کوێخاکانی گوندە کوردنشینەکان داوە ئارامی و هێمنیی

خۆیان بپارێزن. لەوکاتەدا کە زیرۆ بەگ هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکەی داوە، گرووپێکی چەکداری ئازەری و ژاندارمری هێرشی کردوەتە سەر گوندی تومانتار و گەمارۆی داوە، شەش کوردی لەسەر خوانی نیوەڕۆ کوشتووە. دوابەدوای ئەم ڕووداوە، چارەسەرکردنی ئاشتییانەی کێشەکە کۆتایی پێ هاتووە. زیرۆ بەگ و پیاوەکانی خۆی هێرشیان کردووەتە سەر دەستدرێژیکەران. بە هاتنی سوپای ئێران بۆ بەهێزکردنی ژاندارمری و ئازەریەکان، زیرۆ بەگیش داوای یارمەتیی لە کوردەکان کردووە، هێزی یارمەتی بە سەرۆکایەتیی تاهیر ئاغا و قادر ئاغا و شێخ جەلیل و قەرەنی ئاغای زەرزا و کوڕی مووساخانی زەرزا و... بۆ پشتیوانیی زیرۆ بەگ خۆیان گەیاندوەتە جێ، هێزی کوردەکان گوشاریان خستوەتە سەر ژاندارم و ئازەریەکان و پاشەکشەیان پێ کردوون.

دوای گەمارۆدان و گرتنی پۆستی ژاندارمەکان لە گوندی بالانۆش و پولاتلی، لەوێشەوە بە ڕاکردن ترسنۆکانە پاشەکشەیان کردووە. لە ئەنجامدا کوردەکان بێئەوەی زیانی گیانی بە ۳۰ ژاندارم و ئازەری بگات، توانیویانە سەدو شەست کەسیان چەك بکەن، دواتر بێ چەك ئازادیان کردوون. ڕۆژی ۲۸ی نیسان کوردەکان بەرەو ڕەزائیە کەوتنە ڕێ، لای باشوور و ڕۆژهەڵاتەوە گەمارۆی شاری ڕەزائیەیان دا. هەر لە ۲٤ی نیساندا کوردەکان لای ڕۆژئاوای باکوور و ڕۆژئاوای ڕەزائیەیان گەمارۆ دا، گەیشتنە گوندی ئانهار (۱۰ کیلۆمەتر لە ڕەزائیە دوورە). کامیل بەگ کە سەرهەنگ هاشمی سووکایەتیی پێ کردبوو، لەگەڵ نووری بەگی برایدا بە دووسەد چەکداری سوارەوە گەیشتنە ئەوێ، داوایان کرد هاشمی و ژاندارمری لە ڕەزائیە و دەوروبەری نەمێنن. چەند ڕۆژێك دواتر سەرکردەکانی دیکەی کورد وەك ڕەشید بەگ و حەسەن هەناری و شێخ حەمەسادق و سەیید تەهای گەیلانی لەگەڵ براکانیدا بە خۆیان و چەکدارەکانیانەوە گەیشتنە لایان. هۆزی شکاك بە سەرۆکایەتیی عومەر خان و سەرتیپ ئاغای شکاك و حەسەن تیلوو... بە مەبەستی هێرشکردن بۆ یارمەتیدانیان چوون. بەشێکی هێزەکەی هۆزی شکاك بە سەرۆکایەتیی قوتاس ئاغا گەمارۆی شاپووریان دا. ڕۆژانی ۲۸-۲۹ی نیسان هێزەکانی کورد کە ژمارەیان دەگەیشتە ۱۰ هەزار چەکدار، گەمارۆی

ڕەزائیەیان دا. دووسەد چەکداری خێڵی هەرکی لە عیراقەوە بە مەبەستی یارمەتیدانی زیرۆ بەگ هاتبوون، یەکگرتن و هێرشی کوردەکان ترسی خستە دڵی دانیشتوانی ئازەری، لە هەموولایەکەوە بەرەو ڕەزائیەو شاپوور هەڵدەهاتن، ژمارەیان بەگشتی خۆی لە ٢٥-٣٠ هەزار کەس دەدا.

شایانی باسە، ئاسووری و ئەرمەنیەکان هەڵنەهاتن بۆ شار، لە ماڵ و گوندی خۆیاندا مانەوە. سەرکونسوڵی سۆڤیەت لە تەوریز هاوڕێ کولاژینکۆڤ و سەرتیپ سیلوانۆڤ جێگری فەرماندەی سوپای ١٥ی سوارە کە بە فڕۆکە گەیشتبوە ڕەزائیە، بڕیاریان دا بکەونە نێوان کاربەدەستانی ئێران و کوردەکان. ڕۆژانی ٣٠ی نیسان و ١و ٢ی ئایار وتووێژی نێوان نوێنەرانی ئێرانی کە لە سەرهەنگ جەلیل و پشکنەری پۆلیس پێك هاتبوون، لەگەڵ کوردەکاندا دەستی پێکرد، کوردەکان ئەم داخوازیانەیان خستە بەرچاو:

١- نابێ کوردەکان چەك بکرێن.

٢- لە باشووری شاری (خۆی) بەولاوە پۆستی ژاندارمری دانەنرێ.

٣- کوردەکان ئازادبن لە هاتوچۆکردندا بۆ ناو شارو مافیان پارێزراو بێ.

٤- چەککردنی ئازەریەکان، کە لەلایەن دەوڵەتی ئێران و موڵکدارەکانەوە چەکیان پێدراوە.

٥- کوردەکان وەك هەموو دانیشتوانی ئێران لە کاروباری ئیدارە و دەزگاکانی دەوڵەتدا ئازاد بن.

٦- پاراستنی ڕێگاکان و هێمنیی ڕێگاوبانەکان بە دەست کوردەکانەوە بێ.

٧- گێڕانەوەی ئەو زەویانەی کە پێشتر لە کوردەکان زەوت کرابوون و بدرێنەوە بە خاوەنەکانیان.

٨- کردنەوەی قوتابخانە لە ناوچە کوردنشینەکاندا و خوێندن بە زمانی کوردی بێ.

٩- ئازادکردنی ئەو کوردە بێتاوانانەی کە ئەم ماوەیە لەلایەن پۆلیس و ژاندارمەکانەوە گیراون.

١٠- چەوساندنەوەی نەتەوایەتی بەرامبەر بە کورد نەکرێ.

نوێنەرانی ئێمە بە کوردەکانیان ڕاگەیاندبوو کە بەشێك لەو داخوازیانە لەلایەن کاربەدەستانی خۆجێیی‌یەوە جێبەجێ ناکرێن، بەڵێنیان دا لەڕێگای باڵوێزی سۆڤیەتەوە بگاتە دەستی بەرپرسانی دەوڵەتی ئێران. کاربەدەستانی خۆجێیی ئێران بە سەرۆکایەتیی "سەرهەنگ جەلیل" پێشنیاری جێبەجێکردنی ئەم داخوازیانەیان پێدان:

١- دەسەڵاتدارانی ئێرانی کوردەکان چەك نەکەن.

٢- پۆستەکانی ژاندارمری لەسەر ڕێگاکان هەڵگیرێن.

٣- کوردەکان دەتوانن ئازادانە بەبێ چەك هاتوچۆی شار بکەن.

٤- مافی شەخسیی کوردەکان مسۆگەر بکرێ، هیچ چەشنە هەنگاوێك دژ بە بەشدارانی ڕاپەڕین هەڵنەگیرێ.

سەرکردە کوردەکانی بەشداری ئەم کۆبوونەوەیە، بەو مەرجانە ڕازی بوون، بەڵێنیان دا چالاکیی چەکدارییان نەبێ و بگەڕێنەوە بۆ سەر ماڵوحاڵی خۆیان. کوردەکان بەکردەوە بەڵێنەکانی خۆیان جێبەجێ کرد و هێندێکیان لە شار پاشەکشەیان کرد، تا ٤ی ئایاری ١٩٤٢ شار هەر گەمارۆ درابوو. پێویستە بگوترێ کوردەکان لە ٤-٥ ڕۆژی یەکەمدا وازیان لە تالأنکردن هێنا، تەنانەت هەوڵیان دا ئازەریەکان هێور بکەنەوە؛ ڕایانگەیاند ئەوان دژ بە ژاندارمری بەشەڕ دێن. کاتێ کوردەکان شاریان گەمارۆ دابوو، ڕێیان لە هاتوچۆی خەڵك نەدەگرت. بەڵام پاش ئەوەی زانییان ئازەریەکانیش هاوشانی ژاندارمەکان دژی ئەمان شەڕیان کردووە و یەکەم کوژراویش لە کوردەکان بووە، داوای سزادانی قاتڵی کوردە کوژراوەکانیان کرد، دەستیان کرد بە تالأنکردنی ئەو شتانەی کە نەیانتوانیوە بۆ شاری ببەن. درۆودەلەسە و ئاژاوەگێڕییەکی زۆر لە شار و گوندەکانی ناوچەی ڕەزائیە بڵاو کرانەوە، سەبارەت بە کوشتنی ژن و منداڵ و دەستدرێژیکردنە سەر ئافرەت و سووتاندنی گوندەکان لەلایەن کوردەکانەوە بە هاوکاریی ڕووسەکان. لەگەڵ کۆمیساری تیپ و پشکنەری پۆلیس و بەرپرسی سیاسی هاوڕێ یەنالیف سەردانی ناوچەکانی دەوروبەری شارمان کرد، بۆ ڕوونکردنەوەی ڕووداوەکان. دەرکەوت جگە لە تالأنکردنی هێندێ شوێن، هەموو هەواڵەکان درۆ بوون. داوام لە نوێنەری

کاربەدەستانی ئێران کرد بەرپەرچی ئەو هەوڵانە بداتەوە، چونکە خۆیشی لەگەڵمدا بوو، ڕاستیەکانی بە چاوی خۆی دیبوو.

کاتێ سەردانی ناوچەکەم کرد، چاوم بە عومەر خان و سەرتیپ ئاغا و حەسەن تیلەکۆ لە سەرکردەکانی هۆزی شکاك کەوت، داوام لێ کردن بە زووترین کات بگەڕێنەوە بۆ جێوشوێنی خۆیان و واز لە ئاژاوە بهێنن. سەرەتا ئامادە نەبوون و دەیانگوت: بانگ نەکراون بۆ وتوویژ و چارەسەری کێشەکە و ئەوان چیتر هیچ بەرپرسییەك لە ئەستۆی خۆیان ناگرن. بەڵام دواتر بەڵێنیان دا بگەڕێنەوە بۆ سەر ماڵوحاڵی خۆیان. سەرباری گەڕانەوەی کوردەکان لە ٤ ی ئایاری دا، دەسەڵاتدارانی ئێرانی دەستبەرداری بڵاوکردنەوەی هەواڵی درۆ و تاوانبارکردنی کوردەکان نەبوون. گەنجینە و فرۆشگاکان بە فەرمانی پۆلیس و ژاندارمری لە ٧و٨ ی مانگی ئایاردا داخران، گەرچی دوکاندار و بازرگانەکان بەڵێنیان بە ئێمە دابوو دوکانەکانیان دانەخەن. هەر بۆیە لەو ماوەیەدا کەس نەکوژرا و دزیش نەکرا. سەرتیپ جەهانبانی وەزیری جەنگی ئێران لە ٨ی ئایاردا سەری لە شار دا، دکتۆر مەزرەبانیان بە ئوستانداری ئوستانی (٤) دانایەوە.

ئێمە دوای وتوویژی پێویست بڕیارمان دا چەند پۆست لەسەر بارەگاکانی سوپای سوور لە چەند جێگەیەکدا دابمەزرێنن، تا بەم چەشنە گەڕانەوەی خەڵك بۆ شوێنەکانی خۆیان مسۆگەر بکرێ. بەڵام سەرەڕای ئەوە خەڵك هەر لە شاردا مانەوە، چاوەڕێی بڕیاری کاربەدەستانی ئێرانیان دەکرد تا پێیان بڵێن بگەڕێنەوە. دوو جار بڕیاری گەڕانەوەی خەڵك درا و تا ئەمڕۆ بەشێکی دانیشتوان کە نزیکەی ١٠ هەزار کەسێك دەبن، گەڕاونەتەوە. سەیر لەوەدایە هەموویان بە ڕۆژ دەچنەوە گوندەکانی خۆیان و کاری کشتوکاڵی خۆیان دەکەن، بە شەو دەگەڕێنەوە بۆ شار. بەڵام کاربەدەستانی ئێران بە نهێنی و ژێربەژێر لەڕێی مەلاکانەوە (کە ژمارەیان لەشاردا زۆر زۆرە) بڕیاریان داوە بۆ ئەم مەبەستانەی لای خوارەوە دەست بەکار بن:

١- خەڵك نەگەڕێتەوە بۆ سەر ماڵوحاڵی خۆیان، تا ئەوە ببێتە بیانوویەك و دەوڵەتی ناوەندی بڕێك پارە بۆ یارمەتیدانیان بنێرێ، بەشێکی زۆری لەلایەن

کاربەدەستانی ناوچەکەوە بخورێ. بۆ نموونە، کاربەدەستانی ئێرە دەڵێن ڕۆژانە پەنجا هەزاریان یارمەتی داوە بە دانیشتوانی ناوچەکە، لەڕاستیشدا لە دە هەزار زیاتریشیان خەرج نەکردووە.

٢- بیانوویەك هەبێ تا درێژە بە ناردنی سوپای ئێران بۆ ناوچەکە بدرێ.

٣- بەردەوامی بە ڕقی خەڵك لە دژی ئێمە بدەن، لەوبارەوە هانیان بدەن. ڕەشید بەگ و نووری بەگ لە نامەیەکدا ڕۆژی ١٣ی ئایار بۆ ئوستانداریان نووسیوە و باسی ئەوەیان کردووە کە ڕێککەوتنی ڕۆژانی ١و ٣ی ئایار جێبەجێ ناکرێ، پرسیار دەکەن کەی جێبەجێ دەکرێ. ئوستاندار وەڵامی ئەو نامەیەی نەداوەتەوە. چەکدارەکانی ڕەشید بەگ و نووری بەگ ڕۆژی ١٣ی ئایار لە دەوروبەری شار سەر هەڵدەنێنەوە. ئێمە ترسمان لە هەڵگیرسانەوەی شەڕ هەبوو، داوامان لە ئوستاندار کردبوو لەگەڵ کوردەکاندا بکەوێتە وتووێژ، تا پێش بە هەڵایسانی شەڕ بگرین. ئەنجام پاش چاوپێکەوتن هەردوولا پێك هاتن، کوردەکان بەڵێنی گەڕانەوەیان دا بۆ سەر ماڵوحاڵی خۆیان، ئوستانداریش بەڵێنی جێبەجێکردنی ئەم چەند خاڵەی دا:

١- کوردەکان چەك بکرێن.

٢- کوردەکان ئازادانە بەبێ چەك هاتوچۆی ناوشار بکەن. سەرکردە کوردەکان بەتایبەت ئازادن چەك هەڵبگرن.

٣- پۆستی ژاندارمری لە گوندەکانی کوردنشین دانەمەزرێ.

٤- کوردە خوێندەوارەکان لە دامودەزگاکانی دەوڵەتیی ناوچە کوردنشینەکاندا دابمەزرێن.

کوردەکان لە ١٤ی ئایاری ١٩٤٢دا گەڕانەوە بۆ سەر ماڵوحاڵی خۆیان. بارودۆخی ناوچەکە ئاسایی بووەوە، بەڵام تاڵان و برۆ لەملاو ئەولادا هەروا ڕووی داوە. پێدەچوو کردەوەی تاڵانکاریی گرووپی سێ کەسیی ئازەریەکان، بە بەرگی کوردییەوە ئەنجام درابێ. هەر بۆیە ئێمە پۆستی سوپای سوورمان دانا، تا بتوانین ئەو چەتانە لە دواڕۆژێکی نزیکدا لەناو ببەین. پێویستە بگوترێ "داماد ئۆغلی"ی بەڕێوەبەری کاروباری کۆنسوڵی تورکیا کە مێجەر (مایۆر)ی سوپای

تورکیایە، دەورێکی گلاّوی لەو ڕووداوانەدا هەیە، داوای لە ئازەریەکان کردووە جەخت لەسەر قەرەبووکردنەوەی زیانەکانیان بکەنەوە، مۆڵەتی پێ‌داون بێنە ناو باخچەکەی کونسوڵخانەی تورکیا و لە بەردەمی کۆنسوڵخانەدا کۆببنەوە، تەنانەت بە پارەیش هاوکاریی کردوون، ١-٣ ڕیاڵی داوە بە هەریەکەیان.

هەروەها داواکاریی خەڵکی وەرگرتووە، کە داوای مافی هاووڵاتی‌بوونی تورکیایان کردووە. بەڵگەیش بەدەستەوەیە کە بەڵێنی بە ئازەریەکان داوە لەکاتی پێویستدا سوپای تورکیا هاوکارییان بکات. جگە لەوە، لەکاتی کۆبوونەوەی خەڵکدا لە تەلگرافخانە، داماد ئۆغلوویش لەگەڵیان بووە لەسەر ئەو ڕاگەیاندنانەی سەرەوە. بەکورتی دەتوانم بڵێم: هۆکاری ڕووداوەکان هەر کاربەدەستانی خۆجێیی بوون، بە فەرمانی دەوڵەتی ئێران کراون. بەو مەبەستەی کە:

١- سوپای ئێران بنێرنە ئازەربایجان و بڵێن هێزەکانی ئێرە بەش ناکات.
٢- هەلومەرجێکی وا لە ناوچەکەدا بخوڵقێنن تا سوپای سوور نەتوانێ تێیدا بمێنێتەوە و بەزوویی لە ناوچەکە دەربچێ.
٣- سۆڤیەت لە ئاستی نێودەوڵەتیدا تەنگەوتاو بکەن و نیشانی بدەن کە ئێمە ناتوانین هێمنیی ئەو ناوچانەی وا سوپای ئێمەیان تێدایە، بپارێزین، بەو جۆرە خەڵکانیشمان لێ دوور بخەنەوە.
٤- دەرفەت بە تورکیا بدرێ تا بە بیانووی پشتیوانیی برا موسڵمانەکانەوە دژ بە ئێمە ڕاوەستن.

پێم وایە پێویستە:

١) بە دەوڵەتی ئێران بگوترێ سەرهەنگ هاشمی فەرماندەی ژاندارمری ئوستانی ٣و ٤ دەورێکی ئاژاوەگێڕانەی ئاشکرای لەو ڕووداوانەدا هەیە، داوا بکرێ لێکۆڵینەوە سەبارەت بە کردەوەکانی بکرێ.

٢) دەوڵەتی ئێران ئاگادار بکرێتەوە کە کاربەدەستانی خۆجێیی ئێران هەنگاوی پێویست و باش بۆ چارەسەرکردنی تێکهەڵچوونەکان نانێن، بەڵکوو بەپێچەوانەوە هاندەرو پەرەپێدەری ڕووداوەکانن.

٣) داوا له دەوڵەتی ئێران بکرێ، ڕێوشوێنی پێویست دژی ئەو کەسانەی کە بوونەتە مایەی ناڕەزایی کورد، دابنرێ.

٤) بەردەوام بین لەسەر گوشار خستنە سەر کاربەدەستانی ئوستانی چوار تا بە ڕێکوپێکی هێمنیی ناوچەکە بپارێزن.

ماکسیمۆڤ

کونسوڵی سۆڤیەت لە ڕەزائیە

دانەی بۆ:

١- هاوڕێ دیکانزۆڤ.

٢- باڵوێزی سۆڤیەت له ئێران.

٣- کونسوڵی سۆڤیەت لە تەورێز.

**بەڵگەنامەیەکی گرنگو**
**هەڵوێستی ڕەسمیی سۆڤیەت بەرامبەر بە کورد**

٣١ی ئابی ١٩٤٢

ژمارە ١٤٢-م

نهێنی،

وێنەگرتنەوەی قەدەغەیە

بۆ باڵوێزی یەکێتیی سۆڤیەت لە ئێران

هاوڕێ سمیرنۆڤ

لەو ڕێنوێنیانەدا کە کۆمیسایاری گەل بۆ کاروباری دەرەوە (وەزارەتی دەرەوە) ڕێکەوتی ١٣ی مایسی ئەمساڵ بە برووسکە بۆ باڵوێزخانەی ناردووە، ئەو هەڵسوکەوتە ناڕاستانە کە نوێنەرانی کونسوڵخانە و هێزەکانی عەسکەریمان لە ئازەربایجانی ئێران نواندوویانن، دەستنیشان کراون. بۆ نموونە، بەرگریکردن لە هاتنی سوپای سوور بۆ ڕەزائیە یەکێکە لەو هەڵوێستە چەوتانە کە لە ئەنجامی

ئەوەوە پەیدا بووە. ئێمە ١٣ی مایسی ئەمساڵ بەتایبەتی ئەوەمان دیاری کردبوو کە نابێ کونسوڵەکانمان (مەرجی تایبەت بەرامبەر بە کاربەدەستانی عەسکەری و... ئێران دابنێن بۆ چەسپاندنی هێمنی و ئاسایشی ناوچەکە؛ لەبەر ئەوەی یەکەم: پێچەوانەی ئەو ڕێنوێنی و فەرمانانەیە کە ئێمە لەم ڕووەوە سەبارەت بەم کێشەیە داومانن، دووەهەم: ئەو سنوور و مەرجانەی وا ئێوە داوتاننناون بۆ ئێرانیەکان بۆ سەپاندنی هێمنی و ئاسایشی ناوچەکە، ئێرانیەکان وایان لێك داونەتەوە کە ئێوە پشتگیرییان دەکەن. تەواوی بەرپرسیی داخستن و کۆتاییهێنان بە ئاژاوەو نائارامی، دەخرێتە ئەستۆی ئێمە، ئەمەیش زیان بە بەرژەوەندەکانی یەکێتیی سۆڤیەت دەگەیەنێ)).

فەرمانبەرانی کونسوڵخانە و عەسکەریمان، سەرەڕای ئەم ئاگادارکردنەوەیە، کە دەبوو پابەندی ئەم فەرمانەی دەوڵەت بن و کۆسپ نەنێنە بەردەم هاتنی سوپای ئێران بۆ ڕەزائیە، لە ئەنجامی چەند هەنگاوێکی ناڕاستی عەمەلییەوە سەربازگەی ئێرانیان لە ڕەزائیە خستوەتە بارودۆخێکەوە کە نەتوانێ هیچ ڕێوشوێنێك بە کردەوە بۆ سەقامگیرکردنی هێمنی و ئاسایش لەم ناوچەیەدا دابنێ. ئەمەیش هەر ئەوە دەگەیەنێ کە دەبێ فەرمانبەرەکان بەپێی فەرمانەکانی ناوەند بجوولێنەوە و لە هەڵە سیاسیەکانی خۆیان لەم بارەیەوە تێنەگەیشتوون و ئەنجامی پێویستیان لەم هەڵانە وەرنەگرتووە. ئەرکی ئێوە ئەوە بوو لەو هەڵانەی وا فەرمانبەرانی ئێمە کردوویانە، بکۆڵنەوە و دەستنیشانیان بکەن و بەم جۆرە لە کاروبارەکانیاندا یارمەتییان بدەن تا بە ڕێکوپێکی بەڕێوەیان بەرن.

جگە لەوە، ئەم هەڵانەی فەرمانبەرانمان لە نامەی ٢٥ی مایسی باڵوێزدا بۆ کونسوڵەکان سەبارەت بە ڕووداوەکانی ڕەزائیە، بە ڕوونی دیاری کراون. لەو نامەیەی ڕێنوێنییەدا بۆ کونسوڵەکان کە چۆن بجوولێنەوە، ئەمە هاتووە: ((بە هەڵسەنگاندنی ڕووداوەکانی ڕەزائیە، پێویستە بوترێ: فەرمانبەرانی کونسوڵخانە و عەسکەریمان لە ناوەڕۆکەکەیان تێنەگەیشتوون و ئێرانیەکانیش وا حاڵی بوون کە ئێمە پشتی کوردەکان دەگرین و لەگەڵیاندا نەرمو نیانین)).

ئەم هەڵسەنگاندنەی هەڵسوکەوتی فەرمانبەرەکانمان ڕاست نییە. کارەکە لەوەدا نییە کە ئێرانیەکان بە هەڵە هەڵسوکەوتی فەرمانبەرانی کونسوڵخانە و عەسکەریی ئێمەیان وەرگرتووە و پێیان وایە -گوایە- ئێمە لەگەڵ کوردەکاندا نەرمو نیانین، بەڵکوو لەوەدایە کە فەرمانبەرانی ئێمە لەو کێشانەدا کە لە ڕەزائیە ڕوویان داوە، لە ڕاستیدا لایەنی کوردە ((ڕەنجاوەکان))یان گرتووە و بە تەگەرە دروستکردن بۆ کاربەدەستانی ئێرانی نەیانهێشتووە هێمنی و ئاسایش بگێڕنەوە بۆ ناو کوردەکان کە لەژێر دەسەلاتی ئێران دەرچوون. ئەم هەڵەیە بە هەڵکەوت نییە، بەڵکوو لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە فەرمانبەرانی ئێمە پێیان وایە سەرانی کورد لایەنگری سۆڤیەتن و بە هەرە بڕواپێکراوترین و بەئەمەك و پاکترین کەسان و پشتی بەرژەوەندەکانی ئێمە لە ئازەربایجانی ئێران داتانناون و لێیان تێگەیشتوون. شایەتی ئەم هەڵوێستە، دەربڕینی سادەلەوحانە و خۆشباوەڕانەی هاوڕێ ماکسیمۆڤی کونسوڵی ئێمەیە لە ڕەزائیە کە وتوویە ((زۆربەی هەرە زۆری سەرکردەکان [مەبەستی سەرکردەکانی کوردە، هەورامی] لایەنگری یەکێتیی سۆڤیەتن)). فەرمانبەرانی ئێمە بەو هەڵوێستەی وا نواندوویانە، واتە پشتیوانی و پارێزگاریکردنی (لایەنگرانی یەکێتیی سۆڤیەت) و کوردە (چەوساوەکان)، ئاڵۆزی و ناکۆکییە نەتەوایەتیەکانیان لە ئێران، بە تایبەت دوژمنایەتیی کۆنی ئەنجامی سیاسەتی کۆنەپەرستانەی ڕژێمی شای پێشوو لەنێوان کوردەکانی ئێران لەلایەك و ئێرانیەکان و ئازەربایجانیەکانی ئێراندا لەلایەکی ترەوە، ڕەچاو نەکردووە.

کوردەکان کە دژی کردەوەی ئاژاوەگێڕانە و خراپی دەسەلاتدارانی خۆجێیی ئێران ڕاپەڕیون، هاوکات دەستیان داوەتە تالانکردنی دانیشتوانی بێتاوانی ئێران. ئەو خەڵکەیش لە ترساندا پەنا دەبەنە بەر شار تا دەسەلاتدارانی خۆجێیی بیانپارێزن، بەڵام دەسەلاتداران ناتوانن پارێزگارییان بکەن. لەبەر ئەوە بەرامبەر بە کوردانی چەکدار بێهێز دەبن. ئەوە پێویستیی هێنانی هێزی عەسکەریی ئێرانی بۆ ڕەزائیە هێنایە گۆڕێ. نوێنەرانی کونسوڵخانە و عەسکەریمان بە یەکجاری پێشگیری لەوە دەکەن. فەرمانبەرانی ئێمە، لە ئەنجامی ڕەوتی ئەو ڕووداوانەوە،

کەوتنە ڕیزی کوردەکانەوە دژ بە زۆربەی دانیشتوانی ئازەربایجانی ئێران، واتە ئازەربایجانی و ئێرانیەکان، کە کوردەکان تیرۆر و تالانیان دەکەن. ئاشکرایە ئەمەیش کێشایەوە بۆ دوورکەوتنەوە هێندێ لەو ئازەربایجانی و ئێرانیانەی کە نزیکی ئێمە بوون، ئەویش لەبەر ناڕازیبوونیان لە هەڵسوکەوتی نوێنەرانی ئێمە.

هەڵەی نوێنەرەکانمان لە ئازەربایجانی ئێران، دەستبەجێ لەلایەن سیخوڕەکانی تورکیاوە کە خۆیان بە جۆرە پارێزەرێکی ئازەربایجانیەکان دادەنا و بەڵێنیان پێدابوون -ئەگەر پێویست بوو- یارمەتیی چەکدارییان بدەن و سنوورەکانی تورکیایان بە ڕوودا بکەنەوە، کەڵکی لێوەرگیرا. بەم چەشنە ڕەفتاری فەرمانبەرەکانمان وا بە قازانجی سیخوڕەکانی تورکیا شکایەوە، کە سوودیان لە ڕووداوەکانی ڕەزائیە بینی بۆ قایمکردنی جێپێی خۆیان لە ئازەربایجانی ئێران.

بەم پێیە نوێنەرانی ئێمە، بە تەگەرە نانە بەر هەوڵی دەسەڵاتدارانی ئێران بۆ دابینکردنی هێمنی و ئاسایش لە ناوچە کوردنشینەکاندا، دەوری سەرپەرشتێکی ناپێویستیان گێڕا و دەستیان وەردایە کاروباری ناوخۆی کاربەدەستانی ئێران، کە کارێکی ناڕەوا (قابیلی دەربڕدن نەبوو) و وەڵامدەرەوەی بەرژەوەندەکانی ئێمە نییە.

هەڵەی نوێنەرەکانمان نیشاندەری ئەوەیە کە ئەوانە خراپ لە پەیوەندیەکانی کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتیی ناو ئێران حاڵی بوون و ئەوەیان لەلا ڕوون نییە و نازانن کە خەباتی کوردانی ئێران بۆ ئۆتۆنۆمی و سەربەخۆیی، بەپێی ناوەڕۆکە کۆمەڵایەتیەکەی خۆی، کۆنەپەرستانەیە و پارێزگاریی فیۆداڵە سەرخێڵەکانی کورده جیاییخوازەکانە کە دژی سیاسەتی سەنترالیزەکردن (بەهێزکردنی ناوەند)ن. کوردەکان کە پارچەپارچە کراون و زۆر جار خێڵەکانی دوژمنایەتیی یەکتری دەکەن، یەکگرتنی نەتەوایەتییان نییە. جیاییخوازە کوردەکان لە ئێران هەمیشە وەك چەك یا ئامرازێکی سیاسەتی ئینگلیز و تورکیا بوون لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. خەباتی یەکگرتووی کوردەکان بۆ جیابوونەوە لە ئێران، ئەگەرچی لە ڕابوردوویشدا هەبوە، بە هاندانی هێندێ تاقمی ئینگلیزی یا تورکی بووە بۆ باج وەرگرتن و پاشەکشە پێکردنی سیاسی و ئابووری لە ئێران. سەرکردەکانی کورد خۆیان کە خەڵکی ئاسایی کورد بە گوێڕایەڵییەوە بەدوایانەوەن، سەرپاکیان

نۆکەر و نزیکی دەوڵەتانی جیاجیای ئیمپریالیستین، ئەوانەیشیان لەناودا کەم نین کە نۆکەری دەوڵەتانی فاشیستین.

فیوداڵە بەکرێگیراوەکانی کورد کە دەسەڵاتی موڵکدارییان بەستوەتەوە بە دەسەڵاتی سەرکردایەتیی خێڵەکییەوە، ئەم سەرکردە کوردانە بەپێی هەڵکەوتی بەرژەوەندیەکانیان زۆر بە ئاسانی ئاغاکانی خۆیان (ئیمپریالیستەکان) گۆڕیوە و لەکوێ بەرژەوەندیان زیاتر بووبێ، ڕوویان تێکردووە. لەبەرئەوە نابێ وا بیر بکەنەوە هەڵسوکەوتی سەرکردەکانی کورد کە حاڵی حازر پەیوەندییان بە نوێنەرانی ئێمەوە باشە، تاسەر وا دەمێنێتەوە. ئێستا لە خەباتی دژ بە دەسەڵاتدارانی ئێراندا پاڵیان داوەتە پاڵ سوپای سوور، چونکە بەرژەوەندی خۆیانی تێدا دەبیننەوە. دیارە ئەمەیش دەبێتە هۆی سەرلێ شێواوی و گومڕایی فەرمانبەرانی ئێمە کە لەبەر بێئەزموونی و ساکارییان پێیان وایە هەموو سەرکردەکانی کورد، یا لانی کەم زۆربەیان، لایەنگری سۆڤیەتن.

ئەگەر بێتو ئەم باوەڕو بۆچوونە نەگۆڕدرێ یا ڕاست نەکرێتەوە، لەوانەیە کاریگەری و شوێنەوارێکی زۆر زیانبەخشی بۆ ئێمە بەدواوە بێ. کوشتن و بریندارکردنی سەربازانی سوپای سوورمان، درێژەدانی کوردەکان بە تالانکردن، سەرباری ڕێوشوێنی بەرهەڵستانەی ئێمە، مەڕوماڵات بە قاچاغی بردن بۆ تورکیا ...هتد، بەردەوامن. دەبێ نوێنەرانی ئێمە دەستبەرداری باوەڕهێنانی کوێرانە بە کوردەکان و سەرکردەکانیان بن و لێیان بتەکنەوە. دەبێ فەرمانبەرانی ئێمە ، بۆ ڕێگرتن لە قووڵبوونەوەی هەڵەکان، واز لە ڕێبازی ناڕاستی نەرمونیانی نواندن بەرامبەر بە کوردەکان بهێنن و ڕێی پتەوکردن و پەرەپێدانی پەیوەندیەکان لەگەڵ دانیشتوانی ڕەسەنی ناوچەکەدا و بە پلەی یەکەم لەگەڵ ئازەربایجانیەکاندا، بگرنە بەر؛ وەك ئاشکرایە ئەوانە زۆربەی دانیشتوانی ئازەربایجان پێك دەهێنن و لە باری ئەتنۆگرافی و مێژوویی‌یەوە پەیوەندییەکی نزیکیان بە یەکێتیی سۆڤیەتەوە (ئازەربایجان سۆڤیەت) هەیە و هەمیشە بەشی هەرە زۆری بزووتنەوەی دیموکراتیی ئێرانیان پێك هێناوە. دەبێ فەرمانبەرانی ئێمە لە ئازەربایجانی ئێران پشت بە سەرکردە کۆنەپەرست و خۆفرۆشەکانی کورد

نەبەستن، بەڵکوو بە کۆمەڵ و کەسانی پێشەنگ و پێشکەوتنخوازی دانیشتوانی ئازەربایجان پشت ئەستوور بن.

ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئێمە واز لە هەموو پەیوەندییەك لەگەڵ کوردەکاندا دەهێنن و کەڵك لەو جۆرە پەیوەندیانە وەرناگرین بۆ بەرژەوەندی خۆمان. بەڵام دەبێ پشت بە ئازەریەکانی ئێران ببەستین بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری سیاسیمان لە باکووری ئێران. ئەوەیش بزانرێ کە دەکرێ هەر لەناو ئەوانەدا، نەك ناو کوردەکان، کەسانی بڕواپێکراو و دڵسۆزی ئێمە بدۆزرێنەوە. بۆ ئەم مەبەستەیش پێویستە بە یەکجاری دەست لە سەرپەرشتیی کوردەکان هەڵبگرین و نابێ هیچ کۆسپێکیش بهێنرێتە بەردەم دەسەڵاتدارانی ئێران بۆ دابینکردنی هێمنی و ئارامی؛ بەپێچەوانەوە، پێویستە یارمەتییان (هی دەسەڵاتدارانی ئێران) بدرێ تاڵانکاریی کوردەکان لە ئازەربایجان نەهێڵرێ، تا هێمنی و ئاسایش بۆ ئەو دانیشتوانەی وا کەوتوونەتە بەر شاڵاو و تاڵانکاریی کوردەکان، دابین بکرێن.

پێویستە ئەو ڕێبازی پشتیوانی و هاوکاریکردنەی کوردەکان بۆ گەیشتنیان بە ئۆتۆنۆمی و سەربەخۆیی کوردستان، وازی لێ بهێنرێ و دانی پێدا نەنرێ، لەبەر ئەوەی ئەم داخوازییە لەم بارودۆخەی ئەمڕۆی ئێراندا بێبناغە و کۆنەپەرستانەیە. بە کورتی، تازەکردنەوەیەکی بنەڕەتی لە کاروباری فەرمانبەرانماندا لە ئازەربایجانی ئێران پێویستە، ئەویش بەهۆی پەرەپێدانی بنکە و پێگەکانمانەوە لەناو دانیشتوانی ڕەسەنی ئەوێدا، واتە ئازەربایجانیەکان.

پێویستە ئێوە زۆربەی فەرمانبەرانی باڵوێزخانە و کونسوڵخانە و فەرمانبەرانی عەسکەری و فەرماندەکانی کەرتە عەسکەریەکانمان لە ئێران، لەم نامەیە ئاگادار بکەنەوە. دوای ئاگاداربوونیان لە نامەکە، پێویستە بنێردرێتەوە بۆ کۆمیسارییای گەل بۆ کاروباری دەرەوە (وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت)[١].

---

[1] ئەرشیڤی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی کۆماری فیدراڵی ڕووسیا (یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو)، فۆندی ٩٤، سکرتاریەتی مۆلۆتۆڤ. ڤ، کۆپییی٤، دۆسیەی ١٨٨، کارتۆنی١٨، ل١٠-١٤.

تێبینی: ئەم بەڵگەنامە گرنگە بۆ یەکەمین جار نووسەری ئەم کتێبە لە نامەی دکتۆراکەیدا ساڵی ١٩٩٤ ئاماژەی پێداوە و ئاشکرای کردووە، دواتر ساڵی ١٩٩٦ لە گۆڤاری "گزنیگ"دا بەبۆنەی شەست ساڵەی کۆماری

## کۆمیسێری گەلی (وەزیری) کاروباری
## دەرەوەی یەکێتیی سۆڤیەت
## ڤ. مۆلۆتۆڤ[1]
## ئیمزا

جێی داخ و کەسەرە کە سیاسەتی سۆڤیەت بەرامبەر بە کێشەی کورد لە ماوەی چەند ساڵێکدا، هەر ئەم ڕێباز و فەرمان و ڕێنوێنیانەی مۆلۆتۆڤ بووە. بۆ نموونە، لە بەڵگەنامەیەکی تردا هاتووە: ((ڕاوێژکاری باڵوێزخانەی سۆڤیەت لە

---

کوردستانەوە لەگەڵ هێندێ بەڵگەنامەی تردا بڵاوی کردەوە. ئەم بەڵگەنامەیەوەلامدەرەوەی زۆر بۆچوونی هەڵبەستراو و چەوتە، بە دەرکەوتنی بەڵگەنامەیەکی وا پەردە لە ڕووی سیاسەتی ڕاستەقینەی سۆڤیەت بەرامبەر بە کورد لادرا. چەند کوردناسێکی سۆڤیت و بیانی و کوردیش سوودێکی زۆریان لێ وەرگرت.

[1] مۆلۆتۆڤ ڤیچیسلاڤ میخائیلۆڤیچ (١٨٩٠-١٩٨٦): ناودارێکی حیزبی و دەوڵەتیی سۆڤیەت و نێوان ١٩٢٦-١٩٥٢ ئەندامی بیرۆی سیاسیی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەت، لە ١٩٣٠-١٩٤١ سەرۆکی شووڕای کۆمیسارییاکانی گەل و وەزیری کاروباری دەرەوەی یەکێتیی سۆڤیەت و یەکێکی ئەو بەرپرسانە بووە کە چالاکانە بەشداری گرتن و کوشتن و بێسەروشوێنکردنی ناودارانی ڕۆشنبیر و نیشتمانپەروەر و ئازادیخوازی سۆڤیەت و دوورخستنەوەی گەلانی گومانلێکراوی وەك گەلی کورد و بڕیاردەری چارەنووسیان بووە. هەزاران بەڵگەنامە و دیکۆمێنت کە پاش هەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤیەت ئاشکرا و بڵاو کرانەوە، بگرە ژمارەیەکیان پێش هەڵوەشانەوەیش بڵاو کرانەوە، ئیمزا و فەرمان و ڕەزامەندیی مۆلۆتۆڤیشیان پێوەیە بۆ گرتن و کوشتن و دوورخستنەوە و بێسەروشوێنکردن.

وەك وتراوە، زۆرجار بە باشی نەیڕوانیوەتە ئەو نووسراوانە (دۆسیانە) تا بزانێ کامیان بۆ گوللەبارانکردن یا زیندانیکردن یا دوورخستنەوەیە، بە کورتی سێ پیتی (ڤ. م. ن)ی ڕووسیی لێداون، واتە ئەوپەڕی سزای "اوانباری و ئیمزای کردوون. ساڵی ١٩٤٩ بە تاوانی ئەوەی وا ژنەکەی جوولەکەیە و پەیوەندیی بە جوولەکەکانەوە هەبوە، لە پۆستی وەزیری کاروباری دەرەوەی سۆڤیەت لابرا. پاش مەرگی ستالین لە ١٩٥٣دا لە سەرکردایەتیی حیزب دەرکراو کرایە باڵوێزی سۆڤیەت لە مەغۆلستان (مەنگۆلیا)، لە ١٩٦٣دا خانەنشین کرا.

مۆلۆتۆڤ، لە ئاستەکانی ناوەوە و دەرەوەدا دژی سیاسەتی خرۆشچۆڤ و وەفاداری سیاسەتی ستالین بوو" ماوەیەکی زۆر دووەم کەسی (پاش ستالین) دەسەڵات بوو لە یەکێتی سۆڤیەت. ئەو نووسەر و مێژوونووس و مافپەروەر و لێکۆڵەرەوانەی کە لەسەر مۆڵەتۆڤیان نووسیوە، لەوەدا هاودەنگن کە ڕابوردووی ئەم کابرایە ڕەش و پڕ لە تاوانە، تاوانی بەرامبەر بە کوردیشی (کوردی سۆڤیەتی پێشوو و ڕۆژهەڵاتی کوردستان) دەچێتە خانەی تاوانەکانی تریەوە.

ئێران ئا- یاکووبۆڤ [بە ڕەگەز ئازەری بوو، هەورامی] لە نامەیەکی ٤ی مارتی ١٩٤٥یدا بۆ کونسولی سۆڤیەت لە ورمێ، نووسیویە: فەرمانەکانی هاوڕێ مۆلۆتۆڤ سەبارەت بە کێشەی کورد جێبەجێ بکەن))[1].

باڵوێزی سۆڤیەت نامەی ئاماژەپێکراوی بە دەستی ناردووە بۆ کاربەدەستانی دیپلۆماسی و عەسکەریی سوپای سوور لە ئێران، تا پاش خوێندنەوەی ئیمزای لێ بدەن. ئەم نامەیە، وەك وترا، کۆپیکردنی یاساغ بووە، تەنیا دراوەتە بەرپرسە بەرزەکانی دیپلۆماسی و عەسکەری، لەوانە کە پێویستە ناویان بهێنین: کونسوڵەکانی سۆڤیەت لە تەورێز و ورمێ و ماکۆ و کرماشان و مەشهەد، سکرتێری باڵوێزخانەکان لە تاران و تەورێز و ورمێ، ژەنەڕاڵ "ڤاسیلۆڤیسکی"ی سەرۆکی ئەرکانی سوپای سۆڤیەت لە ئێران و ژەنەڕاڵ ئەمیر ئەسلانۆڤ ... هتد[2].

لە سەرەتا یا سەردێڕی ئەم بەڵگەنامەیەدا نووسراوە: ((زۆر زۆر نهێنییە))، لەلایەکی ترەوە (کۆپیکردنی یاساغە)، نەوەك بکەوێتە دەستی لایەنێك و لەقاو بدرێ و ڕیسوایی بەدواوە بێ.

لەم نامەیەدا ئاماژە بە جێبەجێکردنی فەرمانەکە دراوە، فەرمانبەرانی دیپلۆماسی و عەسکەریی سۆڤیەتیش لە ئازەربایجانی ئێران، بە پێچەوانەی فەرمانەکەی مۆسکۆوە جووڵاونەتەوە. مۆلۆتۆڤ و وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت لە بارودۆخی ناوچەکە و کێشەی کورد و سیاسەتی ئێران و تورکیا و... هتد تێنەگەیشتوون، بەڵکە فەرمانبەرانی سۆڤیەتی لە ناوخۆی ئێران زیاتر ئاگاداری بارودۆخەکە بوون و بەپێی بەرژەوەندەکانی وڵاتەکەیان جووڵاونەتەوە و مامەڵەیان کردووە. کورد، بەپێی هەموو بەڵگەنامەکانی سۆڤیەتی (هی کونسوڵەکانی ورمێ و ماکۆ و...) بە هانای سۆڤیەتیەکانەوە چوون و پشتیوان و یاریدەدەریان بوون، کاتێك ئەوانە هاتوونەتە ناوچەکە: بەپیریانەوە چوون و شاییان گێڕاوە و تفاق و خواردەمەنییان داونێ و ئاژەڵیان بۆ سەر بڕیون و

---

[1] هەمان سەرچاوە، کۆپیی ٣١، دۆسیەی ٧٥، کارتۆنی ٣٥٤، ل٣٥.

[2] هەمان سەرچاوە، کۆپیی ٤، دۆسیەی ١٨٨، کارتۆنی ١٨، ل ١٥، ١٦.

ڕێنیشاندەریان بوون، سیخوڕ و پیاوەکانی ئەڵمانیا و ئێران و تورکیایان پێناساندوون، تەنانەت پارە و یارمەتییان کۆکردوەتەوە و ناردوویانە بۆ سوپای سوور لە بەرەکانی شەڕ و ئامادەیی خۆیان نیشان داوە بۆ چوونە بەرەکانی شەڕ لە ئەورووپا تا شانبەشانی سوپای سوور شەڕ بکەن. هەتا ناوی گوندێکیشیان گۆڕیوە و کردوویانە بە (ستالین ئاباد)... هتد. (کۆمەڵە بەڵگەنامەیەکم بەجیا لەم بارەیەوە بڵاو کردوەتەوە).

فەرمانبەرانی سۆڤیەت، لەبەر ئەم هەڵوێستانە، هاوهەستیی خۆیان بەرامبەر بە کورد دەربڕیوە و بە وتەی خۆیان یارمەتییان داونو پشتیان گرتوون. هەر پشتبەستوو بە ڕاپۆرتەکانی خۆیان و بەڵگەنامە و سەرچاوەکانی ئێرانی و کوردیش، کاربەدەستانی ئێرانی لەو پەیوەندیە نزیك و دۆستایەتیە باشەی نێوان کورد و نوێنەرانی سۆڤیەت نائارام و ناڕازی بوون، چونکە نەیانتوانیوە وەك ڕابوردوو خەڵکەکە بڕووتێننەوە. ئەوانە کە نیگەران بوون لەوەی وا دەسەڵاتیان نەبوە، هەر ڕۆژەی بیانوویەکیان گرتووە و پیلانێکیان گێڕاوە تا کوردی پێ بەدناو و سەرکوت بکەن. هەموو سەرچاوە و بەڵگەنامەکانی ناوبراوی سەرەوە، بگرە سەرچاوە ئازەریەکانیش، لەوە دوواون کە ئازەریەکان پاڵپشتی دەسەڵاتی ئێرانی و لە سۆڤیەتیەکان دوور بوون یا دوورەپەرێز وەستاون، تەنانەت دژایەتیشیان کردوون؛ ئەم کردەوەیەیان، تا دامەزراندنی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان لە پایزی ١٩٤٥دا و ڕاگەیاندنی دەسەڵاتی نیشتمانیی خۆیان، هەر بەردەوام بووە. ئەوانە تا ئەودەمە، هەر چەشنە هاوار و هەوڵێکی ئازادیخوازانە و نیشتمانیی کوردیان بە ڕێگری و تاڵانکاری و کوشتن و جیابوونەوە لە ئێران و دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆ لەقەڵەم داوە.

کەرتەکانی سوپای سوور و فەرمانبەرانی دیپلۆماسیی سۆڤیەت کە نەیانهێشتووە سوپای ئێران بێتە ناوچەکە، لەبەر پشتیوانیی کورد نەبوە، وەك خۆیان لە بەڵگەنامەکانی تردا (هەتا لە یاداشتنامەکانیاندا بۆ دەوڵەتی ئێران) نووسیویانە، بەڵکوو دژی هاتنی سوپای ئێران بوون، چونکە ناوچەکە هێمن و ئارام بووە و پێویستی بە هێنانی ئەو سوپایە نەکردووە. لەلایەکی ترەوە

وتوويانه هێنانی سوپای ئێران بۆ ناوچەکه بارودۆخی تێك دەدات و دەبێته هۆی شەڕو ئاژاوه لەنێوان کورد و ئەو سوپایەدا، ئەمەیش گیروگرفت و کێشەیەکی زۆر بۆ فەرمانبەرانی سۆڤیەت دروست دەکات و دەیانگلێنێته ئەو ئاژاوانه. ئەوانه جەختیان کردوەتەوه که کوردەکان گوێڕایەڵی سیاسەتی سۆڤیەتن، واته لەژێر کۆنترۆڵی ئەواندان؛ جگه لەوه، به هاتنی سوپای ئێران، کۆنەپەرستانی ناوچەکه و لایەنگرانی ئەڵمانیای فاشیستی کەڵك له ئاڵۆزیی ناوچەکه وەردەگرن و به دزەکردن له ڕێگەی تورکیا و ناوچەکانی تری ئێرانەوه پیلانەکانی خۆیان جێبەجێ دەکەن.

لەپاڵ ئەوانەدا، فەرمانبەرانی سۆڤیەت دژی هاتنی سوپای ئێران بوون، پێیان وابووه هێزێکی تەواوی ئێران له ناوچەکەدا هەیه بۆ پاراستنی هێمنی و ئاسایش، پێویست به هێزی تر ناکات" دەسەڵاتدارانی کۆنەپەرستی ڕژێمی پێشوو و سیخوڕەکانی تورکیا، به یارمەتیی کۆنەپەرستانی ناوچەکه، ئازەریەکانیان دژ به کورد و سۆڤیەت هان داوه. هەروەها کاربەدەستانی ئێران هیچ داخوازییەکی کوردەکانیان بەجێ نەهێناوه، بۆیه ئەوانیش دژی هاتنیان بوون. له ڕاپۆرتێکی تایبەتدا که فەرمانبەرانی سۆڤیەت له ناوچەکەدا بۆ باڵوێزی سۆڤیەت له تاران و وەزارەتی دەرەوەیان له مۆسکۆ، ناردووه، وتوویانه: کوردەکان چەند جارێك ویستوویانه ورمێ و شوێنەکانی تر بگرن، ئێمه نەمانهێشتووه.

کاربەدەستانی سۆڤیەت له ناوچەکەدا، وایشی بۆ چوون که هاتنی سوپای ئێران، دەوری ئەوان بەتایبەت لەناو دانیشتواندا کەم دەکاتەوه و پێشبینیی ئەوەشیان کردووه که لەگەڵ ئەو سوپایەدا تووشی تێکهەڵچوون بن، دیاره ئەوەیان نەویستووه، چونکه هێشتا چارەنووسی دووەم جەنگی جیهانی نادیار بووەو هەموو هەوڵەکان بۆ شکستپێهێنانی فاشیزم بوون. وەك هێندێ سەرچاوه ئاماژەیان پێداوه، فەرمانبەرانی سۆڤیەتی لەوه دوواون که سیاسەتی ڕژێمی ڕەزا شا بەرامبەر به کورد کۆنەپەرستانه و شۆڤێنیانه بووه و تێکۆشاوه ئاژاوه و دوژمنایەتی لەنێوان گەلانی دانیشتووی ناوچەکەدا، بەتایبەت ئازەری و کورد، دروست بکات، بۆیه کوردەکان به

چاوێکی خراپ و بێباوەڕییەوە ڕوانیویانەتە سوپای ئێران و گومانیان لێی هەبوە کە بۆ پاراستنی هێمنی و ئاسایش بێتە ناوچەکە.

دەسەڵاتدارانی سۆڤیەت (هێزی هاوپەیمانانیش بەگشتی لە ئێران) باڵادەستی لە ناوچەکەدا ستراتیژی سیاسەتیان بوو، نەیاندەهێشت ئەم باڵادەستییە لەدەست بدەن؛ فەرمانبەرانی ئێرانی جێی متمانە و باوەڕیان نەبوون، چونکە تا دوێنێ بوو ڕژێمەکەیان لایەنگری ئەڵمانیای فاشی بوو، ئەوسا و تەنانەت پاش داگیرکرانی ئێران لەلایەن هاوپەیمانانەوە هەڵوێستی دژی سۆڤیەتی خۆیان نەدەشاردەوە. هاوکات نزیکبوونەوەی کوردی چەوساوەی زۆرلێکراو لە فەرمانبەرانی سۆڤیەت، ببوونە مایەی نیگەرانیی کاربەدەستانی ئێران و تورك، تورکیایش هێشتا ئەوپەڕی گومانی لەسەر بوو کە بتوانێ بێلایەنیی لە شەڕدا ڕابگرێ.

ئەوی ڕاستی بێ، وەك ڕاپۆرتی کونسوڵ و فەرمانبەرانی عەسکەریی سۆڤیەت نواندوویانە، ئەوە کوردەکان بوون کە باوەشیان بۆ سوپای سوور کردەوە و بڕواپێکراو و دۆستی بەئەمەکیان بوون، لەکاتێکدا فەرمانبەرانی سۆڤیەتی هیچ ڕاپۆرتێکیان لەسەر گەلانی تر و بە تایبەت ئازەرییەکان نەداوە کە یارمەتییان دابن، بەڵکوو بە پێچەوانەوە ڕاپۆرتەکانیان باسی هاوکاریی ئازەرییەکانیان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئێراندا کردووە. ئەو ڕاپۆرتانەیش نێردراونە مۆسکۆ بۆ وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت کە مۆڵەتۆڤ سەرکردایەتیی کردووە. پرسیار ئەوەیە: ئەگەر کورد بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ سۆڤیەتیەکاندا نەکردایە، فەرمانبەرانیان پشتیان پێدەبەستن؟ بێگومان نا. ئەوەی کە مۆلۆتۆڤ لە نامەیەکدا وتوویە گوایە خەڵکی کورد خەریکی تاڵان و ڕاوڕووتکردن بوون، دانیشتوان بەدەستیانەوە پەرێشان و هەراسان بوون و هەڵاتوونەتە شار و پەنایان بۆ دەسەڵاتدارانی ئێران بردووە و داوای سوپایان لێ کردوون بێتە ناوچەکە و لەدەست کورد بیانپارێزێ، ئەوە هەر ئەو ئاژاوە و پیلان و هەراوهوریایە بوو کە ڕژێمی شا ماوەیەك بوو نابوونیەوە. کورد ئەگەر سەرقاڵی ئەو شتانە بووە، چۆن داوای ئۆتۆنۆمی یا سەربەخۆیی و جیابوونەوە و مافی خۆی کردووە؟! بیرۆکەی ئازادیخوازی و —مۆڵەتۆڤ وتەنی— سەربەخۆیی کوردستان کۆنەپەرستانە و بۆ پارێزگاریی بەرژەوەندی سەرخێڵ و فیوداڵەکانی کورد بووە و بەسترابووەوە بە ئیمپریالیزمەوە! ئەم بۆچوونەی مۆلۆتۆڤ پەردەی لەڕووی سیاسەتی

درۆزنانه و دووڕوویانه و قێزەونی دەوڵەتەکەی هەڵماڵیوە، کە گوایە خۆی بە پشتیوانی گەلانی چەوساوە و بەدیهێنی مافی چارەی خۆنووسینی گەلانی ژێردەست ناساندووە!

گریمان ئەو وتە بێشەرمانەیەی مۆڵۆتۆڤ کە گوایە کورد هەمیشە داردەست و... بووە، ڕاستە، بەڵام خۆ ئەوجارە داردەستی سۆڤیەت بوو و بە هەرزانیش فرۆشتی. کورد و ئازەری لەو سەردەمەدا هیچ پەیوەندییەکیان بە ئینگلیزەکانەوە نەبوو، ئینگلیز و تورك لە ناوچەکەدا نەبوون، تا جێی دڕدۆنگی و گومان بن. داوای ئۆتۆنۆمی و سەربەخۆییشیان نەکردبوو، تا بەرژەوەندی سۆڤیەت کەوتبێتە مەترسییەوە. جگە لەوە ئەگەر ئیمپریالیستەکان هەمیشە کەڵکیان لە کێشەی کورد وەرگرتبێ بۆ گوشار خستنە سەر ئێران و تەنازول و پاشەکشەپێکردن و بەدەستهێنانی ئیمتیازی سیاسی و ئابووری، ئایا کۆماری کوردستان لەلایەن دەوڵەتەکەی مۆڵۆتۆڤەوە بەکار نەهێنرا بۆ وەرگرتنی ئیمتیازی نەوت دەرهێنان و بێشەرمانەیش نەفرۆشرا؟! مۆڵۆتۆڤ کوردی هەر بەو تاوانە ناڕەوایانە بەدناو نەکردووە، بەڵکوو تاوانی لایەنگری و هاوهەستیی لەگەڵ دەوڵەتانی فاشیستدا داوەتە پاڵ. نووسەری ئەم دێڕانە کە پانزە ساڵ زیاترە خەریکی لێکۆڵینەوەی پەیوەندیەکانی سۆڤیەت و کورد و بەتایبەت کۆماری کوردستان بووە، بەڵگەنامەیەك یا هەواڵێك یا سەرچاوەیەکی ناو ئەرشیڤەکانی سۆڤیەت یا سەرچاوەیەکی تری نەدیوە، نووسیبێتی کورد سەربازی سوپای سووری کوشتووە، یا بریندار کردووە. ئەگەر کوردی ئەمبەرو ئەوبەری سنوورە دەستکردەکانی نێوان ئێران و تورکیا بەدرێژایی مێژوو هاتوچۆ و پەیوەندیی بنەماڵەیی و بازرگانییان بووبێ و کوردی ئێرانیش مەڕومالاتی بردبێتە کوردستانی تورکیا، بۆچی دەبێ بە قاچاخچێتی و... دابنرێ؟!

خاڵێکی تر کە مۆڵۆتۆڤ لەم نامەیەدا ئاماژەی پێکردووە، جەختکردنی بووە لەسەر زۆربەی دانیشتوانی ئازەربایجان کە گوایە ئازەرین و دەبێ دۆستایەتییان لەگەڵدا ببەسترێ" ئازەربایجانی ڕۆژوا هیچ کاتێك زۆرینەی دانیشتوانی ئازەری نەبوە و بەشێکی جیانەکراوەی کوردستان بووە، با ئازەریشی تێهاتبێ و

دیمۆگرافیای ناوچەکەی تێك دابێ. مۆلۆتۆڤ وتوویە دانیشتوانی ڕەسەنی ئەوێ زۆربەیان ئازەرین و لە باری مێژوویی و ئەتنۆگرافییەوە بەستراون بەوانەوە (بە ئازەربایجانی سۆڤیەتەوە) و هەمیشە ئەوان زۆربەی هێزی پێشکەوتنخواز و دیموکراتیخوازی ئێرانیان پێك هێناوە، بۆیە دەبێ پشتیان پێببەسترێ، نەك بە کوردی کۆنەپەرست و خێڵەکی و خۆفرۆش و... کە دەبێ بە یەکجاری وازیان لێ بهێنرێ و ڕێ بە سوپای ئێران بدرێ بێتە ناوچەکە و یارمەتیشی بدرێ بۆ گێڕانەوەی هێمنی و ئاسایش.

هەر ئەو مۆلۆتۆڤە و دەوڵەتەکەی، کاتێك فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانیان بۆ ئازەرییەکانی ئێران دامەزراند و ویستیان ئازەربایجانیش بلکێنن بە ئازەربایجانی سۆڤیەتەوە، یا بیکەنە دەوڵەت یا پێگەیەکی خۆیان لە ئێران، لە چەککردنی تەواوی هێزەکانی ئێران و پێچانەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتدا لە ئازەربایجانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوادا، یارمەتیی ئازەریەکانیان دا" لەکاتێکدا کورد چوارپێنج ساڵ پێشتر ویستیان شارەکانی ورمێ و خۆی ماکۆ و سەڵماس و... بخەنە ژێر دەستی خۆیان و سۆڤیەتیەکان نەیانهێشت، تەنانەت نەیانهێشت سەقز و سەردەشتیش ئازاد بکەن.

ئەمە سیاسەتی زلهێزێك بوو کە کورد زیاتر لە ٧٥ ساڵ هیوای پێبوو و هێزە سیاسیەکانی بە درێژایی تەمەنی سۆڤیەت تەپڵو زوڕنایان بۆ لێ دا، هاوکات تاوانی ئەو ڕژێمە بەرامبەر بە سمکۆ و درۆکردنی لەگەڵ شێخ مەحموودی حەفیددا و هاوکاریی لەگەڵ کەمالیەکاندا بۆ لێدانی شۆڕشەکانی شێخ سەعیدی پیران و ئاگری و دەرسیم و بەزۆر گواستنەوە و کۆچ پێکردنی بەکۆمەڵی کوردانی سۆڤیەت و هەرەسپێهێنانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد و.. لە لێکدانەوە و خوێندنەوە و بیرو بۆچوونی هیچ هێزێکی سیاسیی کورددا ڕەخنەیان لێ نەگیرا و ڕیسوا نەکران، بەڵکوو تا لە گۆڕنانی ئۆردووگای بەناو سۆشیالیزمیش بە سەرۆکایەتیی سۆڤیەت لەسەر هەمان ڕێباز بەردەوام بوون.

خاڵێکی تری ئەم نامەیەی مۆلۆتۆڤ کە دەبێ ڕەچاو بکرێ، بێوەفایی سۆڤیەت بووە بەرامبەر بەو هەموو خزمەتە کە کورد پێشکەشی ئەو دەوڵەتەی کردووە و

دەستنانی بووە بە ڕووی کوردەوە کە خۆیی لێنزیك کردوەتەوە و –با بە شێوەیەکی کاتیش بووبێ– پاڵپشت و یاریدەدەری بووە. ئایا ئەو هەڵوێستەی مۆلۆتۆڤ شایستەی کورد بوو؟! ئەگەر پێشتر ئیمپریالیستەکان درۆیان لەگەڵدا کردبێ، دەکرا سۆڤیەت ئەوجارە درۆی لەگەڵدا نەکات.

ناتوانین بڵێین تەنیا تاقمی باقرۆڤ و نوێنەرانی ئازەریی سۆڤیەت لە ئێران بە هاندانی دەوڵەتی سۆڤیەت و ئامادەکردنی ناوەڕۆکی ئەم نامەیە تاوانبارن و لەو ڕووەوە دەوری سەرەکییان هەبوە، گەرچی دەوری خراپیان لە داڕشتنی سیاسەتی سۆڤیەتدا بەرامبەر بە کورد کەم نەبوە، بەڵام مۆلەتۆڤ هەمان ئەو کەسە بوو لە سەرکردایەتیی حیزبی و دەوڵەتیی یەکێتیی سۆڤیەتدا بووە و دەنگ و بڕیاری لە دوورخستنەوە و قەلاچۆکردنی کوردانی سۆڤیەتدا هەبوە. ئایا شیاو بووە گەلێکی چەوساوە و ژێردەستی وەك کورد بەو چەشنە تاوانبار و بەدناو بکرێ و بێشەرمانە بوترێ هەموو پەیوەندییەکی لەگەڵدا بپچڕێنرێ و بۆ بەرژەوەندی خۆیان لە باکووری ئێراندا کەڵکی لێوەربگیرێ، ئیتر نە باسی مافی کورد نە تەنانەت مافی کولتووریشی نەکرێ. لێدان و هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی (ژێکاف)یش لەلایەن سۆڤیەتەوە، هەر لەم ڕوانگەیەوە بووە. هێشتنەوەی کورد لە چوارچێوەی ئازەربایجانی ئێراندا و سەرەنجام هەرەسپێهێنانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد، درێژەی ئەو سیاسەتە نامرۆڤانەیە بوو کە شانۆی تراژیدیای کوردی بە فەرمانێك لە مۆسکۆوە پێ کۆتایی هێنرا.

**وتوویژ لەگەڵ سەرهەنگ "ماهینی"ی**
**فەرماندەی هێزەکانی ئێراندا**
١٩٤٢/٩/٢١:

ماهینی، بەبۆنەی گەڕانەوەیەوە لە تاران هاتە لام، سەبارەت بە گەشتەکەی پرسیارم لێ کرد. ماهینی گوتی: لە سەفەرەکەی خۆی بۆ تاران ڕازییە، توانیویە ڕووداوەکانی ڕەزائیە بە ڕێکوپێکی بگەیەنێتە کاربەدەستانی ئێران. گوتی: زۆر

لەوە دەترسام ژنەکەم بڕوا بە درۆودەلەسەکانی ڕۆژنامەی "پەرچەم" لەبارەی ڕووداوەکانی ڕەزائیەوە بکات و خەمی منیان بێ. بەڵام دەرکەوت نە بنەماڵەکەم و نە خزم و کەسوکاری ئەو ڕۆژنامەیەیان نەخوێندوەتەوە. وا دەرکەوت ڕۆژنامەی "پەرچەم" لە تاران خوێنەری نییە، زیاتر لە ٧٥٪ی ڕۆژنامەکە بۆ دەرەوەی تاران دەنێردرێ.

پاشان ماهینی سەبارەت بە دیداری سەرنووسەری ڕۆژنامەی "پەرچەم" کاتێك لای سەرۆك وەزیران بووە، گوتی: لەبەر چاوی من سەرنووسەری ڕۆژنامەی "پەرچەم"ی ئاگادار کردەوە و پێی گوت گەر ناوەڕۆکی گوتارەکانتان نەگۆڕن، ناچار دەبین ڕۆژنامەکەتان دابخەین. سەرۆك وەزیران لە کۆتایی وتووێژەکەدا گوتوویە: ((ئەمە ئەو ماهینی‌یەیە کە ئێوە زۆرتان لەبارەوە نووسیوە)). سەرنووسەر چاوەڕوانی قسەیەکی ئاوهای نەکرد و هیچی نەگوت. بەقسەی ماهینی کە پاشتر چاوی بە سەرنووسەری پەرچەم کەوتووە، ئەو هەموو ئاژاوەنانەوە و درۆودەلەسانە کاری ئەفسەرانی بەرزی سوپای ئێران بووە. ماهینی ئەوەیشی گوت: کاتێ چاوی بە وەزیرەکانی ئێران کەوتووە، پێی گوتون هێرشکردنە سەر کوردەکان ئەنجامێکی باشی نابێ. هێرشکردنە سەر گوندە کوردنشینەکان جگە لە کاولبوونی گوندەکان و هەڵاتنی خەڵك و پەنابردنیان بۆ چیاکان، شتێکی تری بەدواوە نابێ. تەنیا هێرشێك کە ئێستا ئێمە دەتوانین هەنگاوی بۆ هەڵگرینەوە، هێرشکردنە سەر جەلالیەکانە [هۆزێکی کوردن لە ناوچەی ماکۆ دەژین] لەبەر ئەوەی هۆزی "مین ...؟ " هاوسێیانە [ئەوانیش هۆزێکی کوردن] دوژمنایەتی لە نێوانیاندا هەیە، پشتیوانی لەیەك ناکەن. دواتر ماهینی بەڵگەیەکی پێشان دام، کە بالوێزی ئێمە مۆڵەتی پێدابوو چەك و تەقەمەنی بگوازێتەوە.

ماکسیمۆڤ

**لیدوان و هەواڵ سەبارەت بە بارودۆخی ڕەزائیەو ناوچەکانی**
**٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٣:**

خەلە و خەرمانی ناوچەکە کۆکراوەتەوە و بەشێکی بە دەوڵەت فرۆشراوە، بەشێکی زۆریشی لای موڵکدارەکان ماوەتەوە. کاربەدەستانی ئێران زۆر لە خۆیان ڕازین کە توانیویانە عەمبارەکانی دەوڵەت پڕ بکەن، تەنانەت هەوڵ دەدەن ئەو گوندانەی کە پێش خەرمانانی ١٣٢٥ لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە لە کوردەکان زەوت کرابوون، پاش ئەو مانگە کوردەکان توانییان دەستیان بە سەردا بگرنەوە [نزیکەی ٧٦ گوندە، ١٨ گوندی سەر بە ناوچەی تەرگەوەڕ و ٢١ گوندی ناوچەی دەشت و ٢٧ گوندی ناوچەی مەرگەوەڕ]، دووبارە زەوتیان بکەنەوە، گەنمیان لێ بسێننەوە، بەڵام ناوێرن. لەبەر ئەوە ئوستاندار داوای لە ئێمە کرد یارمەتیی بدەین بۆ کۆکردنەوەی گەنمی ئەو گوندانە. یارمەتیدانی ئێمە -بە تێگەیشتنی ئەو- ئەوەیە سەربازانی سوپای سوور لەگەڵ ژاندارمەکانی ئێراندا دەستبەجێ ئەم ئەرکە جێبەجێ بکەن و لەگەڵیاندا بچن. بەڵام من پێیم گوت و بەڵێنم پێ دا کە ئێمە دەست لە کاروباریان وەرنەدەین، گوتم: کوێخا لە گوندەکاندا هەن، دەبێ ئەوان گەنمەکە کۆبکەنەوە. چەند ڕۆژێك لەمەوبەر پێیان ڕاگەیاندنم کە ئوستاندار لەگەڵ هێندێ ڕێبەری کورددا سەبارەت بە گۆڕینەوەی گەنم بە قەند وچا و کارگە (مانوفاکتۆر) وتووێژی کردووە و پێك هاتوون. کێشەی کۆکردنەوەی گەنم سەرنجی تورکەکان و ئینگلیزەکانی ڕاکێشاوە، هەوڵی زۆریان دا تا هەرچی زیاترە گەنم بکڕن.

بۆ نموونە، "ماك لارین"ی سەرکونسوڵی ئینگلیز لە تەورێز لە ١١ی ئەیلوولی ١٩٤٢ هاتبووە ڕەزائیە تا گەنم بکڕێ و بۆ باشووری ئێرانی بنێرێ کە لە ژێردەستی خۆیاندایە. لە تورکیا و عیراق نرخی فەردەیەك گەنم دوو قاتی ئێران گرانترە. لەبەر ئەوەیە کوردەکان گەنمی زۆر دەبەن بۆ ئەودیو. ئێمە بە دانانی خاڵی پشکنین فرۆشتنی گەنممان بۆ ئەودیوی سنورەکانی ئێران لەلایەن کوردەکانەوە کەم کردوەتەوە. دانانی خاڵی پشکنین لەسەر ئەو ڕێگایانەی کە لە سنووری عیراقەوە نزیکن، زیانی گەورەی بە کوردەکان گەیاندووە، بەتایبەت ئەو کوردە کۆچەریانەی کە بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانیان لە عیراقەوە هاتوون بۆ ناوچەکانی سەر سنوورو نانی خۆیان لە کوردستانی ئێران بەدەست دەهێنن و لێرە دەیکڕن.

"فەتاح بەگ"ی یەکێ لە سەرکردە بەناوبانگەکانی خێڵی هەرکی، بۆ ئەم مەبەستە هاتە کونسوڵخانە و داوای لێ کردین ڕێ بە گواستنەوەی گەنم بدەین بۆ کۆچەریەکان؛ لەبری گشت سەرکردە کوردەکانی ئێران بەڵێنی داینێ کە گەنم نانێردرێتە ئەودیوی سنوور. بەباشمان زانی داواکاریەکانیان جێبەجێ بکرێن، چونکە ئەوانە هەردەم کۆچەرن و نانیان لە ئێران کڕیوە. جگە لەوە، پێشگرتن لە کڕینی نان دەبێتە مایەی تاڵانکردن یا کڕینی نان لە عیراق، ئەمەیش بۆ ئەوان زۆر زەحمەتە و پێیان ناکرێ.

سەبارەت بە فرۆشتنی گەنم بە تورکیاو عیراق، پێم وایە پێویستە خاڵەکانی پشکنین هەروا بمێننەوە، بۆ ئەوەی ئاودیوکردنی گەنم بۆ عیراق کەم بکرێتەوە. هەروەها دەبێ فەرمان بە پاسەوانی سنوور بدرێ کۆنترۆڵی ناوچەکە بەهێزتر بکەن. کوردەکان لە ناوچەی ماکۆ زیاتر کەوتوونەتە تاڵانکردن، ئەوان سەر بە هۆزی جەلالین. لەوبارەوە پێشتر لە ڕاپۆرتێکدا پێشبینیی ئەوەم کردبوو و ئاگادارم کردبوونەوە کە لەوانەیە ئەم هۆزە دەست بە تاڵانکاری بکاتەوە، چونکە لە ناوچەی شیراز گەڕاونەتەوە و لەوپەڕی هەژاریدا دەژین. ئەو ٣٠ هەزار تمەنە کە دەوڵەتی ئێران بڕیاری دابوو بە یارمەتی بیدات بەو هۆزە، لە تاران گیریان داوە. لە ناوچەی شاپوور (شکاکەکان) قسەی خۆیان ڕاگرتووە و هیچ ئاژاوەیەك ڕووی نەداوە. لە ناوچەی ڕەزائیە لە چەند گوندی باراندوزچای و تارلوچانی، کە دەکەونە ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی ئێمە، محەمەد حوسێن و سەعید فەهیمی و حاتەم بەگ هێندێ دەستدرێژی و تاڵانکارییان کردووە. فەرماندەی سوپای سوور لە ناوچەی ناوبراو، فەرمانی چەککردنی ئەو کەسانەی داوە. پۆستەکانمان ٣ کوردی سەر بە خێڵی محەمەد حسێنیان چەك کردووە. ڕۆژی دواتر یەکێك لە پۆستەکان محەمەد حسێن و خزمەتکارەکەی چەك دەکەن.

دوایی بۆمان دەرکەوت ناوبراو پەیوەندییەکی باشی بە "مەنوچهر خان"ی کۆنەپەرست و یەکێك لە موڵکدارانی ناوچەکەوە هەبوە کە ناسناوی مستەفاخانە. مستەفا خان، سەرباری ئەوە، شکاتی لە محەمەد حسین کردووە کە گوای گوندەکەی ئەویشی تاڵان کردووە. بۆ ڕوونکردنەوەی ڕووداوەکە، چووین بۆ

گونـدی دیـدانی خـواروو (کـه مـوڵکی مەنوچـهریـیـه). جووتیارەکـانی ئـەویٚ بـه ئێمەیان گوت محەمەد حسێن به میوانداری و داواکاریی مەنوچهری هاتوەته ئێره. "محەمـەد حسێن"یش دانی بەوەدا نا کە چوار نامـەی مەنوچهری وەرگرتووە و پێشانی ئێمەی دا، له یەکێکیاندا نووسرابوو ((کەسێك دەنێرم بۆ لات، چیت پێ بڵیٚ ئەوە بکە)). لـه ئەنجامـدا دەرکەوت مەنوچهری ئەو هەموو تاڵانکارییـەی رێك خستووە. ئوستانداریش گوتی لەپێش چاوی خەڵك قسەم به مەنوچهری گوتووەو خانەنشینم کردووە. قسەکانی ئوستاندار به مەنوچهری بەو مەبەسته بوو که من داوای سزادانی نەکەم، وا دیاره ئوستانداریش ئاگای لـه کردەوەکانی مەنوچهری بووه. له ناوچەی نەغەده (سولدوز) که قەرەپاپاغی لێن، تائێستا هیچ رووداوێك نەقەوماوه. بەڵام هێندیٚ له نوێنـەرانی هۆزی مەنگوڕ و مامـەش دەیانەویٚ ماڵیات له قەرەپاپاغەکان وەربگرن و ئـەوانیش ئامادە نابن بیدەن. بـەڵام هاورێیانی ئێمه سەرەنجام توانییان پێش به تێکهەڵچوونی کوردەکان و قەرەپاپاغەکان بگرن.

چالاکیی کوردەکان له ناوچەی مـەهاباد بەگشتی شێوازێکی دیکەی بەخۆوه گرتووه که بۆ کاربەدەستانی ئێران زیاتر مایەی مەترسییه، له هۆزه گەورەکانی ئەویٚ بلووکێکی هاوبەندیان پێك هێناوه بۆ پاراستنی هەم ئەو ئازادییـەی کـه دەستیان کەوتووه، هەم ئەو حکوومەتەی که له ناوچەی بێلایەن دایانمەزراندووه. ئەم جووڵانەوەیه به دژایەتیکردنی عەلی ئاغا "ئـەمیر ئەسعەد" دەستی پێکرد کـه فەرمانـداری مـەهابادە و بـە خـائین بـە گـەلی کـورد و نۆکـەری ئێـران و خـۆفرۆش تاوانبـار کـراوه. پـاش هێنـدیٚ وتوویـژ لـه تـاران و مـەهاباد، عـەلی ئاغـا ناچـارکرا پۆسـتی فەرمانـداری بـەجیٚ بهێڵـیٚ. قـەرەنی ئاغـای مامـەش (سـەرخێڵی مامـەش) پێشنیار کرا بۆ ئەم پۆسته، هـەر لەوکاتـەدا سـەرۆك خێڵـەکانی دیکه (مـەنگوڕ و مامەش و...) داوای ئەم پۆستەیان کرد. حـاجی قەرەنی ئاغـای مامـەش و عەبدوڵڵا ئاغای مەنگوڕ و قازی محەمەد و بایەزید ئاغای گەورك پێشنیاری ئەوەیان دەکرد کـه فەرمانـداری مـەهاباد ئێرانـی بیٚ و لەلایـەن ئێرانـەوه دیـاری بکـریٚ، دەوڵـەت فەرمان بدات دادستانی ئێران لەگـەڵ بیست پۆلیسدا بێنه مـەهاباد، بەو مەرجەی که کاربەدەستەکانی دیکه کورد بن. ئەم پێشنیاره لەلایەن دەوڵەتەوه پەسند کرا،

"یەدوڵڵا سەریعول کەلام"ی شارەوانی پێشووی ڕەزائیە دەچێتە مەهاباد تا بە ئەستۆ دەگرێ. پێویست بەوە ناکات بگوترێ: فەرماندارو دادستان و پۆلیسی ئێران لە مەهاباد تەنیا وێنەیەکی سیمبولی (ڕواڵەتی)یان هەیە، بەکردەوە دەسەڵاتێکیان نییە، هەر پۆلیسێکی ئێران دوو کوردی لەگەڵە تا لە هەر ڕووداوێك بیانپارێزن. بەکردەوە دەسەڵات لە مەهاباددا بەدەستی حاجی قەرەنی ئاغا مامەش و عەبدوڵڵا ئاغاو بایەزید ئاغای گەورکە و مافی ئەوەیان پێدراوە سێسەد ژاندارمی کورد ڕابگرن.

قازی محەمەد، قازیی ئاینیی شاری مەهابادە و ئەرکی شارەوانیی مەهابادی بەئەستۆ گرتووە. ئەم تاقمە سەرکردانە دەستەیەك دەنێرنە لای ئێمە تا لە مەبەست و نیازیان ئاگادارمان بکەنەوە پێش جێبەجێکردنیان. ئێمەش لەوەڵامدا پێمان گوتن ئەوە کاری خەڵکی مەهاباد و کاربەدەستانی ئێران و تایبەتی خۆتانە. بەرژەوەندی ئێمە تەنیا هێشتنەوەی ئارامی و هێمنیی ناوچەکەیە. ئەوانە بە ئێمەیان گوت: باش لە بارودۆخەکە تێدەگەن، تەنیا بۆ ڕواڵەت دانیان بە دەسەڵاتدارانی ئێرانیدا ناوە، بەهیوان بە چاوێکی باش لێیان بڕوانین.

پاشان دەستەی نوێنەران بە ئێمەیان ڕاگەیاند کە ئەوان دەیانەوێ بۆ دابینکردنی ئارامی و هێمنی و کۆتاییهێنان بە تالان و دزێتیی نێوان خێڵەکانی کورد، قسە لەگەڵ هەموو کوردەکانی ژێر دەسەڵاتی ئێمەدا بکەن. پاش دیتنی یەکە بە یەکەیان، بۆم دەرکەوت ئەوانە دەیانەوێ هەموو سەرکردە کوردەکان لە شاری شنۆ کۆببنەوە و بڕیارێکی گشتی لەوبارەوە بدەن. ئێمە زانیمان کوردەکانی مەهاباد دەیانەوێ بەم هەنگاوانە بەرەیەکی بەهێز دژی دەستەی عەلی ئاغا "ئەمیر ئەسعەد" پێك بهێنن، کە هەوڵ دەدا بە یارمەتیی "شابەختی" بەرەیەك لە خێڵەکانی دێبوکری، مەنگوڕ، بانە، پشدەر [خێڵێکی گەورەی کوردی عیراق] پێکەوە بنێن، دووبارە پۆستی فەرمانداری مەهاباد بەدەستەوە بگرن. بۆیە ئێمە ئامادە نەبووین لەم بارەوە قسەیان لەگەڵدا بکەین. عەلی ئاغا هەوڵی دەدا جووڵانەوەیەکی چەکداری دژی ئەم گرووپە ڕێك بخات، بەنیاز بوو هێزێکی زۆر کۆبکاتەوە، بەڵام دەستتێوەردانی هاوڕێیانی ئێمە، دەرفەتی بۆ عەلی ئاغا

نەڕەخساند هێزێکی ئاوها کۆبکاتەوە، ئەم پیلانە سەری نەگرت. بەکەڵك وەرگرتن لــە زەماوەنــدی کــوڕی قــەڕەنی ئاغــای زەرزا (فەرمانــدەی شــنۆ) کــە زۆربــەی ســـەرکردەکانی کـــوردی بـــۆ داوەت کرابـــوون، پـــاش زەماوەندەکـــە هـــەموویان کۆبوونەوە. لەم کۆبوونەوەیەدا ئەمانەی خوارەوە بەشدار بوون:

١- قوتاس لە هۆزی مەمەدی.

٢- حەسەن تیلو (دیری).

٣- عومەر خان (شکاك).

٤- ڕەشید بەگ (هەرکی.

٥- نووری بەگ (بەگزادە).

٦- زیرۆ بەگ (هەرکی).

٧- تاهیر ئاغا (هەرکی).

٨- قەرەنی ئاغا زەرزا (زەرزا).

٩- مووسا خانی زەرزا (زەرزا).

١٠- حاجی قەرەنی ئاغا (مامەش).

١١- عەبدوڵڵا ئاغا (مەنگوڕ).

١٢- حاجی کاك حەمزە (سوارە).

١٣- فەتاح بەگی هەرکی (کۆچەری لە عیراقەوە).

١٤- قازی محەمەد (قازی).

١٥- بایەزید ئاغا (گەورك).

١٦- عەزیز عەباس ئاغا (دێبوکری).

شێخ عەبدوڵڵا سەیید* و کوڕەکانی و هێندێ خزمی نزیکی و ژمارەیەك بەگی بچووك لەو کۆبوونەوەیەدا بەشدار بوون. بەم چەشنە نوێنەرانی هەموو خێڵەکانی کورد لە شاپوورەوە تا سەقز لە کۆبوونەوەکەدا بەشدارییان هەبوو. بەشدارانی

---

* بەوپێیە کە باس کراوە، دەبێ شێخ عەبدوڵڵای گەیلانیی کوڕی شێخ عەبدولقادری نەهری بێ و بە هەڵە وا ناوی برابێ. ناوبراو بە سەیید عەبدوڵڵایش ناسراو بووە.

کۆبوونەوەکە، دوای لێکۆڵینەوەی بارودۆخی کوردستان، سوێندیان بە قورئان خوارد کەم ئەم بڕیارانەی خوارەوە جێبەجێ بکەن:

١- وەفادار بن بە دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەت و هیچ کارێك دژی ئەو وڵاتە و سوپاکەی لە ئێران نەکرێ، بەبێ ڕێگەپێدانی یەکێتیی سۆڤیەتیش پەیمان لەگەڵ هیچ دەوڵەتێکدا نەبەسترێ.

٢- کۆتایی‌هێنان بە کاری تالآن و بڕۆ، بە گرتنەبەری ڕێوشوێن دژی تالآنکەران و سزادانیان.

٣- پاراستنی یەکێتیی گەلی کورد، وەفادار بوون بە پرنسیپی ((هەموان بۆ یەك و یەکێك بۆ هەموان)).

سەرباری ئەوە، بڕیار درا هەموو مانگێك کۆبوونەوەیەکی ئاوها ببەسترێ تا لە هەر کێشە و ڕووداوێکی هەموو دوو کۆبوونەوەیەك بکۆڵرێتەوە. (لە باکووری کوردستانەوە تا ناوچەی ڕەشت) درایە دەستی عومەر خان و لە ناوچەی ڕەشتەوە بەرەو خوار تا باشوور درایە دەستی حاجی قەرەنی ئاغای مامەش. ئینگلیزەکان هەوڵیان دا، بە ناردنی شێخ عەبدوڵلا سەیید، دەورێکیان لەم کۆبوونەوەیەدا هەبێ، بەلآم زۆربەی سەرکردە کوردەکان کە ئاگاداری پێوەندیی شێخ و ئینگلیز و ئێرانیەکان بوون، ڕوویان پێنەداو لە ڕێبەرایەتیی کۆبوونەوەکە دوور خرایەوە. هاوڕێیانی ئێمە بەڵگەی بڕواپێکراویان لایە کە لەمێژە ئینگلیزەکان ئەم کۆبوونەوەیەیان ئامادە کردووە، بەو مەبەستەی کە شێخ عەبدوڵلا سەیید ببێتە سەرکردەی هەموو سەرانی کوردی ئێران، وەك ڕابردوو دەوری خۆی لەناو کوردی ئێراندا هەبێ. عەبدوڵلا سەیید، بەپێی فەرمانی "مایۆر لاین" و "مایۆر چاکمان"ی کاربەدەستانی دەزگای سیخوڕیی ئینگلیز، بەشدارییان لە ئامادەکاریی ئەم کۆبوونەوەیەدا کردووە.

دوای تەواوبوونی کۆبوونەوەکە، سەرکردەکانی کورد بە ڕێبەرایەتیی عومەر خان و هەڤاڵانی بۆ ئاگادارکردنەوەی ئێمەو ئوستاندار سەبارەت بەم کۆبوونەوەیە هاتبوون بۆ ڕەزائیە. کوردەکان لە وتووێژیاندا لەگەڵ ئوستانداردا سەبارەت بە

بارودۆخی ماکۆ، داوایان کرد بەم چەشنەی خوارەوە لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکرێ (مەبەست چارەسەرکردنی کێشەی هۆزی جەلالییە):

١- کوردەکان کۆتایی بە تالآنکردن بهێنن؛ بەڵێنی گێڕانەوەی هەموو مەڕومالآتێك کە بە تالآن براوە، بدەن.

٢- کوردەکان دژ بە چەککردنی ئەو کەسانەن کە دەستیان لە تالآنکاریدا هەبوە.

٣- کاربەدەستانی خۆجێیی دەبێ ئەو سی هەزار تمەنەی کە دەوڵەت بۆ یارمەتیدانی جەلالییەکانی ناردووە، لەنێوانیاندا دابەشی بکەن.

پاشان کوردەکان ڕایانگەیاند، گەر کاربەدەستانی خۆجێیی هەنگاو بنێن بۆ چەککردنی جەلالیەکان، ئەوا کوردەکانیش بۆ جێبەجێکردنی ئەو سوێندەی کە خواردوویانە (سەبارەت بە یەکبوون) پشتیوانی لە جەلالیەکان دەکەن. ڕاپەڕینی کوردەکان سەرتاسەری و دژ بە هەموو پۆستەکانی ئێران و سەربازگەکان دەبێ (ئێمە بەڵگەمان بەدەستەوەیە کە کوردەکان لەمێژە خۆیان بۆ ڕاپەڕینێکی ئاوها ئامادە کردووە، بەڵام نەیاندەویست جێبەجێی بکەن و دەیانویست کێشەکەیان بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانە چارەسەر بکرێ).

ئوستاندار بەڕواڵەت بە چارەسەرکردنی ئاشتییانەی کێشەی کورد ڕازی بووە، سەبارەت بە پێویستیی ژیانێکی دۆستانەی نێوان کورد و ئازەری قسەی بۆ کردبوون، گوتبووی دەست نیشانی ئەوەی کردووە کە ئێستا وا خەریکە شەڕ نزیکی سنوورەکانی ئێران دەبێتەوە، دەبێ هێزەکانمان دژ بە دوژمنی گشتی ڕێك بخەین. ئوستاندار لە قسەکانیدا ئاشکرای نەکردووە کێ دوژمنی گشتییە. بەڵام گوتوویە نایەوێ کوردەکان چەك بکات، وای پێشان داوە ئەوە ڕووسەکانن کە باسی چەککردنی کوردەکان دەهێننە گۆڕێ. کاربەدەستانی ئێرانی و ئینگلیزی زۆر نیگەرانن لەوەی کە نەیانتوانیوە دەوری خۆیان لەو کۆبوونەوەیەدا ببینن. کاتی کۆبوونەوەکە، کابرایەکی ئینگلیز و شێخ عەلائەدین و شێخ ئۆغلی ویستوویانە بۆ بەشداریکردن لە کۆبوونەوەکەی شنۆدا لە ڕێگەی نەغەدەوە خۆیان بگەیەننە شنۆ؛ بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوانە مۆڵەتیان پێ نەبوە، هاوڕێیانی

ئێمە نەیانهێشتوە بچنە ئەوێ. لە بەغداوە شێخ محەمەد سادیق گەیلانی بۆ بەشداری لە کۆبوونەوەکەدا خۆی گەیاندوەتە شنۆ (ئێمە ئاگادارین کە تەواوی ئەو ڕێگایەی بە یەك ڕۆژ بڕیوە). ناوبراو پیاوێکی بە ئاشکرا سەر بە ئینگلیزە. چوار ڕۆژ پاش کۆتاییهاتنی کۆبوونەوەکە، ماك لارین سەرکونسوڵی ئینگلیز لە تەوریز خۆی گەیاندووەتە ڕەزائیە. جگە لەوە، حەمەڕەشید خانی بانە کە هەر دەستی ئینگلیزی بەسەرەوەیە، هاتووەتە مەهاباد. ئەمە بەو مانایەیە کە تەواوی ئەم سەفەرانە بۆ ئەوەن کەوا بزانن بڕیاری چی لەو کۆبوونەوەیەدا دراوە، لەوانەیشە نەهێڵن بڕیاری کۆبوونەوەکە جێبەجێ بکرێ. ئێمە ئاگادارین پرسیاری تر لە کۆبوونەوەکەدا باس نەکراوە، ئەم هەراو هوریایە بێمانایە کە گوایە ئێمە بەشداریمان لە ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی ئەم کۆبوونەوەیەدا کردووە، ڕاست نییە. کاربەدەستانی خۆجێیی بە ڕواڵەت چالاکیی سیاسیی کوردەکان بەڕووی خۆیاندا ناهێنن، ترسی زۆریان لێ نیشتووە، بەڵام لە کوردەکانی دەشارنەوە. گومانی تێدا نییە کە دەیانەوێ ئەم یەکگرتنە نوێیەی کوردەکان هەڵبوەشێننەوە. لە گوندە ئازەریەکان لەسەر بلانکی ئیدارەی دارایی شیعریان دژی کورد نووسیوە و بڵاو کردووەتەوە. ئەم کردەوەیەی ڕژێم دەیسەلمێنێ نایانەوێ دوژمنایەتی و هاندانی ئازەریەکان دژی کورد ڕاگرن و هەڕەشەی لەناوبردنی کوردیش دەکەن.

وەك ئاشکرا بوو نووری بەگ ١ی تشرینی یەکەم لە گوندی (ئامبیلا) کۆبوونەوەیەکی بچووکی ڕێك خستبوو، ئەمە بە پێشنیاری دوو ئەفسەری ئینگلیزی کرابوو کە جلوبەرگی کوردییان پۆشیبوو و بە نهێنی هاتبوون. تائێستا ڕوون بووەتەوە کە جگە لە نووری بەگ، براکانی ڕەشید بەگ، حاتەم بەگ و سەعید بەگ و قادر بەگی جەهانگیری بەشدارییان لە کۆبوونەوەکەدا کردووە. ناوی تەواوی بەشداران ڕوون نییە، ڕەشید ئامادە نەبوە بەشداری لەم کۆبوونەوەیەدا بکات. ئینگلیزەکان لەم کۆبوونەوەیەدا ڕایانگەیاندووە کە ئەوان بە هەڵبژاردنی عومەر خان ڕازی نین، چونکە بڕوای پێناکەن، بەباشی بە بەژن و باڵای شێخ عەبدوڵڵا سەییدو "سەعید بەگ"یاندا هەڵداوەو باسیان کردوون،

ئامۆژگارییان کردوون کە نابێ بڕوا بە ڕووس بکەن، ڕووسەکان دەتوانن درۆتان لەگەڵدا بکەن و بتانفرۆشن بە ئێرانیەکان. بەشدارانی کۆبوونەوە بڕیاریان داوە عومەر خان بە ڕەسمی نەناسن.

حەمەڕەشید خان بۆ جاری دووهەم لەم ڕۆژانەدا هاتە مەهاباد، بۆ ئەوەی چاوی بە عومەر خان بکەوێ (عومەر خان لە ٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٢دا چووەتە مەهاباد). پێدەچێ سەفەری حەمەڕەشید خان بۆ ئەوە بووبێ کە عومەر خان بەلای ئینگلیزدا ڕابکێشێ.

"بوزورگ خان" لە ٤ ی تشرینی یەکەمدا هاتە ڕەزائیەو ماوەی شەش ڕۆژ لەگەڵ ئوستانداری ئوستانی چواردەدا کۆبووەتەوە، دوای چەند وتووێژ لەگەڵ "مەرزەبان"دا نیسانی ١٩٤٢ چوو بۆ کوردستان. بەپێی ئەو ڕاستیانەی کە بە دەستمانەوەن، وادیارە ئینگلیزەکان و ئێرانیەکان دەیانەوێ دەست بخەنە ناو کاروباری کوردەکان.

بەم جۆرە دەکرێ بڵێین:

١- بەشێکی زۆری سەرکردەکانی کورد لەم کاتەدا بڕیاریان داوە ڕەنگوڕوویەکی سیاسی بە چالاکیی کوردەکان بدەن و کۆتایی بە ڕاووڕووت بهێنن.

٢- ئەم جووڵانەوەیە کە لە توانایدایە هێمنیی ناوچەکە بپارێزێ، ناتوانێ لە بەرژەوەندی ئێمەدا نەبێ.

٣- ئێمە بەردەوام کاردەکەینە سەر کوردەکان، تا پێش بە چالاکیی چەکدارانەی کوردەکان بۆ نەغەدەو مەهاباد بگرین، هەروەها بۆ ئەوەی جەلالیەکان بێپشتیوان بن.

پێویستە لە داهاتوودا بەجۆرێ لەناو کوردەکاندا هەڵسوکەوت بکەین کە لە ئامۆژگاریی ئێمە دەرنەچن و واز لە هێندێ پرسیار بێنن و ڕوویان پێنەدەین. بەم جۆرە دەرفەت بە ئێرانیەکان نەدرێ ئێمە بکەنە بەشدار لە سیاسەتی دژ بە کوردی خۆیاندا، یا ڕامان بکێشن. هەرچەند لایەنە گرنگەکانی کێشەی کورد لە کونسڵخانەی ئێمە چارەسەر دەکرێ، بەڵام بە پێویستی دەزانین ئاگاداری ناوەندو باڵوێزخانەمان بین سەبارەت بە کێشەی کورد لە ناوچەکانی (ماکۆ، خۆی و ...).

ڕووداوەکانی بەرەی شەڕ ڕەنگدانەوەی زیندوویان لە بارودۆخی ناوخۆو گشت ڕووداوەکانی ئەم دوایی‌یەی ناوچەکەدا هەیە، بەتایبەت لە شار زۆر هەست بەم شتە دەکرێ. هەبوونی ژمارەیەکی کەمی ڕادیۆ (تا ٥٠ دانە) بووەتە مایەی ئەوەی کە تەواوی دەنگوباسەکان و ڕاگەیاندنی بەرەی شەڕ بەپێچەوانەوە بڵاو بکرێنەوە. گەرچی ئاسووری و ئەرمەنیەکان سەرکەوتنەکانی ئێمە گەورەتر دەکەن، داروودەستە کۆنەپەرستەکانی ئازەری لە هەوڵدان بە ئاشکرا سەرکەوتنەکانی ئەڵمان گەورە بکەن؛ جگە لەوەیش، پەرە بە دەنگوباسی ئەڵمانیەکان دەدەن. هێندێ سەرکەوتنی ئەڵمان لە باشوور، کۆنەپەرستانی ئێرەی بەدەماخ کردووە، دەوری ڕوو لە زیادبوونی ئێمەی ڕاگرتووە، بەتایبەت لەناو ڕووناکبیرانی ئازەری و موڵکدارەکاندا، کە لە ڕابردوودا بێلایەن بوون؛ تەنانەت هەڵوێستی دوژمنانەیشیان لەگەڵ ئێمەدا هەبوو. ئەگەر ئەوسا کاتی هێرشی ئەڵمان بۆ سەر باشوور ڕۆژانە چەند کەس لەوانە دەهاتنە لام، بەلام ئێستا کەمتر دێن، هەڵوێستی ((چاوەڕێ بە و ببینە))یان وەرگرتووە (ئەوانە تەنانەت بۆ ئیش نەدەهاتنە لامان، بەڵکوو بۆ بینینی فیلمی سینەمایی دەهاتنە لامان).

بە ڕۆیشتنی لەشکری زرێپۆشی ٢٣ی سوپای سوور لێرە، داروودەستەی کۆنەپەرست وایان بڵاو کردووەتەوە گوایە ئێمە بەگشتی لە ئێران دەردەچین، سوپای ئینگلیزو ئەمریکا دێنە جێگامان. جگە لەوە، "ماک لارین"ی سەرکونسڵخانەی ئینگلیز لە وتووێژیدا لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکەدا ئەم هەواڵانەی بەدرۆ نەخستەوە، بگرە یارمەتیی بڵاوبوونەوەیشی داون.

پاش گەڕانەوەی لەشکری ناوبراو بۆ شاپوور، هەر لەلایەن ئەوانەوە بێشەرمانە وا بڵاو بووەتەوە کە گوایە ئەڵمانیەکان دەرفەتی تێپەڕبوونیان بە قەفقازدا پێنەداون، لەشکرەکە بە ناچاری گەڕاوەتەوە، ئەمەیش پاش ئەوەی کە زیانێکی گەورەیان لێ کەوتووە. لەکاتی گەڕانەوەی لەشکرەکەدا، ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان بۆ تەماشاکردنی (بریندارەکان) لە ماڵ هاتبوونە دەر. بەلام بۆیان دەرکەوتبوو ئەو هەواڵانە درۆ بوون. بەگشتی، ڕۆژێک ڕانابووری و هەواڵێکی

بەزۆری دوژمنانە و دژ بە ئێمە لە ڕەزائیە بڵاو نەکرێتەوە. سەرچاوەی ئەو هەواڵ و درۆودەلەسانە ئەمانەن:

کونسوڵی تورکیا (جێگری داماد ئۆغلی) لە ڕەزائیە کە مێجەرە لە سوپای تورکیادا. "موعیزی" بەڕێوەبەری پەروەردە و بارهێنان لە کاربەدەستانی خۆجێیی، "فەرجام" بەرپرسی بەڕێوەبەرایەتیی ڕێگاوبان، "عەزیم" دادستان، فەرماندەی ژاندارمری و پۆلیس و چەند کەس لە دانیشتوانی ناوچەکە، "ئینتزار" ناوی کابرایەکی بازرگان، مەحموود زادە بەڕێوەبەری ئێستگەی کارەبا، "جەلال سوڵتان" خاوەن موڵك (کە بە داوای ئێمە ڕەزائیەی بەجێهێشت) و ... . جگە لەوە، لە ناوچەکانی ئەنگیان و قووشی و هێندێ گوندی ئازەرنشین چەکداری ئازەری هەن (هەروەك پێشتر باسم کردبوو). لەم دواییانەیشدا ڕێکخراوێکی نەتەوایەتیی لاوان دەستبەکار بوو. ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە کوڕی موڵکدارەکانن، لە کۆبوونەوەیاندا بڕیاریان داوە هێزێکی چەکداری دژ بە کورد و ئەرمەن و ئاسووری پێك بهێنن. بەمجۆرە کار بۆ ڕێکخستنی دەستەی چەکدار کە ئامادەن ((لە کاتی پێویستدا دژی ئێمەش بوەستنەوە)) هەروا بەردەوامە.

ئوستاندار ڕاستەوخۆ بەشداری لەم چالاکیانەدا ناکات کە دژ بە ئێمەن، بەڵام بێگومان ئاگاداری ئەم هەڵسوکەوتانەیە و دیارە لەگەڵیشیاندا هاودەنگە؛ بەڕواڵەت نیازی لەگەڵ ئێمەدا باشە، تەنانەت لایەنگری لە ئێمە دەکات، بەڵام لەوکاتەدا هەنگاوی دروست دژ بە کۆنەپەرستان هەڵنانێتەوە، بگرە پشتیوانی لەم درۆودەلەسانەیش دەکات. بۆ نموونە، لە وتووێژیدا لەگەڵ هاوڕێ "سولەد"ی سکرتێری باڵوێزخانەی ئێمەدا، بە ئاشکرا پشتیوانیی لە پروپاگەندەی ئەڵمانیەکان کردووە، گوایە پێکهێنانی بەرەی دووهەم جێبەجێ نابێ، تەنانەت بێشەرمانە پێشنیاری گرەوی لەسەر هەزار تمەن لەگەڵ هاوڕێ سولەددا کردووە کە بەرەی دووهەم ناکرێتەوە.

کۆنسوڵی سۆڤیەت لە ڕەزائیە

ماکسیمۆڤ

**وتوویژ لەگەڵ بەڕێز "ئۆرکات"ی کونسوڵی بریتانیای گەورەدا**

١٩ی ئایاری ١٩٤٢:

ئۆرکارت بۆ ماڵئاواییکردن هاتە لام و گوتی: سبەینێ سەفەر دەکەم بەرەو تەورێز. سەبارەت بە زۆر مەسەلە قسەمان کرد و گوتی: لەوباوەڕەدایە کە زۆربەی ئەو هەواڵانەی وا لەبارەی ناوچەی ڕەزائیەوە بلاو دەبنەوە، درۆیە؛ گوتیشی: لە گەڕانەوەیدا بیرو بۆچوونی خۆی لەم بارەوە بۆ کونسوڵی ئەمریکا (کە نەهاتووە بۆ ئێرە) دەگێڕێتەوە. ئۆرکات گوتی: ئەو بڕوای تەواوی پێ دەکات و کەڵك لەم هەواڵانە وەردەگرێ. هەروەها گوتی: کاتێك لای ئوستاندار بووم، باسی دڕندەیی و ڕێگری و ڕاووڕووتی کوردەکانی کرد. پاشان گوتی: سوپای ئێران لە تارانەوە بەرەو ڕەزائیە کەوتوەتە ڕێ. من گوتم: بیستوومە، بەڵام پێم وایە ئەم کردەوەیە هەنگاوێکی زۆر پەلەیە و لەوانەیە بە گەیشتنی سوپا ئیشەکە تێك بچێ. هاوڕای من بوو، گوتی: سوپاکان کە ئامادە نەبن لەژێر کۆنترۆڵی ئوستانداردا بن، ئەفسەرەکان دەتوانن ببنە مایەی تێکهەڵچوونی نوێ.

کونسوڵی سۆڤیەت لە ڕەزائیە

ماکسیمۆڤ

**ڕاگەیاندنی هەواڵ لەبارەی بارودۆخی ڕەزائیەوە**

٨ی حوزەیرانی ١٩٤٢:

پاش ١٤ی ئایار بارودۆخی ناوچەی ڕەزائیە بەزوویی هێمن بووەوە، دانیشتوانی گوندەکان بەرەو ماڵەکانی خۆیان گەڕانەوە، تالان و ڕاووڕووت کە لە هێندێ جێگادا بوو، بەگشتی، بەتەواوی بنبڕ کراوە. بەلام پێدەچێ ئەم هەلومەرجە بە دڵی هێندێ لە کاربەدەستانی ناوچەکە و ئەو کەسانەیش نەبێ کە لەپشت سیخوڕەکانی ئەڵمان- تورکیاوەن. هەروەك ڕابردوو کورد و ئەرمەن و ئاسووری تاوانبار دەکرێن. ئەوەندەی لەتواناماندا بوو چووینە بنج و بناوانی ئەو

هەولآنە و بۆمان دەرکەوت هەموویان درۆن. بۆ نموونە، کەسێکی "فەقێ عەباس ئۆغلی" ناو لە گوندی نەورۆز گوتبووی: ٨٤٠ سەر ئاژەڵیان بردووە، بەلآم لەڕاستیدا ئەو ئاژەلآنە بەرەو هەوارگەیەکی دوور نێردراون و شوانی کابرا خۆی بردوونی و...

سەرەڕای بەردەوامبوونی ڕۆژنامەکانی "پەرچەم و ئومێد" لە بلآوکردنەوەی هەواڵی دژی کوردان، ئێمە سەرکردەکانی کوردمان ئاگادار کردەوە کە بیانوو نەدەنە دەستی سوپای ئێران تا هێرش بکاتە سەریان (کوردەکان بە پەرۆشەوە خۆیان ئامادە کردووە بۆ لێدانی سوپای ئێران). ئێمە بە کوردەکانمان گوت: نووسراوی ئەم ڕۆژنامانە بیروباوەڕی دەوڵەتی ئێران دەرنابڕن. کوردەکان ئامۆژگاریی ئێمەیان لەگوێ گرت، داوایان لێ کردین نەهێڵن ئێرانیەکان هێرشی سەرکوتکەرانەی خۆیان بکەنە سەرمان، گوتیان: ((ئێمە هێرش ناکەینە سەر ژاندارم و سوپای ئێران، بەلآم نایەنە ناو گوندەکان. ئەگەر ئەوان هێرش بکەنە سەرمان، ئێمەش بەرگری لە خۆمان دەکەین. ئەگەر بێنە سەرمان، ئەوکاتە هەموو چەکەکانیان دەکەوێتە دەست ئێمە)).

لە وتووێژەکاندا لەگەڵ سەرکردەکانی کورددا چەندین جار بەڵێنیان بە ئێمە دا کە وەفاداری دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەتن ، ئەو دەوڵەتە دەناسن. ((وتەی ستالین بۆ ئێمە یاسایە))، ئەمە قسەی سەرتیپ ئاغای شکاك و نووری بەگ و زیرۆ بەگ و ڕەشید بەگ و سەرکردەکانی ترە.

سەرتیپ ئاغای شکاك (یەکێك لە سەرکردە گەورەکانی هۆزی شکاکە) بەناوی هێندێ لە سەرکردەکانی کوردەوە داوای لێ کردین ڕێگەیان بدەین بچنە ناو خاکی یەکێتیی سۆڤیەت، لەوێ لەژێر سایەی یەکێتیی سۆڤیەتدا بژین. جگە لەوە، سەرتیپ ئاغا داوای کرد دوو نوێنەری کورد بچن بۆ مۆسکۆ و چاویان بە هاوڕێ ستالین بکەوێ، تا باسی هەژاری و کوێرەوەریی کوردی لە سەرەتای هەبوونیانەوە تائێستای بۆ بکەن و بیروڕا و ئامانجەکانی کوردی بخەنە بەرچاو. لە وەلآمدا گوتمان: ئێستا کاتی ئەوە نییە نە باسی وەرگرتنی مافی هاوولآتیبوونی سۆڤیەت و نە چوونە مۆسکۆ بکەن. باشتر وایە گوێڕایەڵی ئێمە بن و ئامۆژگاریەکانمان جێبەجێ بکەن. هەروەك ئوستاندار داوای کردبوو چاوی بە

سەرکردەکانی کورد بکەویٚ، بەلاٚم سەرکردەکانی کورد ئامادە نەبوون بیبینن. ئێمە داوامان لە کوردەکان کرد، ئەوە بوو لە ڕێکەوتی ۲۸ی ئایاردا ئوستاندار چاوی بە چەند سەرکردەیەکی کورد کەوت. ئوستاندار داوای لیٚ کردن هێمنیی ناوچەکە بپارێزن؛ پێی گوتن: ڕابردوو لەبیر بکەن و هاوکاری دەوڵەتی ئێران بن، بەڵێنی دا جیاوازی نەخاتە نێوان کورد و نەتەوەکانی تر، کوردەکانیش بەڵێنی جێبەجێکردنی داواکاریی ئوستانداریان دا، داواشیان کرد سوپا و ژاندارم نەنێردرێنە ناوچەکە. ئوستاندار بەڵێنی دا ئەم داخوازییە و داخوازیە بچووکەکانی تریان جێبەجیٚ بکات. سەرکردە ناوبراوەکان لایەنگری ئێمەن (سۆڤیەت)، نایانەویٚ ئێرانیەکان وەك خاوەن دەسەلاٚت بناسن. بەلاٚم ئەمیر ئەسعەد "عەلی ئاغا"ی فەرمانداری مەهاباد کە کەسێکی لایەنگری ئێران و ئینگلیزە و لە سەرکردە گەورەکانی کوردە، دژی ئەم سەرکردانەیە و خەریکی پیلانگێڕانە لەنێوان ئەو "ئوستاندار"و سەرکردەکانی تردا (ئەویش بۆ خۆی چەند سەرکردەیەکی لە دەوری خۆی کۆکردوەتەوە). ئەم پیاوە هێندە ئاڵۆز بووە، زۆربەی سەرکردەکانی کورد لە کوشتنی عەلی ئاغا دەدوێن.

دەسەلاٚتدارانی ئێران دانیشتوانی ئازەرییان بۆ پێشوازیکردن لە سوپای ئێران بۆ ڕەزائیە ئامادە کردووە. ئەوەبوو ڕێکەوتی ۳-٤ی مانگی حوزەیران بە هوراو چەپڵەڕێزان و گوڵباران پێشوازییان لە سوپای ئێران کرد. بەیاننامەیەکی تایبەت بەبۆنەی گەیشتنی سوپای ئێرانەوە بەم ناوەڕۆکەی لای خوارەوە بلاٚو کرایەوە:

((زۆرلێکراوانی ڕەزائیە!

بە دڵێکی گەرم و دەستێکی پاك و بە دیارییەوە، بە گیان و بەخۆشییەوە پێشوازی لە سوپای خۆبەختکەری شاهنشا بکەن و....))

تائێستا سوپای ئێران شتێکی ئەوتۆی لە خۆی نیشان نەداوە، بەلاٚم بە هاتنیان دوو کوردیان کوشتووە، ئەمەیش ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە هاتنی ئەوانەوە هەیە، ڕووداوەکە بەم جۆرەیە:

"قەرەباغ لیل" ناوێکی دانیشتووی گوندی (سارنا) کە کۆنە حیسابێکی لەگەڵ کوردەکاندا هەیە، ڕۆژی ٣١ی ئایاری ١٩٤٢ شکاتی لەلای سەرهەنگ ماهینی کردووە (کە کوڕەکەی ئەفسەری هەنگی ٦ی ئێرانە، لەکاتی هاتنی سوپای سووردا بۆ ئێران هەوڵی دابوو ڕابکاتە تورکیا، بەڵام لەلایەن کوردەکانەوە گیراوە و دواتر بە پارەیەکی زۆر ئازاد کراوە). لە شکاتەکەیدا ئاگاداری "ماهینی"ی کردوەتەوە کە کوردەکان مەڕوماڵاتەکەیان دزیوە. ماهینیش، بەبێ فەرماندەی ژاندارمری، دەستەیەك ژاندارمی بۆ دەستگیرکردنی کوردەکان ناردووەتە گوندی سارنا. کاتێ ژاندارمەکان گەیشتوونەتە گوندەکە، هیچ کوردێکی لێ نەبوە و ئاشکرا بووە کە هیچ مەڕوماڵاتێك نەدزراوە. ژاندارمەکان ئاگادار کراونەتەوە کە گوندێکی دراوسێی (ماخلام) ناو سێ کوردی لێیە. ئەمجا ژاندارمەکان گەمارۆی گوندی ناوبراویان داوە، سەرکردەیەکی خێڵی شکاکی ئادۆ "عەبدۆ" ناو و کوڕەکەییان کوشتووە و خزمەتکارەکەیان توانیویە خۆی ڕزگار بکات. ئەو کوردانە بۆ کڕینی شتومەك و ناڵ و بزماری سمی ئەسپ هاتبوونە گوندی (ماخلام)، تفەنگ و دەمانچەیان پێ بووە. پاش لێکۆڵینەوە دەرکەوت لەوماوەیەدا هیچ مەڕوماڵاتێك لە گوندەکانی سارنا و ماخلام نەدزراوە، تەنانەت ئادۆ و کوڕەکەیشی لەو ڕووداوەدا فریای دەستکردنەوە و تەقەکردن نەکەوتبوون. ئەم ڕووداوە کوردەکانی نیگەران و نارەحەت کرد و کەوتنەخۆ بۆ هێرشبردن. ئێمە هەوڵمان دا و پێشمان بە هێرشی کوردەکان گرت.

ئازار و ئەشکەنجەی ئەرمەنی و ئاسووریەکان هەروا بەردەوامە. هێندێ جار بە تاوانی هاوکاریکردنی کورد سزا دەدرێن. زۆرجاریش داوایان لێ دەکرێ لەکاتی هێرشکردنی کوردەکاندا هاوکاریی ئازەریەکان بکەن. ئازەریەکان مەڕوماڵاتیان لای کوردەکان بەجێ دەهێڵن. جگە لەوە، هێندێکیان ئێستا لە گوندی ئەرمەنی و ئاسووریەکاندا دەژین.

هەواڵێکی تر ئەوەیە کە تائێستا ٢٠٠-٢٥٠ بنەماڵەی کوردی عیراق بە سەرۆکایەتیی فەتاح بەگی سەرکردەی خێڵی هەرکی هاتوونەتە هەوارگەکانی سەر

سنوور؛ ئەوانە عادەتیانە سالآنە بێنە ئێرە و مۆڵەت لە ئێران وەردەگرن و چەند هەزار تمەن دەدەن بە دەوڵەتی ئێران. بەلآم ئێستا ئامادە نین ئەو پارەیە بدەن. پێدەچێ پارەیان نەبێ، چونکە ئێستا برسێتی لە عیراق بلآوە، پێیان وایە ئێمە خاوەن دەسەلآتی ناوچەکەین، بۆ ئەم مەبەستە، مۆڵەتیان لە ئێمە دەوێ. سەبارەت بەم مەسەلەیە، ٢٥ی مانگی ئایار ئێوەم لێ ئاگادار کردەوە، هێشتا وەلآمتان نەداوەتەوە. پێمان باشە نەبینە ڕێگریان و پێویستە وتووێژ لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بکرێ تا نەهێڵن کوردەکانی عیراق لەوێ دەربچن. لایەنگرانی فاشیزم و کۆنەپەرستان هەموو هەوڵی خۆیان خستووەتە گەڕ بۆ ئاژاوەنانەوەو تێکدانی ئارامی، خەریکی خۆسازدانن بۆ هێرشبردن. زۆربەی دانیشتوانی کورد و ئەرمەن و ئاسووری، سەر بە یەکێتیی سۆڤیەتن و پشتیوانی لە هەموو هەنگاوەکانی دەکەن، ئەگەر ڕێگە نەدەین ئێرانیەکان گوشار بخەنە سەریان.

کونسوڵی سۆڤیەت لە ڕەزائیە

ماکسیمۆڤ

**وتووێژ لەگەڵ "محەمەد حسێن"ی سەرکردەیەکی کوردی خێڵی هەرکیدا**

**١٦ی ئایاری ١٩٤٢:**

ناوبراو بە تەنیا هاتە کونسوڵخانە، کە نیشانەی ئەوەیە زۆر بڕوای پێمانە. من سەبارەت بە سەفەرەکەی بۆ شاپوور پرسیارم لێ کرد: بڕیار بوو سەرکردەی هۆزەکانی کورد لەگەڵ "سەرتیپ میلینک"ی فەرماندەی سوپای ١٥ و "ئەمیر ئەسلآنۆڤ"ی کۆمیسەری سوپادا چاویان بەیەکتر بکەوێ. محەمەد حسێن لە وەلآمدا گوتی: لەبەر دواکەوتنیان لەڕێگە چاوپێکەتنەکە سەری نەگرت. سەبارەت بە بارودۆخی چۆمی باراندوزچای، محەمەد حسین گوتی: ئێمە کە بەڵێنمان بە سۆڤیەت دا هێمنیی ناوچەکە بپارێزین، لەسەر بەڵێنی خۆمان ماوین و ڕێگە بە کەس نادەین ڕاووڕووت بکات و ئاژاوە بنێتەوە. پاشان گوتی کوردەکان تا هاتنی سوپای سوور لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە دەچەوسێنرانەوە، ئێستا ئێمە وەك مرۆڤ

دەژین. ئێمە بۆ بەدەستهێنانی ئازادی خوێنی زۆرمان ڕشتووە، بەلاّم نەمانتوانی ئەو شتە دەست بخەین کە پاش هاتنی سوپای سوور دەستمان کەوتووە. بۆیە بە پێویستی دەزانین هەرچی دەولّەتی سۆڤیەتی داوای بکات لە ئێمە، جێبەجێی بکەین. هەموومان لە خزمەتتاندداین و هەموو داواکارییەکی ئێوە جێبەجێ دەکەین، ئێمە دەزانین یەکێتیی سۆڤیەت نەك هەر دەتوانێ ئازادی و سەربەخۆییمان پێ بدات، بەلّکوو یەکێتیی سۆڤیەت لە کاتی خۆیدا یارمەتیی زۆری ئێرانی داوە. بەلاّم ئێرانیە فێلّبازەکان دەیانویست یارمەتیی دوژمنانی یەکێتیی سۆڤیەت بدەن. محەمەد حسین گوتی: ئێمەی کورد باش شارەزای فێلّبازیی ئێرانیەکان بووین. ئەگەر سوپای سوور لە ئێران دەربچێ، ئێمەیش بەدوایدا دێین، چونکە پاش دەرچوونی سوپای سوور ئێرانیەکان ناهێلّن بە ئاسوودەیی بژین. محەمەد حسین پاشان ڕایگەیاند کاربەدەستانی خۆجێیی و ئازەریەکان هۆکاری هەستان و ڕاپەڕینی کوردەکانن. ناوبراو گوتی: هێرشی پیاوەکانی بۆ سەر ژاندارم و ئازەریەکان پاش کوشتنی چوار کوردی هۆزەکەی خۆی بوو، کە یەکیان برای بووە و لەکاتی نوێژ کردندا کوشتوویانە.

محەمەد حسین گوتی: ئێستا زۆربەی کوردەکان وازیان لە ناکۆکیی نێوانیان هێناوە و دۆستانە دەژین. بەلاّم خۆفرۆشی واش لەناو کوردەکاندا هەن دەیانەوێ تۆوی جیاوازی و دوژمنایەتی بچێنن و بەم چەشنە بەرەی کوردەکان بێهێز بکەن.

ماکسیمۆڤ

**ڕاپۆرت**
**سەبارەت بە گەشتی ناوچەکانی دەوروبەری ڕەزائیە**
**لەگەلّ بەڕێز "ئۆرکارت"ی کونسولّی ئینگلیزدا لە تەوریز**

١٧ی ئایاری ١٩٤٢:

ئۆرکارت سەعات ٩،٣٠ی سەرلەبەیانی بە مەبەستی گەشتکردن بۆ ناوچەکانی دەوروبەری ڕەزائیە، بەدوامدا هات. من و هاوڕێ "یەلینتۆڤ"ی سکرتێری کونسولّخانە و قوماندارانی شار و هاوڕێ "دوولێیڤ" ستوامی یەکەم

و هاوڕێ "یوسویۆڤ" سەرکردەی سیاسی بە ئوتومبیلی قوماندان کەوتینە ڕێ. ئۆرکارت و داماد ئوغڵیی کونسوڵی تورکیا و من لەناو ئوتومبیلەکەدا پێکەوە دانیشتووین. چەند ڕاستییەکم هێنایەوە کە بەڵگەی درۆودەلەسەی ئەو هەواڵانە بوو؛ بەتایبەتی دەست نیشانی ئەوەم کرد کە بەپێی ڕاگەیاندنی کاربەدەستانی خۆجێیی هەرچی ئاژەڵ هەیە کوردەکان بە تاڵان بردوویانە، بەڵام ئێمە بەچاوی خۆمان ئاژەڵ لەسەر مەزراکان و کێڵگەکان دەبینین. ئورکارت هاودەنگم بوو.

یەکەمجار لە گوندی (بالانۆش) لامان دا، ئەو جێگایەی کە ڕووداوەکان پەرەیان تێدا سەند و تێکهەڵچوونی گەورەی نێوان کورد و ژاندارم ڕووی دا؛ خانوەکان هەموو تەواو دەستیان لێ نەدرابوو، تەنیا جێگایەك نەبێ کە ژاندارمی تێدابوو و بەشێکی سووتا بوو. چەند ماڵێك تاڵان کرابوون. هێشتا لە ڕەزائیە دەرنەچووبووین کە بەتەواوی قەناعەتم هەبوو کونسوڵی تورکیا جێ‌وڕێی سەفەرەکەمانی بۆ ئەوێ دیاری کردبوو و بە ئۆرکارتی گوتبوو. ئەم بۆچوونە ڕاست دەرچوو. ئەوەبوو کەسێکی خەڵکی تورکیا لە گوندێکی ترەوە بە فەرمانی "داماد ئوغڵی"ی کۆنسوڵی تورکیا هاتبووە گوندی (بالانۆش). (دیارە پیلانەکە پێشتر داڕێژرابوو)، تا ئەو هەراوهوریایە لە بنچینەدا ناڕاستە بۆ "ئۆرکارت" بسەلمێنن و دەریبخەن قسەی ئەمان هەمووی ڕاستە، ئورکارت وەك دانیشتوانی ناوچەکە گوێیان لێ بگرێ. منیش داوام لە هاوڕێیان کرد دانیشتوانی گوند کۆبکەنەوە، تا باسی ڕاستەقینەی ڕووداوەکەمان بۆ بگێڕنەوە. داماد ئۆغڵی، بە هاتنی خەڵکەکە، دوور کەوتەوە. خەڵکی دێ بە "ئۆرکارت"یان گوت: ئەمان تا هاتنی کوردەکان لە گوند ڕایان کردبوو؛ ئەویش لەبەر ئەوەی کە ژاندارمەکان کەوتنە تاڵانکاری و زۆرداری نواندن دەرهەق بە خەڵك. بۆ نموونە، ژاندارمەکان کابرایەکی ئەرمەنی نانکەری خەڵکی ئەوێیان کوشتووە. هەروەها ئێمە دەمانزانی پاش کوشتنی کوردەکان لە بالانۆش و زۆرگ ئاباد بەدەستی ژاندارمەکان، کوردەکانیش بێ‌دەنگ نابن. ئێمە لەبەر ئەوە بڕیارمان دا ڕووبکەینە شار.

ئەم قسانەی خەڵك کارێکی زۆریان کردە سەر ئۆرکارت. داماد ئۆغڵی دستەپاچە، سەری لێ شێوابوو، نەیدەزانی چی بکات. ئۆرکارت لێرە و پاشتریش

ئەو قەناعەتەی پەیدا کرد کە دەنگوباسی بڵاوکراوەی ئێرانیەکان سەبارەت بە سووتاندن یا وێرانکردنی خانوو و گوندەکان، هەمووی درۆیە. بە پێشنیاری کۆنسوڵی تورکیا درێژەمان بە گەشتەکەمان دا. لەسەر ڕێگا دوو خانوومان بینی، پێشتر پۆستی ژاندارمی زۆر کۆن بوون، دیار بوو دەسووتان. داماد ئۆغڵی هەوڵی دا ئەمە بکاتە ڕاستی تا ئورکارت بڕوای پێبکات. منیش بە "ئورکارت"م گوت: ئەمە ماڵی جووتیاران نەبوە و پۆستی ژاندارمی تێدا بووە. داماد ئۆغڵی هەوڵی دا نیشانی بدات کە شوێنەواری گوللەی پێوەیە، بەڵام ئەمەیش سەری نەگرت. بەرەو گوندی (زورگ ئاباد) بەشێکی ڕێگاکەمان بەپێ بڕی، لە ڕێگە ئۆرکارت گوتی: دیارە کوردەکان هێندێ بەڵگەیان بەدەستەوە بووە کە هێرشیان کردووەتە سەر ژاندارمەکان. داماد ئۆغڵی قسەی پێ نەمابوو، گوتی: ((کردەوەی ژاندارمەکان هێندە داخیان ناوە بە دڵی کوردەکانەوە، تا ناچار بن ڕاپەڕن)). بە پێویستم زانی کەمێ باسی هەڵسوکەوتی سەرهەنگ "هاشمی" فەرمانندەی ژاندارمری حکوومەت بەرانبەر بە کوردەکان بکەم بۆ داماد ئۆغڵی و ئورکارت.

ماکسیمۆڤ

**ناوەڕۆکی وتووێژ لەگەڵ**
**"دکتۆر مەرزەبان" ئوستانداری ئوستانی چوار و**
**"ئۆرکارت"ی کونسوڵی بریتانیای گەورەدا**
**١٨ی ئایاری ١٩٤٢:**

وتووێژ بە پێشنیاری ئورکارت هەر لە ژوورەکەی ئوستاندار پێك هات. ئۆرکارت بە مەرزەبانی گوت ((لە گەشتەکەیدا بۆ ناو گوندەکانی دەروبەری ڕەزائیە))، ئەو ڕاستییەی بەدەست هێنا کە ئەو هەواڵانەی وا لە تەورێز و ڕەزائیە سەبارەت بە ڕووداوەکانی ئەم دواییەی ناوچەکە بڵاو بوونەتەوە، بە ئاشکرا گەورە کراون و بەگشتی ڕاست نین. تەواوی خانوەکان دەستیان لێ نەدراوە، هیچ هێرشێکی دڕندانە نەکراوە. لەبەرئەوە هیچ پاساوێك بۆ ترسانی خەڵکی لەئارادا نییە. مەرزەبان دەیویست بڵێ ((هێندێ لەو دەنگوباسانە ڕاستن، گوتی نزیکەی ٥٠٠ کەسی ئازەری

کوژراون و بریندار بوون)). منیش لە وەڵامدا گوتم ڕاست نییە، بەپێی نەخۆشخانەی شار لەماوەی ڕووداوەکاندا ٥٤ کەس زیانیان لێ کەوتووە.

مەزرەبان گوتی: ((ئەو لە خزمێکیەوە کە نوێنەری مەجلیسە لە تاران ناوی پێ گەیشتووە، باسی ناردنی سوپای ئێران دەکات لە تارانەوە بۆ ئێرە. ئۆرکارت ڕووی لە مەزرەبان کرد و گوتی: ((دەبێ بە زووترین کات هەنگاو هەڵگیرێ بۆ گەڕانەوەی تەواوی دانیشتوان بۆ گوندەکانی خۆیان، تا هاتنی سوپای ئێران ناوچەکە بەتەواوی هێمن بووبێتەوە)). مەزرەبان بەڵێنی دا داواکانی ئورکارت جێبەجێ بکات. منیش گوتم: پێویستە فەرمانیان پێ بدرێ بگەڕێنەوە، چونکە تەواوی ناوچەکە ئارامە. مەزرەبان سەبارەت بە قسەکانی "ژەنەڕاڵ مایور سبلیوانۆڤ" لەگەڵ وەزیری جەنگی ئێراندا، گوتی: پێویستە بەیاننامەیەکی هاوبەش بۆ خەڵك دەربکەین، تا بۆ شوێنی خۆیان بگەڕێنەوە. منیش گوتم: پێویستی نابینم بەیاننامەی هاوبەش دەربکەین، چونکە دەسەڵاتدارانی ئێران لە ناوچەکەدا هەن و دەتوانن داوا لە خەڵك بکەن بگەڕێنەوە. خەڵکیش دەبێ بڕیاری ئێوە جێبەجێ بکات. ئۆرکارت پشتیوانیی لە قسەکانی من کرد، مەزرەبانیش بەڵێنی دا هەر ئەمڕۆ ئەم داواکارییە جێبەجێ بکات. پاشان مەزرەبان گوتی: نیازی وایە لە ٣٠ی ئایاردا چاوی بە سەرکردەکانی کورد بکەوێ. پێشنیازم کرد بە جیاجیا نامەیان بۆ بنووسێ، مەزرەبان گوتی: ئەگەر فەرماندەی هێزەکانی سۆڤیەت هاوکاریی بکات، بەڵێنەکانی خۆی جێبەجێ دەکات.

پێش چوونە دەرەوەمان لە ئوستانداری، مەزرەبان پێی ڕاگەیاندین هەواڵێکی تازەی بەدەست گەیشتووە، لەوبارەیەوە کە گوایە کوردەکان نیازیانە لە ناوچەی خۆی هێرش بەرن، داوای لە من کرد هاوکاریی بکەم بۆ دامەزراندنی پێگە و پۆستی ژاندارمری. منیش بەڵێنم پێ دا بۆ ئەو مەبەستە پێوەندی بە فەرماندەی سوپای سۆڤیەتەوە بکەم لە تەورێز و ئەم داواکارییەی پێ ڕابگەیەنم.

ماکسیمۆڤ

**ڕاستی سەبارەت بە ناوچەی کوردنشین**

١٩٤٢/١/١٥

ژمارە ڤ-٤٣

بۆ هاوڕێ مۆڵەتۆڤ ڤ. م

پێم‌وایە دەبێ داخوازیەکەی "ئەکتای" سەبارەت بە کێشەی کورد هەندێ شیکردنەوەی لە بارەوە بکرێ و بەم چەشنەی خوارەوە وەڵام بدرێتەوە: ((لە وتووێژی ١٩٤٢/١/١٤ی من و ئێوەدا، داواتان لێ کردم داخوازیتان لە هاوڕێ مۆڵەتۆڤ سەبارەت بە هەندێ شیکردنەوەی تایبەت بە کێشەی کورد کە بەڕێزان مۆڵەتۆڤ و ئیدەن -کاتی سەردانەکەی بۆ مۆسکۆ- لێی دوواون، پێ ڕابگەیەنم. بە ڕاسپێریی بەڕێز مۆڵەتۆڤ وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئیدەندا هەبوە، دەتوانم پێیان بڵێم: هاوڕێ مۆڵەتۆڤ ڕایگەیاندووە دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەت هیچ پاساو یا بنچینەیەك بۆ پەرۆشیی تورکیا دەرهەق بە کێشەی کورد نابینێتەوە.

ئێمە هیچ زانیارییەکمان لەبارەی نائارامیی ناو هۆز و خێڵەکانی کوردەوە بەدەستەوە نییە، کە گوایە ئەم نائارامییە ئەنجامی پشتیوانیی کوردەکانەوە لەلایەن هێزەکانی عەسکەریی سۆڤیەتەوە لە ئێران پەیدا بووە.

هێزەکانی سۆڤیەتی لە ئێران نەك تەنیا هیچ یارمەتییەکی ئەم کوردانە و کوردەکانی تریان نەداوە، بەڵکوو بەپێچەوانەوە هەنگاویان بۆ ئەوە ناوە کە تێکهەڵچوون لەنێوان کوردان و ئێرانیەکاندا ڕوو نەدات. ئەو ناوچانە کە سوپای ئێمەیان لێیە، تائێستایش نە تێکهەڵچوون نە هیچ نائارامییەکیان لەناو کوردەکاندا تێدا بەدی نەکراوە. بۆیە نابێ هەر باسی ئەوە بکرێ کە هێزەکانی سۆڤیەت لە نائارامی و ئاژاوەنانەوەدا بواری کوردەکانی دانیشتووی ئازەربایجانیان داوە یا پشتیان گرتوون.

کەواتە ناردنی سوپای تورکیا بۆسەر سنوورەکانی لەگەڵ ئێراندا هیچ بنچینە یا پاساوێکی بۆ نییە.

بەم پێیە دەتوانین بڵێین یا ئەو ئەنجامە بەدەستبهێنن کە هیچ هۆیەکەیش نییە بۆ پچڕاندنی پەیوەندیەکانی سۆڤیەت و تورکیا.

ئەوی پەیوەندیی بە سەردانی هێندێك ناوداری کوردەوە هەیە بۆ باکۆ، دەبێ بوترێ ئەم سەردانە ناوەرۆکێکی سیاسیی نەبوە، بەڵکوو هەر بۆ مەبەستێکی کولتووری بووە[1].

داوای فەرمانی ئێوە دەکەم.

ویشینسکی، ئا.

١٩٤٢/١/١٥

لە ئینگلیزییەوە وەرگێڕدراوە:

نوێنەرایەتیی بەریتانیا لە تاران

١٩٤٢/١/٣

ژمارە ٤٢/٣/٢٣

لە بۆلاردەوە

بۆ هاوڕێ سیمیرنۆڤ

باڵوێزی زۆر بەڕێز،

کاتی گەشتەکەم بۆ مۆسکۆ، یەکێك لەو کێشانە کە لەگەڵ بەڕێز مۆڵەتۆڤدا لێی دووانین، بارودۆخی کوردەکان بوو. ئەوەیشم پێبەپێ بیرهێنایەوە کە ئێمە بە بڵاوکردنەوەی بەیاننامەیەکی ئاشکرا وتەی کابرایەکی حەمەڕەشید ناو [مەبەست حەمەڕەشید خانی بانەیە، هەورامی]مان، کە گوایە یارمەتیی لە ئێمە وەرگرتووە، بە درۆ خستەوە. هەروەها لەم بەیاننامەیەدا ڕاگەیەندراوە کە سیاسەتی ئێمە ئەوەیە هانی دەوڵەتی ئێران بدەین بۆ هەم گێڕانەوەی دەسەڵاتی خۆی لە کوردستان و هەم کەمکردنەوەی کەموکوڕی (پێویستی یا تەنگوچەڵەمە)ــە

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٤٧، ٤٨.

ڕەواکانی کوردەکان ئەم بەیاننامەیە سەرنجی بەڕێز مۆلەتۆڤی ڕاکێشا و منیش هەر بەم بۆنەیەوە بەشانازییەوە ئاڕاستەی بەڕێزتانی دەکەم.
تکایە ئەم بەیاننامەیە بگەیەننە دەوڵەتەکەتان[1].

دڵسۆزتان

بۆلارد

بۆ بەڕێز ئاندرێ ئاندرەیڤیچ سیمیرنۆڤ
باڵوێزی یەکێتیی سۆڤیەت لە تاران

نێردراوە بۆ هاوڕێیان:
- مۆلەتۆڤ
- ویشینسکی
- دیکانزۆڤ

**سەبارەت بە ڕووداوەکان و بارودۆخی ناوچەی ڕەزائیە**

٧ی کانوونی یەکەم (دیسەمبەر)ی ١٩٤٢:

... پێویستە بڵێین تورکەکان و ئینگلیزەکان گوێ بە نرخی شتومەك نادەن، یەك تەن گەنم تا ١٠ هەزار ڕیاڵی پێ دەدەن. لەوکاتەدا بەڕێوەبەرێتیی خۆجێیی ٣٥٠٠ ڕیاڵ دەدات بە یەك تەن گەنم و لەم دواییانەدا گەیاندوویانەتە ٥٠٠٠ ڕیاڵ. نرخی تەنی گەنم لە بازاڕدا ٤٣٠٠- ٤٥٠٠ ڕیاڵە. جگە لە ئاودیوکردنی گەنم بۆ تورکیا و عیراق، موڵکدارەکانیش گەنمێکی زۆریان هەڵگرتووە تا بە نرخێکی زۆرتر بیفرۆشن. بەڕێوەبەرێتیی خۆجێیی ئێستا چالاکانە کەوتوەتە کڕینەوەی گەنم لە ناوچە کورد نشینەکان، ئەگەر بتوانن قەند و چاو کارگە بۆ ناوچەکە بهێنن، چەند بەرانبەر گەنمی زیاتر کۆدەکەنەوە.

---

[1] ئەرشیڤی وەزارەتی دەرەوەی ڕووسیای فیدراڵ، فۆندی ٩٤، کۆپیی ٢٧، کارتۆنی ٧٠، دۆسیەی ٧، ل١.
تێبینی: ئەم دەقە لە ڕووسیەکەوە وەرگێراوە، هەورامی.

سەبارەت بە ئاژەڵ (بەتایبەت ئاژەڵی بچووکی شاخدار) کە لە ناوچەکەدا زیاد لە پێویستە، سەرباری ئەوەی کە بەشێکی زۆری بۆ فرۆشتن دەنێردرێتە تورکیا و عیراق، هێندێ لە دەوڵەمەندەکانی کورد مێگەل (ڕان)ی وایان هەیە کە هەرکامیان دەگاتە چەند هەزار سەر، ئامادەش نین بڵێن چەند سەریان هەیە. سەرەڕای ئەوەی کە شتومەك و خواردەمەنی (لەچاو ناوچەکانی تری ئێراندا) باشترە، بەڵام نرخی هەموو شتێك دووجار چووەتە سەر. بۆ نموونە، نانی لەواشە لە ٢ ڕیاڵەوە بووە بە ٤,٥ ڕیاڵ، کیلۆی گۆشت لە ٦ ڕیاڵەوە گەیشتوەتە ١٢ ڕیاڵ و شەکر لە ٢٧ ڕیاڵەوە گەیشتوەتە ٥٠ ڕیاڵ. دەتوانین بڵێین ناوچەی ڕەزائیە لەڕووی خواردەمەنییەوە پێویستی نەك تەنیا دانیشتوانی خۆی، بەڵکوو هی سوپای ئێمەش دەستەبەر دەکات. لەبەر ئەوەی مەڕومالآت لە ناوچەکەدا زۆرە، بەتایبەت لەناو کوردەکاندا، ئێمە دەتوانین ژمارەیەکی زۆر ئاژەڵی بچووك و خوری بکڕین.

### بەهێزبوونی دەسەڵاتی بەڕێوەبەرانی خۆجێیی و جموجووڵی دژی دانیشتوانی ئەرمەن و ئاسووری:

هاتنی سوپای ئێران بۆ ڕەزائیە، ئەو دەرفەتەی بە ئێرانیەکان دا کە دووبارە پۆستەکانی ژاندارمری دابمەزرێننەوە. هەروەها ڕۆیشتنی کوردەکان لە چەند ناوچەیەکداو گەڕانەوەی کوردە کۆچەرەکانی عیراقیش، دەستی کاربەدەستانی ئێرانیان زیاتر ئاوالآ کردەوە. پشتیوانیکردنی ئێمە لە کاربەدەستانی خۆجێیی، بوو بەهۆی ئەوەی وەك پێشوو پۆستەکانی ژاندارمری، سەرەتا لە گوندە ئازەرنشینەکان و پاشان لە هی ئەرمەن و ئاسووری‌نشینەکاندا دابمەزرێننەوە. دواجار هەوڵیان دا چەند پۆستێك لە نزیکی ناوچە کوردنشینەکان دابمەزرێنن. بۆ وێنە، لە کۆتایی تشرینی یەکەمدا پۆستی ژاندارمری لە گوندی (والینە) دامەزرا، کە گوندێکی هاوسێی کوردستانەو دانیشتوانەکەی سونین. کوردەکان بۆ ڕۆژی دوایی چوار ڕۆژ ژاندارمەکانیان گەمارۆ دابوو، ویستبوویان چەکیان بکەن.

لەوکاتەدا کوردەکان هاواری ڕەخنەیان لە دژی ئوستاندار بەرز کردەوە، ڕایانگەیاند: بەپێی ئەو بەڵێنەی کە دەوڵەتی ئێران لە ڕێگای "جەلیل"ـەوە لە

ڕێکەوتی ١١ی ئایاری ١٩٤٢ دا بە بەشداریی هاوڕێ "ئیڤانۆڤ"ی کۆنسوڵی ئێمە دابووی، بڕیار وابوو پۆستی ژاندارم لە ناوچە کوردنشینەکاندا دانەنرێ. ئێمە بە بیانووی پێویستیی جێبەجێکردنی بڕیارەکانی دەوڵەتی ئێرانەوە، وازمان لە پشتیوانیکردنی داخوازیی کوردەکان هێنا. لەلایەکی ترەوە، (بەدەمی) پێمان گوتن ئێمە ناتوانین و ڕێگەتان پێ نادەین هێرش بکەنە سەر دەوڵەتی ئێران و ئاژاوە بنێنەوە. سەرئەنجام کوردەکان لە گوند دەرچوون و گەمارۆکەیان هەڵگرت. دوای چەند ڕۆژێك پۆستی ژاندارمەکانیان گواستەوە بۆ گوندی هاوسێ کە هی ئازەرییەکانە. بەم جۆرە توانیمان بەر بە ڕۆیشتنی ژاندارمەکان بۆ کوردستان بگرین. دەسەڵاتدارانی ئێرانی، جگە لەوەی کە توانییان پۆستەکانی ژاندارمری دابمەزرێننەوە، بە هاوکاریی ئێمە، توانییان کۆتایی بە هاتوچۆی کوردە چەکدارەکان بۆ شارەکانی ڕەزائیەو شاپوورو خۆی و... بێنن.

ئەم هەنگاوە سەرکەوتوانەیە زیاتر هانی دەسەڵاتدارانی خۆجێیی ئێرانی داوە، هەندێ ڕێوشوێن دژ بە کوردەکان دابنێ؛ بۆ وێنە، ژاندارمری و پۆلیس کەوتوونەتە زەوتکردنی ئاژەڵی ئەو کوردانەی کە بۆ فرۆشتن دەیبەنە شار، بەو بیانووەی کە ئەو ئاژەڵە دزراوە، تەنانەت خەڵکیشیان دەستگیر کردووە. بەڵام لەبەر ئەوەی کوردەکان ئاژەڵەکانیان بۆ فرۆشتن ناهێننە ناو شارو بگرە خۆیشیان نایەنە ناو شار، کاربەدەستانی خۆجێیی ئێران لەوە گەیشتوون کە کارێکی نابەجێ و خراپیان کردووە، وازیان لەو کردەوانە هێناوە. کاربەدەستانی ئێران دەبینن پیلان و هەڵسوکەوتیان دژ بە کوردەکان باش سەر ناگرن و ناتوانن هیچیان لەگەڵدا بکەن. تا کوردەکان چەکیان بەدەستەوە بێ، دەسەڵاتدارانی ئێران دەستیان کردووە بە سەرکوتکردنی دانیشتوانە ئەرمەنی و ئاسوورییەکان. بۆ ئەوە بیانوویان زۆرە؛ یەکەم- ئەرمەنی و ئاسوورییەکان بەتایبەتی ئەوانەی کە پێشتر لە سۆڤیەت ژیاون، ماوەیەکی درێژە لەلایەن ئێرانیەکانەوە وەك سیخوڕی ڕووس و بەربووك ناسراون؛ دووهەم- بەشێکی زۆری ئەرمەنی و ئاسوورییەکانی ناوچەکە، هەر لە یەکەم ڕۆژی هاتنی سوپای سوورەوە بۆ ئێران، بە گەرمی و شادییەوە

پێشوازییان لێ کردوون و بە هەموو جۆرێك وەك ئەمڕۆ هاوکاریان بوون. لەلایەکی ترەوە، ئەوانە کە ئامادە نەبوون هاوکاریی کاربەدەستان بکەن دژی کوردەکان، تاوانبار دەکرێن بە پشتگرتنی کوردەکان، گوایە تائێستا کوردەکان دەستیان لێ نەکردوونەتەوە. ئەم هۆیانەی دوایی بەڕواڵەت بوونە مایەی تەنگ پێهەڵچنینی ئەرمەن و ئاسوورییەکان. ئاشکرایە دەسەلاتدارانی خۆجێیی نەیاندەوێرا بە ڕەسمی هێرش ڕابگەیەنن دژ بە ئەرمەنی و ئاسووری، لەبەر ئەوە کەوتنە دژایەتیکردنیان بە دەستی ژاندارمی ئاسایی و گرووپە چەکدارەکانی ئازەری. ئەم چەند بەڵگانەی لای خوارەوە نیشاندەری ڕاستیەکانن:

١- سەعات ١ی شەوی ڕۆژی ١٢ی تشرینی یەکەم، ٧ ژاندارم بە فەرماندەیی ئەفسەرێك لەگەڵ گرووپێکی چەکداری ئازەریدا گەمارۆی (شوم بولاباد)یان دا، بە بیانووی گەڕان بەدوای کوردەکاندا، هەموو ماڵەکانیان پشکنی، تەنانەت کەلوپەلی تایبەتی خەڵکیان پشکنی، لێفەیان لەسەر کەسانی نوستوو هەڵدایەوە، بەلام هیچیان نەدۆزیەوە. کابرایەکی "موراد" ناویان گرت، بە تاوانی ئەوەی کە داوای کردووە ببێ بە هاوولاتیی سۆڤیەتی و کەوتنە دارکاریکردنی؛ دواتر ئازاد کرا، بەلام پێی نەگوترا لەبەرچی ئازار دراوە.

٢- ژاندارمەکان ڕۆژانی ٣، ١٤، ١٧ چوونەتە ناو گوندی ڕاگو (ڕیحان ئاباد) و سێ کەسیان بە تاوانی کوشتن گرتووە، دواتر موحاکەمەیان کردوون، دادگا هەرسێکیانی بە بێتاوان ناسیوە. بەلام لە زیندان ئازاد نەکراون، لەبەر ئەوەی بە پیاوخراپ و گومانلێکراویان ناسیون (ئەوانیش داوای هاوولاتیبوونی سۆڤیەتیان کردووە).

مەرزەبان ڕۆژی ٢٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ چاوی بە "ماکسیمۆڤ" کەوت و پێی گوت: بارودۆخی مەهابادو سەردەشت و ناوچەکانی تر ئەویان تەواو پەرێشان کردووە، چونکە هەواڵی پێگەیشتووە کە شێخ "لەتیف" کوڕی شێخ "مەحموود"، گوایە خۆی لە ئینگلیزەکان دەپارێزێو بەدوایدا دەگەڕێن، خۆی گەیاندووەتە سەردەشت و دەیەوێ لەوێ بمێنێتەوەو دەسەلاتی ئەم ناوچەیە

بگرێتە دەست. مەرزەبان گوتی: زانیاریی بەدەست گەیشتووە کە حەمەڕەشید خانی بانە دژی هاتنی شێخ لەتیفە بۆ سەردەشت و دەیەوێ دەری بکاتەوە بۆ عیراق. بەڵام ئێستا چەند سەرکردەیەکی کوردی سەردەشت لە خێڵی گەورك، لایەنگریی شێخ لەتیف دەکەن. بەم جۆرە دەشێ تێکهەڵچوونێکی گەورە لەم ناوچەیەدا ڕوو بدات.

مەرزەبان سەبارەت بە مەهاباد گوتی: گومانی لە قازی محەمەد هەیە کە خەریکی چالاکی و خۆڕێکخستنە بۆ ڕاگەیاندنی کوردستانێکی سەربەخۆ. بڕیار وایە یەکەمجار سەربەخۆیی مەهاباد ڕابگەیەنرێ، پاشان ئەم بزووتنەوەیە بە فەرمانی ئینگلیز لەلایەن شێخ لەتیف و کوردەکانی ترەوەو پشتیوانی لێ بکرێ. هەروەها گوتی: سەدری قازی (برای قازی محەمەد) بە هاوکاریی ئینگلیزەکان کراوە بە نوێنەری مەجلیس. لە "مەرزەبان"م پرسی: دەیەوێ لەم بارەیەوە چی بکات؟ لە وەڵامدا گوتی: بڕیاری هیچی نەداوە، بەڵام دەیەوێ بە وردی تاران لەو بارەوە ئاگادار بکاتەوە. بەڵام ترسی لەوە هەیە ڕاپۆرتەکەی دەست ئینگلیزەکان بکەوێ، داوا لە تاران دەکات دەوڵەت بۆ پێشگیریی ئاژاوەنانەوە سوپا ڕەوانەی (سەقزو مەهاباد) بکات. بەڵام ئەوی پێوەندیی بە قازی محەمەدەوە هەیە، ئەوەیە کە دەبێ ئەو لە مەهاباد لاببرێ. پرسیم: دەتەوێ بە چ شێوەیەك قازی محەمەد لە مەهاباد لاببرێ؟ گوتی: پێم وایە دەبێ دەستگیر بکرێ. قسەکەیم پێ بڕی‌و پرسیم: ئەم گرتنە نابێتە مایەی ڕاپەڕینی خەڵکی مەهاباد؟ مەرزەبان گوتی: ئەگەر سوپای ئێران لە مەهاباد بێ، گرتنی ئەو زۆر ئاسانە.

ڕێکەوتی ١ی تشرینی دووەم (نۆڤەمبەر)ی ١٩٤٣ جارێکی دیکە چاوم بە مەزرەبان کەوتەوە، گوتی: سەرۆکی بەشی ئیدارەی پۆست و ئەحواڵی مەهاباد لە ئیدارەی پۆلیسی مەهاباد کوژراوە، دەڵێن خزمێکی قازی محەمەد کوشتوویەتی. وا دیارە مەزرەبان پیلانێکی لەدژی قازی محەمەد بە دەستەوەیە، دەیەوێ خزمەکانی قازی محەمەدو کەسانی نزیکی لاببرێن. دەیگوت: لابردنی ئەوانە لەڕێی قەرەنی ئاغای مامەش یا عەلی ئاغا یا عەبدوڵڵا ئاغای مەنگوڕەوە جێبەجێ

دەکات. مەزرەبان لەڕێی قولی خانی بوزچانووەوە پێوەندیی بە قەرەنی ئاغاوە هەیە. دواتر مەزرەبان گوتی: هەڵس وکەوتی ئاسووریەکان لە هی کوردەکان و ئەوانی دیکە خراپترە، ئەوانە لە ساڵانی ١٩١٤-١٩١٨دا نزیکەی سەدوهەشتا هەزار موسڵمانیان لە کوردو ئازەری کوشتووە، تەنانەت بەزەیی‌یان بە ژن و منداڵیشدا نەهاتووەتەوە. بە قسەی مەزرەبان، "ئەبیل زیا"ی قەشەی گەورەی ئاسووریان گوتوویە: ڕقی ئاسووریەکان لە موسڵمانان لە خوێنیاندایەو نابڕێتەوە، گوتوویە: تا سوپای سوور لێرە بێ، ئێمە ئاوها دەجووڵێینەوە؛ کە سوپای سوور ڕۆیشت، ئێمەیش ئێران بەجێ دەهێڵین. پرسیم: بۆ کوێ دەچن؟ مەزرەبان گوتی: دەیانەوێ بەرەو عیراق بڕۆن، چونکە لەوێ ژمارەیان زۆرترە)). بێگومان ئابیل زیا هەرگیز قسەی وای نەکردووە. مەزرەبان، بۆ گرتنی دوو ئاسووری، داوای هاوکاریی لە ئێمە کرد. منیش پێم گوت: نابێ گەلێك بە کردەوەی چەند کەسێك تاوانبار بکرێ. داوام لێ کردو پێم گوت: دەتوانی بە هەڵس وکەوتی خۆی لەگەڵ ئاسووریەکاندا، دوژمنایەتیی نێوان ئەوان و موسڵمانەکان نەهێڵێ.

**وتوویژ لەگەڵ "دکتۆر مەرزەبان"ی**
**ئوستانداری ئوستانی چواردا**
**٩ی تشرینی دووەمی ١٩٤٣:**

دیسان باسی حسێنی ئەفشار کرا کە سەرلەنوێ بیکەنە نوێنەری ڕەزائیە لە مەجلیسی ئێران. مەرزەبان گوتی: زۆر جار حسێن بە زیانی دەوڵەت قسەی کردووە. بۆ نموونە، گوتوویە: دەبێ دەست بە لەناوبردنی فیزیکیی هەموو کوردەکان بکرێ. پێم گوت: ئەم قسانەت لەڕووی تووڕەبوونەوەیەو زۆر پێی لێ هەڵدەبڕی. هەروەها پێم گوت: ئەو بە هەڵەدا چووەو دەکرێ بڵێین مەبەستی ئاژاوەنانەوەیە لە ناوچەکەدا. لەبەر ئەوە لەناوبردنی فیزیکیی هەموو کوردەکان، خۆی لە خۆیدا شتێکی نەك تەنیا ڕاست نییە، بەڵکوو زیانباریشە)). دواتر مەرزەبان گوتی: حسێنی ئەفشار دوچاری نەخۆشی دەروونی بووە، لە ڕاستیدا

نابێ دەرفەتی پێ بدرێ بچێتە مەجلیس، دەبێ هەوڵ بدرێ حسێنی ئەفشار لە کاندیدکردن بخرێ.

**لە یاداشتی هاوڕێ "سیمیرنۆڤ" باڵوێزی سۆڤیەت**

١٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٤١:

... فرووغی سەرۆك وەزیرانی ئێران لە وتووێژدا لەگەڵ مندا پەرۆشیی دەوڵەتی ئێرانی سەبارەت بە ئاژاوەنانەوەو کۆبوونەوەی کوردەکان لە باشووری ڕەزائیە دەربڕی.

**نامەی هاوڕێ "چیفیلوڤ"ی کونسوڵی سۆڤیەت لە قەزوین**
**بۆ هاوڕێ "ماکسیمۆڤ. م. ئا"ی باڵوێزی سۆڤیەت لە ئێران**

١٢ی نیسانی ١٩٤٥:

... وا بلاوە بە نیازن خێڵە چەکدارەکانی کوردی قەزوین، لەکاتی پێویستدا دژ بە پارتی توودەی ئێران و سۆڤیەت بەکار بهێنن. بەقسەی توودەییەکان، "سەیید زیائەددین" ئەوانەی چەکدار کردووە، ئەم پیلانە بە سەرۆکایەتیی "عەباس وەند"ی بەڕێوەبەری شارەداریی برای ئەمیر ئەمجەدی غیاسوەند کە خۆیشی سەرکردەی خێڵە کوردەکانی قەزوێنە، جێبەجێ دەکرێ.

عەباس وەندی شارەداری قەزوێن هاتە لامان و بەرپەرچی ئەو درۆو دەلەسەیەی دایەوە. گەشتێکمان بە ناوچە کوردنشینەکانی شیرین سوی قەزویندا کرد، هیچ شتێکمان دەست نەکەوت ئەو دەنگوباسانە بسەلمێنێ. فەرماندەی هێزەکانی ئێمەش لە قەزوین هیچ بەڵگەیەکی بە دەستەوە نییە.

**وتووێژی "کوزنتسیف"ی کونسوڵی سۆڤیەت لە تەورێز**
**لەگەڵ "فەهیمی" ی ئوستانداری ئوستانی ٣دا**

٥ی تشرینی دووەمی ١٩٤١:

سەبارەت بە جموجوڵی کوردەکان پرسیارم کرد، فەهیمی گوتی: کوردەکان پاش کۆبوونەوەی شنۆو مەهاباد نیازی دامەزراندنی کوردستانی گەورەو ئازادیان هەیە؛ بۆ ئەم کارەیش هیوایان بە ڕووس و ئینگلیزەکانە. لەسەر هەڵبژاردنی سەرکردایەتیی کوردەکان پرسیارم کرد، گوتی: نازانێ بۆ ئەم مەبەستە چەند

کاندیدیان هەبوە، نموونەی عومەر ئاغای شکاك و قەرەنی ئاغای مامەش و ئەمیر ئەسعەدیان هەیە، بەلام بەهۆی دووبەرەکییەوە کۆمیتەی ڕێبەرایەتییان هەڵنەبژاردووە. سەبارەت بەو ناوانە پرسیم، فەهیمی گوتی: ئەمیر ئەسعەد مرۆڤێکی ڕۆشنبیرو تێگەیشتووەو قەرەنی ئاغای مامەشیش کەسێکی عاقڵ و لەوانی دیکە پاکترە. فەهیمی گوتی: قەرەنی ئاغا هەموو هەفتەیەك بە نامە بەوردی لە ڕووداوەکانی کوردستان ئاگادارم دەکاتەوە.

پرسیم بۆچی ئەمیر ئەسعەد لە پۆستی فەرمانداری مەهاباد لابراوەو پەیوەندیی بە "شابەختی"یەوە چۆن بووە؟ فەهیمی گوتی: شابەختی دەیویست حەمەڕەشید خان سەرکوت بکات. بۆ ئەم مەبەستە ئەمیر ئەسعەدی پێشنیار کرد ببێتە فەرمانداری مەهابادو بە هەموو جۆرێك پشتیوانیی لێ کرد، تا کرایە فەرمانداری مەهاباد. دوایی ئەمیر ئەسعەد کەوتە تالانکاری و قاچاخچێتیکردن، ئەوە بووە مایەی ئەوەی کە کوردەکانی تر دژی ڕابوەستن. بۆ نموونە، فەهیمی باسی ئەوەی کرد کە ئەمیر ئەسعەد شەکری لە نوێنەری بازرگانیی سۆڤیەت کڕیوە، لەم مامەڵەیەدا دووسەد هەزار ڕیاڵی قازانج کردووە، ڕۆژانەیش ٣٥٠٠-٤٠٠٠ ڕیاڵی بە قاچاخچێتی پەیدا کردووە.

ئەو هیوایەی شابەختی بەدی نەهات کە بتوانێ عەلی ئاغا (ئەمیر ئەسعەد) دژ بە حەمەڕەشید خان بەکاربێنێ، هەردوکیان پێکەوە ڕێك کەوتوون. فەهیمی گوتی: بۆ ئەوەی ئەمیر ئەسعەد دژی حەمەڕەشید خان بوەستێتەوە، پێشنیاری بە دەوڵەتی ئێران کردووە بیست تا سی تەن شەکر بداتە ئەمیر ئەسعەد، ئەوسا تەماع دەیگرێ و دژی حەمەڕەشید خان ڕادەوەستێ، شەڕ هەڵ دەگیرسێ و دەوڵەتیش کەڵك لەو بارودۆخە دەبینێ و دەتوانێ کێشەی کورد بە یەکجارەکی کۆتایی پێ بهێنێ. هەروەها وا پێویست دەکات هێندێکیان بە پارە دەمیان چەور بکرێ، هێندێکی تریان ڕەوانەی تاران بکرێن. پرسیم پێوەندیی نێوان کوردەکانی تورکیاو ئێران چۆنە؟ فەهیمی گوتی: کوردەکانی ئێران جگە لە پێوەندیی بنەماڵەیی هیچ پێوەندییەکی تریان بە کوردی تورکیاوە نییە. پێوەندیی سیاسی و ئابووریی نێوان ئێمەو تورکیا دە ساڵ بەر لە ئێستا لەلایەن ڕەزا شاو دەوڵەتی

تورکیاوه پچڕا. تورکەکان کوردیان خۆش ناوێ، شەش ساڵ لەمەوبەر کەوتنە سەرکوتکردنی کوردەکان و نزیکەی چل هەزاریان لێ کوشتن.

٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٢ چوومە لای "یۆرکارت"ی کونسوڵی ئینگلیز، سەبارەت بە هاتنی هۆزی پشدەر لە عیراقەوە بۆ سەردەشت، لێم پرسی: گوتی: دەبێ ئەوانە دەربکرێنەوە بۆ ئەودیوی سنوور، واتە عیراق. یۆرکارت گوتی، هەوڵ دەدا ئەوانە لەڕێی باڵوێزخانەی ئینگلیزەوە لە بەغدا، بگەڕێنێتەوە.

ڕۆژی ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٢ چوومە لای بەڕێز "کینکسهۆڵ"ی کۆنسوڵی ئەمریکا. ناوبراو گوتی: هەواڵی بڕواپێکراوی بەدەست گەیشتووە، کە کوردەکان ١٨ تەن گەنم و ٣٥٠ هەزار سەر مەڕوماڵاتیان بردووە بۆ تورکیاو عیراق. هەروەها گوتی، دەچمە تاران و لەگەڵ "دەریفوس"ی باڵوێزی ئەمریکادا لە ئێران لەم بارەوەو سەبارەت بە بارودۆخی ئازەربایجان قسە دەکەم.

### کونسوڵی سۆڤیەت لە تەورێز
### کوزیتسێڤ

کوزیتسێڤ، لە ڕاپۆرتی ساڵانەی خۆیدا سەبارەت بە "فەهیمی"ی ئوستانداری تەورێز نووسیویە: ناوبراو دژی ئێمەو هێزە دیموکراتەکان، خەڵکی وای لە پۆستەکانی دەوڵەتدا داناوە کە کۆنەپەرست و دژی سۆڤیەتن، لایەنگری ناردنی سوپای ئێرانن بۆ ناوچەکە؛ ژمارەیەکی زۆری لایەنگرانی سۆڤیەتی گرتووە: نرخی شتومەکی بردووەتە سەر، بەردەوام دوژمنایەتی و دووبەرەکی لەنێوان گەلانی ناوچەکەو هۆزەکاندا دەنێتەوەو هێندێ لە خانەکانی ناوچەکەی چەکدار کردووە.

**وتووێژی "کوزنتسێڤ"**
**لەگەڵ "موقەدەم"ی ئوستانداری تەورێزدا**

١٢ی شوباتی ١٩٤٣:

داوام کرد لە بارودۆخی کوردستان ئاگادارم بکاتەوە، پێم گوت: جووڵانەوەی نابەجێ لە ناوچەکانی سەردەشت و مەهاباد دەبینرێ. ئوستاندار گوتی: ٥-٦

ساڵ لەمەوبەر هۆزی پشدەر لە عیراقەوە بەزۆر هاتوونەتە ناوچەی سەردەشت، کاربەدەستانی ئێرانیان لەوێ دەرپەڕاندووە، مەبەستیان ئەوەیە دەسەڵاتی ناوچەکەیان بەدەستەوە بێ. ئێستا وای لێ هاتووە خۆیان حاکمی ناوچەکەن و هێشتاماڵیات بە دەوڵەت نادەن. دەوڵەتی ئێران هەوڵی زۆری داوە دەریان بکات لە ناوچەکە، بەلام بۆی نەچوەتە سەر. وەزیری جەنگی ئێران فەرمانی پێ دراوە بەو هێزانە کە لە تەورێزو ڕەزائیە هەمانە، ڕەوانە بکرێن بۆ ناوچەکە بۆ دەرکردنی ئەوانە، یا لەڕێی حەمەڕەشید خانەوە دەریان بکات. وەزیری جەنگی ئێران دەزانێ سوپای ئێران توانای شەڕکردنی کەمە، هەر لە یەکەم تێکهەڵچووندا دەشکێت. حەمەڕەشید خان هەشتسەد چەکداری هەیە، دەتوانێ چالاکییەکی وەها بنوێنێ، ئەوکاتە بەناوبانگ دەبێ و لە هەموو کوردستاندا ناو دەردەکات. گەرچی ترسی ئەوە هەیە تەواوی کوردەکان لە دەوری سمکۆ [مەبەست کوڕی سمایل ئاغای شکاکە] کۆببنەوە، دژی دەوڵەتی ئێران بوەستنەوە. حەمەڕەشید خان ماوەیەکی درێژ لە خزمەتی ئینگلیزەکاندا بووە، هاوکاریی کردوون و مانگانە ٥٠٠٠ پێنج هەزار تمەنیان داوەتێ سپاردنی ئەرکی دەرپەڕاندنی هۆزی پشدەر بە حەمەڕەشید خان، کارێکی نابەجێیە. لە "موقەدەم"م پرسی: ئەی چۆن ئەم کێشەیە چارەسەر دەکەن؟ گوتی: بە ئاشتیانە، ئەگەر سەری نەگرت، دەبێ پەنا بەرینە بەر ئەو هۆزانەی کە دوژمنایەتییان لەگەڵ هۆزی پشدەردا هەیە، بە یارمەتیی سوپای ئێران دەتوانین دەریان بکەین بۆ ئەو دیوی سنووری عیراق.

**وتووێژی "کوزنتیسف"**
**لەگەڵ "خەدیوی"ی فەرماندەی ژاندارمریدا**
شوباتی ١٩٤٣:

خەدیوی گوتی: سنورەکانی ئێران- تورکیا هێمنن، بەلام بە پێچەوانەوە سنوورەکانی ئێران- عیراق زۆر نائارامن. کوردەکان دووبارە چەکدار کراون. ئێستا ئەمیر ئەسعەد ٧٠٠ چەکداری هەیە، قەرەنی ئاغا ٤٠٠ و ڕەشید خان ٢٥٠٠ چەکدار. پشدەریەکان هەموو گەنمی کوردستانیان بردووەو بۆ عیراق، لە

عیراقیش شۆڕشی کوردەکان پەرەی سەندووە. ناوچە گرنگەکانی وەك سەقزو سەردەشت و خانێیان لەژێر دەستدایە. بەم جۆرە دەتوانن هەموو کوردستان کۆنترۆڵ بکەن. کابرایەکی ئینگلیزی "شیڤان" ناو پلاندارێژی ئەم ڕاپەڕینانەیە، لەڕێی کەسانێکی وەك سلێمان فەهیدو سالح ئاغای بابەکر پشدەرییەوە ئەم پیلانانە دەباتە بەردەستی ئینگلیزەکان لە بەغدا، نەخشەی کوردستانی سەربەخۆیان چاپ کردووە، کە ڕەزائیە و مەراغە و میاندواو و ماکۆیش دەگرێتەوە و لەو نەخشەیەدایە. وا بڵاوە کوردەکان دوای شەڕ سەربەخۆیی خۆیان بەدەست دەهێنن و مەهاباد پایتەختیان دەبێ.

**لە دەفتەری یاداشتەکانی**
**"ناشومۆڤ"ی کونسوڵی سۆڤیەتدا**
**١٣ی مارتی ١٩٤٥:**

١٤ی شوباتی ١٩٤٥ تێکهەڵچوونێك لەنێوان دوو ژاندارم و کوردەکانی ڕەشید بەگدا لە گوندی حاجی ڕووی دا، لە ئەنجامدا ژاندارمێك بریندار بوو و ئەوانی تر چەك کران. گوردانی پیادەی نیزامیی ٨ی ئێران کە ژمارەی دەگەیشتە ٥٠٠ کەس، لە ناوچەکەدا بووە. "سەرگورد مەعافی"ی فەرماندەی گوردان ویستوویە تەقە لە کوردەکان بکات، بەڵام کوردەکان زووتر لێی هاتوونە دەست و ناوبراویان کوشتووە. تەرمەکەی سەرگورد مەعافی ڕۆژی ١٥ی شوبات نێژرا و ٢٥٠٠ کەس بەشداری ناشتنەکەی بوون. کاربەدەستانی خۆجێیی ئێران ویستیان ئەم بۆنەیە بکەنە خۆپیشاندانێکی دژی کورد، بەڵام ئێمە نەمانهێشت. ئێمە، بۆ سەرخۆشیکردن، چووینە لای ئوستاندار. بەڵام ڕووداوەکە بارێکی تازەی بەخۆوە بینی، ڕۆژی ١٧ی شوبات ١٥ کەس لە کوردەکان چوونە پشت بەرەی سوپای ئێران لە گوندی ئیجی و بەرزاییەکانی کێوی یەهوودی لە بیست کیلومەتریی ڕەزائیە و گرتیان. ٦٠-٧٠ سەرباز، بۆ یارمەتیدانی سوپای ئێران، ڕەوانەی شوێنی ڕووداوەکە کران. کوردەکان لەسەر (پردی پیر موراد)یش تەقەیان لە ماشێنێکی خواردەمەنی کرد کە شەش سەربازی لەناودا بوو و ڕایان گرت، سەربازەکان بە ناچاری هەڵاتن.

"زەنگەنە"ی ئوستاندارو سەرگورد "کەمال"ی فەرماندەی ژاندارمری و فەرماندەی پۆلیس لە ترساندا هاتنە لامان و داوای یارمەتییان لێ کردین، داوایان کرد ڕێگەیان پێ بدەین تانك لەدژی کوردەکان بەکار بهێنین، گوتیان دووجار ویستوویانە لەگەڵ ڕەشید بەگدا بکەونە وتووێژەوە تا بە ئاشتیانە کۆتایی بە شەڕەکە بهێنرێ، بەڵام وەڵامی نەداونەتەوە. لە شاری ڕەزائیەیش تەقە کرا، بووە هۆی ترس و دڵەڕاوکێی خەڵك. ئێمە پێمان گوتن کاربەدەستانی خۆجێیی ئێران بەرپرسی ئەم تێکهەڵچوونانەن، نامانەوێ گوشار بخەینە سەر هەردوولا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە، پێویستە بەر بە خوێنرشتن بگیرێ. تانکەکان بە مەبەستی خۆپیشاندان و مانۆڕدان بۆ ترساندنی خەڵك، بەڕێ کەوتن، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو. پاشان کاربەدەستانی ئێران هەوڵیان دا بەم کردەوەیە نیشانی بدەن گوایە ئێمە ڕێگەمان بە تانکەکان داوە بکەونە ڕێ. بەڵام ئەویش سەری نەگرت.

من بۆ پێشگیری لە ئاڵۆزبوونی بارودۆخەکە کە لەوانە بوو هەموو کوردستان بگرێتەوە، ڕۆژی ١٨ی شوبات لەگەڵ ژەنەڕاڵ مایۆر هاوڕێ "سیمیرنۆڤ"دا چووینە گوندی (لوربالاجۆ) بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕەشید بەگدا بکەوینە وتووێژ. دوای چاوپێکەوتنی، ناوبراومان ئاگادار کردەوە کە نابێ ڕووداوی ئاوها لە ناوچەی مۆڵخواردنی سوپای ئێمە دووبارە ببێتەوە، داوامان لێ کرد بەزووترین کات دەستبەرداری شەڕکردن بێ. هەروەها نیازی دەوڵەتی ئێرانمان لەم بارەیەوە بەکورتی پێ ڕاگەیاند، بڕیار درا کۆتایی بە شەڕ بهێنرێ، ڕەشید بەگیش چەکدارەکانی خۆی لەوێ دوور بخاتەوە. هەر هەمان ڕۆژ ڕەشید بەگ بەڵێنەکەی خۆی جێبەجێ کرد. کاربەدەستانی ئێرانیش چەکدارەکانی خۆیان لە ناوچەکە دوور خستەوە، بەم جۆرە ناوچەکە هێمن بووەوە: کوڕی ڕەشید خان بەناوی "ئەمیر خان"ەوە لە گوندی لوربالاجۆ (١٥ کیلۆمەتری باکووری ڕۆژئاوای ڕەزائیە) دەژی، ١٥٠ چەکداری هەیە، کاربەدەستانی ئێرانی دەیانویست سەربازو ژاندارمیش بنێرن بۆ ئەوێ تا چەکیان بکەن و کوڕی ڕەشید بەگ بگرن. دەبێ بگوترێ ناردنی مەعافی بۆ ناوچەکە هەروا بە ڕێکەوت نەبوو، لەبەر ئەوەی برای مەعافی بەدەستی کوردەکان کوژرابوو، ئەویش ئەفسەرێکی سوپای ئێران بووە.

برای ڕەشید بەگ "سەعید خان بەگی هەرکی" بە دوو هەزار چەکدارەوە بۆ یارمەتیدان هاتە لای ڕەشید بەگ، ڕەشید بەگ گوتی: لە ١٤- ١٩ی شوباتدا ئێرانیەکان هیچ کوژراویان نەبوو، بەڵام سی کوردیان کوشت و گوێ و لووتیشیان بڕین.

ئەنساری سەرنووسەری ڕۆژنامەی "کەیهان" لە ١٨ی شوباتدا هاتە لامان، گوتی: چەکێکی زۆر لە شاری مەهاباد لەناو خەڵکدا دابەش کراوە، گوایە ئەم چەکانە لە عیراقەوە هێنراون. تەنیا بەڵگەی ئەو لەم بارەوە ئەوە بوو گوایە هەر ناوچە سنووریەکانی عیراق لەم چەکانەیان هەیە.

١- کومیسارۆف دانیل سیمینۆڤیچ کونسوڵی سۆڤیەت لە ورمێ (ڕەزائیە) لە ئابی ١٩٤٤- شوباتی ١٩٤٥دا. ماوەیەکی درێژیش فەرمانبەرێکی گەورە بووە لە باڵوێزخانەی سۆڤیەت لە تاران.

٢- ماکسیمۆڤ ئیپولیت ئەلکساندرۆڤیچ، کونسوڵی سۆڤیەت لە ورمێ (ڕەزائیە) لە مانگی ئایاری ١٩٤٢- دیکابری ١٩٤٣دا و لە کانوونی یەکەمی ١٩٤١- ئەیلوولی ١٩٤٢دا کونسوڵی سۆڤیەت بووە لە مەشەد.

٣- ماکسیمۆڤ میخائیل ئەلسەیوڤیچ باڵوێزی سۆڤیەت لە ئێران نێوان ساڵانی ١٩٤٤-١٩٤٦.

٤- کوزنیسۆڤ ئاندرەی ئەلکساندرۆڤیچ کونسوڵی سۆڤیەت لە تەورێز نێوان ئەیلوولی ١٩٤٢- شوباتی ١٩٤٤.

## کۆمەڵەی ژێکاف و سۆڤیەت

ژێکاف زۆری لەبارەوە نووسراوەو لەلایەن زۆر نووسەرەوە ناهەقیی پێ کراوە. ئەم بەڵگانەی ئێستا دەکەونە بەردەستی خوێنەران، تا ڕادەیەك وەڵامی ئەو بۆچوون و نووسینانە دەدەنەوە. بۆ وێنە، چالاکیی پارتی ژێکاف و هۆی لەناوچوونی، دەوری سۆڤیەت و گەلێك پرسیاری تر. مامۆستا جەمال نەبەز لە لێکۆڵینەوە بەنرخەکەیدا بەناوی ("گۆڤاری نیشتمان" زمانی حاڵی کۆمەڵەی ژێکاف، ستۆکهۆڵم، سوێد، ١٩٨٥)ەوە، سیمای کۆمەڵەی ژێکافی کێشاوە. لێرەدا مەبەست لێکۆڵینەوەی گشتی لەسەر ئەو پارتییە نییە، مرۆڤ تەنیا پاش بینینی ئەرشیڤەکانی ئێران و بریتانیاو تورکیاو وڵاتانی تر دەتوانێ دیمەنێکی ڕاستەقینەی ئەم پارتییە بخاتە ڕوو. وەك لە دیکۆمێنتەکاندا دەردەکەوێ، ژێکاف لە هەموو لایەکەوە بە دەستەمۆی سۆڤیەت و ئینگلیز و ئەڵمان تاوانبار دەکرێ، هەروەها ڕەنگ نەماوە کە بۆیاخی پێ نەکەن. لەلایەکی ترەوە، هیچ بەڵگەیەك بەدەستەوە نییە کە کۆمەڵە ناوی خۆی یا گۆڕیبێ یان هەڵوەشاندنەوەی خۆی ڕاگەیاندبێ.

خۆپیشاندان بۆ نەوت لە بەرژەوەندی سۆڤیەت، هەڵکردنی ئاڵای سوور لە ڕۆژی سەرکەوتن بەسەر فاشیزمدا، بەرزکردنەوەی وێنەی لێنین و ستالین لەلایەن

کوردانەوە، پرسکردن بە نوێنەرانی سۆڤیەت کە چی بکەن و چی نەکەن، داواکردن لە سۆڤیەت کە نوێنەرێکی خۆیان بۆ ڕێنوێنیکردن و یارمەتیدانی کۆمەڵەی ژێکاف بنێرن و... بەلای سۆڤێتیەکانەوە بەس نەبوون کە ژێکاف بیسەلمێنێ سەر بە هیچ لایەنێك نییە.

بانگکردنی کوردەکان بۆ باکۆ، ڕێکخستنی میتینگ و خۆپیشاندان و کۆکردنەوەی ئیمزاو ناردنی تێلگرام لەلایەن کوردەکانەوە بۆ دەوڵەت و مەجلیسی ئێران تا نەوت بدرێتە سۆڤیەت، هەنگاوی زەوتکارانەی فەرمانبەرانی سۆڤیەت لە کوردستان؛ ئەمانە نەك تەنیا دەسەڵاتدارانی ئێرانی دژی کوردەکان هارتر کرد، بەڵکوو ئەمریکاو ئینگلیزیش هەر بە یەکجاری کەوتنە دژایەتیی کورد.

سۆڤیەت هیچ بەرنامەیەکی بۆ کێشەی کورد نەبوەو یارمەتیی کوردیشی نەداوە، بەڵکوو بۆ لێدانی بزووتنەوەی کورد یارمەتیی دوژمنانیی داوە. پشتیوانیکردنی سۆڤیەت لە ئەتاتورك بەتایبەتی بۆ لێدانی شۆڕشی شێخ سەعیدو بزووتنەوەی کورد لە ڕۆژهەلات بە سەرۆکایەتیی سمکۆو پشتیوانیی ڕەزا شاو هەڵوەشاندنەوەی کۆماری کوردستانی سوور (لە سۆڤیەت لە ناوچەی لاچین ١٩٢٣- ١٩٢٩). هەروا وەڵام نەدانەوەی نامەکانی شێخ مەحموودو داواکاری و پەیوەندیی چەند جارەی کوردەکانی کوردستانی باکوور (تورکیا) و کۆماری کوردستان ١٩٤٦و ... هتد، بەڵگەی ئەو قسانەن. کاتێکیش لە ئابی ١٩٤١دا سوپای سوور هاتە کوردستانی ڕۆژهەلاتو ڕەزا شا لە دەسەلات کەوت و کوردەکان کەوتنە چالاکیی سیاسی، سۆڤێتیەکان نەك تەنیا پێکهێنانی ڕێکخراوێکی سیاسییان بۆ کوردەکان بە پێویست نەزانیوە، بەڵکوو ئەو پارتییەش (ژێکاف) کە کوردەکان پێکیان هێنابوو، بێهێز کراو لە ئەنجامدا لەناو برا (بەڵام پارتی تووده بە یارمەتی و پشتیوانیی هەمەلایەنەی سۆڤیەت پێك هات).

سەرکردەکانی ژێکاف بە دڵشادی ڕەسووڵی و زەبیحی و قاسمی قادری، کە بۆ چالاکی و ڕێکخستنی کاروباری کۆمەڵە سەریان لە ناوچەی ورمێ دا، ژاندارمەی ئێران لە نزیکی ورمێ دەستگیری کردن و گواستنیەوە بۆ تاران و خستنیە ناو زیندانی قەسری قەجەر. ئەگەر کاربەدەستانی بالادەستی ئەو دەمەی سۆڤێت لە

ناوچەکەدا دەستیشیان تێدا نەبووبێ، بێدەنگییان لەم کردەوەیەو هەوڵنەدانیان بۆ ئازادکردنیان، زۆر مانا دەگەیەنێ و زۆر پرسیاریش قوت دەکاتەوە ((ڕاستە کە گوتراوە: بێدەنگی، نیشانەی ڕەزامەندییە!)). ئەندامانی چالاکی ژێکاف، دوای گیرانی ئەوانە، دەستبەجێ فەرمانبەرانی سۆڤێتیان ئاگادار کردوەتەوە تا هەوڵی بەردانیان بدەن، چونکە ترسی کوشتن و بێسەروشوێنکردنیان لەئارادا بووە. هەشت مانگ بەسەر گرتنیاندا تێپەڕیوەو خەڵك مووچەخۆرانی دەوڵەتی ئێرانیان لە مەهاباد بە بارمتە گرتووەو داوای ئازادکردنی ئەو سێ کەسەیان کردووە، ئەمجا بەردراون. کاربەدەستانی سۆڤێت ئەو سەردەمە دەسەڵاتی تەواویان لە ناوچەکەدا هەبوەو کاربەدەستانی ئێران بەبێ پرسی ئەوان بچووکترین هەنگاویان نەناوە، تەنانەت هاتوچۆی ژاندارمەکان بۆ دەرەوەی شاری ورمێ، یا پێگەدانانیان، بەپێی پەیمانی مۆرکراوی نێوان کاربەدەستانی خۆجێیی ئێران و سۆڤێت و کورد، یاساغ کرابوو. ژاندارمە لە ترسی کورد بەبێ سەربازی ڕووس بەناو شاری ورمێدا نەدەگەڕان، دەیانگوت ئەگەر ڕووسمان لەگەڵدا بێ، کورد دەستمان بۆ نابات (هێندێ بەڵگەنامە لەم بارەیەوە هەیە، هیوامە بتوانم بیانخەمە بەرچاو).

هەروەك گوترا، سۆڤیەت هیچ هەڵوێستێکی پرنیسیپانە (مەبدەئی)ی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد نەبوو، تەنیا مەبەستی کەڵك وەرگرتن بوو لە کوردەکان بۆ بەرژەوەندەکانی خۆی، بۆ ئەوەی نەکەونە ئامێزی ئینگلیزو ئەمریکا، لەکاتی پێویستدا بۆ فشار خستنە سەر تورکیا یان ئێران (بۆ نموونە لە کێشەی نەوتی نێوان ئێران و سۆڤیەتدا) وەك کارتێك سوود لە کێشەی کورد وەربگرێ.

سۆڤیەت، ئەگەر بەرنامەی بۆ کێشەی کورد هەبوایە، یارمەتیی پارتی ژێکافی دەداو ڕێنوێنی و پشتیوانیی ماددی و مەعنەویی لێ دەکرد، بۆ بەهێزکردنی پێگەی سۆڤیەت لە بەشەکانی تری کوردستاندا، هاوکاریی ئەم پارتییەی دەکرد.

فەرمانبەرانی سۆڤیەت لە کوردستان، لەباتی ئەوەی ڕاستەوخۆ لەگەڵ پارتی ژێکافدا پەیوەندی بگرن، لەگەڵ سەرۆك هۆزو خێڵەکانی کورددا پەیوەندییان بەستبوو (گەرچی لە زۆر لاوە ژێکاف تاوانبار دەکرێ کە موڵکدارو سەرۆك خێڵ و پیاوی ئاینی سەرکردایەتیی دەکات، لە باری چینایەتییەوە ناتوانێ بەرژەوەندی گەلی

کورد بپارێزێ، کەچی لە زۆر لاوە لە ڕاپۆرتەکاندا باسی پیلانی دەرەبەگ و سەرۆك خێڵەکانی کورد دژی ژێکاف دەکرێ).

سۆڤێتیەکان لە کوردستان بەڵێنی هیچ هاوکارییەکیان بە ژێکاف نەدا، بەڵام بۆ وەرگرتنی دەنگوباس کەڵکیان لە چاوپێکەوتنی نوێنەرانی ژێکاف وەردەگرت؛ ئامادە نەبوون ئەم پارتییە بە ڕەسمی بناسن و وتووێژی لەگەڵدا بکەن. ئەوان هەوڵیان دەدا لە ئیش‌وکاری نهێنی و سەرکردایەتیی ژێکاف ئاگادار ببنەوە. سۆڤێتەکان کە دووجار هێندێ کوردیان بۆ باکۆ بانگ کرد، نوێنەرانی پارتی ژێکافیان (وەك نوێنەری سیاسی) لەگەڵدا نەبوو.

باڵوێزی سۆڤیەت "زانتسێف" لە عیراق، هەروا هێندێ فەرماندەی سوپایی سۆڤیەت لە کوردستانی ئێران، چەند جارێك ڕێبەرانی سۆڤیەت، بەتایبەتی باڵوێزی سۆڤیەت لە تاران، ئاگادار دەکەنەوە کە کوردەکان هیوایان بە ئینگلیز نەماوە، لەبەر ئەوەی چەند جارێك درۆی لەگەڵ کورداندا کردووە، ئێستاش لەگەڵ ڕژێمی عیراق دژی بزووتنەوەی کورد دەجوڵێنەوە، هیوای کوردەکان ئێستا بە ئێمەیە. کوردەکان بە ئاشکرا ئەم هەست و هیوایە لەگەڵ ئێمەدا دەردەبڕن. جگە لەوە، هێندێ لە بەڕێوەبەرانی کۆمەڵە وا خەڵکەکە تێدەگەیەنن کە پارتی ژێکاف بە ئاگاداری و پشتیوانیی سۆڤیەت دروست کراوە. لە لایەکی ترەوە، ئێران لە ڕێگای چاپەمەنیەکانەوە پارتی ژێکافی بە پارتی کۆمۆنیستی کوردستان ناو بردووە.

گومان لەوەدا نییە کە ژێکاف بە فشاری سۆڤێتیەکان لەناو چوو، لەبەر ئەوەی ئەوان پارتەکەیان بە دەستکردی ئینگلیزەکان دەزانی. مەبەست و دروشمی پارتی، کە سەربەخۆیی کوردستان بوو. لەگەڵ هەڵوێستی سۆڤیەتدا نەدەگونجا. دروشمی سەربەخۆیی بۆ کوردستان لە ڕوانگەی سۆڤیەتیەکانەوە، دروشمێکە لەلایەن ئیمپریالیزمەوە خراوەتە سەر زاری کوردان. کوردستان کە ببێتە دەوڵەت، دەبێتە پێگەیەکی ئیمپریالیزم دژی یەکێتیی سۆڤیەت.

سۆڤیەت نەیتوانی ژێکاف بگۆڕێ و بیکاتە پارتێکی ئێرانی، یان وشەیەکی ئێرانی پێوە بنێ و تاسەر هەروەك پارتێکی کوردی مایەوە. سۆڤیەت هەوڵی دەدا ژێکاف لەو دروشمانەی پاشگەز بکاتەوە، تا گومان و دوودڵیی وڵاتانی ئێران و

تورکیاو عیراق لەسەر خۆی لابەرێ. سۆڤیەت، هاوپەیمانەکان و ئێرانیشی دڵنیا کرد کە لەگەڵ جیاییخوازیی کورددا نییە، بەتایبەت کە سۆڤیەت بەتەمای نەوتی ئێران بوو. لەگەڵ ڕۆژئاواییەکانیشدا لە کێ بڕکێدا بوون، تا ئێران بخەنە ژێر دەستی خۆیانەوە؛ هەوڵیان دەدا پەیوەندیی ئابووری و سیاسی و سوپایی لەگەڵ ئێراندا پەرە پێ بدەن.

ژێکاف لە لایەکی ترەوە کەوتبوە بەر پەلاماری توودەییەکان و هەوڵی بێهێزکردن و تواندنەوەی دەدرا. بە لای پارتی توودەوە، ژێکاف پارتێکی جیاییخواز بوو، پەکپارچەیی و سەربەخۆیی ئێرانی دەخستە مەترسییەوە. ڕێبەرانی توودە پێیان وابوو مادام پارتی توودە دروست کراوەو پارتی تەواوی گەلانی ئێرانە، دروستبوونی پارتێکی کوردی کە دروشمی سەربەخۆیی کوردستانی هەڵگرتووە، پێویست نییە. سەرەڕای ئەوەی کە پارتی ژێکاف لە زۆربەی شارەکانی کوردستاندا ڕێکخراوی هەبوو، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە توودە هێشتا هیچ ڕێکخراوێکی لە کوردستاندا نەبوو. هەروا پارتی توودە لەسەر کێشەی نەتەوایەتی هیچ پرۆگرامێکی نەبوو (ئەمە وەڵامی هێندێ نووسەرە، بەتایبەتی نووسەرانی سۆڤیەتی، کە نووسیویانە ژێکاف بە هاوکاریی توودە دامەزراوە).

پارتی توودە زۆر هەوڵی دەدا ژێکاف لە ناویدا بتوێتەوە و هەڵبوەشێتەوە. توودەییەکان لای سۆڤیەتیەکان شکاتیان کرد کە ئەندامانی ژێکاف ڕێگەیان لە پارتی توودە گرتووە، یا ئەندامان و لایەنگرانی توودە بەزۆر لە پارتی ژێکاف ناونووس کراون. هەروا ژێکاف بە لایەنگیریی ئینگلیزو تەنانەت ئەڵمانیای فاشیش تاوانبار کرا. توودە نەیتوانی بە مەبەستی خۆی بگات. پاشان کە حیزبی دیموکراتی کوردستانیش دروست بوو، ویستیان بیکەنە هەرێمی ڕێکخراوی پارتی توودە، گەرچی بۆ ماوەیەك توانییان ئەم کارە بکەن، بەڵام لە ئەنجامدا بە ئاکام نەگەیشتن.

هەندێ نووسەر بە هەڵە دەنووسن ژێکاف بە یارمەتیی پارتی توودە دامەزرا. وەك باس کرا، پارتی ژێکاف لە کوردستان دامەزرابوو، بەپێی ڕاپۆرتی کونسولی سۆڤیەت لە ورمێ لە ١٩٤٤دا، مانگی سێپتامبەری ١٩٤٣ "ئەمیر خیزی و ئازاد وەتەن و ئاوانسیان" لەلایەن کۆمیتەی ناوەندیی توودەوە هاتنە ورمێ بۆ ڕێکخستنی پارتی

توودە. جگە لەوە، توودە هەر لە سەرەتادا چاوی بینینی ژێکافی نەبوە. لە یەکێك لە ڕاپۆرتەکاندا کە دەکەوێتە بەردەستتان، دەڵێ: چالاکیی ژێکاف زۆر ڕێگەی بۆ ڕێکخستنی شانەی پارتی توودە لە ناوچە کوردیەکاندا هەموار کرد، بۆیە پارتی توودە توانیی لەم دواییانەدا چەند شانەیەك لە باکوورو ڕۆژهەڵاتی ئێران ڕێك بخات.

ئەگەر پارتی ژێکاف دەستکردی ئینگلیز بووە، بۆچی لە ناوچەکانی تری ڕۆژهەڵاتی کوردستان (لە سەقز بەرەو سنە تا کرماشان و ... هتد)ی ژێر نفووزی ئینگلیز وەك ناوچەکانی کرماشان و سنە کە لەژێر نفووزی ئینگلیزدا بوون، ئەم پارتییە قەدەغە کرابوو.

نووسراوەکانی ژێکاف زیاتر لەسەر سۆڤیەت و شۆڕشی ئۆکتۆبەر بەگشتی لە بەرژەوەندی سۆڤیەتدا بوون. تەنانەت لە هێندێ جێ هێرشی کردوەتە سەر ئیمپریالیزم، واتە ئینگلیز، ڕەخنەی لێ گرتووە. چۆن پارتێکی سەر بە ئینگلیز خۆپیشاندان و میتینگ ڕێك دەخات کە نەوتی ئێران بدرێتە یەکێتیی سۆڤیەت؟! چۆن بە ئاشکراو بە ناوی گەلی کوردەوە ئیمزا کۆدەکاتەوەو داوا لە دەوڵەت و پەرلەمانی ئێران دەکات دەرهێنانی نەوتی باکووری ئێران بدرێتە یەکێتیی سۆڤیەت؟!

ئەگەر پەیوەندییەکی بچووکیش لەنێوان ژێکاف و ئینگلیزەکاندا هەبوایە، نەیاندەهێشت نە زەبیحی ماوەیەکی درێژ بخرێتە ناو زیندانەکانی ئێران و نە ئەم پارتییە ناو و پێڕەوو پرۆگرامی بگۆڕدرێن، یان لانی کەم دەیانکردە دوو بەشەوە. جگە لەوە، ئەو کاتەی کە پارتی ژێکاف پێك هات، ئینگلیزو سۆڤیەت لە یەك بەرەدا بوون دژی ئەڵمانیاو هاوکاری و پشتیوانیی گەلی کوردیش دژی فاشیزم و کۆنەپەرستی لە سیمای ژێکافدا خۆی دەنواند. ژێکاف هیچ کاتێك دژی سۆڤیەت ڕانەوەستاو ڕەخنەشی لێ نەگرت و سۆڤیەتی بە دۆستی گەلی کورد دادەنا. بەڵام ئەو هەستەی بەرامبەر نە بە ئینگلیز، نە بە ئەمریکا هەبوو.

سیاسەتی ئینگلیزو ئەمریکا وابووە کە پشتیوانی لە ئێران بکەن و دژی سەرهەڵدانی کوردان و مافە ڕەواکانی بوون؛ بە تایبەتی لە ئێران، وا تێگەیشتبوون کە سۆڤیەت هاندەری کوردەکانە، بە دەستپێشخەریی ئەو دەجووڵێنەوە. لەلایەکی ترەوە، بەشداریی هێزەکانی ئینگلیز لەگەڵ سوپای عیراقدا دژی بزووتنەوەی کورد بە

سەرۆکایەتیی مستەفا بارزانی، سەرئەنجام هەڵهاتنیان بۆ کوردستانی ڕۆژهەڵات و پەیوەندیی بارزانی لەگەڵ پارتی ژێکافدا، لەگەڵ بۆچوونەکانی فەرماندارانی سۆڤیەتدا کە "ژێکاف"یان بە سەر بە ئینگلیز دەزانی، جووت نەدەهاتنەوە.

ژێکاف، دەستپێشخەری دامەزراندنی کۆمارێکی کوردی و هەڵکردنی ئاڵای کوردستان و زیاتر لە سێ ساڵ ڕێبەرایەتیی بزووتنەوەی گەلی کوردی کرد. هەوڵی زۆری دا بۆ چارەسەری کێشەی کورد پشتیوانیی هاوپەیمانەکان دەستەبەر کات. سەرەڕای هەڵوێستی نالەباری ئینگلیزو ئەمریکا بەرامبەر بە کێشەی کورد، هیچ کام لە دەوڵەتانی ناوبراوی بە دوژمنی کورد لەقەڵەم نەداوە. پارتی ژێکاف نە ڕاست و نە چەپ بووەو ئامادە نەبوە خۆی بە هیچ هێزێکی گەورەوە ببەستێتەوە، بەڵکوو پارتێکی نەتەوایەتی بووەو بەرژەوەندی و ئازادیی کوردی ویستووە. دەتوانین بڵێین، پارتێکی کلاسیکیی کوردیی پێشکەوتوو بووەو لەو سەردەمەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا وێنەی کەم بووە. پارتی ژێکاف وەك بەرەیەك بووە، هەموو چین و توێژو بیروباوەڕێکی گرتبووە خۆ، لایەنگرانی سۆڤیەت و ئینگلیزو ئەمریکاو ئێران، هی سەربەخۆیی و خودموختاریشی تێدا بووە.

جگە لەوە، کۆمەڵەی ژێکاف وەك تاقە ڕێکخراوی سیاسیی ئەو دەمەی کوردستانی ڕۆژهەڵات، هێزێکی دیموکراسیخوازو دژی فاشیزم و کۆنەپەرستی و نوێنەری سیاسیی گەلێکی چەوساوە بوو. بۆچی دەبێ سۆڤێت دروشمی سەربەخۆیی بۆ کوردستان و مافی چارەی خۆنووسینی گەلی کورد کە ژێکاف هەڵی گرتبوو، بە کوردی ڕەوا نەبینی؟! لەکاتێکدا ژێکاف لە نووسین و بۆچوونەکانیدا سۆڤێتی بە ئاڵاهەڵگری ئینتەرناسیۆنالیزم و پشتیوانیی گەلانی چەوساوەو ژێردەست ناساندبوو. ڕێبەرانی ژێکاف ئاگاداری سیاسەتی ئینگلیزو ئەمریکا بوون کە بە ئاشکراو نهێنی پشتی ڕژێمی تارانیان ئەگرت.

سۆڤیەتیەکان لە زۆر ڕاپۆرتدا لەوە دوواون کە دەوری ئینگلیز دەستی وەرداوەتە ناو سەرکردایەتیی ژێکاف. ئەگەر وای دابنێین ڕاستە، خۆ کاربەدەستانی سۆڤیەت ئاوڕیان لە ژێکاف نەداوەتەوەو بەڵێنی هیچ هاوکاری و پشتیوانییەکیان نەداوەتێ، تا بەرەو لای ئینگلیز نەچێ. زۆربەی سەرکردەکانی ژێکاف دەرکیان بە هەڵوێستی

نالەباری سۆڤیەت کردووە. کەوابوو ئەگەر باسی ئینگلیز لە سەرکردایەتیی ژێکافدا کرابێ و خرابێتە بەر قسەو گفتوگۆو دووبەرەکیی لەسەر پەیدا بووبێ، ئەوە نابێتە پاکانە بۆ هەڵوێستی خراپی سۆڤیەت کە دەستی بە ڕووی ژێکافەوە ناوەو دەرگای هاوکاریی لێ داخستووەو دیارە لە ئەنجامدا بەرەو کوێ چووە. سەرباری ئەوە، ژێکاف نەکەوتە دژایەتی یا ڕەخنەگرتن لە سۆڤیەتو هەڵدان بە شانوباڵی ئینگلیزو ڕۆژاوادا. سۆڤیەت کە بە هیچ شێوەیەك متمانەی بە ژێکاف نەبوە، داوای هەڵوێستێکی دژی ئیمپریالیستانە (واتە ئینگلیزو ئەمریکای هاوپەیمانی دژی فاشیستیی سۆڤیەت)و لایەنگریی خۆیو ڕێبازی دەوڵەتەکەیی لێ کردووە. بەڵام ژێکاف ژیرانەو بەوپەڕی بەرپرسییەوە نەکەوتوەتە داوی سۆڤیەت.

هەڵوەشاندنەوە یان گۆڕینی ناوی پارتی ژێکاف، ناتوانین بڵێین لە ئەنجامی دووبەرەکی لەسەر لایەنگریی دۆستان یا دوژمنانی گەلی کورد، یا لەسەر خودموختاری یان سەربەخۆیی بووە. لێرەدا پرسیارێکی تر دێتە کایەوە، ئەویش ئەوەیە ئەگەر ژێکاف سەر بە ئینگلیز بووە، ئینگلیز بۆ هێشتی ئەم پارتییە وای بەسەر بێ و تا کۆتایی پشتیوانیی لێ نەکرد، یان ئەو بەشەی وەك پارتێك نەهێشتەوە کە لایەنگری خۆی بوو؟

لەلایەکی ترەوە، ئەگەر ئەم پارتییە سەر بە ئینگلیز بوایە، ئینگلیزەکان بەگوێرەی پێویستیی خۆیان ڕێڕەوو سیاسەتی ئەم پارتەیان دیاری دەکرد. سەیر ئەوەیە، نە ئێران و نە سۆڤیەت و نە پارتی توودە نەیانویستووە لە وتووێژو دیداردا لەگەڵ پارتی ژێکافدا دانیشن. باسی ئینگلیزو ئەمریکاش ناکرێ کە هەر خۆیان تێنەگەیاندووە، چونکە کۆمەڵەی ژێکاف لای ئەوانیش پارتێکی سەر بە سۆڤیەت بوو. تورکیاو عیراقیش دیارە کە دەبێ هەڵوێستیان چی بووبێ، چونکە کۆمەڵە خۆی بە خاوەنی کێشەی سەرانسەری کوردستان دەزانی. هەر بۆیە لە هەموو لایەکەوە هەوڵی لەناوچوونی دراوە.

سۆڤیەت هەر لەسەرەتاوە کاروباری کوردەکانی خستبوە دەستی باکۆو تەورێزو پارتی توودەوە، هەڵوێستی ئەوانی بەرامبەر بە کورد لا گرنگتر بوو، تا گوێ لە ژێکاف بگرێ. قازی محەمەدیش کە بانگ کرایە تاران، وەك شارداری مەهابادو

پیاوێکی ناسراوو ئاینی و کۆمەلایەتی بانگ کرا، نەك وەك سەرۆکی کۆمەڵە یان سەرۆکی بزووتنەوەی کورد. گەرچی ماوەیەکی یەکجار درێژ بوو کۆمەڵەی ژێکاف دامەزرابوو، قازی محەمەد پاشان هاتە ڕیزی کۆمەڵەوە، تا ئێستا دەمەش دەسەلاتدارانی ئێران لەگەڵ نە سەرۆکی ژێکاف "حوسێنی زەرگەری" و نە سکرتێری ژێکاف "عەبدولڕەحمانی زەبیحی"دا وتوویژیان نەکردووە.

زیاتر لە سێ ساڵ چالاکیی بێوچانی ژێکاف لەبەر زۆر هۆ: وەك هەلوێستی نالەباری سۆڤیەت و پشت بەستنی ئێران بە ئەمریکاو ئینگلیز، بە تەنیا مانەوەی ژێکاف، ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی سەرکردایەتیی ژێکاف بە باشیان زانی، بۆ نەهێشتنی بیانوو بە لەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی دژواری کورد و بۆ پێشگرتن لە دووبەرەکی لەناو ڕیزەکانی بزووتنەوەی کورددا، بەبێدەنگی پاشەکشە بکەن بۆ دروستبوونی پارتێکی نوێ، واتە حیزبی دیموکراتی کوردستان، کە لە ئەنجامی گوشارێکی دەرەکیدا پێك هات. بەلام مخابن هەلوێستێکی مرۆڤانەو دیموکراتیانە لەلایەن هیچ زلهێزێکەوە بۆ چارەسەر یا چاکەی کێشەی کورد نەبوە، بەتایبەت لە سۆڤیەتەوە کە بەڕواڵەت خۆی بە خاوەنی کێشەکە دەزانی و دەستی تێوەردابوو.

**وتوویژی "حەسەنۆڤ"ی سەرکونسولی سۆڤیەت لە ورمێ لەگەڵ ڕێبەری یەکێك لە هۆزەکانی کورددا:**

٩ی ئەیلوولی ١٩٤٤ کوڕی یەکێك لەسەرۆك هۆزەکانی کورد (هۆزی دێبوکری) بەناوی قاسمی ئێلخانی زادەوە هاتە لام، ڕایگەیاند: لە مەهاباد ڕێکخراوێکی نهێنیی کوردییان پێك هێناوە، ئەوو زەبیحی و عەلی ڕیحانی و مەناف کەریمی و ... هتد ئەندامانی سەرکردایەتیی ئەم ڕێکخراون. ئەم ڕێکخراوە گۆڤارێکی تایبەتی خۆی هەیەو ئۆرگانی ناوەندیی ئەم پارتەیە، تائێستا چەند ژمارەیان لێ بلاو کردۆتەوە. ناوبراو گوتی: هەولدانی دەسەلاتدارانی ئێران بۆ دۆزینەوەو ناساندنی ئەم ڕێکخراوە، هەروەها دۆزینەوەی تیپۆگرافیەکەمان، تائێستا بێئەنجام بووە. مەبەستی ڕێکخراوی ئێمە گەیشتن بە سەربەخۆیی و ئازادیی کوردستانە. ئێلخانی زادە گوتی: ئێمەش دەمانەوێ قوتابخانەو چاپەمەنیمان بە زمانی خۆمان و بەڕێوەبەرێتیی

کوردی‌و... مان هه‌بێ. به‌ڵام ئێمه به‌بێ یارمه‌تیی ده‌ره‌وه، زه‌حمه‌ته بگه‌ینه مه‌به‌ستی خۆمان. کورده‌کان له‌و باوه‌ڕه‌دان که دۆستی گه‌لانی بچووك، له‌وانه‌ش گه‌لی کورد، یه‌کێتیی سۆڤیه‌ته. له‌به‌ر ئه‌وه ئێمه ئازادیی گه‌لی کوردمان به ده‌ستی یه‌کێتیی سۆڤیه‌ت ده‌وێ. بۆیه ئێمه داوا له کونسوڵی سۆڤیه‌ت ده‌که‌ین داواکاریه‌کانمان بگه‌یه‌نێنته ده‌وڵه‌تی یه‌کێتیی سۆڤیه‌ت، ده‌مانه‌وێ سۆڤیه‌ت کوردان له‌ژێر باڵی خۆی بگرێ و بۆ ئازادیی کوردستان یارمه‌تیمان بدات.

منیش له وه‌ڵامدا گوتم: ئێستا یه‌کێتیی سۆڤیه‌ت له‌شه‌ڕدایه‌و ده‌رفه‌تی لێکۆڵینه‌وه‌ی ئه‌م پرسیارانه‌ی نییه. ئێلخانی زاده گوتی، له‌م باره‌وه تێده‌گات، به‌ڵام له‌به‌ر ئه‌وه‌ی شه‌ڕ خه‌ریکه کۆتایی پێ دێت و به‌م زووانه وتووێژی ئاشتیانه ده‌ست پێده‌کات، داخوازیی ئه‌وه‌یه ده‌وڵه‌تی یه‌کێتیی سۆڤیه‌ت له دامه‌زراندن و مه‌به‌ستی ئه‌م ڕێکخراوه ئاگادار بکاته‌وه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی گه‌لی کورد هیوای به یه‌کێتیی سۆڤیه‌ت هه‌یه. منیش گوتم داواکاریه‌که‌ی ئه‌و ده‌گه‌یه‌نمه ده‌وڵه‌تی خۆمان.

له وه‌ڵامی پرسیاری مندا که ئایا ئه‌و ڕێکخراوه‌ی ئێوه به‌رنامه‌ی هه‌یه؟ ئێلخانی زاده گوتی: به‌ڵێ و به‌ڵێنی پێ دام نوسخه‌یه‌کی به‌رنامه‌که‌مان بۆ بێنێ. ١٣ی ئه‌یلول بۆ دووه‌م جار ئێلخانی زاده ئه‌مجاره‌یان له‌گه‌ڵ "عه‌بدولره‌حمان زه‌بیحی"دا هاته‌وه لام. نوسخه‌یه‌کی له پرۆگرامی پارتیه‌که‌ی خۆیان به زمانی کوردی بۆ هێنام (وه‌رگێڕاوه ڕووسیه‌که‌ی پێشکه‌ش ده‌کرێ). زه‌بیحی گوته‌کانی ئێلخانی زاده‌ی دووپات کرده‌وه‌و گوتی: ئه‌م ڕێکخراوه نزیکه‌ی دوو ساڵه پێك هاتووه‌و ناوی پارتی ژێکافه‌و به مانای (پارتی ژیانه‌وه‌ی کوردستان)ه.

زۆربه‌ی ئه‌ندامانی ئه‌م پارتییه لاوانی پێشکه‌وتووخوازی کوردستانن و نزیکه‌ی هه‌زارو دووسه‌د ئه‌ندامی هه‌یه. ژێکاف به ته‌واوی ڕێکخراوێکی نهێنییه‌و تائێستا شه‌ش ژماره‌ی له گۆڤاری "نیشتمان" ده‌رکردووه. زه‌بیحی پێنج ژماره‌ی له‌م گۆڤاره پێ دام. "نیشتمان" له ته‌واوی کوردستاندا بڵاو ده‌بێته‌وه. به‌ڵام ئینگلیزه‌کان بڵاوکردنه‌وه‌ی ئه‌م گۆڤاره‌یان له عیراق قه‌ده‌غه کردووه. هه‌روه‌ها زه‌بیحی گوتی: ئه‌م ڕێکخراوه زۆرتر له کوردستانی ناوه‌ندی چالاکی ده‌کات، ئه‌گه‌ر ئێمه دژ نه‌بین،

دەیانەوێ نوێنەری خۆیان بنێرن بۆ عیراق و باکووری کوردستان بۆ پێکهێنان و ڕێکخستنی ئەم پارتییە.

منیش لە وەڵامدا گوتم: ئێوە بۆ خۆتان ئەم پارتیەتان دروست کردووە، دەبێ خۆتان بەرپرسی ئیش‌وکاری خۆتان بن. زەبیحی گوتی: دەیانەوێ بە دەستووری ئێمە ئیش‌وکار بکەن، لەبەر ئەوەیە داوا لە ئێمە دەکات لە بەڕێوەبردنیاندا دەست بە ڕوویانەوە نەنێین. منیش لە وەڵامدا گوتم: ئەم پارتییە ناناسم، دەبێ لەپێشدا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەم. پاشان زەبیحی ڕایگەیاند کوردەکانی عیراق و ئینگلیز لە سلێمانی ڕۆژنامەی کوردی دەردەکەن و بەبێ پارەو بە خۆڕایی لەناو خەڵکدا بڵاوی دەکەنەوە. لەم دواییەدا دەوڵەتی عیراق بڵاوکردنەوەی ئەم ڕۆژنامەیەی [مەبەست گۆڤاری "دەنگی گێتی‌ی تازە"یە- هەورامی] بە پۆست لەلایەن کوردەکانەوە یاساغ کردووە. بەڵام ئەو ڕۆژنامەیە. کە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە دەردەچێ، بە پۆست دەگاتە کوردستان. ئینگلیزەکان زانیاری لەو ڕۆژنامەیەدا لەسەر ڕووداوەکانی شەڕو سەرکەوتنەکانی خۆیان لە بەرەکانی شەڕدا بڵاو دەکەنەوە. هەروەها دەنووسن ئینگلیز دۆستی هەرە نزیکی گەلانی بچووکەو هەمیشە یارمەتیی ئەو گەلانەی داوەو دەدات کە بۆ سەربەخۆیی خۆیان تێ‌دەکۆشن. زەبیحی بەڵێنی دا، بە داوای من، دانەیەك لە ژمارەکانی ئەو ڕۆژنامەیە کە ئینگلیزەکان بە زمانی کوردی دەری دەکەن، بگەیەنێتە دەستمان[1].

حەسەنۆڤ

سەرکونسوڵی یەکێتیی سۆڤیەت لە تەورێز

**لە ڕاپۆرتی "ماکسیمۆڤ. م"ی**
**باڵویزی سۆڤیەت لە ئێران**
١٩٤٤/١١/١٣:

بەپێی ڕاپۆرتی هاوڕێ حەسەنۆڤ کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ قاسمی ئێلخانی زادەدا سەبارەت بە پارتی ژێکاف هەبوە، وا دەردەکەوێ ئەم پارتییە تا هاتنی سوپای سۆڤیەت بۆ ئێران لەدایك بووە [دیارە مەبەست حیزبی ئازادیخوازی کوردستانە-

---

[1] ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی ڕووسیای فیدڕاڵ، ف٠٩٤، ئو٣٠، د٦٥، پ٣٤٨، ل١٤٩.

هـەورامی]. چـالاکترین ئەنـدامانی بـریتین لـە ئێلخـانی زادەو زەبیحـی و وەهـابی بلووریان. پارتی ناوبراو پارتێکی ناسیۆنالیستەو گۆڤاری "نیشتمان" ئۆرگانی ئەم پارتیەیە کە بە نهێنی لە تەورێز دەردەچێ.

دەبێ هەڵوێستی ئێمە بەرامبەر بەم پارتە ئەوە بێ کە بە وردی لێکۆڵینـەوەی لەسـەر بکـەین، هـەروەها ڕێبـەرەکان و ئەندامـە چـالاکەکانی بناسـین و دەسـت لـە ئیش‌وکاری ڕێبەرایەتی و ئاڵوگۆڕکردنیان وەرنەدەین. لە ڕاپۆرتی داهاتوودا زیاتر لەسەر ئەم پارتە ئاگادارمان بکەنەوە[1].

**وتووێژی "حەسەنۆڤ"ی سەرکونسوڵی سۆڤیەت لە تەورێز**
**لەگەڵ ئەندامانی کۆمیتەی کوردیی ژێکافدا**
ڕێکەوتی ٢٦ی شوباتی ١٩٤٤:

زەبیحـی، ئەنـدامی کۆمیتـەی ژێکـاف، ڕایگەیانـد: کۆمیتـە کـارێکی زۆری لـەناو کوردەکاندا کردووەو بە دەرکردنی بەیاننامەیەکی تایبەتی بە زمانی کوردی سەبارەت بە ئیمتیـازی نـەوتی ئێـران بۆ سۆڤیەت ڕەخنـەی لـە هەڵوێـستی دەوڵـەتی "سـاعید" گرتووە؛ لەلایەن (٩) ملیۆن کوردەوە داواکارە ئیمتیازی نەوتی باکووری ئێران بدرێتـە سۆڤیەت. ئەم بەیاننامەیە لە ناوچەکانی کوردستانی ناوەندیدا بڵاو کراوەتەوە. لـە مـەهاباد کاریکاتێرێکی هیتلـەرو ساعیدیان کێـشاوەو لـە شـەقامی سـەرەکیدا هـەڵیان واسـیوە. کاریکاتۆرەکـە وا کێـشراوە کـە هیتلـەرو بـە تەلـەفۆن دەسـتوور بـە سـاعیدی سـەرۆك وەزیرانـی ئێـران دەدات ئیمتیـازی نـەوتی ئێـران نەدرێتـە یـەکێتیی سۆڤیەت. پـارتی ژێکـاف تـەلگرامێکی بـە ئیمـزای (٢١٣) نەفـەر لـە پیاوماقووڵ و ناسـراوەکانی کـورد نـاردبوو بـۆ مەجلیـسی ئێـران و ڕۆژنامـەکانی تـاران، داوای کـردووە ئیمتیـازی نەوتی ئێران بدرێتە یەکێتیی سۆڤیەت؛ بۆ ئەم مەبەستە کۆبوونەوەیان لە زۆر گوندو ناوچـەی کوردنـشین پێـك هێنـاوە. هـەروەها ڕێکـەوتی ١٠ی شـوباتی ئـەم مانگـە

---

[1] هەمان سەرچاوە، ف٠٩٤، ئو٣٠، د٦٦، پ٣٤٨، ل٥٦.

کۆبوونەوەیەکی سێ هەزار نەفەری لە شاری مەهاباد لەلایەن ژێکافەوە پێك هێنرا. لاوێکی کوردی ئەندامی ژێکاف بە ناوی محەمەدەوە ڕووی لە بەشدارانی کۆبوونەوەکە کردو وتی:

((برایانی خۆشەویست و ئاغایانی بەڕێز

بەبۆنەی بەشداریکردنتانەوە لەم میتینگەدا سوپاستان دەکەم. کە ئێوە دەبینم، خۆم بە بەختەوەر دەزانم. گەلی کورد کێشەی زۆری لەپێشە و دەبێ ئێمە باسیان بکەین. بەڵام ئیمڕۆ من تەنیا لەسەر یەکێك لەو کێشانە دەدوێم. ئیمڕۆ کێشەیەکی گەورە بەرامبەر بە گەلی کورد ڕاوەستاوە، دەمەوێ بۆ ئێوەی ڕوون بکەمەوە، ئەویش کێشەی نەوتە. هەروەك دەزانن لەم دواییانەدا دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەت داوای دەرهێنانی نەوتی باکووری ئێرانی لە دەوڵەتی ئێران کردووە، بەڵام دەوڵەتی ساعید ئەم پێشنیارەی ڕەت کردوەتەوەو چارەسەرکردنی ئەم پرسیارەی هێشتوەتەوە بۆ دوای شەڕ. دەوڵەتی ساعید بڕیارێکی بەپەلەو هەڵنەسەنگێندراوی داوە. لەبەر ئەوەی دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەت لە ماوەی ٢٦ ساڵدا چاکەیەکی زۆری بەرامبەر بە گەلی ئێران کردووە، وەك دەزانن سێ ملیۆن کوردیش لەم خێرو بەرەکەتەدا بەشدار بوون. ماوەی ئەم سێ ساڵەی دواییش دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەت هێندە چاکەی بەرامبەر بە گەلی کورد کردووە کە هیچ کوردێکی نیشتیمانپەروەر ناتوانێ فەرامۆشی بکات. کێ لە ئێوە ئەوەی لەبیر دەچێتەوە کە کوردەکان لە ماوەی دەسەڵاتداریێتیی ڕەزا شادا لەژێر باری چ چەوساندنەوەیەکدا بوون؟ هیچ مافێك بە کورد نەدراو ڕێزی هیچ کوردێکی ناوداریان نەدەگرت و ئازاریان دەدان. دوای هاتنی سوپای سۆڤیەت بۆ ئێران، کۆتایی بە کوێرەوەری و هەژاریی گەلی کورد هات.

ماوەی دەسەڵاتداریێتیی ساعید ناحەقییەکی زۆر بەرامبەر بە کورد کراوە. شاری بانەو گوندەکانی دەوروبەری سووتێنران. براکانمان بەبێ خانوو وماڵ مانەوەو ناچار کران هەڵوەدای شاخەکان بن. ئەمە سەرەتای هەڵوێستی ساعید بوو بەرامبەر بە گەلی کورد، ئێمە نابێ ئەمە لەبیر بکەین. ئێستاش ساعید بە نەدانی ئیمتیازی نەوتی ئێران بە سۆڤیەت، دەیەوێ قەیرانی ئابووری لە وڵات دروست بکات. بەم

چەشنە دەکرێ بڵێین خراپتربوونی بارودۆخی ئابووریی گەلی ئێران، بەتایبەتی سێ ملیۆن کوردی ئێرانی بەدواوە دەبێ.

دەوڵەتی ئێران دەترسێ ئیمتیازی نەوت بداتە دەوڵەتی سۆڤیەت، لەبەر ئەوەی دەزانێ دوای شەڕ دۆستایەتیی نێوان گەلی ئێران و سۆڤیەت زیاتر بەهێز دەبێ، ئاستی کولتووریی ئێران گەشەی پێ دەدرێ و ئەوکاتە داوای مافی خۆیان دەکەن. وەك ئاشکرایە دوای هاتنی سوپای سوور بۆ ئێران و دوای بەستنی پەیمانی نێوان ئێران و سۆڤیەت و ئینگلیز، دەوڵەتی ئێران نایەوێ دانیشتوانی ئێران تێکەڵیی لەگەڵ سوپای سۆڤیەتدا هەبێ. گەلی کورد، بەتایبەتی لەناو گەلی ئێراندا، چیتر دەسەلاتداریێتیی ساعید قەبووڵ ناکات و نایەوێ ئەو سەرۆکی دەوڵەتی ئێران بێ و پەیوەندیی ئێران و یەکێتیی سۆڤیەت تێك بچێ.

گەلی کورد باش دەزانێ ئەگەر ئیمتیازی نەوت بدرێتە یەکێتیی سۆڤیەت، کوردی هەژار دەتوانێ لەوێ کار بکاو زانیاری و شارەزایی بۆ خۆی وەدەست بهێنێ و لە باری کولتوورییەوە بەرەو پێش بچێ. کوردەکان باش دەزانن کە یەکێتیی سۆڤیەت دۆستی هەرە نزیکی گەلانی بچووکەو یارمەتییان دەدات بۆ گەیشتن بە مافی خۆیان. لەبەر ئەمە ئێمە بە ئەرکی خۆمانی دەزانین بە هەموو تواناو ڕێگایەك لەم بارەوە یارمەتی و هەوڵ بدەین تا دەوری یەکێتیی سۆڤیەت لە ئێراندا زیاتر بەهێز بکرێ، چونکە بەهێزبوونی یەکێتیی سۆڤیەت لە بەرژەوەندی ئێمەدایە.

بژی کوردو کوردستان

نەمان بۆ ساعیدو ساعیدیەکان))

دوای ئەو قسانە، بڕیارنامەیەك لەلایەن بەشدارانەوە پەسند کرا. سەبارەت بە هاتنی فەهیمی بۆ کوردستان، زەبیحی ڕایگەیاند فەهیمی چۆتە بانەو حەمامیان و میاندواو، ١٤ی کانوونی دووهەم هاتە مەهاباد. فەهیمی لە سەقز چاوی بە "قولی کەسایی" ئەفسەری ئێرانی کەوتووە. قولی کەسایی پێشتر لە مەهاباد خزمەتی کردووەو گوایە بە "فەهیمی"ی گوتووە ڕۆیشتنی بۆ مەهاباد مەترسیی تێدایە، لەبەر ئەوەی ڕووسەکان کوردەکانیان فێر کردووە ناخۆشیی بۆ دروست بکەن. کاتێك

فەهیمی هاتە مەهاباد، سەرنجی کاروبارو جوولانەوەی ڕووسەکانی لە کوردستان دەدا، فەهیمی لە مەهاباد چاوی بە هەموو سەرۆك هۆزەکانی کورد کەوتووەو پێی گوتوون دەوڵەتی ئێران دەسەلاتی پێداوە وتوویژیان لەگەڵدا بکاتو پێویستیەکانیان (داخوازیەکانیان) بزانێ، هەروەها داواکاریەکانی دەوڵەتی ئێرانیان پێ ڕابگەیەنێ، بۆ ئەوەی گەلی کوردیش لەگەڵ گەلانی تری ئێراندا پێکەوە بۆ سەربەخۆیی و پاراستنی ئێران هەوڵ بدەن.

پاشان فەهیمی ڕایگەیاندووە لەوانەیە دوای گەڕانەوەی بۆ تاران، بۆ ئەم مەبەستە کۆمیسیۆنێکی تر لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە بێتە کوردستان. لە وەلامدا سەرکردە کوردەکان ڕایانگەیاندووە ئەوانە خزمەتیان کردووەو ئامادەی خزمەتکردنیشن بە دەوڵەتی ئێران.

سەرکردەکانی کورد داوایان لە فەهیمی کردووە دەوڵەتی ئێران نرخی تووتن بەرزبکاتەوە، نرخی شەکرو چا بۆ هۆزەکان کەم بکاتەوە، لەباتی ئەوەی کە ئەوانە ئارامی لە کوردستاندا دەپارێزن، پارەیان پێ بدات. فەهیمی بەڵێنی پێ داون ئەم پرسیارە لە تاران چارەسەر بکات. کۆمیتەی ژێکاف نامەیەکی داوە بە فەهیمی، داوای مافی نەتەوایەتیی کوردەکانی بەم چەشنەی خوارەوە تێدا کردووە:

((دوای بیست ساڵ دیکتاتۆری، واتە پاش ئابی ١٩٤١، دەوڵەتی ئێران بە دنیای ڕاگەیاند کە لە ئێران کۆتایی بە دیکتاتۆری هاتووەو دیموکراتی لە ئێراندا جێگیر بووە. ئەم ڕاگەیاندنە بۆ سێ ملیۆن کەسی گەلی کورد لە ئێران زۆر هەواڵێکی شادی بوو. گەلی کورد وا تێگەیشت لە ئێراندا کۆتایی بە درۆو دەلەسەو چەوساندنەوەو پیلانگێڕان هاتووەو کوردەکان ئێستا دەتوانن کەڵك لەو ئازادییە وەربگرن.

وەك لە ڕۆژنامەکانی تاراندا دەردەکەوێ، ئەم هەموو بەڵێنانە درۆ بوون، نەك تەنیا کوردەکان، بەڵکوو گەلانی ئێرانیش بە ئازادیو دیموکراتی نەگەیشتن. بە بۆنەی هاتنی ئێوە، بە کەڵك وەرگرتن لە سەفەرەکەتان بۆ کوردستان، داواتان لێ دەکەین ئەم داخوازیانەی کوردەکان بگەیەنن بە مەجلیسی ئێران:

١- زمانی کوردی لە کوردستاندا ببێتە زمانی ڕەسمی.

٢- فێرکردن لە قوتابخانەکاندا، هەروەها نووسین لە دامودەزگاکانی دەوڵەتدا لە کوردستان، بە زمانی کوردی بێ.

٣- بەلای کەمەوە لە شەوو ڕۆژێکدا دوو سەعات بەرنامەی ڕادیۆی تاران بە کوردی بڵاو بێتەوە.

٤- لەسەر دوو پرسیار (داواکاری)ی یەکەم، دەبێ مەجلیسی ئێران بڕیاریان لەسەر بدات. ئەم داواکاریانە تەنیا تایبەتن بە کاتی شەڕ. دوای دووهەمین جەنگی جیهانی، دەبێ کێشەی کورد بخرێتە بەردەست. ئێمە هیوادارین کێشەی کورد لە کۆنفرانسێکی ئاشتیدا چارەسەر بکرێ.

دوو ئەفسەری ئێرانی بەناوی تولابی و ئیلاهی‌یەوە لەگەڵ "فەهیمی"دا هاتبوون بۆ مەهاباد، لە ماڵی قازی محەمەد جیاجیا چاوپێکەوتن و وتووێژیان لەگەڵ کوردەکاندا کردووە. هەروەها فەهیمی بە کوردەکانی گوتووە: دەوڵەتی ئێران وەك دانیشتوانی تری ئێران سەیری کوردەکان دەکات، دەبێ کوردەکان هەموو داواکاریەکانی دەوڵەتی ئێران جێبەجێ بکەن. فەهیمی لەگەڵ ئەفسەرانی ناوبراودا چوەتە گوندی قوم قەڵاو سەردانی ماڵی کەریم ئاغای کردووە. لەوێش فەهیمی وتووێژی لەگەڵ سەرکردەکانی کورددا کردووە. فەهیمی، یاسای بنەڕەتی (قانون اساسی)ی یەکێتیی سۆڤیەتی لای کوردێك دیوە، لەلایەن پارتی ژێکافەوە بڵاو کراوەتەوە. فەهیمیش گوتوویە لە ماددەی یەکەمی یاسای بنەڕەتی یەکێتیی سۆڤیەتدا نووسراوە: دەسەڵات لە یەکێتیی سۆڤیەتدا بە دەستی کرێکارو جووتیارەوەیە. ڕووی لە دانیشتوان کردووەو گوتوویە: تەماشا ئەم دەوڵەتە بەرژەوەندی کێ دەپارێزێ، ئێوە دەتوانن چی لەم دەوڵەتە بکەن؟

زەبیحی گوتی: شتێکی سروشتییە فەهیمی بەپێی یاسای خۆی قسە دەکات. لەبەر ئەوە، بەپێی یاسای سۆڤیەتی، سەرۆك هۆزو چەوسێنەرەکان ناتوانن هیچ بکەن. ئەگەر بتوانن ئەوانە ژێکاف لەناو دەبەن.

لە کۆتاییدا زەبیحی گوتی: بۆ بڵاوکردنەوەو پەرەپێدانی ئیش‌وکاری کۆمەڵە بۆ دەرکردنی نامیلکەو گۆڤار، پێویستیی بە تیپۆگرافێکی دەستی هەیە. داوای لە ئێمە

کرد کە ئایا ناتوانین هاوکاریی بکەین و تیپۆگرافیکی ئەوتۆی لە ڕێگای نوێنەری بازرگانییەوە پێ بفرۆشین. منیش گوتم بەداخەوە ئێستا ئێمە توانای جێبەجێکردنی ئەم داواکاریەمان نییە[1].

حەسەنۆڤ

سەرکونسوڵی یەکێتیی سۆڤیەت لە تەورێز

**ڕاپۆرتی "کۆمیسارۆڤ"ی کونسوڵی سۆڤیەت لە ڕەزائیە**

**لە ١٩٤٤دا:**

ڕێکخراوی هەرە جیددی کە بانگەوازی سەربەخۆیی کوردستان دەکات، کۆمەڵەی ژێکافە. گەرچی بەداخەوە ئێمە زانیاریمان لەسەر ئەم ڕێکخراوە کەمە، بۆیە ئەمەی کە باس دەکرێ پێشەکییە.

ڕێکخراوو شانەکانی ئەم پارتە لە زۆربەی شارو ناوچەکانی کوردستاندا هەن. هەروا ڕێکخراوی ئەم پارتە لە تاران و تەورێزیش هەیە. "نیشتمان" ئۆرگانی ئەم کۆمەڵەیە کە بە نهێنی لە تەورێز دەردەچێ و تائێستا شەش ژمارەی لێ دەرچووە. لە "نیشتمان"دا وتاری نیشتیمانپەروەری دەنووسرێ، کە داوای یەکگرتنی کوردان بۆ ئازادی و سەربەخۆیی و پێشکەوتن دەکات. هەروەها وتار لەسەر مێژووی شۆڕشی ئۆکتۆبەر دەنووسرێ و وێنەی لینین و ستالین و قارەمانەکانی کوردی سۆڤیەت، کە لە دووەم جەنگی جیهانیدا دژی داگیرکەرانی ئەڵمان بەشدارییان کردووە، لە لاپەڕەکانی "نیشتمان"دا خۆیان دەنوێنن.

ژێکاف ڕێکخراوی لاوانی پێك هێناوە. ئەندامانی ڕێبەرایەتیی کۆمەڵەی ژێکاف بریتین لە قازی محەمەد، مەحموودیان، ئیبراهیمیان، میرزا عەلی ڕیحانی، سوڵتانیان و ... . کۆمەڵە دژی ڕاووڕوتە، هەوڵ دەدات بایەخێکی سیاسی بداتە بزووتنەوەی کورد. ئەم ڕێکخراوە بە هەموو توانای خۆیەوە دەیەوێ پشتیوانی و هاوکاریی ئێمە بۆ خۆی بەدەست بهێنێ. دەکرێ بڵێین: زۆربەی سەرکردەکانی کورد کە باسی

---

[1] هەمان سەرچاوە، ف٠٩٤، ئو٣٠، د٦٦، پ٣٤٨، ل١٢٤-١٣٦.

((سەربەخۆیی کوردستان دەکەن))، دەڵێن ئەم سەربەخۆییە تەنیا بە یارمەتیی یەکێتیی سۆڤیەت بەدەست دێت، بۆ ئەم کارەیش ئەوان ئامادەی هەموو چەشنە هاوکارییەکن لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا و دەڵێن دەبێ تەنیا چاوەڕێی کۆیلایەتیی کوردان لە سیاسەتی کۆلۆنیانەی ئینگلیز بکرێت. بەلام ئەم وتانە پێدەچێ مەبەستێکی گلاویان بەدواوە بێ. کوردەکان بە قازانجیانە ئێستا بە ئاشتی لەگەڵ ئێمەدا بژین. ئەوان دەیانەوێ خۆیان لەپشت ئێمەوە بشارنەوە. بەلام سەرکردە گەورەکانی کورد هیچ کاتێك بە دڵسۆزییەوە لەگەڵ ئێمەدا نابن، تاسەر هاوکارییان لەگەڵ ئێمەدا نامێنێ. سەرکردەکانی کورد، لەسەر کێشە سەرەکیەکان (پرنسیپەکان) و قۆناغە گرنگەکانی ساتە چارەنووسسازەکان، زیاتر کەینوبەینیان لەگەڵ ئینگلیزەکانەو سەربەخۆیی کوردستان لای ئەوان بە مانای بەشنەکردنی ئەو سامانەیە کە لە چەوساندنەوەدا پێك هاتووە. هەروەها دەیانەوێ ئەم سامانەش بپارێزن و کەمتر بیر لە بەرژەوەندەکانی گەلی کورد دەکەنەوە. بە قازانجی ئینگلیزەکانیشە کوردەکان بە دروشمی سەربەخۆیی کوردستانەوە خۆیان بە ئێمەوە ببەستن و بەم چەشنە گومان لەسەر خۆیان لابدەن. بەم شێوەیە، ئەوان لەوە بە باشتری دەزانن کە خۆیان بشارنەوە. لەلایەکی ترەوە دەیانەوێ ئێرانییەکان بەم چەشنە دژی ئێمە هان بدەن. ئەم پرسیارە جێی سەرنجەو پێویستە لێکۆڵینەوەیەکی قووڵی لەسەر بکرێ[1].

**ڕاپۆرتی "کۆمیساڕۆڤ"ی بەڕێوەبەری سەرکونسوڵی سۆڤیەت لە ورمێ لە سەفەرێکیدا بۆ مەهاباد**

**٢٨-٣٠ی کانوونی دووهەمی ١٩٤٤:**

پاش گەڕان بەناو شاردا، چاوپێکەوتنم لەگەڵ "ئاغای مستەفا سوڵتانیان"دا هەبوو. ئەو شەست ساڵ تەمەنیەتی و وەك نوێنەری شوورای شار خۆی بە من ناساند. ناوبراو بازرگانەو یەکێك لە ئەندامانی سەرکردایەتیی کۆمەڵەیە کە بۆ سەربەخۆیی کوردستان خەبات دەکات. لە وتووێژ لەگەڵ ناوبراودا "سوڵتانیان" گوتی: کۆمیتەی کۆمەڵە لە دە نەفەر پێك هاتووە، بە تەمەنترینیان ئیبراهیمی

---

[1] هەمان سەرچاوە، ف٠٩٤، ئو٢٩، د١٩٦، پ٣٢٢، ل١٧، ١٨.

ئیبراهیمیانەو جێگری میرزا عەلی ڕیحانی‌یە. میرزا ڕەحمانی زەبیحی دیاری کراوە بۆ پەیوەندی گرتن لەگەڵ تەورێزدا. عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەدو قەرەنی ئاغای مامەش لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئێراندا دژی کۆمەڵەن و هەوڵی لەناوبردنی دەدەن. بۆیە کۆمەڵە بە نهێنی ئیش‌وکاری خۆی بەڕێوە دەبات.

ڕێکخراوی کۆمەڵە لە زۆر شاری ئێراندا (سەقز، سەردەشت، سنە، نەغەدە، شنۆ، ڕەزائیە، تاران و ...) هەن. کۆمەڵە لە عیراقیشدا هەیە. ڕێکخراوی لاوانی کورد دامەزراوە کە ناوەندەکەی لە مەهابادە. کۆمەڵە گۆڤار (ئۆرگان)ی خۆی هەیە کە ناوی "نیشتمان" و لە تەورێز دەردەچێ، کەس جێگەی دەرچوونی نازانێ و تائێستا شەش ژمارەی لێ دەرچووە. سەبارەت بە قازی محەمەد، گوتی: سیاسەتێکی دیاری نەکراوی گرتوەتە بەر، یارمەتیی کۆمەڵەی ژێکاف دەدات و لە هەمان کاتیشدا هاوکاری لەگەڵ ئێرانیەکاندا دەکات، بۆ ڕاکێشانی کوردەکان بەلای دەوڵەتی ئێراندا. ئازاردان و ڕاوەدوونانی ئەندامانی کۆمەڵە لە ئەستۆی هۆشمەندی ئەفشارە کە لە هەموویان چالاکترە. ژەنەڕاڵ هووشمەندی ئەفشار فەرماندەی لەشکری ٤ی ئێران، هەوڵ دەدات بە هیچ شێوەیەك نەهێڵێ مەهاباد سەر بە سنە بێ و کوردەکان ناچار دەکات لەگەڵ بیروڕای ئەودا بن، بە پێچەوانەوە ژێکاف دەیەوێ مەهاباد سەر بە سنە بێ. هووشمەندی ئەفشار لەسەردەشت ڕەحمانی غەنی پوور و ٢٠ کوردی تری بە تاوانی بەشداریکردن لە ڕێکخراوی کۆمەڵەدا دەستگیر کردووەو سامانیانی زەوت کردووە.

ڕیحانی لایەنگری دانی ئیمتیازی نەوتی ئێرانە بە یەکێتیی سۆڤیەت و باسی ڕێکخستنی میتینگ لە مەهابادو دەرکردنی بەیاننامەی کوردەکانی لەم بارەیەوە کرد کە پشتیوانییان لە سۆڤیەت کردووە.

ئەمیر ئەسعەد ئامادە نەبوە ئەو تەلگرامە ئیمزا بکات کە کوردەکان بۆ دەوڵەتی ئێرانیان ناردووەو ڕەخنەیان لێ گرتووە، پشتیوانیی لە دەوڵەتی ئێران کردووە. ئیبراهیمیان لەکاتی هاتنی فەهیمی‌دا چاوی پێکەوتووەو وتووێژی لەگەڵدا کردووە. لەم ڕووەوە گوتی فەهیمی پرسیاری زۆری لەسەر بزووتنەوەی کوردو سەربەخۆیی کوردستان هەبوە. بەڵام ئیبراهیمیان لەم بارەوە شتێکی بە فەهیمی نەگوتووە.

بە چاوخشاندنێکی خێرا بە مەهاباددا، بەو ئەنجامە دەگەی کە ئەم ناوچەیە بایەخێکی زۆری هەیە. بێهوودە نییە کە ئینگلیزەکان و ئێرانیەکان بایەخی زۆری پێدەدەن. ئێمە زۆر کەم هاتوچۆی ئەو ناوچەیە دەکەین و فەرمانبەری پێویستمان بۆ ئەو مەبەستە تەرخان نەکردووە. ئێمە نەك تەنیا ناتوانین دەورێکمان لەوێ هەبێ، بەڵکوو ناشتوانین ئاگاداری ڕووداوەکانی ئەوێ بین [1].

کۆمیسارۆڤ

**یاداشتی سەفەری "ماتڤیێڤ"ی کونسوڵی سۆڤیەت**
**بۆ مەهاباد لە ١١ و ١٢ی کانوونی دووەمی ١٩٤٥دا:**

سەعات ١١ی بەیانی گەیشتینە مەهاباد، کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی سۆڤیەتی لێ نییە. کە چووینە لای ئاغای "سەریعول کەلام"ی فەرمانداری مەهاباد، وتی: قازی محەمەد لێرە نییەو چووە بۆ تاران و دروستکردنی کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی سۆڤیەت بەبێ ئیجازەی قازی محەمەد زەحمەتە. ناوبراو گوتی: لەلایەکی تریشەوە من هیچ فەرمانێکم لەلایەن کاربەدەستانی سەرەوە لەم بارەیەوە پێ نەگەیشتووە.

لەسەر داخوازیی بازرگانێکی کورد چووینە ماڵی محەمەد ئەمین، ناوبراو خۆی بە نزیکی ئێمە دەزانێ. بە ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازیی لێ کردین. محەمەد ئەمین زۆر شارەزای پارتی ژێکافەو هەڵوێستی ئێمەی پرسی کە ئایا بایەخی ئەوەی هەیە بچێتە ڕیزی ژێکافەوە. ئێمەش لە وەڵامدا گوتمان ئەو لە ئێمە باشتر شارەزای ئەم پارتەیە. جا لەبەر ئەوە دەبێ خۆی بڕیار لەسەر ئەم مەسەلەیە بدات. بۆ ئێوارەکەی، ئەم نوێنەرانەی ژێکاف هاتنە لامان:

١- ئیبراهیم ئیبراهیمیان (بازرگان)
٢- مستەفا سوڵتانیان (بازرگان)
٣- عەلی ڕیحانی (بازرگان)
٤- ئەحمەد پەناهی (بازرگان)

---

[1] هەمان سەرچاوە، ف٠٩٤، ئو٣١، د٧٠، پ٣٥٤، ل١٢، ١٣.

٥- محەمەد دڵشاد لە هەموویان گەنجترە (کوڕە بازرگان)
٦- خەلیل خوسرەوی (بازرگان)
٧- قازی قاسمی (...)

ناوبراوان ڕایانگەیاند پارتی ژێکاف لەم دواییانەدا زۆر پەرەی سەندووە. ئێستا نوێنەرانی هەموو خێڵ و هۆزەکانی کورد خەریکن دێنە ڕیزی ژێکافەوە. سەرۆکەکانی کورد دژی ژێکاف دەجووڵێنەوە، دەیانەوێ گەلی کورد هەر لەژێر دەستی خۆیان ڕاگرن و بیچەوسێننەوە، بۆیە زۆربەی دانیشتوانی کورد لایەنگری لە ژێکاف دەکەن.

ناوبراوان لە چاوپێکەوتنەکەدا داوای ئەم شتانەیان لێ کردین:

١- لە ڕێگەی ڕۆژنامەکانەوە ئاگادار کراونەتەوە کە کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی سۆڤیەت و ئێران لە شارەکانی تر دامەزراون، زۆر حەز دەکەن ئەم ناوەندە لە مەهابادیش بکرێتەوە.

٢- بۆ پەرەپێدانی پروپاگەندەو ئیش وکاری ژێکاف لەناو دانیشتوانی کورددا، پێویستیان بە دەرکردنی گۆڤارو ڕۆژنامەی کوردی هەیە، بەڵام توانایان نییە. لەبەر ئەوە داوا لە ئێمە دەکەن یارمەتییان بدەین بۆ بەدەستهێنانی تیپۆگرافی.

٣- داوای ڕێکخستن و کردنەوەی بەرنامەی ڕادیۆیی بە زاراوەی مەهابادی، واتە ئەو زاراوەیەی کە کوردەکانی عیراقیش تێی بگەن و ئەم بەرنامە ڕادیۆیی‌یە لە مۆسکۆ بڵاو بکرێتەوە.

٤- یارمەتییان بدرێ بۆ ڕزگاربوونی گەلی کورد لە چەوساندنەوەی سێ دەوڵەتی ئێران و عیراق و تورکیا، هەروەها یەکگرتنیان لە دەوڵەتێکدا.

لەسەر پرسیاری ئێمە سەبارەت بە نوێنەرایەتیی ڕێکخراوی پەیوەندیەکانی کولتووری، ناوبراوان گوتیان گونجاوترین و باشترین مرۆڤ بۆ ئەم کارە قازی محەمەدە کە ئێستا لە تارانە. ئێمە پێڕەوی کۆمەڵەی پەیوەندیی کولتووری و هێندێ چاپەمەنی و ئەدەبیاتمان پێ دان و ئامادەمان کردن بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵەی پەیوەندی تا گەڕانەوەی قازی محەمەد. سەبارەت بە بڵاوکردنەوەی پرۆگرامی ڕادیۆیی، پێمان گوتن هەوڵ دەدەین لەم بارەیەوە یارمەتیتان بدەین، بەڵام بۆ تیپۆگرافیا پێمان گوتن زەحمەتە. سەبارەت بە ڕزگاربوونی کوردەکان، ئێمە وەڵاممان دایەوە کە وەختی هێنانەکایەی ئەم پرسیارە نییە، ئێمە ناتوانین هیچ بەڵێنێك لەم

بارەیـەوە بـدەین. ئـەوان دەبـێ پـێش هـەموو شتێك هـەوڵ بـدەن بـە زووتـرین کـات کۆمەڵەی پەیوەندی ڕێك بخەن و پەیوەندیی پێویست لە ڕێگەی ئەوەوە بەڕێوە بچێ.

ئێمـە بـەیانی سـەعات ١٢ بـۆ جـاری دووەم چـووینە لای "سـەریعول کـەلام"ی فەرمانداری مەهاباد؛ ناوبراو گوتی من پێڕەوی کۆمەڵەی پەیوەندیی سۆڤیەتم لەگەڵ ئێرانـدا خوێندوەتـەوە، بـەڵام بەداخـەوە تـا وەرگرتنـی فـەرمان لـە ڕەزائیـەوە بـۆ ڕێکخستنی ئـەم ڕێکخـراوە، نـاتوانێ ئـەم کـارە بکـات. ئێمـەش بـەڵێنمان پـێ دا لـەم بارەیـەوە وتوویـژ لەگـەڵ ئوسـتانداری ئوسـتانی چـواردا بکـەین. پاشـان چـووین سەردانی بازاڕی مەهابادمان کرد[1].

**ڕاپۆرتی "شەریپۆڤ"ی بەرپرسی**
**کۆمەڵەی پەیوەندیی کولتووریی سۆڤیەت**
**لەگەڵ ئازەربایجانی ئێراندا:**

ئەوڕەحمانی زەبیحی و قاسمی ئێلخانیزادە ڕێکەوتی ٢ی شوباتی ١٩٤٥ هاتنە لام، داوایـان لـێ کـردم ئیجازەیـان بـدرێتێ ڕێکخـراوی پەیوەنـدیی کولتـووری لەگـەڵ سۆڤیەتدا لە کوردستان دروست بکەن و سەربەخۆیش بێ. کاتێك ئەم مەسەلەیەم بۆ جەنابی ئەوڕەحمانی زەبیحی ڕوون کردەوەو پێم گوت ئێمە ناتوانین پێشنیاری ئەوتۆ قبووڵ بکەین، زەبیحی گوتی: ئەگەر ئێمە لقێکی ئەم ڕێکخراوە پێك بهێنین و ناوی لێ بنێین ڕێکخراوی پەیوەندیە کولتووریەکان لەگەڵ سۆڤیەتدا. لە وەڵامی پرسیاری مندا کە بۆچی ئەوانە نایانەوێ ناوی لێ بنێین (کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی کولتووریی ئێران لەگەڵ سۆڤیەتدا)، زەبیحی گوتی: ئێرانیەکان ئێمەیان خۆش ناوێ و ڕێزمان لێ ناگرن و بە چاوێکی خراپ و سووکەوە سەیرمان دەکەن، لەبەر ئەوە ئێمە حەز ناکەین ناوی بەشی پەیوەندیە کولتووریەکانی سۆڤیەت و ئێرانی پێوە بێ، بەڵکوو باشترە ناوی (بەشی یان لقی کۆمەڵەی پەیوەندیە کولتووریەکانی سۆڤیەت) بێ.

من جارێکی تر هەوڵم دا بۆ "زەبیحی"ی ڕوون بکەمەوە کە بۆچی ئێمە پێشنیار دەکەین ناوی پەیوەندیەکانی کولتووریی ئێران لەگەڵ سۆڤیەتدای پێوە بێ، ئەویش

---

[1] هەمان سەرچاوە، ف٠٩٤، ئو٣٠، د٦٥، پ٣٤٨، ل٢١، ٢٢.

ئەوەیە کە ئێران دەوڵەتێکی دۆستەو نابێ نکوولی لەمە بکرێ، بە پێچەوانەوە ئەو پەیوەندیە کولتووریانەی کە دروستیان دەکەین چەندیان پێ بچێ، دەبێ بەهێزتر بن.

بەکارهێنانی وشەی (ئێرانی) هەموو جارێك هەم زەبیحی و هەم ئێلخانی زادەی قەڵس و تووڕە دەکرد. گوتی ((ئەگەر ولاتێکی وەك سۆڤیەت، کە سوپاکەی شکست بە لەشکری ئەڵمان دەهێنێ، لە ئێران بترسێ، دانیشتوانی بەدبەختی کورد، کە زۆر زەحمەتە لە سەدا پێنجی خوێندەوارو ڕۆشنبیری تێدا بێ، دەبێ چی بکات؟ زەبیحی گوتی: ئێمە چارەڕەشترین گەلین، هیچ کەس یارمەتیمان نادات. منیش گوتم بۆچی وا دەڵێی، جەنابی زەبیحی؟ ئایا سوپای سووری ئازای ئێمە کەم قازانجی بۆ گەلی کورد هێناوە، کە ژمارەیەك لە هۆزەکانی کوردی گەڕاندەوە بۆ سەر جێوڕێی خۆیان؟ زەبیحی گوتی زۆر ڕاست دەڵێی و کەس ناتوانێ نکوولی لەوە بکات، بەلام بۆچی بەم دواییانە یارمەتیمان نادەن؟ منیش پرسیارم کرد: وەك چی؟ ئەویش گوتی: بۆ وێنە، ئێمە چووینە لای هاوڕێ حەسەنۆڤ و داوای تیپۆگرافیمان لێ کرد کە زۆر پێویستمانە، بەلام تائێستا هیچی نەکردووە. ئاخر ئێمە بە خۆڕایی نامانەوێ، تەنانەت ئامادەین نرخەکەیشی بە زێڕ بدەین و بەڵێنتان پێ دەدەین کەس لەم بارەوە ئاگادار نابێ. پرسیارم کرد: تیپۆگرافیتان بۆ چییە؟ لە وەلامدا گوتی: بۆ ئەوەیە گۆڤارو ڕۆژنامەو ئەدەبیاتی تری پێ چاپ بکەین، لەناو دانیشتوانی کورددا بلاویان بکەینەوە. ئەگەر بێتو تیپۆگرافیمان پێ بدەن، لە جێگایەکی وای دادەنێین باڵداریش بەسەریدا نەفڕێ.

منیش بەڵێنم پێدان وتووێژی هاوڕێ حەسەنۆڤ و زەبیحی سەبارەت بە تیپۆگرافی، ڕوون بکەمەوە چۆن بووە. لە وەلامی پرسیاری مندا کە کێیان بۆ سەرۆکی کۆمەڵەی پەیوەندیە کولتووریەکان لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا دیاری کردووە، زەبیحی گوتی: برای گەورە جەنابی قاسمی ئێلخانیزادە. بەڕێز ئێلخانیزادە مرۆڤێکی زۆر ڕۆشنبیرو خوێندەوارەو زمانی عەرەبی و فارسی و کوردیش دەزانێ و خوێندەواریی لە مەدرەسەی کۆنی کوردی وەرگرتووە. ئەمجار ڕووم لە بەڕێز ئێلخانیزادە کردو لێم پرسی: ئایا ئامادەیە ببێتە سەرۆکی لقی کۆمەڵەی پەیوەندیە کولتوریەکانی سۆڤیەت لەگەڵ ئێراندا لە مەهاباد؟ لە وەلامدا گوتی: ئامادەیە ببێتە سەرۆکی بەشی کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی کولتووریی سۆڤیەت لە مەهاباد.

منیش گوتم داوات لێ دەکەم بەو چەشنەی کە من ناوی دەبەم ناوی بهێنی. لە کۆتایی چاوپێکەوتنەکەدا بەڕێز زەبیحی و ئیلخانیزادە داوای ئەدەبیاتیان بە زمانی ئازەری و کوردی لێ کردم و دەیانەوێ ئاگاداری ژیانی کوردەکانی سۆڤیەت بن.

منیش بەڵێنم پێ دان لەڕێگەی (ئەنجومەنی سەرتاسەریی پەیوەندیی ڕۆشنبیریی سۆڤیەت)ـەوە ئەوپەڕی هەوڵی خۆم بدەم بۆ ئەم مەبەستە.

شەریپۆڤ

تەورێز

١٩٤٥/٢/٦

ژمارە ٦٨

**لە یاداشتەکانی ئاشومۆڤ ١٨ی مارتی ١٩٤٥:**

کاتی گەڕانەوەم لە تەورێزەوە بۆ ورمێ، لە ڕێگە چاوم بە عومەر خانی شکاك کەوت. عومەر خان دەڵێ خەریکی یەکخستنی کوردەکانەو دەیەوێ هێندێ سەرۆك هۆزی کورد کە دژایەتییان پێکەوە هەیە، ئاشت بکاتەوە، بۆ ئەم مەبەستەیش دیسان گەشتێك بۆ ناوچەکانی باکوور دەکات. عومەر، ستایشی یەکێتیی سۆڤیەتی کردو گوتی گوێی لە هەموو ئیزگەکانی ڕادیۆی جیهان بووەو لە هێزو گەورەیی گەلانی سۆڤیەت تێ نەگەیشتووەو هیوای خۆی دەربڕی کە یەکێتیی سۆڤیەت لە خەباتیاندا بۆ سەربەخۆیی یارمەتییان بدات.

٢٧ی مارتی ١٩٤٥ چاوم بە شێخ عەبدوڵڵا پیاوی ناوبانگی کورد کەوت، گوتی ئەرکی سەر شانی سەرکردە کوردەکان و ناسراوەکانی کورد ئێستا بەدیهێنانی سەربەخۆیی کوردستانە؛ بۆ ئەم مەبەستەیش هەوڵدانێکی زۆر بۆ یەکگرتنی گەلی کورد لە دەوروبەری پارتی ژێکاف بەڕێوە دەچێ. ئێستا زۆربەی کوردەکان ئەندامی پارتی ژێکافن. هەروەها کارێکی زۆر بۆ یەکگرتنی کوردەکانی عیراق و ئێران و تورکیا دەکرێ. بە دەستووری ژێکاف (لە عیراق) چەند کەس لە ڕێگەی سووریاوە بۆ ڕێکخستن و چالاککردنی کوردەکانی تورکیا نێردراون بۆ تورکیا. بەڵام ئەوانە لەلایەن

کاربەدەستانی تورکیاوە گیراون و تائێستا هیچ هەواڵێکیان نەزانراوە. شێخ، گوایە ناوەکانیان نازانێ، لە سەرکردەکانی بزووتنەوەی کورد لە عیراق، ناوی "مەجید بەگ" وەزیری کشتوکاڵی عیراق و ئەمین زەکی کە پرۆفیسۆری زانستی مێژووە، برد؛ هەروەها ناوی میرزا ئیبراهیم حاجی قادر و حەسەن ئاغای کوڕی مەحموود ئاغا لە هۆزی دێبوکری کە ئێستا لە تەورێز دادەنیشێ. ناوی "زەبیحی"شی برد، کە پەیوەندیی لەگەڵ کونسولی سۆڤیەتدا هەیە. ئەو ناوی ئەوانی تر نازانێ، چونکە ڕێبەرایەتیی پارتی ژێکاف نهێنییە.

لەبارەی قازی محەمەدەوە، شێخ عەبدوڵڵا گوتی بە گەڕانەوەی لە تاران چالاکانە لە کۆمەڵەی "ژێکاف"دا ئیش دەکات. ئەم ڕۆژانە شێخ عەبدوڵڵا لەگەڵ قازی محەمەدو پیاوە ناسراوەکانی تری کورددا چاوپێکەوتنی هەبوە، دەڵێ بڕیاریان داوە لەنێو کوردەکانی ناوچە سنوورییەکانی ئێران و تورکیادا ئیش بکەن، دوژمنایەتیی نێوان هۆزەکانی کوردو ڕاوڕووت کۆتایی پێ بهێنن. بڕیارە سەرکردەکانی کورد هەر کەس لە ناوچەی خۆی ئیش‌وکار بکات بۆ ئەوەی دووبەرەکی نەمێنێ. هەروەها باسی "عومەر خان"یش کرا کە بڕیارە بەشداریی ئەم ئەرکە بکات. بە کۆتایی هاتن بەم ئیش‌وکارە، بڕیار وایە کۆبوونەوەیەکی گەورە بکرێ و ئەم کۆبوونەوەیە سێ کەس دیاری بکات بچن بۆ مۆسکۆ بۆ لای هاوڕێ مۆڵەتۆڤ. بڕیارە ئەم دەستەی نوێنەرانە داوای لێکۆڵینەوەی کێشەی کورد لە کۆنفرانسی سان فرانسیسکۆ بکات.

شێخ عەبدوڵڵا گەیلانی نامەی ژێکافی لە کونسوڵخانە بەجێهێشت، کە ژێکاف دەسەڵاتی تێدا بە ناوبراو داوە لەنێو دانیشتوانی کوردی ناوچەکانی نزیکی سنووری ئێران-تورکیادا کار بکات. لە نامەکەدا ژێکاف داوا لە کونسوڵخانەی ئێمە دەکات یارمەتیی شێخ عەبدوڵڵا بدەین بۆ ئیش‌وکارەکانی.

٦ی نیسانی ١٩٤٥ "قولی خان"ی بەخشداری سوڵدوز لەگەڵ خزمەکانیدا وەك "پاشا خان" و "ئینتساری" کە موڵکداری گەورەن، هاتە لامان و شکاتی لە کوردەکان کرد؛ گوتی لەم دواییانەدا کوردەکان سووکایەتی بە قەرەپاپاخەکان دەکەن و ناچاریان دەکەن بچنە ڕیزی کۆمەڵەی ژێکافەوە، دەیانەوێ دوژمنایەتی لەنێوان

کوردەکـان و ئازەریـەکان دروسـت بکـەن. تـاکوو بـەم چەشـنە دانیشتوانی ئازەریی ناوچەکە تالان بکەن، دژایەتیی نێوان کوردەکان و قەرەپاپاخـەکان درێژە بکێشێ. لـە کۆنەوە خەڵکی ناوچە گوتوویانە ((بیر تەرەفەندی دەنیز، ئووچ تەرەفەندی دونگون)) (لەلایەکەوە دەریایە و لە سێ لاوە بەران) مەبەستیان کوردە.

قولی خـان لـە کۆتـایی مـارتی ئەمسـاڵدا میتینگێکـی ڕێك خستبوو، ئاسـووری و ئەرمەنی و ئازەری و کوردی تێدا بەشدار بوون و ژمارەیان (١٥٠٠) کەس بووە. قوولی خـان کـە دەسـتی بـە قسـەکردن کـردووە، دژی زۆرداریـی کۆمیتـەی ژێکـاف قسـەی کردووە کە بەزۆر خەڵك لـە ڕیزەکانی خۆیدا ناونووس دەکات. ناوبراو بە چاوێکی باشـەوە دەڕوانێتـە پـارتی تـوودەی ئێـران. بەشـدارانی میتینـگ، جگـە لـە کوردەکـان، هەموویان پشتیوانییان لە قولی خان کردووە.

بـەپێی ڕاگەیانـدنی "ئـازاد وەتـەن"، بەرپرسـی حیزبـی تـوودە لـە ورمـێ دەری خستووە کوردەکان ڕیزی بەرگرییان دروست کردووەو ئەندامانی پارتی ژێکاف کە دەچنە گوندەکان پروپاگەندە بۆ هاتنە ڕیزی کۆمەڵە دەکەن. ئەگەر کەسانێك ئامادە نـەبن، بـەزۆر دەیـانهێنن، لـەناو ئەوانـەدا کـە بـەزۆر ناچـاریان دەکـەن بێنـە ڕیـزی ژێکافـەوەو ئەنـدامانی توودەیـشیان تێدایـە، بـە قورئـان سـوێندیان دەدەن. ژێکـاف دەیەوێ کوردستانی سەربەخۆ پێك بهێنێ.

٨ی نیسانی ١٩٤٥ "ئەنساری"[1] ی سەرنووسەری ڕۆژنامەی "کەیوان"، کە چاوی پێم کەوت، گوتی لە مانگی مارتەوە نوێنەری کوردەکانی عیراق سەیید تەها هاتووەتە

---

[1] ئەنساری جگە لە نووسراوەکانی دژی کورد کە لە ڕۆژنامەکەی خۆیدا بڵاوی کردوونەتەوە، زۆر جار لەگەڵ نوێنەرانی سۆڤیەتدا، بەتایبەت کۆنسوڵی سۆڤیەت، چاوپێکەوتنی هەبوە. ناوبراو ئەو دەنگوباسانەی لەلایەن دەزگاکانی جاسووسیی ئێران و ئینگلیزەوە پێدراون، تا بیانگەیەنێتە سۆڤیەتیەکان. هەندێ جار باسی خراپیی ئینگلیزەکانی کردووە تا گومانی لێ نەکرێ، تەنانەت لای سۆڤیەت خۆی بە دژی ئینگلیز داناوە. ئەنساری، جگە لە نووسراوەکانی بۆ سۆڤیەتیەکان، ڕایگەیاندووە کوردەکانی مەهاباد چەکێکی زۆریان کۆ کردووەتەوەو زۆربەیان لە ڕێگەی عیراقەوە بۆ هاتووە. جێگری بەشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت "سیچێڤ"، بە هۆی ئەم ڕاگەیاندنانەوە، لە ٢٤ی نیسانی ١٩٤٥دا بە نامەیەك داوای لە کونسوڵەکانی سۆڤیەت لە تەورێزو ڕەزائیەو لە باڵوێزخانەی سۆڤیەت لە تاران کردووە، لەم هەواڵانە بکۆڵنەوەو ڕوونیان بکەنەوە. ئەنساری، بۆ هەڵبژاردنی دەورەی پازدەیەمی مەجلیس، لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئێرانەوە کاندیدو پشتیوانیی لێ دەکرێ (هەمان سەرچاوە، ل١٠١).

کوردستانی ئێران و لەگەڵ قازی محەمەددا چاوپێکەوتنی هەبوە سەبارەت بە پەیوەندیەکانی کوردی ئێران و عیراق؛ هەروەها سەیید تەها چووەتە سەقزو بۆکان و مەهاباد و لاجان، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ ماڵی خۆی. ئەنساری گوتی سەیید تەها زۆر خزمی بەناوبانگی لە عیراق هەیە، شێخ سەیید عەبدوڵلاَ ئەفەندی خاڵیەتی؛ شێخ تەویلە مامیەتی؛ شێخ ئەحمەدی برای لە تاران لەناو سوپای ئێراندا خزمەت دەکات، بەڵام پەیوەندیی بە سەیید تەهاوە نییە، بە چاوێکی خراپەوە تەماشای چالاکیی سیاسیی برای خۆی دەکات. بە وتەی ئەنساری، بەبێ پشتیوانیی ئینگلیز ناوێرن باسی سەربەخۆییی کوردستان بکەن و بە یارمەتیی سەیید زیائەددین ئەم کارە دەکەن. ئەم سیاسەتەی ئینگلیز کە ئەوان بە دەوڵەتانی بچووکی دیکەی دەکەن، لە رابردووشدا ئاشنایە. ئەنساری گوتی: نابێ باوەڕ بە برای قازی محەمەد، "سەدری قازی"، بکرێ، لەبەر ئەوەی قازی بۆ خۆی چوەتە تاران و چاوی بە سەیید زیائەددین کەوتووەو هەڵوێستی بەرەو خراپی گۆڕاوە. ئەنساری گوتی: ئینگلیزەکان دەیانەوێ نوێنەرایەتیی یەکێتیی سۆڤیەت لە ئێران بشکێنن و گوایە ئەنساری دەیەوێ لە ڕۆژنامەکەی خۆیدا پەردە لەسەر ئەم سیاسەتەی ئینگلیز لابدات[1].

### ئاشومۆڤ
### سەرکۆنسوڵی سۆڤیەت لە ڕەزائیە

پێویستە ئەوەیش بڵێین کە ژێکاف نە فارس و نە عەجەم و نە ئازەری و نە قەرەپاپاخی بە ئەندام وەرگرتووە. بەپێی پێڕەو و پرۆگرامی ژێکاف، کەسانێك بە ئەندام وەردەگیرێن کە بە ڕەچەڵەك کورد بن. بەڵام دیارە ئەنساری و پاشان توودەییەکان و فیرقەییەکان، جگە لەم تاوانە پووچانە، هیچ تاوانێکی تریان نەبوو بیدەنە پاڵ ژێکاف.

کونسوڵی سۆڤیەت لە ڕاپۆرتێکی ڕێکەوتی ١٥ی نیسانی ١٩٤٥دا دەنووسێ: کاربەدەستانی خۆجێیی ئێران کەوتوونەتە نێوان دوو ئاگر، پارتی توودەو

---

[1] هەمان سەرچاوە، ف٠٩٤، ئو٣١، د٧٠، پ٣٥٤، ل٨٧-٩٢.

بزووتنەوەی کورد بۆ سەربەخۆیی کوردستان. بەڵام ئەوان، زیاتر لە هەموان، لە بزووتنەوەی کورد دەترسن. هەندێ لە زانایانی کۆمەڵایەتی دەڵێن سەیید زیائەددین بە فەرمانی خاوەنەکەی یارمەتیی پەرەسەندنی بزووتنەوەی کورد دەدات و دەیەوێ ژێکاف و توودە دژی یەکتر ڕاوەستن.

ژێکاف بۆ بەرەنگاریی سوپای ئێران، پاش کۆتایی هاتنی دووهەمین شەڕی جیهانی، کە لەوانەیە دوای دەرچوونی سوپای سوور هێرش بکاتە سەر کوردستان، خۆی ئامادە دەکات و لەم ڕاپۆرتەدا دەردەکەوێ.

بەپێی ئەم هەواڵانە کە پێمان گەیشتوون، عومەر خانی شەریفی، تاهیر خانی سمکۆ، قوتاس ئاغای مەمەدی، عەباس فەنەکی، تەمەر خان و شیر ئاغا، گوایە لەلایەن ژێکافەوە فەرمانیان پێدراوە شەش هێز، کە ژمارەی هەر هێزێك (٦٠٦) کەس دەبێ، پێك بێنن. جگە لەوە، لە هەر کوردێك (٦) تمەن ئابوونە وەربگرن. ئەم هەواڵانە هێشتا بەتەواوی ڕوون نەکراونەتەوە. هێمنایەتی ئیش‌وکاری کۆمەڵەی ژێکاف لەم ڕۆژانەدا، لەبەر ئەوەیە کە کۆمەڵە چاوەڕێی کۆتایی هاتن بە کاروباری کۆبوونەوەی سان فرانسیسکۆ دەکات، کە گوایا دەبێ کێشەی کوردیشی تێدا باس بکرێ[1].

**لە ڕاپۆرتی کونسوڵی سۆڤیەت لە ماکۆ:**

بەهاری ئەمساڵ (١٩٤٥) هێندێ سەرۆك هۆزی کورد لە ناوچەی ماکۆ دەستیان بە پێکهێنانی ڕێکخراوێکی سیاسی بۆ کوردەکان کردووە. یەکەم ڕێکخراوی سیاسیی ئەم ناوچەیە، ڕێکخراوی نهێنیی پارتی کۆمەڵە بوو کە لەناو هۆزی شکاك پێك هێنرا.

مانگی مارتی ئەمساڵ عومەر خانی شەریفی لەگەڵ سەرۆك هۆزو خێڵەکانی کورد لە گوندی (زەندەشت)ی سەر بە ناوچەی شاپوور (گوندی زەندەشت هی عومەر خانە) کۆبوونەوەی هەبوە، قسەی لەسەر پێویستیی پێکهێنانی ڕێکخراوی کۆمەڵە کردووەو ئاگاداری کردوونەوە کە نهێنیی پێکهێنانی ئەم ڕێکخراوە بپارێزن. دوو کەسی نەناسراوی کورد، کە لە تەورێزەوە هاتوون، لە پێکهێنانی ئەم ڕێکخراوەدا بەشدار

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٩٧-١١٩.

بوون. عومەر خان ناوی ئەو دوو کەسەی نەبردووە. عومەر خان گوتوویە: ((هەروەها ئێمەیش لە تەورێزەوە ئەم هەواڵەمان پێگەیشتووە))، ئەم ڕێکخراوە بە ئاگاداری و پشتیوانیی دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەت پێک هاتووەو بۆ ئەمەش وێنەی لینین و ستالین وەك سیمبول و ڕەمزی ئیش‌وکاری پارتی کوردی پیشان دراون. دوای ئەوەی بەشداران بەڵێنی پێکهێنانی ئەم ڕێکخراوەیان داوە، عومەر خان لەگەڵ ئەوانەدا کە لە تەورێزەوە هاتبوون، پێشنیاری سوێندخواردنیان بۆ بەشداران کردووە. بەپێی ئەم بڕیارە، دەبێ بەشداران بە چۆکدانانەوە بەرامبەر بە قورئان بە دەنگەوە ڕابگەیەنن:

١- سوێند دەخۆم بە قورئان، خۆفرۆش نەبم و نەکەومە بەر کاریگەریی تورکیاو ئێران و عیراق.

٢- وەفادار بم بە بەرژەوەندەکانی گەلی کورد.

٣- بەبێ چەندو چوون تەواوی بڕیارەکانی پارتی کۆمەڵە جێبەجێ بکەم.

بەشدارانی ئەم کۆبوونەوەیە بریتی بوون لە:

١. مەمەد قوتاس ئاغا (سەرکردەی تایفەی مەمەدی).

٢. تاهیر خانی سمکۆ (سەرکردەی تایفەی عەدۆیی).

٣. حەسەن تیلو (سەرکردەی تایفەی دیری).

٤. موراد برو (سەرکردەی تایفەی نیسانی).

٥. شێرۆ ئیسماعیل (سەرکردەی تایفەی پسگا).

دوای ئەوە عومەر خان پێی وتوون ڕێکخراوی کۆمەڵە لەناو تایفەکانی خۆیاندا پێك بهێنن، بەشداران پەسندیان کردووە.

**مەبەست و ئەرکەکانی کۆمەڵە:**

مەبەستی کۆمەڵە گەیشتن بە سەربەخۆیی کوردە، کە کوردەکانی ئێران و عیراق و تورکیاو سووریاش بگرێتەوە.

**ئەرکەکانی کۆمەڵە:**

١- کۆتایی هێنان بە ڕاووڕووت و دژایەتیی ناوخۆ.

٢- یەکخستنی تەواوی کوردەکانی ئێران و عیراق و تورکیا.

٣- کێشەی سەربەخۆیی دەوڵەتی کوردی بخرێتە بەر دەستی هاوپەیمانەکان (سۆڤیەت و ئینگلیز و ئەمریکا).

**لەسەر وەرگرتنی ئەندام لە پارتی کۆمەڵەدا:**

کۆمەڵە، هەوڵ دەدات زیاتر خەڵکی خوێندەوار بهێنێتە ڕیزی خۆیەوە. وەرگرتنی پیاوەکان بۆ ڕیزی کۆمەڵە، دەبێ بە تاکە کەسی بێ و داوای لێ بکرێ:

١- بەرامبەر بە بەرپرسی ڕێکخراوی ناوچە سوێند بخوات.

٢- ئەندامی وەرگیراو لە کۆمەڵە دەبێ کوردی ڕەسەن بێ (واتە هەم لە دایکەوەو هەم لە باوکەوە).

٣- ئەندامی وەرگیراو لە کۆمەڵە دەبێ گەلی کوردی خۆش بوێ و ڕێز لە داب و نەریتی کورد بگرێ.

٤- ئەندامی کۆمەڵە دەبێ پارەپەرست نەبێ و خۆی بە پارە نەفرۆشێ و بەم چەشنە نامووسی کورد بپارێزێ.

٥- ئەندامی کۆمەڵە دەبێ ئابوونەی ئەندامێتی بدات، کە مانگی دە ڕیاڵە. دەوڵەمەندەکان دەتوانن جگە لە ئابوونە، هێندێ یارمەتیی دراویش بدەن بە کۆمەڵە.

**پرنسیپەکانی ڕێکخستنی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵە:**

١- دەبێ ڕێکخراوی کۆمەڵە لەناو تایەفەو تیرەکاندا لەلایەن سەرکردەکان یان گەورەکانیانەوە بەڕێوە بچێ و بە نهێنی ئیش بکەن.

٢- ڕێکخراوەکانی کۆمەڵە، کە (٦٠٠-١٠٠٠) ئەندامیان هەبێ، پێویستە یەك کۆمیتەیان هەبێ. ئەگەر زیاتر لە هەزار کەس بێ، دەبێ دوو کۆمیتەیان هەبێ.

٣- ڕێکخراوێك کە ژمارەی ئەندامەکانی نەگاتە شەشسەد کەس، کۆمیتە پێك ناهێنن، بەڕێوەبەری ئەم بەشەی ڕێکخراوە دەبێ گەورەی تایفە بێ، کە دەبێ ئەویش دەستیارو سکرتێری هەبێ.

٤- دەبێ ڕێکخراوی کۆمەڵە لەسەر پرنسیپی ناوچەیی (تیریتۆریاڵ) بێ، لە ڕێگەی سەرکردەکانی کۆمەڵەوە لە ناوەندەوە ڕێبەرایەتی بکرێ.

٥- ناوەند، ناوی نهێنیی خۆی هەیەو لە نووسینەکانیدا تەنیا ناوە نهێنیەکە دەنووسێ. بەم چەشنە ڕێکخراوی نهێنیی پارتی کۆمەڵە لە ناوچەی شاپوور لەناو

کوردەکانی هۆزی شکاکدا، لەناو تەواوی تایفەو تیرەکانی کورددا، بە بەشداری هەموو پیاوەکان دامەزرا.

عومەر خان و هاوکارەکانی لە مانگی ئەیلوولدا چەند جار نوێنەرانی خۆیان ناردوەتە لای سەرۆك خێڵەکانی ناوچەی ماکۆ بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوی پارتی کۆمەڵە و کۆنترۆڵی ئیش‌وکاریان. لەم بارەوە کونسولی خۆمان لە تەورێزو باڵوێزخانەمان لە تاران ئاگادار کردەوە. لە هەر چاوپێکەوتنێکماندا لەگەڵ نوێنەرانی کورددا، هەموو کاتێك پێمان ڕاگەیاندوون مەسەلەی پێکهێنانی سەربەخۆیی کوردستان واقیعبینانە نییەو پێش وەختە، ئێمە ئامۆژگاریمان کردوون پەیوەندی بە ڕێکخراوە دیموکراتیەکانی ئێرانەوە بکەن، بەم چەشنە دەتوانن مافە دیموکراتیەکان بۆ گەلی کورد بەدەست بهێنن. ئەوانە بەڵێنیان دا گوێڕایەڵی ئامۆژگاریەکانمان بن. بەم چەشنە عومەر خان نەیتوانی پارتی کۆمەڵە لەناو کوردەکانی ناوچەی ماکۆدا پێك بهێنێ.

لەسەر حیزبی دیموکراتی کورد:

نیوەی یەکەمی مانگی تشرینی یەکەمی ئەمساڵ، بە پێشنیاری هێندێ کوردی مەهاباد، چەند گرووپێکی دەستپێشخەر بۆ پێکهێنانی حیزبی دیموکراتی کورد هاتنە ناوچەی ماکۆو خۆی. ئەم گرووپانە دەستیان بە پێکهێنانی حیزبی دیموکراتی کورد کردو بە بڵاوکردنەوەی بەیاننامە داوایان لە خەڵك کرد ناوی خۆیان لەم حیزبەدا بنووسن و ئامادەی هەڵبژاردنی نوێنەرانی خۆیان بن بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی حیزبی دیموکراتی کورددا لە مەهاباد.

ئەو دەستەیەی نوێنەران کە لە ماکۆ بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی حیزبدا هەڵبژێردران، بریتین لە: شێخ عەبدولقادر، عومەر ئاغای خالیدی، عەبدوڵڵا ئاغای حاجی قارەمان، حەسەن ئاغای حاجی تیلوو، عومەر ئاغای ئەمویی؛ لە شاپوورەوە: عومەر خانی شەریفی، عەباس فەنەك، قوتاس مەمەدی، عەبدۆی عەبدوول، سۆفی شیرانی، شێرۆ پەس ئاغا، تاهیر خانی سمکۆ، حەسەن تیلوو، موراد نەیسانی و مەلا مەجید.

ناوبراوان دوای گەڕانەوەیان لە کۆنگرە، دەستیان کرد بە ڕوونکردنەوە لەناو تایفەو تیرەکانی کورددا کە زۆر چالاکانە نەبوو و دەری دەخات خوێندەوار لەناو کوردەکاندا کەمە. بەڵام کوردەکان هەموویان لە پێکهاتنی ئەم پارتییە ئاگادار بوون و خۆیان بە ئەندامی دەزانن، بەبێ ئەوەی وەرگرتنی ئەندامێتییان ڕێك بخرێ. سەرۆك

هۆزەکانی کورد (دەستەی نوێنەران) کە لە کۆنگرە گەڕاونەتەوە، بە بڕواپێکراوانی خۆیان گوتووە حیزبی دیموکراتی کورد بە ئاگاداری و بە پشتیوانیی دەزگاکان و کاربەدەستانی یەکێتیی سۆڤیەت پێك دێت. زۆر کورد ئەو ئەنجامەیان دەستگیر بووە کە کورد لەگەڵ ڕووسەکاندا یەك دەگرن. کوردەکان، لەناو زۆربەی تایفەکانی کوردی ناوچەکانی ماکۆو خۆیدا، بەبۆنەی پێکهێنانی حیزبی دیموکراتی کوردەوە دەستیان بە شایی و هەڵپەڕکێ کردووە. ژمارەی ئەوانەی کە لە ناوچەی ماکۆ و خۆی ناویان لە حیزبی دیموکراتی کورددا تائێستا دەگاتە هەشت هەزار کەس.

ڕێکخراوەکانی ناوچە هێشتا دانەمەزرێندراون. ئیش وکاری ڕێکخستن و ڕۆشنبیری بەکزی بەڕێوە دەچێ. سەرۆکە کوردەکانی ناوچە لە ئیش وکاردا نەشارەزان و تائێستا لە ناوەندەوە کەس نەهاتووە بۆ ئێرە.

تاقمی کۆنەپەرستی ماکۆو خۆی هەوڵیان دا جیاوازی و دژایەتی لەنێوان کوردەکان و جووتیارە ئازەریەکانی ناوچەکەدا دروست بکەن و بڵاویان کردووەتەوە کە گوایە کوردەکان چەکدار دەبن و هێرش دەکەنە سەر جووتیارەکانی ناوچە. بەڵام ئەم دەنگ وباسانە بێ ئەنجام بوون، کوردەکان دەڵێن ((ئێمەی کورد دۆستی تەواوی ئازەربایجانیەکانین))، ئێمە تەنیا دوژمنی ئەو کەسانەین کە جیاوازی دەخەنە ناو کوردو ئازەری[1].

**ڕاپۆرتی کونسوڵی سۆڤیەت لە ڕەزائیە، ١٩٤٥:**

پارتی ژێکاف سەرەتا لە ئێران، پاشان لە عیراق، پێك هات. ڕێبەرانی پارتی ژێکاف دەڵێن ئەم پارتە لە تورکیاو سووریاش هەیە، بەڵام ئاگاداریی تەواو تاقیکراوەمان لەم بارەیەوە نییە.

مەهاباد ناوەندی پارتی ژێکافە کە کۆمیتەی ناوەندیی لە (١١) کەس و (٥) ئەندامی پاڵێوراو پێك هاتووە. شانەکانی ژێکاف لە شارو گوندەکانی کوردستان دامەزرێندراون. ژمارەی ئەندامانی ژێکاف دەگاتە (٦٠) هەزار کەس. مەبەستی پارتی ژێکاف ئەوەیە تەواوی گەلی کورد لە باری سەربەخۆیی سیاسی و ئابوورییەوە ئاگادار

---

[1] ڕاپۆرتی کۆنسوڵی سۆڤیەت لە ماکۆ، ساڵی ١٩٤٥، ل١١٣-١٥٢.

بکاتەوە. ئابوونەی ئەندامێتیی ژێکاف دە ڕیاڵە. جگە لەوە، هەر ئەندامێك بەپێی توانای خۆی دەتوانێ زیاتر یارمەتیی پارتیی خۆی بدات. بۆیە زۆربەی سەرچاوەی داهاتی پارتی لەم یارمەتیانەوە بە دەست دێت. گەرچی پارتی ژێکاف لەسەرانسەری کوردستاندا بە ئاشکرا دەستی بە چالاکی کردووە، بەڵام وەك پارتێکی نهێنییە. هەر شانەیەکی پارتی بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبێ، ناوی نهێنیی خۆی هەیەو ناوی سروشتیشیان بۆ هەڵدەبژێرن. پێڕەوی پارتی زیاتر لە پرۆگرامی پارتی هیوا (لە عیراق) وەرگیرابوو، بەڵام زۆربەی بۆچوونەکانی پرۆگرامی ژێکاف شتێکی ترە.

هێندێ لە پیاوە بەناوبانگەکانی کورد بۆ سێ مەبەستی خوارەوە چوونەتە ڕیزی پارتی ژێکافەوە:

١- هێندێك لەبەر بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان (لە پێشەوەی هەموویان ئابووری)، تا تەواوی ئەو ئیمتیازانەی کە لە باری کشتوکاڵ و بازرگانی و... هتد، دەدرێنە ئەندامانی ژێکاف، بیپارێزن.

٢- هێندێکی تریان لەبەر ترسە بۆ ئەوەی هاوسۆزیی یەکێتیی سۆڤیەت بۆ خۆیان دابین بکەن، لەبەر ئەوە وا بیر دەکەنەوە کە ژێکاف بۆ ئامانجی سەرەکیی خۆی کە سەربەخۆیی کوردستانە، پشت بە سۆڤیەت دەبەستێ.

٣- گرووپی سێیەم کە زۆر کەمن، تەنیا لەبەر هەستی نیشتیمانپەروەری هاتوونەتە ڕیزی ژێکافەوە. ئەمان وا لەو پارتە تێگەیشتوون کە ڕزگارکەری هەموو کوردستانە.

بە وتەی هێندێ لە کوردەکان، پارتی ژێکاف کە لە کوردستانی ئێران پێك هات، لەسەر بنچینەیەکی پتەوو بێ ئەوەی سیاسەتی هیچ دەوڵەتێکی بێگانە جێبەجێ بکات، دامەزرێندراوە.

ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی ژێکاف لە پیاوە ناودارەکانی مەهابادن، کە وەك ئاشکرایە جێ متمانەی زۆربەی سەرۆك هۆزو خێڵەکانی کورد نین. پارتی ژێکاف ئاڵای نەتەوایەتیی بۆ کوردستان دروست کرد کە بریتییە لە سێ ڕەنگ و ڕەنگەکانیشی پێچەوانەی ئاڵای دەوڵەتی ئێران دەنوێنێ، ڕەنگی سوور لەسەرەوە، پاشان سپی و لە خوارەوە سەوزو لە ناوەندەکەی هەتاو کێشراوە.

هەر ئەندامێك کە دێتە ڕیزی پارتی ژێکافەوە، پێش ئەوەی وەربگیرێ، دەبێ سوێند بە قورئان و ئاڵای نەتەوایەتی بخوات کە خیانەت لە نیشتمانەکەی ناکات و

نهێنیەکانی پارتی بپارێزێ. ئەندامی وەرگیراو، جگە لە ژمارەیەك کە بۆی دیاری دەکەن بە مەبەستی پاراستنی، ناوی نهێنیی بۆ دادەنێن. لەم دواییانەدا پارتی ژێکاف توانیویەتی دەزگایەکی چاپەمەنیی بچووك بە بیست هەزار ڕیاڵ بکڕێ و چاپەمەنیەکانی پارتی لە مەهاباد بڵاو بکاتەوە.

دەسەڵاتدارانی ئێرانی لە هەموو لایەکەوە هەوڵیان دا پارتی ژێکاف لە ناوەوە تێك بدەن. دەیانویست بە کڕینی هێندێ سەرۆك هۆزو خێڵی کورد، جیاوازی بخەنە نێو ڕیزەکانی کۆمەڵە؛ هێندێ جار بۆیان چووەتە سەر، بۆ وێنە، ئەوانە دوژمنایەتییان لەنێوان ڕەشید بەگ و نووری بەگ، هەروەها نێوان ڕەشید بەگ و تەمەر خانی هەنارە، قەرەنی ئاغای مامەش و قازی محەمەد و... هتددا ناوەتەوە. هەروەها کێشەی نێوان سەرۆکە کوردەکان لەسەر زەوی‌وزارو دەست بەسەرداگرتن، یاخود کاتی فرۆشتنی قەندو شەکر زووتر کارگە (مانوفاکتۆر) بە هێندێکیان دەدەن و بەوانی تر بە پێچەوانەوە.

وەك ڕامانگەیاند، دەسەڵاتدارانی ئێرانی چارەسەری کێشەی کورد تەنیا بە چەککردنی کوردەکان دەزانن. دەسەڵاتدارانی ئێرانی بایەخێکی زۆر دەدەنە مەهاباد، لەبەر ئەوەی مەهاباد ناوەندی سیاسیی کوردانە و لەوێ کێشەی سەربەخۆیی کوردستان دەخرێتە بەر باس‌وخواس و دیاری دەکرێ.

دەسەڵاتدارانی ئێرانی، کە هیوایان بە جێ‌پێ‌قایمکردنی خۆیان لە مەهاباد نەماوە، هەروەها کە نەیانتوانی سوپای ئێران بنێرنە ئەوێ، ئەوانە هەوڵیان دا مەهاباد لە ئوستانی چوارەم (ئازەربایجانی ڕۆژئاوا) جیا بکەنەوەو بیکەنە ناوچەیەکی تایبەتی سەر بە سنە و ڕاستەوخۆ لەژێر دەسەڵاتی تاراندا بێ. مەبەستی دەسەڵاتدارانی ئێران لەم کردەوەیە ئەوەیە، ئەم ناوچەیەی ناوەندی سیاسیی کوردان، کاریگەریی باکوور (سۆڤیەت)ی بەسەرەوە نەمێنێ و بخرێتە ژێر دەستی خۆیان. زۆربەی کوردەکان دژی ئەم گۆڕانکارییەن. دەسەڵاتدارانی ئێران درێژەیان بە جێبەجێکردنی پیلانی ناوبراو داو ویستیان ناسراوەکانی کوردی هاوڕای گەڵاڵەی لکاندنی مەهاباد بە سنەوە قەناعەت پێ بکەن و ڕەزامەندییان لێ وەربگرن. دەسەڵاتدارانی ئێران توانییان بەڵێنی هێندێ لەسەرکردە ناسراوەکانی کورد، وەك

قەرەنی ئاغای مامەش، عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەد، مەحموودیان، عەبدوڵڵا ئاغاو عەلی ئاغای مەنگوڕو هێندێکی تر، وەدەست بهێنن. لەم بارەوە، ئەوانە هێندێ ناوداری کوردی وەك قازی محەمەدو عومەر خانی شەریفی و نووری بەگ و تەمەر خانی هەنارەو... هتد بە هەڵگیرسانی بزووتنەوەی جیاییخوازانەو یاخیبوون و یاخیکردنی کوردەکان لە دەسەڵاتدارانی ئێران تاوانبار دەکەن.

تەواوی کوردە ناودارەکان هەر زوو بە بیروباوەڕی خۆیان بەولایەدا دەگۆڕێن کە بەهێزتر بێ، لەبەر ئەوە نابێ حیساب بۆ لایەنگرییان لە سۆڤیەت بکرێ. هەروەها دووریش نییە سەرکردەکانی پارتی ژێکاف ویستبێتیان کەڵك لەم پارتییە وەربگرن بۆ خۆیان. بەپێی بڕیاری مۆسکۆ، ئێمە لە مانگی ئابەوە پەیوەندیمان لەگەڵ پارتی ژێکافدا گۆڕیوە. لە چاوپێکەوتنەکاندا لەگەڵ ناسراوەکانی کورددا، بە شێوەیەکی قایمکارانە تێمانگەیاندوون کە ئێمە پێمان وایە بیروباوەڕی ((سەربەخۆیی بۆ کوردستان)) کاتی خۆی نییەو واقیعبینانە نییە، لەبەر ئەوەی ئەم بیروباوەڕە زیاتر لەلایەن دوژمنانی کوردەوە پشتگیریی لێ دەکرێ ، هەر ئەوانیش کەمتر لە هەموو لایەك بیر لە ئازادی و سەربەخۆیی ڕاستەقینەی گەلی کورد دەکەنەوە. ئێمە بە مەبەستی باشترکردنی ژیانی گەلی کورد، پێشنیار بە پێشکەوتووخوازەکانی پارتی ژێکاف دەکەین، هەوڵ بدەن بۆ مافی یەکسانیی کورد لە چوارچێوەی یاسایی ئێراندا لەسەر بنچینەیەکی دیموکراتیانەی وڵات. کوردەکانیش زۆر جار لەلایەن سەرکردەکانی پارتی ژێکافەوە درۆیان لەگەڵدا کراوەو کۆمەڵە بەرە بەرە لەپێش چاوی خەڵك دەکەوێ. پارتی ژێکاف بە بڕیاردانێکی تایبەتی هەڵوەشایەوەو ئەندامەکانی سەرلەنوێ چوونە ناو ڕیزی پارتی تازە دروستکراو، واتە حیزبی دیموکراتی کوردستانەوە [1].

ئاشومۆڤ

عەلی ئەکبەرۆڤ

---

[1] ئەرشیڤی وەزارەتی دەرەوەی ڕووسیای فیدراڵ، ئو۳۰، د۲۲۷، پ۳٦۹، ل٥١-٥٤.

**بەشێك لە ڕاپۆرتی لە ئێرانەوە نێردراو**
**بۆ کۆمیتەی ناوەندیی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەت**
**هاوڕێ گ. م. دیمیترۆڤ سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی**
**لەبارەی ڕووداوەکانی کوردستان و پارتی ژێکافەوە**
**(١٢ی ئۆکتۆبری ١٩٤٥):**

ڕۆژنامەی "باختەر" لە ڕێکەوتی ١٩٤٥/٧/٢٥دا نووسیویە: هەواڵی ناخۆش و دڵتەزێن لە کوردستانەوە دەگات، بەڵام ناگەنە لای نوێنەرانی مەجلیس. کار گەیشتووەتە ئەو جێگایە کە باندەکانی مەحموود کانی سانانی شمشێریان لە ڕووی براکانی خۆیاندا هەڵکێشاوەو سوپای شاهەنشاهیش تۆپ و تفەنگی دژی خەڵکی بێ تاوان بەکار هێناوە. ئەم ڕووداوانە بە دوای ئەو هەراو هوریایەدا دێت کە هەم پارتی ژێکاف دروشمی سەربەخۆیی کوردستانی هەڵگرتووەو هەم "حەبیبی موحیت" بە نوێنەری کوردستان سەپێنراوەو کوردەکانی زۆر ناڕازی کردووە.

ڕۆژنامەی "کەیهان" لە ڕێکەوتی ١٩٤٥/٧/٢١دا شیکردنەوەیەکی لەسەر نامەیەك، کە لەلایەن پارتی ژێکافەوە نێردراوە بۆ چاپەمەنیەکانی ئێران، بڵاو کردووەتەوەو پارتی ژێکاف لە زمانی دانیشتوانی کوردستانەوە داوای لە مەجلیس کردووە نوێنەرایەتیی حەبیبی موحیت پەسند نەکات، لەبەر ئەوەی گەلی کورد ئەو کابرایەی هەڵنەبژاردووە و هەڵبژاردنەکەی بە فرۆفێڵ و دەستێوەردانی ئەفسەرانی لەشکری ئێران لە کوردستان بەڕێوە چووە. لە تەلگرامەکەی ژێکافدا هاتووە: ((ئەگەر بێتو نوێنەرایەتیی ئەو کابرایە، واتە حەبیبی موحیت، پەسند بکرێ، بۆ دانیشتوانی کوردستان دەردەکەوێ کە مەجلیسی ئێران نایەوێ هێمنی و ئاوەدانی لە کوردستاندا هەبێ)).

کەیهان لە درێژەی وتارەکەیدا گوتوویە: لەوانەیە بەشی نەخوێندەواری دانیشتوانی کورد نەزانێ مانای ((سەربەخۆیی)) چییە. لەسەردەمی ئێستادا، کاتێك تەنانەت گەلانی گەورەو فرە نەتەوە هەوڵی یەکگرتن دەدەن و پشتی یەکتر دەگرن، ئایا دەکرێ باوەڕ بەو شتە بکرێ کە هێندێ خەڵك لە هۆزە ڕەسەنەکانی ئێران دەیانەوێ لە ڕەگ و ڕیشەی خۆیان جیا ببنەوە؟ باشە ئەوانە بۆ کوێ دەڕۆن؟ ئەگەر ئێستا گەلی ١٥ ملیۆنیی ئێران لەچاو دەوڵەتە زلهێزەکانی جیهاندا دەورێکی بچووك دەبینێ، ئەگەر بێتو ئەو هۆزو خێڵانە جیا ببنەوە، چییان پێ دەکرێ؟ کوا بوخاراو

خوارەزم و گەنجە و تیفلیس، کوردستانی تورکیاو بلووچستانی ئینگلیز، کە لە ئێران جیا بوونەوە، چییان بەسەر هات؟

پاشان ڕۆژنامەکە نووسیویە: کۆمیتەیەکی وا (ژێکاف) کە بەو چەشنە باسی دەکەن، لە کوردستاندا نییە، ئەگەر هەیە ئەندامەکانی تەنیا چەند جاسووسێکی وڵاتانی دەرەوەن. ئەم کردەوە ناپاکانەش، ئیشی هێندێ کەسە کە لە ناوەندی (تاران) دانیشتوون. هێندێ سیاسەتمەداری ناڕازی و نەزان، بەرتیلخۆرو پیلانگێڕ کە لە تاران دانیشتوون، هەر ئەوانەن کە خەڵکیان دەچەوساندەوەو بۆ هەموو کارێك ئامادە بوون بۆ خنکاندنی ئازادی. کابرایەکی سەرهەنگ یان ژەنەڕاڵ، کە پێی خۆشە حەبیبی موحیت بە نوێنەرایەتیی کوردستان بنێردرێتە مەجلیسی ئێران، بە ئەو چی ئەگەر کوردەکان ئەم کابرایەیان نەوێ؟

دەوڵەت و مەجلیسی ئێران پەرۆشی دانیشتوانی خۆیان نین. ئەگەر نوێنەرایەتیی موحیت پەسند نەکراوە، لەبەر ئەوە نییە کە دانیشتوانی کوردستان نایانەوێ، بەڵکوو دوژمنی موحیت لە مەجلیسی ئێراندا زۆرن. جگە لەوەش، ئەوانەی کە لە مەجلیسی ئێران کۆدەبنەوە، هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ موحیتدا نییە.

کۆمیتەی کوردیی ژێکاف لە ١٩٤٢دا بە دەستپێشخەریی هێندێ کوردی دیموکرات لە عیراق بۆ یەکخستنی بەربلاویی هەموو هێزە دیموکراتیەکانی بەشەکانی کوردستان پێك هاتووە. پارتی ژێکاف میراتگری پارتی (خۆیبوون)ـەو نەریتی دەرەبەگی و داشناکەکانی پێوەیە. پارتی خۆیبوون ماوەیەکی دووروودرێژ سەرکردایەتیی بزووتنەوەی کوردی کردووە. ئەم ساڵانەی دوایی بەهۆی نزیکبوونەوەی ئەم پارتەوە لە کۆنەپەرستان و بە تایبەت لایەنگریی لە فاشیزم و پشتیوانیی لە سیاسەتی دەرەوەی پارتی ناسیۆنال- سۆسیالیستی ئەڵمان، دەسەڵاتی لەدەست داوە.

جیاوازیی پارتی ژێکاف لەگەڵ خۆیبووندا ئەوە بوو کە لە خەباتدا بۆ سەربەخۆیی کوردستان هەڵوێستێکی زۆر قایمکارانەی گرتە بەر، ئەم کێشەیەی بە دەستپێکردنی هێندێ داواکاریی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و بەگشتی ڕیفۆرم لە

کوردستان هێنایە پێش. ژێکاف، ئەم شتانەی لە بەرنامەی خۆیدا دەست نیشان کردووە. هەروەها پارتی ژێکاف ڕایگەیاندووە کە خەبات دژی ئەڵمانیای فاشیست و کۆنەپەرستانی نێونەتەوەیی بە ئەرکی سەر شانی خۆی دەزانێ و لەم خەباتە پیرۆزەیشدا پشتیوانی لەگەلانی ئازادیخواز دەکات.

کۆمیتەی ژێکاف، داخوازیی سیاسی و ئابووری و مافی کوردەکانی هەموو پارچەکانی کوردستانی لە بەرنامەی خۆیدا چەسپاندووە.

لەلایەکی ترەوە، ژێکاف ڕایگەیاندووە ئامادەیە لەگەڵ هەموو ڕێکخراوە دیموکراتیەکانی ئەو وڵاتانەدا کە کوردیان تێدایە، بەرەیەکی هاوبەش پێك بهێنێ، بە مەرجێك ئەوانە مافی کوردان بە ڕەسمی بناسن. پرۆگرامی لانی کەمی کۆمەڵەی ژێکاف ئەم داخوازیانەی خوارەوەن:

ڕیفۆرمی ئەرزی: دەست بەسەرداگرتنی تەواوی زەمین (ئەرز)ە دەوڵەتیەکان و مەوقووفەکان و فیئۆداڵەکان و بەشکردنی بەخۆڕاییی‌یان بەسەر زەحمەتکێشان و جووتیاران و ئاژەڵداراندا، گەڕاندنەوەی زەویی ئەو جووتیارانەی کە لەلایەن دەزگاکانی دەوڵەتی و فیئوداڵەکانەوە بە شێوەیەکی نایاسایی دەستیان بەسەردا گیراوە. ئەوپەڕی هەوڵ بدرێ بۆ سەرکەوتنی بازرگانی و پیشەسازی لە ناوچە کوردنشینەکاندا. دابینکردنی مافی زەحمەتکێشان و جووتیاران و ئاژەڵداران و پیشەسازان. خەبات دژی فیئۆداڵەکان و دەسەڵاتی هۆزی و خێڵەکیی خانەکان و دەوڵەتی ناوەندی. ئەوپەڕی هەوڵ بدرێ بۆ پێشخستنی کاروباری پێ‌خوێندن و لەش‌ساغی و بارهێنان و سەرئەنجام تێکۆشان بۆ دیموکراتیزەکردنی ڕادیکاڵانەی ژیانی کۆمەڵانی کورد. کۆمیتەی ژێکاف لەماوەی ١٩٤٣-١٩٤٤دا زۆر چالاك نەبوو، زیاتر خەریکی ئیش‌وکاری ڕێکخستن و ئەندام وەرگرتن لەناو چین و توێژەکانی دانیشتوانی کوردستان، بەتایبەت لە باکوور- ڕۆژهەڵاتی عیراق و ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئێران بوو. ناوەندی چالاکیی ژێکاف لە ئێران، کوردستانی موکرییە کە پایتەختەکەی شاری مەهابادەو لەلایەن کوردە پێشکەوتووخوازەکانەوە بە سەرکردایەتیی قازی محەمەد و "سەدری قازی"ی برای کە نوێنەری مەجلیسی ئێرانە، بەڕێوە دەچێ.

ڕێکخراوی ژێکاف لە مەهاباد کە لە کۆتایی ١٩٤٣دا دامەزراوە، بە شێوەیەکی بەربلاو و فراوان لەناو دانیشتوانی کورددا گەشەی کردووە و سەرکەوتنی زۆری بە دەست هێناوە. حەفتا لە سەدی دانیشتوانی پێگەیشتوو لە کوردستانی موکری- لە ناوچەکانی سەردەشت، بۆکان و مەهاباد- بەپێی سەرچاوەیەك کە هەیە، لە ڕیزی ئەم پارتەدان. بەپێی سەرچاوەیەکی تر، ئەندامانی پارتی ژێکاف لە کوردستانی موکری (٢٣-٣٠) هەزار کەسن. کۆمیتەی ژێکاف لە مەهاباد، گۆڤاری "نیشتمان"، بەیاننامەو ئاگاداری و چاپەمەنیی تر بلاو دەکاتەوە، کە لەناو کوردەکانی ئێراندا داواکارییان زۆرە. ڕێکخراوی شانەکانی ژێکاف، لە هەموو کوردستاندا، لە ماکۆوە تا ناوچەکانی لوڕنشین و بەختیاری بلاو بوونەتەوە. بەپێی ئەو ئاگادارییانەی کە هەمانە، چالاکیی ژێکاف لە ناوچە سەرهەڵداوو ڕاپەڕیوەکانی کوردستاندا لە ١٩٤٤ ەوە دەستی پێ کردووە؛ ژێکاف لەسەرەتای ئەم ڕووداوانەدا توانیویەتی زۆربەی ناودارو نیشتیمانپەروەرە پێشکەوتووخوازەکانی پێنج ئوستان یەك بخات.

ژێکاف لە بەیاننامەو ڕاگەیاندنەکانیدا زۆر جار دژی سیاسەتی کۆنەپەرستانەی دەوڵەت ڕاوەستاوە. بۆ وێنە، ژێکاف لە پایزی ١٩٤٤دا بەناوی کوردەکانی ئێرانەوە داوای لاچوونی دەوڵەتی کۆنەپەرستی ساعیدو دانی ئیمتیازی نەوتی باشووری ئێرانی بە یەکێتیی سۆڤیەت کرد. پارتی ژێکاف لەگەڵ پارتی توودەی ئێران و ڕێکخراوە دیموکراتییەکانی تری ئێراندا، هاودەنگیی خۆی دژی سیاسەتی کۆنەپەرستانەی دەوڵەتی ئێران دەربڕی و چالاکانە لە ناوچە کوردنشینەکاندا بەرامبەر بە کاربەدەستانی کۆنەپەرستی ئێران ڕاوەستا. هەروەها ژێکاف دژی دارودەستەی سەیید زیائەددین و هاوکارەکانی (یەکێتیی هۆزەکانی ئێران- اتحاد عشایر ایران) کە هێندێ سەرۆك هۆزو فیئۆدالی کوردیش دەگرێتەوەو بوونی پارتی ژێکافیان بەلاوە باش نییە، ڕاوەستاوە. وێنەیەك کە لێرەدا پێویستە باس بکرێ، کۆبوونەوەی ڕۆژانی ١٩٤٥/٤/١٩ و ١٩٤٥/٤/٢٢ی دەورووبەری مەهابادە، کە بە بەشداریی هێندێ فیئۆداڵ و سەرۆك هۆزی کورد پێك هاتووە. پرسیاری هەرە گرنگ کە لەم کۆبوونەوەیەدا لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە، چۆنیەتیی هەنگاونان لە خەباتی دژی پارتی ژێکافداو پێشگیری لە پەرەگرتنی ئەو پارتە بووە.

کۆمەڵەی ژێکاف لە خەباتی سیاسیی خۆیدا تاکتیکی جۆراوجۆر بەکار دێنێ. بۆ وێنە، لەلایەکەوە ئەندامی چالاکی ژێکاف سەدری قازی کە نوێنەری مەهابادە لە مەجلیسی ئێران، ڕەخنە لە هەڵسوکەوتی سوپای ئێران و ژاندارمری لە کوردستان دەکرێ و کوردەکان بە نیشتمانپەروەری ئێران ناو دەبات و لەگەڵ کوردە جوداخوازەکانی تر سنووریان بۆ دادەنێ؛ لە لایەکی ترەوە، لەلایەن براکەیەوە "قازی محەمەد" کە شارەداری مەهابادە، چالاکیی تر جێبەجێ دەکرێ. بۆ وێنە، نیسانی ١٩٤٥ دەستەیەکی چەکداری بە سەرکردایەتیی حەمید ئاغا کە ژمارەیان دەگاتە (٥٠) کەسێك، لە مەهاباد ڕێك خستووە، جلوبەرگێکی سوپاییی یەك شکڵ (یونیفۆرم)ی بریتی لە کراسی خاکی و پانتۆڵی ئاوی (شین)یان لەبەر کردووە، وەك (گاردی ڕێزگرتن) بۆ پاراستنی شاری مەهابادو پێشوازیکردن لە نوێنەرانی هاوپەیمانەکان دیاری کراون. ئەم دەستە چەکدارە بە چەکی سەردەم پڕچەك کراون و خولێکی ئامادەکاریی پەلەیان دیوە، هەروەها لە هێندێ شوێن لەسەر ڕێگەکان بۆ ناو شاری مەهاباد لە باشوورەوە، واتە لە ناوچەی موڵگەی لەشکری کوردستان، بە بڕیاری قازی محەمەد ڕێگە بەستراوە، بۆ ئەوەی ئەگەر سوپای ئێران بەرەو مەهاباد چوو، پێشگیریی لێ بکەن.

جێژنی ڕێکەوتی ١٩٤٥/٥/٩ بە بۆنەی سەرکەوتنەوە بەسەر فاشیزمدا گێراو ئاڵای سوور لە مەیدانی ناوەندی شاری مەهاباد و ئاڵای نەتەوایەتیی کورد لەسەر بینای کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی کولتووریی سۆڤیەت هەر لەوێ هەڵکرا؛ ئەم کردەوەیە، بە وتەی دەسەڵاتدارانی کورد خۆیان، نیشانەی ئەوەیە کە کوردەکانی مەهاباد ئامادە نین چیتر دەسەڵاتداریێتیی دەوڵەتی ئێران قبووڵ بکەن. ژێکاف، بەپێی ئەو پرۆگرامە بەرینەی کە هەیەتی مەبەستی سەرەکیی سەربەخۆیی کوردستان و بەربەرەکانیی کۆنەپەرستییە؛ گرووپ و تاقمی جۆراوجۆری سیاسیی تێدایە، تەگەرە دەخەنە ڕێی و هاندەرانە دەجووڵێنەوە. بۆ وێنە، سەرەتای ١٩٤٥، دوای گەڕانەوەی فەهیمی (وەزیری بێپۆستی ئێران) لە کوردستانەوە بۆ تاران، دەوڵەتی ئێران دەستی بە ناردنی چاو شەکرو کارگە (مانوفاکتۆر) کرد بۆ دانیشتوانی مەهاباد. ئەم شتانە لەلایەن حوسێن زەرگەری مووچەخۆری بەڕێوەبەرێتیی مالییەی مەهابادەوە کە لە

هەمان کاتدا ئەندامی ژێکافە، بەش دەکرێن. زەرگەریش هێندێ لەو شتومەکەی، لە ڕێگەی بەرتیل وەرگرتنەوە، داوە بە هێندێ سەرۆك هۆزو خێڵی کورد. کاتێك فەرمانداری مەهاباد فەرمانی داوە لێکۆڵینەوە لەم بارەیەوە بکرێ، زەرگەری ڕێکەوتی ١٩٤٥/٥/١٢ بە پشتیوانیی عەزیز خان و هۆزی بەگزادە میتینگێکی لە شاری مەهاباد ڕێك خستووە و کاربەدەستانی خۆجێیی ئێرانی لەم ڕووەوە تاوانبار کردووە و بەشدارانی میتینگی هان داوە بینای فەرماندارو پۆلیس تێك بدەن. پێنج پۆلیس و کوردێك لە کاتی تێکهەڵچووندا کوژراون. پاشان هێندێ سەرۆك هۆزی کورد کە بەشی شەکرو چاو کارگەی خۆیان وەرنەگرتووە لە عەزیز خان، داوای شەکریان لێ کردووە. عەزیز خانیش هاندەرانە پێی گوتوون ئەوو حوسێنی زەرگەری بە فەرمانی ڕووسەکان کاریان کردووە.

کۆتایی ئابی ١٩٤٥ ئینگلیزەکان بۆ پیشاندانی فیلمی سینەمایی هاتنە مەهاباد. دەستەیەکی کوردی مەهابادی بە بەردبارانکردنی ئیشپێکەری سینەماکە پێشگیرییان لە نیشاندانی فیلمەکە کرد.

سەرەڕای هێندێ ڕاستیی ئەوتۆ کە نیشاندەری ڕەنگاوڕەنگ بوونی ئەندامانی ژێکافە، بەڵام ئەم ڕەنگاوڕەنگ بوونەی بەگشتی ناتوانێ سیاسەتی گشتیی ئەم پارتە بگۆڕێ. چالاکیی ژێکاف زۆر ڕێگەی بۆ ڕێکخستنی شانەی پارتی توودەی ئێران لە ناوچە کوردیەکاندا هەموار کردووە. بۆیە پارتی توودە لەم دواییانەدا توانیویەتی چەند شانەی خۆی لە باکوورو ڕۆژهەڵاتی ئێران لەسەر سنووری تورکیا- ئێران، لە ماکۆو مەهابادو ناوچەی شکاکان، ڕێك بخات. ڕۆژنامەی "ئازادگان" ڕێکەوتی ١٩٤٥/٧/٢٢ سەبارەت بە ڕێکخستنی کۆمیتەی پارتی توودە لە کوردستان، واتە لەو ناوچانەی کە کوردەکانیان تێدا ڕاپەڕیون، نووسیویە. ئازادگان باسی بەیاننامەی کۆمیتەی ناوچەیی پارتی توودەی ئێرانی بۆ دانیشتوانی ئەوێ کردووە، کە تێیدا هاتووە لە چەوساندنەوەو هەژاریی گەلی کورد دوواوە، داوای لە کوردەکان کردووە بێنە توودەوەو لە ڕیزەکانی توودەدا یەك بگرن و دژی کۆنەپەرستی خەبات بکەن. چالاکیی ژێکاف لە عیراق بە سەرکردایەتیی مەلا مستەفایە، بەپێی هەواڵی گەیشتوو لەوێش پەرەی سەندووە. سەرەتای ١٩٤٥ کۆمیتەی ژێکاف لە ناوچە کوردنشینەکانی

باشوور- ڕۆژهەلاتی تورکیای هاوسنووری ئێران و عیراق دەستی بە ڕێکخستنی شانەکانی خۆی کردووە.

زۆربەی ئەندامانی ژێکاف لە عیراق و تورکیا، هەروەك لە کوردستانی ئێران، ڕۆشنبیرانی پیشکەوتنخوازو بازرگانی بچووك، پیشەسازو کوردی ئاسایی و ئاژەلدارو جووتیارن. هەروەها هێندێ لە هەرە پێشکەوتنخوازە فیئۆدالەکانی کورد دێنە ڕیزی ژێکافەوە. چالاکیی ژێکاف لە عیراق و تورکیا لە یەك بەرەدا بە چالاکیی پارتە کوردیەکانی ئەوێوە بەستراوە. بۆ وێنە، لە کوردستانی عیراق گرووپی (ڕزگاریی کوردستان) کە لەسەرەتای ١٩٤٥دا پێك هاتووە، لەگەلّ پارتی ژێکافدا شان بەشان چالاکی دەکەن. گرووپی ڕزگاریی کوردستان چالاکیی خۆی لە ناوچەکانی باکووری عیراقدا بە دروشمی ((بژی کوردو کوردستانی گەورەو ئازادی و سەربەخۆیی بۆ کوردستان)) دەکات. سەبارەت بە چالاکیی تری ئەم پارتەو پرۆگرامەکەی ئاگاداریمان نییە. بەلام دەتوانین زیاتر لەسەر ئیش وکاری (بەشی کوردیی سەر بە پارتی کۆمۆنیستی عیراق) بدوێین. ئەم پارتە ماوەیەك لەمەوبەر دامەزراوە، چالاکیی لەناو کرێکاران و کوردی دانیشتووی بەغداو مووسلّ و کارگەکانی نەوتی عیراق، هەروەها ناو ئاژەلدارو جووتیاران و ڕۆشنبیرانی کوردی ناوچەکانی باکووری عیراق و تورکیای نزیك بە سنووری عیراقدا دەکات. ئەم پارتە شانەو ڕێکخراوی لە هەولێرو کەرکووك و بارزان و سلێمانی و بادینان هەن.

(بەشی کوردیی پارتی کۆمۆنیستی عیراق) کە گۆڤاری خۆی بەناوی "یەکێتیی تێکۆشین"ەوە دەردەکات، تا حوزەیرانی ١٩٤٥ چوار ژمارەی ئەم گۆڤارەیان دەرکردووەو هەر ژمارەیەکیش (٢٤) لاپەڕەیە. زۆربەی وتارەکانی ئەم گۆڤارە ڕەنگدانەوەی باری ژیانی زەحمەتکێشانی کورد لە عیراق و ناوچەکانی باشوورو ڕۆژهەلاتی تورکیایە. هەروەها خەباتی گەلی کورد دژی چەوسێنەران و هەولدانیان بۆ سەربەخۆیی بلاو دەکاتەوە. بەشێکی زۆر لە نووسینەکانی، بانگەوازی خەلك دەکات بۆ لەناوبردنی پەیوەندیەکانی خێلەکی و دەرەبەگایەتی. هەروەها پشتیوانی لە خەباتی نەتەوە یەکگرتوەکان و بەتایبەتی یەکێتیی سۆڤیەت دەکات دژی کۆنەپەرستیی جیهان. گۆڤارەکەیان بە زمانێکی ئاسایی و ساکار و تایبەت بۆ

زۆربەی زەحمەتکێشانی کورد نووسراوە. ئەم بانگەوازە بەم چەشنەی خوارەوە لە لاپەڕەی یەکەمی گۆڤارەکەیاندا بۆ خوێنەران نووسراوە: ((کاتێك دەیخوێننەوە، بیدەن بە براکانی خۆتان، بیدەن بە کرێکاران و جووتیاران و سەربازان و بیدەن بە خوێنەرانی تر... خوێندەواران بیخوێننەوە بۆ نەخوێندەواران، تاکوو ئەوانە هەموو بزانن چۆن دەژین و تووشی چ کوێرەوەرییەك دەبن و چۆن پارتی کۆمۆنیست دەیەوێ یارمەتییان بدات و ڕزگاریان بکات و ...)).

پرۆگرامی (بەشی کوردیی پارتی کۆمۆنیستی عیراق) کە لە ژمارەی (٣و٤)ی "یەکێتیی تێکۆشین"دا بڵاو کراوەتەوەو پێشکەشتان دەکرێ، زۆربەی بەندەکانی بەتایبەتی لە ئاستی ڕیفۆرمی ئەرزی و خەباتی دژی کۆنەپەرستیدا وشە بە وشە لەگەڵ پرۆگرامی پارتی ژێکافدا یەك دەگرنەوە.

ڕاستیەکانی سەرەوە کە باس کران، گەرچی تەواو نین، بەڵام دەرفەتی ئەوە دەدەن پێشەکی چەند ئەنجامی گرنگ بەدەست بهێنین:

١- ڕووداوەکانی سەرەتای ١٩٤٥ لە کوردستانی ئێران هێندە مەترسییان بۆ دەسەڵاتدارانی ئێرانی نییە کە سوپایەکی زۆر بە پشتیوانیی تۆپخانەو هێزی هەوایی بۆ لەناوبردنیان تەرخان کراوە. ئەرکی ئەم بزووتنەوەیە دراوەتە دەستی ستادی ئەرتەشی ئێران.

٢- مەترسیی کاربەدەستانی ئێران لە جیابوونەوەی کوردەکانە، کە هەر لەسەرەتای نەمانی دیکتاتۆریەتی ڕەزا شاوە تائێستا ناوچەکەیان کۆنترۆڵ کردووەو دەسەڵاتی ئێران لە ناوچەکەدا نەماوە.

٣- بە گەشەپێکردنی خەباتی چینایەتی لەگەڵ خەباتی نەتەوایەتیدا، بزووتنەوەی کورد دەنگێکی دیموکراتیانەو پێشکەوتووتری بە خۆوە گرتووە، دەوری دەرەبەگەکان کەم بووەتەوە.

٤- سەرچاوەی زۆر بەدەستەوەیە کە بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد لە کوردستانی عیراق و تورکیا، وەك کوردستانی ئێران، پەرە دەستێنێ و بەهێزە.

٥- کردەوەکانی کۆمەڵە، سەرەڕای ئەو هەموو کەندو کۆسپ و کەموکوڕی و هەڵانەی کە هەیەتی، توانیویە زۆربەی کۆمەڵانی خەڵك لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە.

کۆڵنەدانی ژێکاف و بەردەوامبوونی لە خەباتدا، نزیکبوونەوەی هێزە پێشکەوتنخوازەکانی ئێران و عیراق و تورکیا، پشت بەستنی بە جووتیاران و کاسبکارانی کورد، هەروەها پشتیوانیی ڕوون و ئاشکرای ژێکاف لە گەلانی ئازادیخوازو دیموکراتخواز لە پێشەوەی هەموویان یەکێتیی سۆڤیەت، زیاتر بوونەتە مایەی گەشەکردن و بەهێزبوونی[1].

ڤیلچیفسکی لەلایەکی ترەوە نووسیویە: ژێکاف بڕیاری دابوو ئەگەر بزووتنەوەی کورد لە کوردستانی عیراق بەردەوام بێ و پەرە بستێنێ، پشتیوانیی لێ بکات. بەڵام هەر لەم وەختەدا بوو کە جاسووسانی ئینگلیز بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەستیان خستە ناو پارتی ژێکافەوە و بۆیان دەرکەوت کوردەکانی عیراق پەیوەندییان بە سەرۆکایەتیی بارزانی و هێزە دیموکراتیەکانی تری کوردەوە هەیە.

ئینگلیزەکان توانییان، بە سەرۆکایەتیی ڕاستەوخۆی پاڵکۆنیک "کینگ" کە ڕاوێژکاری سیاسیی ئینگلیزە لە کەرکووك و مووسڵ، دەست بە تێکدانی پارتی ژێکاف بکەن و باڵی ڕاستی ژێکاف کە لە فیئۆداڵ و تاجیرە گەورەکان پێك هاتووە، دژی باڵی چەپی هان بدەن. هەروەها باڵی ڕاستی ژێکاف داوا لە پارتی ژێکاف دەکات واز لە سیاسەتی دژی ئینگلیز بێنێ و لە پارتی توودەی ئێران دوور بکەوێتەوە. باڵی ڕاستی ژێکاف لەم کاتەدا، دژی باڵی چەپی پارتی ژێکاف بە سەرۆکایەتیی زەبیحی، بلۆکێکیان بۆ ماوەیەکی کورت لەگەڵ ناسیۆنالیستە ڕاستڕەوەکانی ئازەربایجاندا کە هەوڵیان دەدا لە یەکەم ڕۆژی دەستپێکردنی بزووتنەوەی نەتەوایەتییەوە لە ئازەربایجانی ئێران پیشانی بدەن گوایە ناوچە کوردیەکانی باکوورو ڕۆژئاوای ئێران ((هەر لەکۆنەوە)) هی ئازەریەکان بوون، دامەزراند. هەر ئەم تاقمەی باڵی ڕاستی ژێکاف، بۆ ڕێکخستنی ڕێکخراوی ژێکاف لەناو شکاکەکاندا، زەبیحی‌یان نارده ئەو ناوچەیە. ناسیۆنالیستە ڕاستڕەوەکانی ئازەری، بەتایبەت نوێنەرانی کۆنەپەرست و ناسراوی مەجلیسی ئێران –وەك سەرتیپ زادەو خەلعەت بەری و کەسرەویی تەبریزیی ڕۆژنامەنووس– کە لە مەبەستێکی سەفەری زەبیحی ئاگادار بوون، توانییان

---

[1] ئەرشیڤی ناوەندیی هەڵگرتن و لێکۆڵینەوەی دیکۆمێنتەکانی مێژووی سەردەم، ف١٧، ئو١٢٨، د٤٤، ل٧٢-٧٩.

به یارمەتیی کۆنەپەرستانی ئێران زەبیحی بگرن و بە تاوانی چالاکیی دژی دەوڵەتی ئێـران و پارچەپارچـەکردنی وڵات، موحاکەمـەی بکـەن. دووبـەرەکی لـە ئاسـتی سـەرکردایەتیی ژێکاف‌دا بوو بە هۆی ئەوەی وا بزووتنـەوەی کورد لـە کوردستانی ناوەندیـدا، کـە لـە نیـوەی دووەمـی سـاڵی ١٩٤٥ بـەدواوە سـەری هەڵـدابوو، بـەبێ سەرکردایەتی بمێنێتەوە[1].

کاپیتـان ڤیلچیفسکی کـە سـەردەمی شـەڕی دووەمـی جیهـانی لـە ناوچـەی موکریـان بووە، لەسەر پارتی ژێکاف نووسیویە: جیاوازیی پارتی ژێکاف لەگەڵ پارتە کوردیەکانی تردا ئەوەیە کە ئەم پارتە خەبات بۆ مافی کورد لە هەموو پارچەکانی تری کوردستاندا دەکـات؛ جیاوازییـەکی تـری ئـەم پارتـە ئەوەیـە کـە ئامادەیـە لەگـەڵ تـەواوی پارتـە دیموکراتیەکانی ئەم وڵاتانەدا واتە ئێران و عیراق و تورکیا، بەرە پێك بهێنێ. مەسەلەی یەکخستنی کوردستـان، بەپێی بەرنامـەی ژێکـاف، دەکەوێتـە قۆنـاغی دووهەمـەوە پـاش کۆتـایی هـاتن بە شەڕ. یـەکگرتنی تـەواوی کوردەکـان لـە دەوڵـەتێکی یـەکگرتوودا، دوای بـەدیهاتنی خودموختـاری بـۆ کوردەکـان لـە چوارچـێوەی تورکیـاو ئێـران و عیراقـدا، جێگیربوونی دیموکراسـی لـەم وڵاتانـەدا دێنێتـە دی. دوای پێکهـاتنی ڕێکخـراوی ژێکـاف، ئەم پارتە توانیی زۆربەی لایەنگیرانی چەپ و پێشکەوتووی بزووتنەوەی کورد لـە ئێران و عیراق بهێنێتە ڕیزی خۆیەوە. کۆمیتەی ناوەندیی ژێکاف لە مەهابادە، هەروەها ڕێکخـراوو شانەی لە عیراق و بە تایبەت لە سلێمانی هەیە.

ئـەم پارتــە لــە ســاڵی ١٩٤٤دا نزیکـەی بیـست بەیاننامــەی دەرکــردووە، کــە ناوەڕۆکـەکانیان دژی ئینگلیـز بـووەو بوونـە هـۆی پەرۆشـیی ئینگلیزەکـان. بـەڵام ئینگلیزەکـان توانییـان بەشـێکی زۆری بـاڵی ڕاسـتی ئـەم پارتـە بـەرەو لای خۆیـان ڕابکێشن. لەبـەر ڕوون نـەبوونی پرۆگرامـی پـارتی ژێکـاف و تـاکتیکی بۆ دوای شـەڕ، کێشەیەکی زۆر لەناو کۆمەڵەدا لەسەر ئینگلیـز پەیـدا بـوو. ئەویش ئەوە بـوو کە ئایا ئینگلیز دۆستی کوردە یان دوژمن؟ ئایا سیاسەتی ئینگلیز لـە ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاستدا

---

[1] هەمان سەرچاوە، ف١٧، ئو١٢٨، د١٧٥، ل٢٠.
هەروەها بڕوانە: ڤیلچیفسکی، بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد، تبلیس، ١٩٤٦، ل٢٥٠.

قازانجی بۆ گەلی کورد هەیە یان زەرەر؟ ئەوە بوو ئەم کێشەیە لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٤٥دا بوو بەهۆی لێك بڵاوبوونەوەی ئەم پارتە. ئەم لێك بڵاوبوونە مەسەلەی گیرانی "زەبیحی"ی سکرتێری ئەم پارتەی بەدواوە بوو، کە کاتی گەشتەکەی بۆ لای کوردەکانی باکوور- ڕۆژئاوای ئێران لە نزیکی شاری ڕەزائیە لەلایەن پۆلیسی ئێرانەوە گیرا. پۆلیس چاپەمەنیی پارتی ژێکافی بە زەبیحی گرتووە، کە بووە هۆی تاوانبارکردنی زەبیحی بە ڕاپەڕین دژی دەوڵەتی ناوەندی. کاربەدەستانی ئێرانی دەیانەوێ ناوبراو موحاکەمە بکەن. ئێستا زەبیحی نزیکەی ساڵێکە لە زیندانی تاراندایە. دەنگوباسی زۆر لەسەر ئەوە هەیە کە پێدەچێ گرتنی زەبیحی لەلایەن پۆلیسی ئێرانەوە بە دەسیسەی باڵی ڕاستی ژێکاف بووبێ، بۆ ئەوەی بەم چەشنە لە ڕەقیبی باڵی چەپی ژێکاف ئازاد بن.

"کووك" کۆنسوڵی ئینگلیز لە کرماشان، ڕێکەوتی ٩ی کانوونی دووهەمی ١٩٤٣ لە چاوپێکەوتندا سەبارەت بە پارتی کۆمەڵە گوتوویە:

- ئەم پارتە لەلایەن شەریف خانەوە پێك هێنراوە ناوبراو لە ١٩٢٠وە لایەنگری ئینگلیز بوو. بەڵام ئێستا لە بەرلینەو کار بۆ ئەڵمانیەکان دەکات. بە وتەی کووك، کۆمەڵەی ژێکاف پشتیوانی لە ئەڵمانەکان دەکات. هەروەها کووك گوتی: داواکاریی کوردەکان بۆ سەربەخۆیی، شتێکی بێماناو بێبنچینەیە[1].

- ماتڤییێڤ. ف. کۆنسوڵی سۆڤیەت لە تەورێز سەبارەت بە سەفەری فەهیمی لە تشرینی دووهەمی ١٩٤٥دا بۆ کوردستان نووسیویە، فەهیمی داوای لە خەڵك کردووە کۆتایی بەو میتینگ و خۆپیشاندانەی کە ژێکاف ((بۆ دانی نەوتی ئێران بە یەکێتیی سۆڤیەت)) ڕێکی خستووە، بهێنێ، لەبەر ئەوەی چیتر ئەم کردەوە دژی دەوڵەتیانە تەحەمووڵ ناکرێن[2].

- دەوری پارتی توودە لە کوردستان زۆر کەم بوو، ئەویش تا ڕادەیەك لەبەر سروشتی گوندایەتیی ناوچەی کوردستان بوو. پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی پاتریارکیی

---

[1] ئەرشیڤی وەزارەتی دەرەوەی ڕووسیای فیدراڵ، ف٠٩٤، ئو٢٩، پ٣٤٢، د٦٧، ل٢٩.

[2] هەمان سەرچاوە، ف٠٩٤، ئو٣١، د٦٤، پ٣٥٣، ل٢٢٢.

موحافەزەکاری کۆمەڵگەی کوردەواری کۆسپێك بوو بۆ خۆجێکردنەوەی توودە لەوێ. هـۆزو خێڵـەکانی کـورد کـە لـەژێر دەسـت و گوێڕایـەڵی سـەرۆکەکانی خۆیـان بـوون، نەیاندەهێـشت پـارتی تـوودە شـانەکانی خـۆی لـە گونـدەکان دامـەزرێنێ. سـەرکردە موحافـەزەکارە ناسیۆنالیـستەکانی (کۆمەڵـە) چـاوی بینینـی توودەیـان نـەبوو، تـەنیا هێندێ کەس هەوڵی هاوکاریی توودەیان دەدا[1].

– لە ڕاپۆرتێکی ڕێکەوتی مارتی ١٩٤٥ی کۆنسوڵی سۆڤیەتدا لە ورمێ، گوتراوە: عومەر خان ڕێکخراوی پارتی ژێکاف لـەناو خێڵی شکاك دادەمـەزرێنێ و ڕادەگەیـەنێ ئەم پارتە بە ئاگاداری و پشتیوانیی سۆڤیەت پێك هێنراوە. عومەر خان گەشت بەناو هۆزەکانی کوردی ناوچەی ماکۆدا دەکات بۆ گەشەپێدانی ژێکـاف، بەڵام دەوتـرێ ئەم هەوڵدانەی عومەر خـان لـە ئەنجامی هەوڵـدانی بێوچانی سەرکونسوڵی سۆڤیەتدا لە ماکۆ سەری نەگرتووە[2].

ڕاوێـژکاری باڵوێزی یـەکێتیی سۆڤیەت لـە ئێـران ئـا. یـاکۆبووف لـە نامەیەکدا بۆ سەرکۆنسوڵی یەکێتیی سۆڤیەت لە ورمێ، نووسیویە:

١– بڕیاری هاوڕێ مۆڵەتۆڤ لە ڕێکـەوتی ٣١ی ئـابی ١٩٤٢دا سەبارەت بـە کێشەی کـورد، بـەبێ چەندوچـوون جێبـەجێ بکـەن. [ئـەم بڕیـارە لـە ژمـارە ١١ی گۆڤـاری "گزینگ"دا بڵاو کراوەتەوە– هەورامی].
٢– لەبـەر ئـەوەی زۆربـەی دانیـشتوانی ناوچـەی ڕەزائیـە ئازەربایجـانین، دەبـێ بایەخی سەرەکیی ئێوە ئیش‌وکار بێ لەناو دانیشتوانی ئازەریدا.
٣– لەنزیکـەوە سـەرنجی زیـاتر بدرێتـە ڕێکخـراوی کۆمەڵـە "ژێکـاف" و زانیـاریی زیــاتر لەســەر ئەنــدامانی ســەرکردایەتی و بەگــشتی ئەنــدامانی تــری کۆمەڵــە کۆبکرێنەوە[3].

---

[1] بڕوانە: ڕەزا قودس، ئێران لە سەدەی بیستەمدا، مۆسکۆ، ١٩٩٤، ل١٧٢.
[2] ئەرشیڤی وەزارەتی دەرەوەی ڕووسیای فیدڕاڵ، ف٠٩٤، ئو٣٧، د٦٥، پ٣٥٩a.
[3] هەمان سەرچاوە، ف٠٩٤، ئو٣١، د٧٠، پ٣٥٤، ل٣٢، ٣٥.

**ڕاپۆرتی ڕۆژی ٢٠ی شوباتی ١٩٤٥ی وتوویژی**
**جێگری کونسوڵی گەورەی یەکێتیی سۆڤیەت لە تەوریز**
**"ڤولییێف. ن. گ" لەگەڵ سەرکردەی بەناوبانگی کورد قازی محەمەددا**
١٩٤٥/٣/٣، ژمارە ١٠٤:

٢٠ی شوباتی ئەمساڵ قازی محەمەد سەرکردەی بەناوبانگی کوردو دانیشتووی شاری مەهاباد، لە گەڕانەوەمدا لە تارانەوە بۆ مەهاباد، سەری لە کونسوڵخانەی ئێمە دا.

قازی محەمەد کە لەگەڵ سەرکردەکانی تری کورددا لەلایەن "ساعید"ی سەرۆک وەزیرانی پێشووی ئێرانەوە بە ناوی دەوڵەتی ئێرانەوە داوەت کرابوو، بە هەموویەوە نزیکەی چوار مانگ لە تاران بووە. لەسەر ئەم گەشتەی و ئەو وتوویژانەی کە لەگەڵ ڕێبەرانی دەوڵەتی ئێران، هەروەها شا هەیانبووە، بەم چەشنەی خوارەوە بۆی گێڕامەوە:

((بە گەیشتنمان بە تاران، ئێمە یەکەم جار چاوپێکەوتنمان لەگەڵ سەرۆک وەزیران "ساعید"دا هەبوو. وتوویژ لەگەڵ وی زۆر درێژەی نەخایاند، ساعید زۆرتر پرسیارو سەرنجی لەسەر دەنگوباسی جۆراوجۆری سەبارەت بە نیازی کوردەکان بۆ دروستکردنی کوردستانێکی سەربەخۆ هەبوو. بەڵگەی سەلماندنیشی، نەناساندنی دەسەڵاتدارانی خۆجێیی ئێران بوو لەلایەن کوردەکانەوە. بۆ وێنە، باسی ڕووداوێکی کرد لە مەهاباد؛ ژەنەڕاڵێکی ئێرانیی "هووشمەند" ناو کە ڕۆیشتبوە ئەوێ، کوردەکان دەریان کردبوو. من بە نۆرەی خۆم ئەم هەواڵانەی ساعیدم بە درۆ خستەوەو سەرنجیم بۆ ئەوە ڕاکێشا کە دەوڵەتی ئێران هیچ بایەخێك بە گیروگرفتی تەندروستی و پەروەردە لە کوردستان نادات. ئەمەش دەبێتە هۆی ناڕەزایی لەلایەن خێڵەکانی کوردەوە. دوای ئەوە، بڕیارمان داوە لە چاوپێکەوتنی داهاتوودا بە وردی لەم بارەوە بدوێین. پاشان لێك جیا بووینەوە. هاوڕێکانم داوایان لە ساعید کرد کێشەی پارەدان بۆ ڕاگرتنی ژاندارمریی لە کورد پێکهاتوو چارەسەر بکات. ساعید بەڵێنی جێبەجێکردنی ئەو داواکاریەی دا. دوای چەند ڕۆژێك، لەگەڵ هاوڕێکانمدا پێکەوە، لە ڕۆژی پێشکەشکردنی نیشاندا بە ئەفسەرانی ئێران، بە شا ناسێندراین. کاتێ شا خەڵاتەکانی دا بە ئەفسەرەکان، بە شێوەیەکی تایبەتی ڕووی لە ئێمە کردو دەستی بۆ ئەفسەرە ئێرانیەکان ڕاکێشاو گوتی: ((ئەم ئەفسەرانە برای ئێوەن لێیان

نزیك ببنەوە پێکەوە خزمەتی ولاّت بکەن)). منیش بەم چەشنەی خوارەوە وەلاّمی شام دایەوە: ((بەپێی هەم باوەڕی ئاینیی ئێمەی سوننی مەزهەب و هەم یاسای ئاینیمان، خەڵك دەبێ خزمەتکاری شای خۆی بێ، ئێمە بەپێی یاسای ئاینیی خۆمان هەموو کاتێك وەفادارو سەر بە شاهەنشای خاوەنشکۆ بووین)) [1].

دوای ئەوە شا ڕووی لە ساعید کردو فەرمانێکی تایبەتی دا کە لەگەڵ هەموو سەرکردەکانی کورددا سەبارەت بە پێویستیەکانیان وتووێژ بکات و هەموو هەنگاوێك بۆ بەجێگەیاندنی ئەو پێویستی و داخوازیانە هەڵبگیردرێ.

چەند ڕۆژێك پاش چاوپێکەوتن لەگەڵ شادا، کابینەی ساعید کەوت و بەم چەشنە نەمانتوانی بۆ جاری دووەم چاومان پێی بکەوێتەوە. ئەو ماوەیەی کە لە تاران بووم، من بە تەنیا و لەگەڵ هاوڕێکانمدا پێکەوە چەند جارێك لەگەڵ "ڕەزم ئارا"ی سەرۆکی ستادی گشتیی سوپای ئێران چاوپێکەوتنمان هەبوە. ڕەزم ئارا لە وتووێژێکی خۆیدا بە ئێمەی گوت: ((ولاّتی ئێمە لە کاتێکی هەرە دژواردا دەژی. لەم ڕۆژە دژوارانەدا ئەرکی هەر ئێرانییەکی خاوێنە کە دژی هەموو چەشنە خیانەتکارێك ڕاوەستێ و دەرفەتی ئەوە نەدەن دەسەلاّتدارانی دەرەوە کەڵك لە بێهێزیی ئێمەو باری ناخۆشی ولاّت وەربگرن)).

ڕەزم ئارا لە وتووێژێدا لەگەڵ ئێمە، بەڵێنی دا لە کاتێکی نزیکدا ژەنەڕاڵ "هووشمەندی ئەفشار"ی فەرماندەی لەشکری سنە لە کار بخات. بەلاّم پاشان، وەك دەرکەوت، ڕەزم ئارا سیاسەتێکی دووڕوویانەی لەگەڵ ئێمەدا بردە سەر؛ یەکەم ئەو نەك تەنیا هووشمەندی لە فەرماندەی لەشکری لەکار نەخست، بەڵکوو بەپێچەوانەوە هەڵیان بژارد بۆ نیشانە وەرگرتن و دوای چەند ڕۆژێك هووشمەند بەبۆنەی چالاکیی سەرکەوتوانەی لە دژی حەمەڕەشید خان لە ناوچەی سەقز لەلایەن شاوە نیشانی پێ خەلاّت کرا. جگە لەوە، ڕەزم ئارا لە تاران دەیویست دووبەرەکی لەنێوان من و هاوڕێکانمدا بنێتەوە، پێشنیاری بە هاوڕێکانم کردبوو لە ڕێگەی سنەوە (نەك تەورێز) بگەڕێنەوە مەهاباد، تا لە سنە هاوکاریی ژەنەڕاڵ هووشمەند بکەن. بەم چەشنە

---

[1] پێناچێ قازی محەمەد قسەی وای کردبێ. ئەگەر کردبێتی، بەو چەشنە لای قولیێڤ نایگێڕێتەوە.

دەیویست دووبەرەکیی نێوان من و هاوڕێکانم پیشان بدات. بەڵام هاوڕێکانم پێشنیاری هووشمەندیان پەسند نەکردبوو.

کاتێك چوومە لای "زەند" وەزیری جەنگ، لە دەمی وتووێژدا ڕەزم ئارا هاتە ژووریٚ، من بەگوێرەی پێویست ئەوەندە گوێم نەدایە. ئەمجا زەند هەستاو ڕەزم ئارای پیٚناساندم و بە چاوێکی سەیرەوە پرسیی: ((ئێوە یەکتر ناناسن؟)). من لە وەڵامدا گوتم لەمێژە ڕەزم ئارا دەناسم و چەند جار چاوپێکەوتنم لەگەڵیدا هەبوەو ڕێزی لیٚ دەگرم، بەڵام نازانم بۆچی ئەو لەگەڵ مندا بیٚمەیل و بیٚڕێزە. ڕەزم ئارا یەکسەر تیٚگەیشت مەبەست لە بیٚئەنجامیی هەوڵدانی ئەوە کە دەیەویٚ دووبەرەکی بخاتە نێوان من و هاوڕێکانمەوە، بەڵام سەری نەگرتووە. لەبەر چاوی زەند نەیدەویست وا پیشان بدات کە لە من تیٚنەگەیشتووە، بۆ ڕۆژی دوایی بە شێوەیەکی ماقووڵانە چاوپێکەوتنی لە ژوورەکەی خۆی دیاری کرد.

دوای ڕۆیشتنی ڕەزم ئارا، زەند پرسیاری لە من کردو گوتی: چ دەنگوباسێك لەمەڕ سەربەخۆیی کوردستان هەیەو ئەو ڕۆژنامەیە چییە کە بە نهێنی لە کوردستان دەردەچیٚ و بیروڕای سەربەخۆیی بۆ کوردان بڵاو دەکاتەوە؟ بۆچی سەرکردەکانی کورد دان بە دەسەڵاتی سوپای ئێراندا نانێن؟ بۆ وێنەش دەرکردنەکەی هووشمەندی لە مەهاباد هێنایەوە. منیش وەڵامم دایەوە کە ئێمە دژی دەسەڵاتی سوپای ئێران نین، ئەوە دەسەڵاتدارانی سوپای ئێرانن هەڕەشەی جۆراوجۆر لە کورد دەکەن. بۆ وێنە، ژەنەراڵ هووشمەند لە یەکێك لە قسەکانی خۆیدا لە سنە، بە ئاشکرا ڕای گەیاندبوو کە چیتر خۆی بە ژەنەراڵ هووشمەند ناو نابات، تا ئەوکاتەی تۆڵەی خۆی لە کوردە مەهابادیەکان بە ڕووخان و کاولکردنی مەهاباد دەکاتەوە. ئەمجا بە زەندم ڕاگەیاند کە کوردەکان نەخوێندەوارن و لە باری کولتوورییەوە دواکەوتوون. ڕاست نییە ئەگەر کوردەکان لە ڕێگەی هەڕەشەوە پەروەردە بکرێن و بە هەڕەشەی ڕووخاندنی شارەکانیان ناچار بکرێن گوێڕایەڵ و ملکەچ بن. ئەگەر دەتانەویٚ کوردەکان گوێتان بۆ بگرن و بە پاکی خزمەتی وڵات بکەن، دەبیٚ دەوڵەت زۆرتر لە باری لەشساغییەوە سەرنج و بایەخیان پیٚ بدا، چوونە ناویان و ئاشنابوون لەگەڵیاندا لەوە باشترە کە تانك لەدژیان بەکار بێنن. لە وەڵامی ئەمەدا، زەند گوتی: ئێران وڵاتێکی هەژارەو

توانای نییه قوتابخانه له هەموو ناوچەکان بکاتەوە، بەڵام هەموو هەنگاوێك بۆ یارمەتیدانی ئەوان لەم بارەوە بەکار دێنێ.

ڕۆژی دواتر، بە بانگهێشتنی ڕەزم ئارا، من و سەدری قازیی برام، نوێنەری مەجلیس، چووینە لای ڕەزم ئارا. گوتی گوایە ئێمەی کورد وەك نیشتیمانپەروەرێکی ڕاستەقینە ناجووڵێینەوەو ئیش بۆ بەرژەوەندی بێگانەکان دەکەین. منیش بەم چەشنەی خوارەوە وەڵامم دایەوە:

((من موسڵمانم و دەتوانم بیسەلمێنم پێشینانمان و من ئێرانی بووین و لە ئێراندا لەدایك بووین، کەس ناتوانێ شك لە ئێرانی بوونی ئێمە بکات. بەڵام ئەگەر ئێوە، بەپێی وتەی هووشمەند، ئێمەی کورد بە خۆفرۆش دەزانن، داوا دەکەم بیسەلمێنن. هووشمەند بە چی دەتوانێ ئێرانی بوونی ڕاستەقینەی خۆی بسەلمێنێ. ئێمە گومان لە ئێرانی بوون و لە کەسێتیی ئەو دەکەین.

دوای ئەوە، گوتم ماوەیەك لەمەوبەر لە ڕۆژنامەی "کیهان"دا نووسرابوو: گوایە من وتووێژم لەگەڵ حەمەڕەشید خاندا کردووە سەبارەت بە جیاکردنەوەی کوردستان لە ئێران و ڕاگەیاندنی سەربەخۆییی کوردستان. من بە تەواوی ئەم هەواڵە درۆزنەی ڕۆژنامە بەرپەرچ دەدەمەوەو داوا دەکەم یا دەبێ ئەم ڕۆژنامەیە نووسراوی ناوبراو بسەلمێنێ، یان دەبێ سەرنووسەرەکەی بەرپرسی دادگا بێ. بەگشتی، دوای وتووێژێکی دووروودرێژ لەگەڵ ڕەزم ئارادا لە کۆتاییدا دیسان ئامۆژگاریی منی کردو گوتی: دەبێ ئێمە لەگەڵ کاربەدەستانی سوپاییدا بە ئاشتی بژین و مافی کەرتەکانی سوپایی پێشێل نەکەین و نابێ کەس پێشگیری لە کاربەدەستانی سوپایی بکات سەبارەت بەوەی کە کوێیان پێ خۆشەو دەتوانن بۆ کوێ بڕۆن و لەکوێ کەرتەکانی خۆیان جێگر دەکەن.

من بۆ جاری دووەم لە تاران دیدارم لەگەڵ شادا کرد. ئەمجارە ئەو بە وردی وتووێژی لەگەڵدا کردمو سەبارەت بە ڕووداوەکانی کوردستان و بیروڕای کوردان و جیاکردنەوەی کوردستان لە ئێران و پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردستان، پرسیاری کرد. دوای ئەوە، ئامۆژگاریی کردم لە کاربەدەستانی سوپایی نزیك

ببمەوەو گوێڕایەڵی ئامۆژگاریەکانیان بم و پەیوەندیەکانی دوولایەنەیان لەگەڵدا تێك نەدەم. لە وەڵامیدا گوتم: ئێمە بەڕێزەوە سەیری کاربەدەستانی سوپای ئێران دەکەین، بەڵام تەنیا لەگەڵ هووشمەنددا کە سیاسەتێکی ناڕاستی بەرامبەر بە کوردان گرتۆتە بەر، پێك نایەین و لێك ناڕازین. لە درێژەی وتووێژەکاندا لەسەر پەروەردەو بارهێنانی کوردستان و لەشساغی بە شام گوت و داوام لێ کرد بە زووترین کات لە فۆند (سندووق)ی خاچی سوور بۆ کاری لەشساغی یارمەتیمان بدرێ. گەرچی شا بەڵێنی دا لە ڕێگەی خاچی سوورەوە یارمەتیمان بدات، بەڵام ئەم بەڵێنەش پاشان جێبەجێ نەکرا.

کاتی سەردانم بۆ تاران، زۆر جار لەگەڵ "فەهیمی"ی وەزیردا چاوپێکەوتنم هەبوە. ئەو پشتیوانیی لە کوردان کردووە لە مەجلیسی ئێراندا و کاربەدەستانی سوپایی ئێرانی بە تاوانبار داناوە کە شتی خراپیان زۆر کردووەو کاتی شەڕکردنیان دژی حەمەڕەشید خان وێرانکارییەکی زۆریان ناوەتەوە. کاتێك لە تاران بووم، جارێك لەگەڵ "بەیات"ی سەرۆك وەزیرانی ئێستادا چاوپێکەوتنم هەبوو، بەڵام دووروودرێژ نەبوو. ئەو ئامۆژگاریی ئەوەی کرد کە لەبەر بەرژەوەندی وڵات و پاراستنی یەکپارچەیی و سەربەخۆیی ئێران، نابێ دەرفەتی هێندێ کەس بۆ جیابوونەوەو ئاژاوەنانەوە لەناو کورداندا بدرێ. لە ئەنجامی چاوپێکەوتنی نوێنەرانی سوپایی و کاربەدەستانی تری دەوڵەتی ناوەندیدا توانیومە ئەم پرسیارانەی خوارەوە چارەسەر بکەم:

١- لابردنی فەرمانداری سوپایی مەهابادو دانانی کابرایەکی "سەریعول کەلام" ناو کە سوپایی نییە لە جێگای ئەو. دیاریکردنی ئەم فەرماندارەش لە ڕێگەی وەزارەتی ناوخۆوە بوو. ئەم کابرایە، وەك کاربەدەستێکی دەوڵەتی، هیچ نییەو بێدەسەڵاتە؛ لە ڕابردوودا وەك فەرمانداری مەهاباد ئیشی کردووەو زۆر بێلایەن و بەگشتی مرۆڤێکی چالاك نییە، تریاك دەکێشێ. ئێمەی کورد مرۆڤێکی وەك "سەریعول کەلام"مان دەوێ، کە بەپێی ئەو توانایەی هەیەتی، نەتوانێ پیلانی سیاسی بنێتەوە.

٢- من توانیم مەهاباد لە باری بەشی پەروەردەو بارهێنانەوە ڕاستەوخۆ بە تارانەوە ببەستمەوە، لەوێشەوە لە ڕێگەی پەروەردەو بارهێنانەوە بودجەی بۆ وەربگیرێ. بە داوای من، سەرۆکی پەروەردەو بارهێنان کابرایەکی کوردی "محەمەدی موکری" ناوی دیاری کرد. ناوبراو لە تاران دەژی و خوێندنی بەرزی تەواو کردووە.

٣- بە داوای من، بەڵێنیان دا کۆمیسیۆنێکی تایبەتی لەشساغی بۆ چاودێری و چارەسەرکردنی دانیشتوانی کورد بنێردرێتە کوردستان. هەروەها دکتۆرێکی زیادە دەنێرن، تا هەمیشە لەوێ بمێنێتەوە.

لە تاران، سەرەڕای هەوڵدانی زۆری من، دەسەڵاتدارانی ناوەندی ئامادە نەبوون کارێك بکەن مەهاباد ڕاستەوخۆ سەر بە تاران بێ. من تەنیا توانیم لە ڕووی پەروەردەو بارهێنانەوە مەهاباد ڕاستەوخۆ بە وەزارەتی پەروەردەو بارهێنانەوە ببەستمەوە.

ئێمەی کورد لە باری سیاسی و ئابوورییەوە قازانجمانە ببینە ناوچەیەکی سەربەخۆو ڕاستەوخۆ سەر بە تاران بین، نامانەوێ سەر بە ئوستانی چوار بین[1]. لە

---

[1] قازی داوای کردووە مەهاباد ڕاستەوخۆ سەر بە تاران بێ و لەژێر دەسەڵاتی ئوستانی چوار (ئازەربایجانی ڕۆژئاوا) بێتە دەرێ. وەك ئاشکرایە ئازەربایجانی ڕۆژئاوا: شارەکانی ورمێو خۆیو ماکۆو سەلماسو سەردەشتو خانێ (پیرانشار)و سولدوز (نەغەدە)و مەهاباد... دەگرێتەوە. زۆربەی ئەم ئوستانی چوارە کە لەمێژ نییە ناوی نراوە ئازەربایجانی ڕۆژئاوا، کوردنو بەشێکی جیانەکراوەی کوردستانەو ناوێکی دەستکردیان لێ ناوە. ئەم شارە مەڵبەندی قەڵای دم دم، ڕاپەڕینی هۆزەکانی جەلالی، زیلان، شکاك (جەعفەر ئاغای شکاك، سمایل ئاغاو عومەر خانی شەریفیو..) سوێسنیو گەورکو مەنگورو دێبوکریو... هتد بووە. کوردەکانی ئەو ناوچانە، نەك تەنیا دژی دەسەڵاتدارانی ئێرانی بوون، بەڵکوو دژی بەتورککردنو بەئازەربایجانیکردنی هەندێك ناوچەو شاری کوردستان بوون، چالاکانە لە شۆڕشەکانی باکوورو باشووری کوردستانیشدا بەشدارییان کردووە. بۆیە هەموو جارێك هەوڵی گواستنەوەو گرتنو کوشتنیان داون، بە زۆرداریش توانییان شارەکانی ورمێ ( ڕەزائیە)و خۆیو ماکۆو سەڵماس، لە زەمانی ڕەزا شاو ماوەیەکی زۆریش لەکاتی دەسەڵاتدارێتیی حەمە ڕەزا شای کوڕیدا، بە ڕووی کوردەکاندا داخەن. هەروەها توانییان تەنگ بە ئاسووریو ئەرمەنەکانی ئەوێ هەڵچننو ئاوارەی هەندەرانیان بکەن. ڕژێمە شۆڤێنیەکانی ئێران کە هەموو کاتێك تورکە ئازەرییەکان دەورێکی باڵایان تیا هەبوە، دەیانەوێ وای پیشان بدەن کە کوردستان یەك ئوستانەو ئەویش ناوەندەکە سنەیە.

ماوەیەکی زۆر ئازەربایجانی ڕۆژئاوا لەژێر دەسەڵاتی سمکۆدا بوو. ورمێ (ڕەزائیە)ش بۆ ماوەیەك کرا بە پایتەختی کوردستان. پاش شەهریوەری ١٣٢٠، واتە ئابی ١٩٤١، چەند جارێك کوردەکان گەمارۆیان داو ویستیان بیگرن، بەڵام سۆڤێتیەکان نەیانهێشت، کەچی کە نۆرەی ئازەرییەکان هات، هیچ بەرگرییان لێ نەکردن. گەرچی شارەکانی خۆیو ماکۆو میاندواو ورمێ، بە هێزی بازووی پێشمەرگەکانی کوردو فیداییەکانی ئاسووریو ئەرمەنی لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لە ئازەرییەکاندا ئازادکران، بەڵام دەسەڵاتی کوردی بەسەریاندا ڕاگەیاندرا. لێرەدا مەبەست لە قسەکانی قازی محەممەدە کە وەك بڵێی هەست نەکردن بێ بە لێپرسراوێتی بەرامبەر بە بەشێکی کوردستانو باسکردنی کێشەی کورد لە سنوورێکی تەسكو چوارچێوەی سەقزو بانەو بۆکانو هێندێ ناوچەی تردا، ئەویش پاش چوار ساڵو داواکردنی یارمەتی بۆ لەشساغیو پەروەردە. ئەمە

تاران چوومە باڵوێزخانەی سۆڤیەت و لەگەڵ باڵوێزدا وتووێژم کردو ئەم داوایانەی خوارەوەم خستە بەردەم:

١- ڕێکخستنی بەشی کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی کولتووریی سۆڤیەت لەگەڵ ئێراندا لە شاری مەهاباد[١].

٢- کردنەوەی خولی فێربوونی زمانی ڕووسی.

---

کاتێك بوو، واتە ١٩٤٥/٣/٣، کە هێشتا فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان دانەمەزرابوو، هێشتا ئازەریەکان نیازی ئەوەیان نەبوو داوای خودموختاری بکەن، تا بڵێین ڕەزائیە لە ژێر دەسەڵاتی ئازەریەکاندا بووە. گەرچی قازی بۆ خۆی ڕێکەوتی ١٧ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦ ئەم ڕاستییەی بۆ هەواڵدەری تاس دەربڕی کە کوردەکانی ئوستانی چوار (ئازەربایجانی ڕۆژئاوا) شۆڕشیان کردووەو ناوچەکە کەوتووەتە بەر کۆنترۆڵیان. هەروەها قازی لە وتووێژێکدا لەگەڵ فەیرووز و سادچیکۆۋ دا گێراویەتیەوە کە داوای کوردستانی گەورە دەکات. لەلایەکی ترەوە، قازی لە وتووێژدا لەگەڵ فەیرووزدا داوای کردووە بانەو سەقزی سەر بە سنە بخرێنە سەر مەهاباد. فەیرووز گوتوویە: بە قازیی گوتووە باشتر وایە کوردستان لە سێ بەڕێوەبەرێتیی سەربەخۆدا جیا بکرێتەوە (سنە، بانە، سەقز، مەهاباد).

پێم وایە پێشنیارەکانی قازی بۆ ئەوەی کە مەهاباد سەر بە تاران بێ، یان سەقزو بانەی سەر بە سنە بخرێنە سەر مەهاباد، تاکتیکێکی بەجێ نەبوون، لەبەر ئەوەی بانەو سەقز هەر لە سەرەتای ڕووداوەکانی ئابی ١٩٤١وە، بە خەڵك و پێشمەرگەوە، لەگەڵ مەهاباددا بوون. جیاکردنەوەی مەهابادیش لە ئوستانی چوار، بۆ ئەوە بووە کە شوێنەکانی تری ئوستانی چوار، ئەگەر لەژێر دەستی تاران یا عەجەمە ئازەریەکانیشدا بن گرنگ نییە، واتە کوردستان نایگرێتەوە. لەلایەکی ترەوە ئەمە داننانە بەو سنوورە دەستکردانەدا کە دوژمن لە کوردستانی دابەشکراودا هەوڵی گۆڕینی قەوارەو ناوو دانیشتوانی داون. با وای دابنێین مەهاباد جیا کرابایەوەو سەر بە تاران بوایەو سەقزو بانەش سەر بە مەهاباد بوونایە، ئایا ئەم ناوچانە چەند بەشی کوردستانی ڕۆژهەڵاتیان دەگرتەوە؟ چارەنووسی گەلی کورد لە سەقزو بانە بەرەو خوار، یاخود لە مەهابادەوە بەرەو ژوور، چیی لێ دەهات؟

[١] سەرەڕای ئەوەی کە کوردەکان هەر لە سەرەتای هاتنی سوپای سوورەوە ئابی ١٩٤١ بۆ ئێران، داوای دامەزراندنی کۆمەڵەی پەیوەندیی کولتووریی سۆڤیەت- کوردیان کرد، کەچی تەنیا مانگی ٣ی ١٩٤٥ نوێنەری سۆڤیەت بۆ ئەم مەبەستە هاتە مەهاباد. گەرچی لە زۆر شوێنی ئێران، بەتایبەت لە ئازەربایجان، لەمێژ بوو ئەم کۆمەڵەیەیان دامەزراندبوو بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەو کتێب و فیلم و کردنەوەی خولی فێربوونی خوێندن و نووسین و نەخشێکی بەرچاوی ڕۆشنبیرییان لەناو خەڵکدا هەبوو . بگرە کتێبی قوتابخانەی سەرەتایی و مامۆستای ئازەربایجانی لە ئازەربایجانی سۆڤیەتەوە هێنرابوون بۆ ئێران. بەڵام بەداخەوە وەك هەمیشە دەرەنگ ئاوڕیان لە کورد دایەوە. لە نووسراوێکدا بۆ ئەو گرووپەی کە هاتوون بۆ مەهاباد تا ناوەندی کولتووریی سۆڤیەت لەوێ دابمەزرێنن، پاش گەڕانەوەیان بۆیان نووسراوە: نەدەبوایە ئێوە ئەو کارە بکەن، دەبێ کوردەکان خۆیان دەستپێشخەرو داواری ئەو کارە بن.

٣- بوار بدریٚ بۆ بەهێزکردنی پەیوەندیەکانی بازرگانی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا، بۆ فرۆشتنی بەرهەمی پیشەسازیی سۆڤیەت لە مەهاباد، هەروەها ڕێکخستنی کڕینی کەلوپەلی ئێمە لەلایەن ڕێکخراوە بازرگانیەکانی سۆڤیەتەوە ڕاستەوخۆ پێك بێنن.

٤- تیپۆگرافێك بدریٚ بە ئێمە.

بالۆیز بەڵێنی دا بەگوێرەی توانا یارمەتیمان بدات بۆ بەدیهێنانی ئەو داخوازیانەی سەرەوە.

قولێیف

جێگری کونسولی گەورەی یەکێتیی سۆڤیەت لە تەورێز[1]

**لە یاداشتەکانی سەرکونسوڵی یەکێتیی سۆڤیەت لە ڕەزائیە "ئاشومۆف. د. س"**

**١ی ئایاری ١٩٤٥:**

ڕۆژی ١٨ی نیسان، من و هاوڕیٚ شەریفۆف بە مەبەستی ڕێکخستنی بەشی کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی کولتووری بۆ مەهاباد ڕۆیشتین. ئێمە یەکەم سەردانمان لە فەرماندار سەریعول کەلام بوو کە ناڕەزایەتیی خۆی لە بارودۆخی مەهاباد دەربڕیو گلەیی دەکرد کە ئێستا بە ناو فەرماندارە، بەڵام هیچ ماف و دەسەڵاتێکی فەرمانداریێتیی نییە، چونکە کوردەکان دوای ڕووداوەکانی مانگی شوباتی ١٩٤٥ خۆیان هەموو کاروبارەکان بەڕێوە دەبەن. هەر لەبەر ئەمە ئەو چەند جار داوای لە تاران کردووە لە مەهاباد بڕوات. بەڵام تاران ئیجازەی پیٚ نەداوە. لە وەڵامی پرسیاری مندا کە کیٚ ڕێبەرایەتیی ئەم بزووتنەوەیە دەکات لەلای ئێوە؟ گوتی ڕێبەرایەتی ناناسیٚ، بەڵام ڕێبەرایەتیی بزووتنەوەی کورد پارتێکی (ژ. ك) ناوەو نزیکەی هەموو دانیشتوانی کورد ناویان لەم پارتەدا نووسیوە. ناوی قازی محەمەدی وەك یەکێك لە ڕێبەرانی (ژ. ك) هێنا. جگە لەوە، ڕایگەیاند قازی محەمەد ئەو کەسەیە کە بە کردەوە ئەرکی سەر شانی فەرمانداری بەدەستەوەیە. پاشان ڕایگەیاند کوردەکان لە دەوروبەری پارتی (ژ. ك) یەکیان گرتووەو هەمیشە باسی پشتیوانیکردنیان لەلایەن یەکێتیی سۆڤیەتەوە دەکەن. لەسەر پرسیاری من کە چ بەڵگەیەکی لەم بارەیەوە پێیە؟

---

[1] ئەرشیڤی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ڕووسیای فیدڕاڵ، ف٠٩٤، ئۆ٣١، د٦٤، پ٣٥٢a، ل١٢٩-١٣٣.

لە وەڵامدا گوتی: عەزیز خانی پێسەری گەنجەوی بەگ لە خێڵی فەیزوڵڵا بەگی زۆر جار لە کۆبوونەوەدا داوای لە کوردەکان کردووە خەبات بکەن بۆ سەربەخۆیی کوردستان، گوایە دوو ئەفسەری سۆڤیەتی (مایۆر و کاپیتان) پێش ڕووداوەکان لە مەهاباد لە میتینگێکی گشتیی ناو شاردا ئامادە بوون و داوایان لە خەڵك کردووە خەبات بکەن بۆ سەربەخۆیی. گوایە ئەوانە لەلایەن یەکێتیی سۆڤیەتەوە دەسەڵاتیان پێ دراوە. هەروەها گوایە پاشان عەزیز خان لەگەڵ دوو ئەفسەرەکەی ئێمەدا چوونەتە ماڵی فەرماندارو داوایان کردووە بارێکی باش بۆ پێشکەوتنی کولتووری و ئازادیی کوردەکان بڕەخسێندرێ. فەرماندار لە وەڵامیدا ڕایگەیاندووە: دەسەڵاتی ئەو شتانەی نییەو دەبێ کوردەکان داوا لە دەوڵەتی ناوەندی بکەن سەبارەت بەم کێشەیە. هەروەك لە ڕابردوویشدا ڕامانگەیاند، دوای ئەمە ڕووداوەکانی مەهاباد پەرەیان سەند. بەپێی ڕاگەیاندنی هاوڕێ شەریفۆڤ، ئێمە هاتووینە ئێرە بۆ کردنەوەی بەشی کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی کولتووری[1].

فەرماندار لە وەڵامدا گوتی: لەمێژە قازی محەمەد ئەو کۆمەڵەیەی پێك هێناوە. ئەندامەکانی بازرگانان و ئەوانەن کە لە قازی‌یەوە نزیکن و کاری نهێنی بە ناوی ئەم کۆمەڵەیەوە دەکرێ. جێی سەرنجە کاتی ڕۆیشتنمان بۆ فەرمانداری، کوردەکان لە هەموو لایەکەوە دەوری ماڵەکەیان دابوو و هەوڵیان دەدا گوێیان لە وتووێژەکانمان بێ. ئێمە سەعات ١٢ چووینە لای قازی و بۆ نانی نیوەڕۆ ماینەوە. کاتی مانەوەمان لەلای قازی، هاتوچۆی پیاوە بەناوبانگەکانی کورد بەردەوام بوو. قازی محەمەد هەموو کاتێك وتووێژەکانی بەرەو سەربەخۆیی کوردستان دەبرد. ئەو، لە دواکەوتنی

---

[1] سەرباری ئەوەی کە کوردەکان هەر لە سەرەتای هاتنی سوپای سوورەوە ئابی ١٩٤١ بۆ ئێران داوای دامەزراندنی کۆمەڵەی پەیوەندیی کولتووریی سۆڤیەت- کوردیان کردووە، کەچی نوێنەرانی سۆڤیەت مارتی ١٩٤٥ ئەمجا هاتنە مەهاباد بۆ ئەم مەبەستە. لەکاتێکدا لەمێژبوو ئەم کۆمەڵەیەیان لە زۆر شوێنی ئێراندا، وەك ئازەربایجان، دامەزراندبوو بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەو کتێب‌و فیلم‌و کردنەوەی خولی فێربوونی خوێندن‌و نووسین، واتە لەم ڕووەوە نەخشێکی ڕۆشنبیریی بەرچاویان هەبوو. تەنانەت کتێبی قوتابخانەی سەرەتایی‌و مامۆستای ئازەری لە ئازەربایجانی سۆڤیەتەوە هێنرانە ئێران. بەڵام بەداخەوە درەنگ ئاوڕیان لە کورد دایەوە. نووسراوێك بۆ ئەو گرووپەی وا هاتبوون ناوەندی کولتووریی سۆڤیەت لە مەهاباد دابمەزرێنێ، دوای گەڕانەوەیان، ئەوی تێدا وتراوە کە نەدەبوو ئێوە کارێکی وا بکەن، دەبوو کوردەکان خۆیان دەست پێشخەرو داواکاری بن.

کـوردان دەدوا، کـە بـەگوێرەی ئـەو هۆیەکەیـشی ئەوەیـە هـەموو کاتێـك لەلایـەن دەسەلاّتدارانی ئێران و تورکیاوە چەوسێندراونەتەوەو ئێستا لە بارێکی نیوە برسیدا دەژین. لەم ڕووەوە سوپاسی سوپای سووری کرد کە بە هاتنی بۆ ئێران، کوردەکان بە تەواوی گەیشتنە سەربەخۆیی خۆیان و لە باری ئێستایان زۆر ڕازین. بۆ وێنە، ئەم شتانەی خوارەوەی باس کرد: هەموو گەلانی سەر زەوی هەوڵ دەدەن هەرچی زووتر کۆتایی بە شەڕ بێ، بەلاّم کوردەکان بە کۆتایی هاتنی شەڕ مەترسییان لێ نیشتووە. لەبەر ئـەوەی بە کۆتـایی هـاتنی شـەڕ هێـزی هاوپەیمانـەکان ئێران بـەجێ دەهێڵن و دەسـەلاّتدارانی ئێرانی سـەرلەنوێ دەست بە سووکایەتی پێکردنـی کـورد دەکەنـەوە. لەبەر ئەمەیە کورد ئێستا دژی هاتنی سوپای ئێرانە بۆ مەهاباد[1].

کوردەکـان وا تێگەیـشتوون کـە تـەنیا یـەکێتیی سـۆڤیەت لـە خەباتیانـدا بـۆ سـەربەخۆیی یارمـەتییان دەدات. پاشـان ئـەو وێنەیـەکی تـری هێنایـەوە: ماوەیـەك لەمەوبـەر لـە مـەهاباد شـانۆگەرییەك پیـشان درا کـە بـەم چەشـنە بـوو، کوردسـتان لـە سـیمای ژنێکـی دیلـدا بـە زنجـیر بەسـتراوەتەوە، لاوێکـی کـورد کـە بـەرگی سـووری پۆشیوەو دەبێ پیشاندەری یەکێتیی سۆڤیەت بێ، بە چەقۆ ئەو زنجیرە دەپچڕێنێ کە ولاّتەکـەی ئـەوی پێـوە بەسـتراوە. پاشـان مرۆڤێـك بـە جلوبـەرگی ژەنەڕاڵییـەوە دێـت، دیمەنی داپۆشراوەو نوێنەرایەتیی ڕێبەرو حاکمی کوردستان دەکات.

قازی محەمەد لـەپێش چاوی هەموان گوتی: کوردەکان، بە تایبەتی ژ. ك، دەیانەوێ نوێنەرێکی بەدەسەلاّت و ڕۆشنبیری دەوڵەتی سۆڤیەتیان لەلا بێ، تا دەوڵەتی سـۆڤیەت لـە ڕووداوەکـانی کوردسـتان و پـارتی (ژ. ك) ئاگـادار بکاتـەوەو بتـوانێ ڕێنـوێنی (ژ. ك) کـە ڕێکخراوێکـی تـازە کوورەیـەو لەوانەیـە تووشـی هەڵـەی زۆر بـێ، بکـات. قـازی محەمـەد ڕایگەیانـد ئاشـنای بنیـاتی پێکهاتـەی یـەکێتیی سـۆڤیەتە؛ سـەرەڕای ئـەوەی کـە خـاوەن

---

[1] شتێکی تر کە لێرەدا سەرنجڕاکێشە ئەوەیە کە قازی پەرۆشیی گەلی کوردی دەربڕیوە بۆ کۆتاییهێنان بە شەڕو دەرچوونی سوپای هاوپەیمانان، لەکاتێکدا دووبارە سەرکوتکردن دەستی پێ کردەوەو کورد بەتەنیا مایەوەو هیچ لایەنێك ناوبژیی نەکرد، یان نەبوە مایەی زامنکردنی ژیانی گەلی کورد بۆ ئەوەی جارێکی تر سەرکوت نەکرێتەوە.

مولکێکی گەورەیە، دەیەوێ دەسەلاتێکی وەك کۆمەڵگەی سۆڤیەت لە کوردستانیش هەبێ، گەرچی ئەوکاتە دەبێ لە مولکەکەی خۆی جیا بێتەوە.

ئەم وتانەی قازی محەمەد بیرەوەرییەکی تاڵ و ناخۆشی لای گەورە پیاوانی ئامادەبوو بەجێهێشت. قازی هەروەها گوتی: کۆمیتەی ژێکاف بۆ بەجێگەیاندنی ئەم کارە سەبارەت بە یەکگرتنی کوردەکان پێی وایە پێویستە پەیوەندیەکانی خێلایەتی لەناو بەرێ.

سەبارەت بە نووسینی ڕۆژنامەی "کەیهان" کە ڕەخنە لە ژێکاف و کوردەکان دەگرێ و لە کۆتاییدا دەنووسێ فیل هەرچەند بچووکیش بێ، لەکاتی ڕاکێشاندا گەورەترو بەرزترە لە کەر، قازی گوتی: ئەم نووسراوە نابێ ببێتە هۆی تووڕەیی کوردەکان. بە پێچەوانەوە، دەبێ کوردەکان شانازی بەوەوە بکەن کە ئەو شتەیان لەبارەوە پێ گوتوون، کەوابێ لێیان دەترسن؛ واتە کوردەکان بەهێزن و هێزێکی گەورەیان هەیە. قازی محەمەدو ئامادەبوان، لەسەر ئەم هەموو باسانە، چاوەڕێی وەلامدانەوەیان لە من دەکرد. من وام دەربڕیبوو کە ئێمە بەتەما نین بریارێك لەسەر ئەو کێشانە بدەین کە ئەوان هێنایاننە گۆڕێ. هەموو گەلان مافی ئەوەیان هەیە بگەنە سەربەخۆیی خۆیان و گەشە بە کولتووری خۆیان بدەن و مەبەستی ڕۆیشتنی ئێمەیش بۆ مەهاباد بریتییە لە پێکهێنانی بەشی کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی کولتووریی سۆڤیەت. من وام هەست کرد وەلامەکەم بە دڵی قازی نەبوو. کۆتایی وتووێژەکان لە ماڵی قازی، چەند مووچەخۆری دەوڵەت کە یەکێکیان بەرپرسی ماڵی و ئەوی تریان سەرۆکی بەشی پەروەردەو بارهێنانی مەهابادو دوو نەفەری تر کە لە تەورێزەوە گەیشتبوونە مەهاباد، میوان بوون. ئەوانە لە ماڵی قازی محەمەد زۆر هەستیان بە ئازادی دەکرد. بە خێزانی نانی نیوەڕۆیان بۆ دروست کراو دواتر وا دەرکەوت ئەوانە بە ماشینی فەرمانداری تەورێز هاتوون، پاشان ئێمە لەو کۆبوونەوەیەدا کە دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمەڵەی پەیوەندیەکانیان هەڵبژارد، ئامادە بووین. قازی محەمەد بە سەرۆکی ئەو کۆمەڵەیە هەڵبژێردراو محەمەدی کەیوانپوور بە جێگری. لەو کۆبوونەوەیەدا شاعیرانی کورد شیعری خۆیان لەسەر یەکێتیی سۆڤیەت و ڕێبەرەکانی بە زمانی کوردی دەخوێندەوە.

کۆبوونەوەکــە لــە دوو ژووردا بــەردەوام بــوو. لــە ژووری یەکــەم، ســەرکردە بەناوبانگەکانی کورد بە ساردییەوە پێشوازییان لەم هۆنراوانە دەکرد. بەلام لە ژوورەکەی تر کە هەژارەکانی تێدا بوو، بە چەپلەلێدانی گەرم پێشوازییان لە شاعیرانی ناوبراو کرد. لەدواییدا هاوڕێ شەریفۆڤ دەستی بە قسە کرد سەبارەت بە ئەرکەکانی کۆمەڵە. پیاوە گەورەکانی کورد وتەکانی ئەویان بەدڵ نەبوو، لەبەر ئەوەی کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی کولتووری دەست لە ژیانی سیاسیی کوردان و بە تایبەتی کاروباری (ژ. ک) وەردەدات. بە کۆتایی پێهاتنی کۆبوونەوەکە، قازی محەمەد داوای لێ کردین بچینە ژوورەکەی تەنیشت. لەوێ چاومان کەوت بە کاك محەمەدی مامەش و مارف ئاغای مەنگوڕ و پیرۆت ئاغای مەنگوڕ و عەبدوڵلای مەنگوڕ، بایز ئاغای گەورگ و کاك عەبدوڵلای گەورك و کاك قادر ئاغای گەورك، ئەمان بەناوی (ژ. ک)وە داوای ئەم شتانەی خوارەوەیان لێ کردین:

١- تیپۆگراف (دەزگای چاپکردن).

٢- دەزگای وەرگرتن و بلاوکردنەوەی ڕادیۆیی.

جگە لەوە، دووبارە داوایان کرد ڕاستەوخۆ نوێنەری ئێمە بۆ جێبەجێکردنی بازرگانیی نێوان کوردەکان و سۆڤیەت دیاری بکرێ. هەروەها داوایان کرد بە بۆنەی ساڵڕۆژی دامەزراندنی ئازەربایجانی سۆڤیەتەوە سێ دەستەی نوێنەر لەلایەن گەلی کوردەوە بنێردرێ بۆ باکۆو خولی زمانی ڕووسی لە مەهاباد بکرێتەوە. لەسەر ئەم داخوازانەیان، گوتم ئەم هەموو پرسیارانە کە ئێوە بە ناوی (ژ. ک)وە ڕاتانگەیاندووە، تەنیا لە دەسەلاتی کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی کولتوورییە کە تازە پێك هاتووە. لەبەر ئەوە پێویستە ئەو پرسیارانە بخەنە بەر دەستی کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی کولتووریی سۆڤیەت لەگەڵ ئێراندا. دیار بوو ئامادەبوانی ناوبراو هیچ پەیوەندییەکیان بە کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی کولتووریی سۆڤیەتەوە نەبوو، ئەوانە تەنیا لەلایەن قازی محەمەدەوە هەڵبژێردرابوون بە ناوی کۆمەڵەی (ژ. ک)ەوە وتووێژمان لەگەڵدا بکەن. لەکاتێکدا ئێمە خەریکی وتووێژ بووین لەگەڵ ناوبراوانی سەرەوەدا، قازی محەمەد میتینگێکی لەسەر شەقام ڕێك خستبوو. هەروەها هێندێ کەسیان هەڵبژاردبوو، دەیانویست وێنەی ئێمە بگرن. کە ئەوەمان زانی، بە خێرایی ماڵئاواییمان لە هەموان

کردو ڕۆیشتین. ڕۆژی دوایی، پاش ڕۆیشتنەکەی ئێمە، پیاوە بەناوبانگەکانی کورد مەهابادیان بەجێ هێشتبوو.

کوردەکان هەوڵ دەدەن قەرەپەپاخەکان ڕابکێشن بۆ لای (ژ. ك)، بەڵام ئەوانە لەبەر ئامادەنەبوونیان لەلایەن کوردەکانەوە ئازار دەدرێن. ئێستا کوردەکانی سوندوس چاوەڕێی بڕیاری نوێ دەکەن سەبارەت بە هەڵسوکەوت لەگەڵ قەرەپەپاخەکاندا لە مەهاباد. من بە چاوی خۆم بوونی پارتی ژێکافم هەست پێ کردووە، زۆربەی خەڵك ناوی پارتی (ژ. ك) بە (کۆمەڵە) دەبەن. زۆربەی دانیشتوانی کوردو پیاوە بەناوبانگەکانیان لایەنگریی سۆڤیەت دەکەن و بەهیوان لە خەباتیاندا بۆ سەربەخۆیی یارمەتی لە سۆڤیەت وەربگرن. کۆمیتەی کوردیی (ژ. ك) خەڵك دڵنیا دەکاتەوە کە لە ئیش‌وکاری خۆیدا پەیوەندیی بە دەوڵەتی سۆڤیەتەوە هەیە. بەڵام هیچ پەیوەندییەك لەنێوان ئێمەو (ژ. ك)دا نییە. پێویستە بگوترێ کەسە بەناوبانگەکانی کورد لە هەموو لایەکەوە هەوڵ دەدەن پەیوەندیمان پێوە بکەن. بەڵام کەس ناوی تەواوی سەرکردایەتیی کۆمیتەی (ژ. ك) نادات و کەس باسی پەیوەندیەکانی ئەو پارتە بە پارتەکانی تری ئێران و سووریاو تورکیاوە ناکات. ئەمە پاڵمان پێوە دەنێ لەگەڵیاندا زۆر وریا بین[1].

٢٧ی نیسانی ئەمساڵ شێخ سەیید عەبدوڵڵای گەیلانی هاتە کونسوڵخانەو گوتی نوێنەری فەرماندەی سوپای سۆڤیەت یارمەتیی "ئەحمەد"ی دوژمنی دەدات و پیاوەکانی لە گوند دەر دەکات و زەوی‌وزاریان دەداتە پیاوەکانی سەیید ئەحمەد. ئەو گومانی لە ئێمە هەیە کە لێیان ناڕازین و گوایە ناوبراو بە ئاگاداریی ئێمە ئەو شتە دەکات. من پێم سەلماند ئەمە وانییەو بەڵێنم پێ دا لەم بارەوە لێکۆڵینەوە بکەم و هەنگاوی پێویست هەڵگرم. هەروا پرسیاری ئەوەم کرد کە کاری ئەو سەبارەت بە وەرگرتن و ناونووسینی خەڵك لە پارتی (ژ. ك)دا چۆن دەچێتە پێش. لە وەڵامدا

---

[1] پارتی ژێکاف کە زۆر جار هەوڵی داوە سۆڤیەتیەکان وەك پارتێکی سیاسیی کوردی پەیوەندیو هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەن، کەچی بە ڕێکخراوێکی سەر بە ئینگلیزیان داناوە، هەتا نەك تە نیا هاوکارییان نەکردووە، بەڵکوو هەوڵی بێ‌هێزکردنو سەرئەنجام لەناوبردنیان داوە.

گوتی لەبەر کێشەی لەگەڵ سەیید ئەحمەددا ناتوانێ لە گوندەکەی خۆیەوە بۆ هیچ کوێیەك بچێ. توانیم ئەم ئەنجامانە لە وتووێژەکانی نێوانماندا دەست بخەم:

١- شێخ سەیید عەبدوڵڵای گەیلانی ئەندامی کۆنی پارتی ژێکافەو درێژەپێدەری نەریتی بنەماڵەکەیانە کە بەشداری لە خەباتدا دەکات بۆ سەربەخۆیی کوردستان و لەبەر ئەوەیە کە لەلای سەرکردەکانی کورد رێزی لێ دەگیرێ.

٢- پارتی هیوا لە عیراق هەیەو پەیوەندیی ئەم پارتە بە پارتی ژێکافەوە لە رێگەی پیاوە بڕواپێکراوەکان و بەتایبەت سەیید عەزیزی کوڕی ئەوەوە کە ئێستا پلەی کاپتیانی لەناو سوپای سوارەی عیراقدا هەیە، بەڕێوە دەچێ.

٣- دەسەڵاتدارانی عیراق متمانە بە سەربازو ئەفسەرانی کورد ناکەن. بۆیە ئەفسەرەکانیان گواستوونەتەوە بۆ سنوورەکانی ئێران و عیراق و بازێڕی (سەماوە) لە باشووری عیراق. ژمارەی کوردە هەڵهاتووەکانی ناو سوپای عیراق بەرەو زیادبوون دەچێ، لە دەوروبەری مەلا مستەفا، رێبەری بەناوبانگی کوردی عیراق، کۆدەبنەوە. مەلا مستەفا ئەندامی کۆمیتەی هیوایە، لە رابردوودا سەرکردایەتیی راپەڕینی چەکداری دژی دەسەڵاتدارانی عیراق کردووە. ئێستا دەسەڵاتدارانی عیراق هەوڵ دەدەن مەلا مستەفا ناچار بکەن خۆی بەدەستەوە بدات، گوێڕایەڵی دەوڵەت بێ. ئینگلیزەکانیش هەر ئەوەیان دەوێ، بەڵام مەلا مستەفا هیچ بڕیارێکی نەداوە. بارزانی ئێستا لە گوندی بارزان دەژی. شێخ گوتی ئەو بە تەواوی نازانێ، بەڵام گوایە کۆمیتەی هیوا لە گوندی بارزانە. پەیوەندی لەنێوان شێخ و مەلا مستەفادا هەیە. بە وتەی شێخ (هیوا) باوەڕ بە ئینگلیز ناکات، لەبەر ئەوەی ئینگلیزەکان کاتێك ساڵی ١٩٢٥ کوردەکان خەباتیان بۆ سەربەخۆیی دەکرد، بەڵێنیان پێ دان، بەڵام پاشان پەیمانیان لەگەڵ تورکیادا بەست؛ بەپێی ئەو پەیمانە ناوچەیەك بە شاری مووسڵەوە کەوتە سەر عیراق، بەم جۆرە کوردەکان لەو پشتیوانییەی کە بەڵێنیان پێ دابوون بێبەش کران. ئەرکی سەرشانی کۆمیتەی هیوا، وەك کۆمیتەی ژێکاف، لەسەردەمی ئێستادا بریتییە لە پێکهێنانی کوردستانێکی سەربەخۆ. جگە لەوە، کۆمیتەکانی ناوبراو بڕیاریان داوە تەنیا لایەنگری لە سۆڤیەت بکەن. شێخ داواکەی منی بەجێ هێنا، کارتی سنوورەکانی کوردستانی وەك چۆن ژێکاف دەیخاتە بەردەست، پیشان

دام. به وتەی شێخ، قازی محەمەد لای کوردان زۆر (بەناوبانگ) نییە، چونکە چەند جار بۆچوون و هەڵوێستی خۆی گۆڕیوەو ئیشی بۆ ئینگلیزەکان کردووەو پەیوەندیی بە دەسەڵاتدارانی ئێرانەوە هەیە. هەروەها قازی محەمەد پارەیەکی زۆر دەدات بۆ ڕاگرتنی چەکدارەکانی کورد، دیارە ئەم پارانە لەکوێوە دێنێ[1].

کوڕەکانی قەرەنی ئاغای مامەش، عەزیز ئاغاو عەلی ئاغا، ٢٩ی نیسانی ئەمساڵ، سەریان لێ دام و لە وتووێژەکانیاندا ڕایانگەیاند:

١- قەرەنی ئاغای مامەش ڕۆیشتنەکەی خۆی بۆ باکۆ زۆر بەدڵ بووەو وتەی ڕێبەری بەلشەفیکەکانی ئازەربایجان هاوڕێ "باقرۆڤ"ی لەبیرە کە گوتبووی دەبێ کوردەکان لە ئاشتیدا بژین. ئەو، یەکێکی ئەوانەیە کە لەگەڵ سەرکردەکانی کورددا ڕۆیشتبوو بۆ باکۆ و وەفاداری ئامۆژگاریەکانی باقرۆڤە. ئێستا لە کوردستان پارتی ژێکاف دامەزراوەو قەرەنی ئاغا نازانێ ئەم پارتە چۆنە، لە ڕێگەی کوڕەکانیەوە داوای ئامۆژگاری لە کۆنسوڵی سۆڤیەت دەکات کە بچێتە ڕیزی ئەم پارتەوە یا نا؟

٢- قەرەنی ئاغای مامەش متمانە بە ژێکاف ناکات، لەبەر ئەوەی وتەو کردەوەی جیاوازن. بە بیروڕای وی، ژێکاف ڕێکخراوێکی سیاسییە، مەبەستی ڕزگارکردنی کوردستانە. جگە لەوە، ئەندامانی ژێکاف خەریکی کێشەو تاڵانکردنی گەلانی ترن. بە بیروڕای قەرەنی ئاغا: ژێکاف کە مەبەستێکی وا گەورەی بەدەستەوە گرتووە ، دەبوایە هەموو گەلانی دانیشتوانی کوردستان لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوەو یەکیان بخات و پشتگیری لە تاڵان و کێشە نەکات.

٣- قەرەنی ئاغای مامەش پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ قازی محەمەددا هەیە. بەڵام لەم دواییانەدا لێی نارازییە، لەبەر ئەوەی زۆر شت لە قەرەنی ئاغا دەشارێتەوە. قازی محەمەد لە پارتی ژێکافدا ئیش دەکات و هەموو پیاوە ئاینیەکانی مەهابادی هێناوەتە ڕیزی ژێکافەوە.

---

[1] دوور نییە ئاشۆمۆڤ ئەم شتەی بەو مەبەستە نووسیبێ، تا قازی محەمەد بەدناو بکات و سۆڤیەتیەکان گومانی لێ بکەن.

٤- قازی محەمەد خەرجیی ئەو گەنجە کوردانە دەدات کە خەریکی فێربوون و خوێندنی ئیش‌وکاری سوپایین، ڕۆژانە هەریەکە ٢٥ قران خەرجییانە. هەروەها قازی محەمەد پارە دەداتە ئەو پیاوە ئاینیانەی کە -وەك باسمان کرد- ناویان لە ژێکافدا دەنووسێ.

٥- جگە لە قەرەنی ئاغای مامەش، هەروەها زێڕۆ بەگ و نووری بەگ و حەسەن تیلوو و ڕەشید بەگیش داوای ئامۆژگاری و ڕێنوێنیێ لە کونسولی سۆڤیەتی دەکەن. ئێمە باش دەزانین حەسەن تیلوو بە ئاشکرا کابرایەکی سەر بە تورکیایە. قەرەنی ئاغای مامەشیش پیاوی ئینگلیزەو ئەوانی تر ئاشکرایە چۆن لایەنگری لە ئینگلیز دەکەن. پێش ڕۆیشتنمان، کوڕەکانی قەرەنی ئاغای مامەش سێ هەزار قرانیان بۆ دروستکردنی ستوونێکی تانك بە ناوی هاوڕێ باقرۆڤەوە تەرخان کرد.

٦- سەرگوردێکی سوپای ئێرانیی "کەیوانی" ناو بۆ ناوچەی ڕەزائیە هاتووە، ٢٩ی نیسان لە ڕەزائیە چووەتە لای قەرەنی ئاغای مامەش و عەزیز عەلی، ٣٠ی نیسان چاوپێکەوتنی لەگەڵ کوڕی بەناوبانگی کورد کەریم ئاغای گوش گەلانیدا بووە. لە چاوپێکەوتنمدا لەگەڵ "ئینتیزاری"دا کە کابرایەکی خاوەن موڵکە، بۆم دەرکەوت محەمەد باقرخان کە لە ستادی ژەنەڕاڵ "شابەختی"دا ئیشی کردووە، ٨-٩ ساڵ لەمەوبەر پاسپۆرتی بۆ ڕەشید بەگ و زێڕۆ بەگ جێبەجێ کردووە. ناوبراو هەمیشە بە کێشەی کوردەوە خەریك بووەو لای ڕەشید بەگ‌و زێڕۆ بەگ ڕێزی هەیە. محەمەد باقرخان لە ڕەزائیە خزمی هەیەو پێم وایە نێردراوە بۆ ئیشکردن لەناو کوردان.

لە وتووێژ لەگەڵ شێخ عەبدوڵڵادا ئەو ئەنجامەم دەستگیر بوو کە ئێستا ئێمەی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەی لەگەڵ سەیید ئەحمەددا و ئیشە تایبەتەکانی تری پێویستە. ئاشکرایە دەیەوێ باوەڕی پێ بکەین.

١ی مانگی ئایاری ئەمساڵ دوو نامە لەلایەن کۆمیتەی ژێکافەوە بۆ کۆنسوڵی سۆڤیەت هاتووە. لە یەکەم نامەدا کۆمیتەی ژێکاف ڕادەگەیێنێ قەرەنی ئاغای مامەش خۆی بە دەسەڵاتدارانی ئێرانی فرۆشتووەو دژی پارتی ژێکاف کار دەکات، سەرتیپ

"هووشمەند ئەفشار"ی فەرمان و بڕیار لە فەرماندەی لەشکری پێنجی ئێران وەردەگرێ. کوڕی قەرەنی ئاغای مامەش و مام عەزیز ئاغا لەگەڵ بایز ئاغادا لە خێڵی گەورگ ڕۆیشتوون بۆ ناو خێڵی مەنگوڕان و کۆبوونەوەی گشتییان هەبوەو بڕیاریان داوە پروپاگەندە بکەن لەناو کوردانندا دژی ژێکاف. برای بایز ئاغا، ئەحمەدی عەزیزی، ماوەیەکی زۆرە لە سەقز دەژی و ئەویش دژی ژێکاف کار دەکات.

کۆمیتەی ژێکاف لە بەندی دوودا داوا لە کونسوڵی سۆڤیەت دەکات دوژمنەکانی شێخ سەیید عەبدوڵلا (محەمەد حوسێنی و "محەمەد ئەمین"ی کوڕی) ناچار بکات (٣٠٠) پەزی دزراوی برای شێخ سەیید عەبدوڵلاو سەیید کەمال بدەنەوە؛ هەروەها لە نامەکەدا هاتووە، ناوبراوانی سەرەوە کۆسپی زۆر دەخەنە بەردەم پارتی ژێکاف کە ئەوەندە هێزی هەیە دژی ناوبراوان هەنگاو بنێ. بەڵام داوا لە ئێمە دەکات کونسولمان لەم بارەوە ناوبژی بکات. سەرکردەکانی کورد هەوڵ دەدەن بۆ دروستکردنی کوردستانێکی سەربەخۆ، جا بە پشتیوانیی هەر کەسێ بێ.

کوردەکان وا تێدەگەن، بەهۆی ئەو سەربەخۆیی‌یەوە، پێش هەمووشتێك لە چەوساندنەوەی دەوڵەتانی ئێران و تورکیاو عیراق ڕزگاریان دەبێ. بەڵام ئەوانە تائێستا نازانن چۆن خۆیان بۆ سەربەخۆیی ڕێك بخەن، هێشتا هیچ کاندیدێکی وا ڕاستەقینە نییە کە شیاوی ڕێبەرایەتیی هەموو کوردستان بێ. کوردەکان پێیان وایە یەکێتیی سۆڤیەت یارمەتییان دەدات بۆ وەرگرتنی خودموختاری. ئەم هیوایە دەبێتە هۆی ئەوەی کە حیسابمان لەسەر بکەن و بە ئاشکرا بوارمان دەداتێ دەوری خۆمان لەناو کوردانندا پەرە پێبدەین. بەڵام دەبێ بزانرێ ئینگلیزەکان ساڵانێکە چالاکیی گەورە لەناو کوردانندا دەنوێنن و توانیویانە پەیوەندی لەگەڵ هێندێ لەسەرکردەکانی کورددا ببەستن و دەوری خۆیان لە کوردستاندا پەرە پێبدەن. چۆنیەتی ئەم دەورەیان لە ناوچەکانی کوردستاندا وەك یەك نییە. لە ناوەندی کوردستان (مەهاباد، جەڵدیان و شنۆ) دەوری ئینگلیزەکان دەوری ئێمەی لەکار خستووە، بەڵام لەم دواییانەدا گوێیان لە دەنگی ئێمەش دەبێ. لە باکووری کوردستان (ڕەزائیە، شاپوور) دەوری ئینگلیزەکان یەکجار کەمەو ئێستا خەریکی ئەوەن دەور لەم ناوچەیەش ببینن. کاری ئەوان بە دەست پێکردنی پەیوەندی گرتن لەگەڵ هێندێ سەرکردەی

کوردداو بڵاوکردنەوەی دەنگوباسی هاندەرانە دژی سوپای سوورو نوێنەرانی ئێمە، بەو مەبەستەیە کە ئەم سەرکردانە لە ئێمە دوور بخەنەوە. ئەم دواییانە هێندێ کەس بە بەرگی ئەفسەری سوپای ئێرانەوە، بەگشتی کە دیار نییە چ کارەن، پەیدا بوون، لە ڕەزائیە پروپاگەندە دژی سۆڤیەت لەناو دانیشتواندا بڵاو دەکەنەوە، لەوانە:

١. سەیید محەمەد عەلی نەقابزادە (٥٥) ساڵەو فارسە، خوێندەوارو دانیشتووی شاری تارانە.

٢. سەیید ئیبراهیم سەیید محەمەد عەلی ئۆغلیی کوڕی، کە ١٩ ساڵەو خوێندەوارە.

٣. سەیید ئیبراهیمی فاتمی و عەلی شەکیبزادە ٥٣ ساڵەو فارسە، خوێندەوارو ئامۆزای سەیید محەمەدە؟

٤. عەلی قەرەنی شۆڕشی ئازەربایجانییە، ٢٢ ساڵەو قوتابیی قوتابخانەی ناوەندییە، لە تاران دەخوێنێ، هۆنراوە دەنووسێ.

٥. محەمەد عەلی ناسری سەرگوردی سوپای ئێرانە لە ڕێستۆرانتی ئیستانبووڵ دژی یەکێتیی سۆڤیەت دوواوە.

ناوبراوان، لە ئەنجامی هەنگاوەکانی ئێمەوە ناچار کران ڕەزائیە بەجێ بهێڵن. کەمیی دەوری تورکیا لەناو کوردەکاندا، لەبەر ئەوەیە کە تورکیا کوردەکانی خۆی زۆر دەچەوسێنێتەوە. ئەم دواییانە چالاکیی ژێکاف لەناو کوردەکاندا بۆ یەکگرتنیان کزە، چونکە کۆمیتەی ژێکاف تائێستا نەیتوانیوە تێکهەڵچوونی نێوان هۆزەکانی کورد چارەسەر بکات و تێکهەڵچوونی ناو خێڵ و تەنانەت هۆزەکانیشیان هێشتا درێژەی هەیە.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئەم تێکهەڵچوونانە زۆر جار دەگەنە ئاستی تێکهەڵچوونی گەورە، پێویستە ئێمە چاومان لە پەیوەندیەکانی نێوان هۆزەکانی کورد بێ و پێش لە تێکهەڵچوونەکان بگرین.

تێکهەڵچوونی کوردان لەناو خۆیاندا زۆرتر بە پیلانی ئێرانیەکانە، کە مەبەستیان بێهێزکردنیانە. ئیشی ئێمە بۆ چوونە ناو کوردان، هێشتا تەواو نییە؛ ئێمە هیچ ڕێکخراوێك (قوتابخانە- نەخۆشخانە)مان لە ناوچەی کونسوڵخانەکە نییە، کە بتوانین لە ڕێگەی ئەوانەوە بچینە ناو خەڵك و لەناو خێزانەکان و لاوەکاندا کاریگەر بین.

ئێمە لە مەهاباد کە ناوچەیەکی گرنگە، نوێنەرێکمان نییە، تا بتوانێ لە ڕووداوە سیاسییەکانی ئەم ناوچەیە ئاگادارمان بکاتەوە[1].

سەرکونسوڵی سۆڤیەت لە ڕەزائیە

ئاشومۆڤ ج. ی.[2]

**وتووێژی سەرنووسەری ڕۆژنامەی "فەرمان" لەگەڵ ڕێبەری کوردەکاندا:**

٢٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥ سەرنووسەری ڕۆژنامەی "فەرمان" ئاغای شاهەندە وتووێژێکی لەگەڵ سەرۆك و ڕێبەری ئاینیی ناسراوی کورد محەمەدی قازی بڵاو کردوەتەوە، شاهیندە لەگەڵ "ئاغای تەفەزولی"ی سەرنووسەری ڕۆژنامەی"ایران ما" و "ئاغای بوزورگی عەلەوی"ی هاوکاری ڕۆژنامەی "رهبر"دا، لە گەشتێکدا بۆ ئازەربایجان، سەریشیان لە مەهاباد داوە. قازی ئەو دەنگوباسەی کە لە تاران سەبارەت بە جیابوونەوەی کوردەکان بڵاو بوەتەوە، بە درۆ خستەوەو جەختی کردەوە کە کوردەکان دەیانەوێ لەژێر ئاڵاو چوارچێوەی ئێراندا بژین و داوای جێبەجێکردنی یاسای بنەڕەتی (قانونی اساسی)و دیموکراسی و پاراستنی ئەو ئۆتۆنۆمییە دەکەن کە ئێستا هەیانە. بە وتەی قازی، ئەو ئۆتۆنۆمییەی کە لە مەهاباد و ناوچەکانی دەوروبەریدا هەیە، ماوەی چوار ساڵە هەیانە. ماوەیەك لەمەوبەر هەڵبژاردنی نوێنەرانی خەڵك لە کوردستان بەڕێوە چوو، کۆنگرەی نوێنەرانی خەڵك هێندێك بڕیاری سەبارەت بە کاروباری ناوخۆی کوردستان، هەروەها دیاریکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا داوە. کۆنگرە نۆ کەسی بەناوی کۆنگرەی نەتەوایەتییەوە کە ئەرکی بەڕێوەبردنی کاروباری کوردستانی وەئەستۆ گرتووە، هەڵبژاردووەو سەرۆکی ئەم کۆمیتەیە قازی محەمەدە. لە وەڵامی پرسیاری دەنگوباسی ڕۆیشتنی قازیدا بۆ باکۆو هێنانی تیپۆگرافی (چاپخانە)، قازی گوتی

---

[1] ئەرشیڤی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی کۆماری ڕووسیای فیدراڵ، فۆندی ڕاگەیاندن لەسەر ئێران، ئۆ٣١، د٧٠، ل٦٢-٧٢.

[2] ئاشومۆڤ جەبرەئیل ئیسرافیلۆڤیچ کە لە شوباتی ١٩٤٥ تا تشرینی یەکەمی ١٩٤٧ کونسوڵی سۆڤیەت بووە لە ڕەزائیە (ورمێ) و دژی بەرژەوەندی کورد بووە، لە زۆر نووسراوەدا بە هەڵە ناوی بە هاشیمۆڤ هاتووە.

ئـەم دەنگ‌وباسـە درۆیانـە لەلایـەن تـاقمێکی کاربەدەسـتی سـوپای ئێرانـەوە بـڵاو بووەتەوە. دەزگای چاپخانەش لە تەوریز کڕراوەو تاقیکردنەوەشی زۆر ئاسانە. قازی هەروەها ئەو دەنگ‌وباسەی سەبارەت بە دروستکردنی پارتی کۆمۆنیستی لە مەهاباد بە درۆ خستەوەو ڕایگەیاند بواری ئازادیی هەموو بیروباوەڕێك لە کوردستان دراوەو لەم کاتەدا تەنیا حیزبی دیموکراتی کوردستان هەیە کە دروشم‌و داخوازیەکانی بەم چەشنەی خوارەوەن:

١- گەلی کورد دەیەوێ لە چوارچێوەی ئێراندا خاوەنی ئۆتۆنۆمی بێ.

٢- دەبێ زمانی کوردی لە قوتابخانەکان‌و دام‌ودەزگاکانی دەوڵەتدا بەکار بهێنرێ.

٣- دەبێ ئەنجومەنی هەرێم‌و ناوچەکان پێك بێن.

٤- دەبـێ مووچـەخۆرانی دام‌ودەزگـا دەوڵەتیـەکان هـەموویان لـە دانیـشتوانی ناوچـەکان بـن، دەبـێ هـەموو ئـەو یاسـا دیکتاتۆریانـەی ئێـستا بگـۆڕدرێن. دەبـێ پەیوەندیی عادیلانە لەنێوان جووتیارەکان‌و خاوەن موڵکەکاندا دابمەزرێن.

٥- حیزبـی دیمـوکراتی کوردسـتان هـەوڵ بـۆ بـەدیهێنانی دۆسـتایەتی‌و برایـەتی لەنێوان گەلانی ئێراندا دەدات.

دەربارەی ڕێکخراوەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان، قازی گوتی: لەو ناوچە کوردیانـەدا کـە دەسـەڵاتدارانی کۆنەپەرسـت‌و دیکتـاتۆر نـاتوانن کۆسـپ بخەنـە سـەر ڕێگـەمان، ڕێکخراوەکـانی حیزبـی بە ئاشـکرا دروسـت کـراون‌و کـار دەکـەن. حیزبـی دیموکراتی کـوردی هـیچ پەیوەندییـەکی لەگـەڵ کوردەکـانی دەرەوەی ئێرانـدا نییـەو یەکگرتنی کوردەکان بە ئەرکی خۆی نازانێ.

لەسەر بۆچوونی حیزبی دیموکرات بەرامبەر بە یاسای بنەڕەتی، قازی ڕایگەیاند: لەو جێگایانەدا کە داخوازەکانیان لەگەڵ یاسای بنەڕەتیـدا جیاوازییـان هەیە، یاسای بنەڕەتی گرنگتر دەبێ. لە وەڵامـی پرسیاری ئازادیی دەنگدانی ژنانـدا، قازی گوتی: هـەموو چەشـنە پێـشوازییەك لـەو ڕاسـتییە کـە دیموکراتـەکانی ئازەربایجـان مـافی بەشداریی ژنیـان بەشـێوەیەکی فـراوان لـە هەڵبژاردنـدا پاراسـتووە، کـردووە؛ گـوتی: دیموکراتـە کوردەکـان لـەم بـارەوە سـەرکەوتنی ئـەوتۆیان وەك فیرقـەی دیمـوکراتی ئازەربایجان بەدەست نەهێناوە.

لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە ئایا ماوەی ئەو چوارساڵەی خودموختاری وتووێژ لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا کراوە؟ قازی گوتی: دوو جار لە تاران بووە. هەردوو جار چووەتە لای شاو داوای لێ کردووە لەباتی ناردنی تۆپو تانك بۆ کوردستان، شتومەك بنێرن بۆ پەرەسەندنو گەشەکردنی پەروەردەو بارهێنانو لەشساخی. بەڵام تائێستا هیچ شتێك نەکراوە.

ئەگەر دەوڵەتی ناوەندی هەروا بێلایەن بێ سەبارەت بە داواکانی کورد، دەبێتە هۆی ئەوەی کە دیموکراتەکان هەنگاو هەڵگرن بۆ سەقامگیرکردنی دیموکراسی بۆ دانیشتوانی شوێنەکانی تری ئێران، رووداوەکانی کوردستان لەو شوێنانەش دووپات ببنەوە.

لەسەر پرسیاری کوردە هەڵاتوەکانی عیراق کە گوایە لە ناوچە جێگیرو دامەزراوەکانی سوپای سوور دەژینو لەلایەن ئەوانەوە پشتیوانییان لێ دەکرێو چەکدار دەکرێن، قازی لە وەڵامدا گوتی: تاقمێکی کورد لە عیراقەوە هەڵاتوون بۆ لایان، بەڵام سوپای سوور لە مەهاباد نییە، تا بتوانێ پشتیوانییان لێ بکات. لە وەڵامی پرسیارێکدا سەبارەت بە پارتی کۆمەڵە، قازی محەمەد گوتی: پارتێکی وا لە عیراق هەیە، بەڵام حیزبی دیموکراتی کوردستان هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵدا نییە[1].

**وتووێژ لەگەڵ سەرۆکی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دیموکراتی کوردستاندا**

تەورێز، ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦:

ڕۆژنامەنووسی هەواڵدەری تاس وتووێژی لەگەڵ سەرۆکی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دیموکراتی کوردستان قازی محەمەدو سەرۆکی ئەنجومەنی کوردستان حاجی باباشێخ کرد. قازی محەمەد گوتی:

((زیاتر لە ١٥٠ ساڵە ئێمە بۆ ئازادی دژی داگیرکەرانی تورکیاو ئێران خەباتمان کردووە. ئێمە زۆر قوربانیمان لەم خەباتەدا داوە. بەشێك لە وڵاتی ئێمە درایە درندەکانی عەرەبو ئێران، کە بوو بە هۆی خراپتربوونی باری ژیانی ئێمەو ناچار

---

[1] هەمان سەرچاوە، فۆندی 56B، ئۆ٦، پ٤٣، د٥١، ل٧٩-٨٠.

کراین دژی هەرسێ دەوڵەتی عیراق و ئێران و تورکیا خەبات بکەین. بە بڕیاری دەوڵەتی ئینگلیز پێشنیاری یەکگرتنمان لەگەڵ ئەرمەنەکاندا پێ کرا، بەڵام گەلی کورد ئامادەی ئەم کارە نەبوو. دوای بەرپەرچدانەوەی ئەم پیلانە، تورکەکان هێرشیان کردە سەرمان. پاش سێ مانگ گەلی کورد بە ڕێبەرایەتیی شێخ سەعید (ڕێبەری شۆڕشی کورد لە تورکیا)، لە خەباتێکی نابەرامبەردا کە ئەنجامەکەی زیاتر لە (١٥) ملیۆن کەس شەهید بوو، شێخ سەعیدو ٧٢ کەسی تر هەڵواسران. بەڵام ئەم کارەساتە نەبوو بە هۆی ترساندنی کوردەکان. کوردەکان بە ڕێبەرایەتیی ئیسماعیل ئاغای سمکۆو بە بەشداریی "عومەر خانی شەریفی"ی ئامادەی ئەم وتووێژە، ساڵی ١٩٢٢ دژی دەوڵەتی ئێران هێرشیان کردو شارەکانی ڕەزائیەو شاپوورو مەهاباد ئازاد کران و شاری خۆی گەمارۆ درا. ئێرانیەکان ئەم بزووتنەوەیەیان بە هاوکاریی ئینگلیز سەرکوت کرد. ئیسماعیل ئاغا بە دەستی ئاژاوەچییەکی بەکرێگیراو کوژرا. بەشێك لە بەشدارانی جووڵانەوە چوونە ئارارات، لەوێ ساڵی ١٩٣١ دەستیان بە خەبات دژی تورك کرد.

ئێرانیەکان لەسەرەتادا یارمەتیی ئەم شۆڕشەیان دا، بەڵام دوایی خیانەتیان کردو لەپشتەوە هێرشیان بۆ هێنان. پاشان بە زۆرەملێ دەستیان بە گواستنەوەیان بۆ باشوورو باکووری ئێران کرد، لە هێندێ شوێن ژنەکانیان لە مێردەکانیان جیا کردنەوە، بەڵام ئەمەش نەیتوانی ئیرادەی گەلی کورد بشکێنێ.

نێوان ساڵی ١٩٣٠-١٩٣٢ هۆزی جەلالی ڕاپەڕین. ئێرانیەکان تا هاتنی وەرزی زستان ڕاوەستان و پاشان هەموو گوندەکانیان وێران کرد. بەڵام سەرەڕای ئەمەش هەر دووسێ ساڵ کوردەکان ئالای ڕاپەڕینیان بەرز کردوەتەوە. هەموو ئەو ڕاپەڕینانە خۆبەخۆیی بوون. بە دوای ئەمەدا دەست بە ڕێکخستنی پارت و ڕێکخراوی جۆراوجۆر کرا، کە بە شێوەیەکی نهێنی دەستیان بە چالاکی کرد. ئەمە تا ڕووداوەکانی ئابی ١٣٢٠، واتە ئابی ١٩٤١، درێژەی هەبوو.

ئێرانیەکان وایان بڵاو کردبوەوە کە کوردەکان بە هاتنی سوپای سوور خەریکی تاڵان و دەستدرێژیکردنن (بیرمان کردەوە تووشی بەدبەختییەکی نوێ بووین). سوپای سوور پێنج ڕۆژان لای ئێمە بووە. ئێمە دیتمان ئەم سوپایە لە هیچ کام لە سوپاکانی تر ناچێ. فرمێسك بە چاوی خەڵکی ئێمە دەهاتە خواریێ و

دەیانگوت ئەمە سوپایە یان نا؟! ئاخر هەموو وا ڕاهاتبوون کاتێك هێزی چەکداریان دەبینی، مانای ئەوە بوو دەبێ کوردەکان جارێکی تر سەرکوت بکرێنەوە.

کاربەدەستان و مووچەخۆرانی ئێرانی لە کوردستان هەڵاتن و ئێمە بێدەسەڵات ماینەوەو کەڵکمان لەو هەلومەرجە لەبارە وەرگرت بۆ یەکگرتنی هێزو خێڵەکانی کورد. لەم ماوەیەدا ئێمە پارتی ژیانی کورد (ژیانەوەی کوردستان)مان پێك هێنا کە ڕێکخراوێکی نهێنی بوو و بۆچوونێکی ناسیۆنالیستانەی هەبوو و مەبەستی پێکهێنانی دەوڵەتێکی گەورەی کوردستان بوو. دەسەڵاتدارانی ئێرانی بێگومان هەوڵی چاندنی دوژمنایەتیی نێوان خێڵەکانی کوردیان دەدا. بەڵام بە کۆتایی هاتنی شەڕ، هەموو هەوڵەکان بە ڕێگەی دیموکراتیدا ڕۆیشتنە پێش. پارتی ژیانەوەی کوردستان لەلایەن ئێمەوە هەڵوەشێندرایەوەو "حیزبی دیموکراتی کوردستان"مان ڕێك خست. بە درستبوونی حیزبی دیموکراتی کوردستان، ئێمە بە یەکجاری کۆتاییمان بە دوژمنایەتیی نێوان خێڵەکان و بە داخوازیی ڕێبەرایەتیی خێڵەکانمان بۆ دەسەڵات وەرگرتن هێنا[1].

٢٨ی شوباتی ١٩٤٥ کۆنگرەی نوێنەرانی باکووری کوردستان ئەنجومەنی بە ڕێبەرایەتی و سەرۆکایەتیی حاجی باباشێخ هەڵبژارد. ڕێکەوتی دەی مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥ ئاڵای نەتەوایەتیمان لەسەر بینای ئەنجومەنی کوردستان هەڵکرد. کوردەکان سوێندیان خوارد کە هەتا کوردێك مابێ کەس ناتوانێ ئەم ئاڵایە لابەرێ. ڕۆژی هەڵکردنی ئاڵاکە بوو بە جێژنێکی نەتەوایەتیی کورد.

ئێمە وەك گەلێك یەکمان گرتووە، بەهێزتر بووین و بەیەکجاری بۆ گەیشتن بە مافی خۆمان دەستمان بە خەبات کردووە. ئێستا ئێمە لەم بارەوە دەسکەوتی زۆرمان بەدەست هێناوە. ئەگەر لە ڕابردوودا نووسین و ئاخافتن بە زمانی کوردی ڕێگەی نەدەدرا، ئێستا ئێمە ڕۆژنامەی "کوردستان"مان هەیە. لە کوردستان نزیکەی سێ هەزار زارۆك بە زمانی خۆیان دەخوێنن. چەند ڕۆژ لەمەوبەر بڕیاری بەزۆر پێخوێندنی سەرەتایی بۆ هەموو کەس، ئەویش کە بێپارەیە، دراوە. قوتابیانی

---

[1] قازی محەمەد بە هەواڵدەری" تاس"ی گوتووە: ئێمە پارتی (ژ. ك)مان هەڵوەشاندەوە. گەرچی قازی هەڵوەشاندنەوەو گۆڕینی ناوی (ژ. ف)ی بەدڵ نەبوو، بەڵام بەسەریدا سەپێندرا.

هەژار لە باری جلوبەرگ و کتێب و هەروەها خواردنی بەیانیانەوە لە قوتابخانە یارمەتی دەدرێن.

لە مەهاباد کاری دەستەجەمعیی شانۆ (تیاتر) هەیە کە ژنان بەشداریی تێدا دەکەن. جێژنی نەتەوایەتیی دووەم ڕێکەوتی ٢٥ی تشرینی یەکەمە، ڕۆژی کردنەوەی کۆنگرەی حیزبی دیموکراتی کوردستانە. گەنجەکان لە "یەکێتیی لاوانی دیموکراتی کوردستان"دا یەك دەگرن لە قوتابخانەکان. هەروەها ڕێکخراوی دیموکراتی دامەزرێنراوە. دەوری حیزبی ئێمە یەکجار گەورەیە. کورد لە خەباتیدا بۆ ئازادیی خۆی، نزیکەی دوو ملیۆن کەسی قوربانی داوە. ئێمە لەو باوەڕەداین کە لە سەردەمی ئێستادا کۆتایی بە خوێنڕشتن هاتووەو دەتوانین لە ڕێگەی ئاشتیانەوە داهاتووی خۆمان چارەسەر بکەین[1].

**وتوویژ لەگەڵ موزەفەری فەیرووز**
**جێگری سیاسیی و پارلەمانیی سەرۆك وەزیرانی ئێران**
**٣ی حوزەیرانی ١٩٤٦:**

داخوازیی فەیرووز بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵماندا پەسند کراو هاتە لام، ڕایگەیاند لە ئەنجامی هەم گفتوگۆکانی نێوان ئەو و قازی محەمەددا لە تەورێزو هەم ئەوەی کە پێشنیار کرا قازی محەمەد بێتە تاران، وتوویژ دەستی پێکرد. کۆمسیۆنی بەرپرس بۆ ئەم مەبەستە دووجار کۆبووەوە. بە وتەی فەیرووز، قازی محەمەد داوا دەکات بانەو سەقز سەر بە مەهاباد بن و بەگشتی باسی کوردستان بە فراوانی دێنێتە کایەوە کە لەسەردەمی ئێستادا بە هۆی دواکەوتنی کۆمەڵایەتیی کوردستان و بوونی دوژمنایەتیی نێوان خێڵ و هۆزو خانەکانی کوردەوە دەرفەتی بەدیهێنانی نابێ. کاتێك لە فەیرووزم پرسی، داخوازەکانی دەست نیشانکراوی قازی محەمەد چین؟ گوتی: داوای ئەوە دەکات بانەو سەقز کە سەر بە سنەن، بخرێنە سەر مەهابادو داوای دەرچوونی سوپای دەوڵەتی بەگشتی لە کوردستان

---

[1] هەمان سەرچاوە، فۆندی A٥٦، ئۆ٩، پ١١٢، د١٧٢، ل١٢١-١٢٢.

دەکات. فەیرووز پێی وایە باشترین ڕێگەی چارەسەرکردنی کێشەی کوردستان بە بیروڕای دەوڵەت بەم چەشنەی خوارەوەیە:

بانەو سەقز پێکەوە لە بەڕێوەبەرایەتییەکی جیاوازدا جیا بکرێنەوە. بەم چەشنە لە کوردستان سێ فەرمانداری لە (سنە)و (بانەو سەقز)و(مەهاباد) دەبن. سوپای دەوڵەتی تا ئەندازەی هەرە کەم، ئەویش بۆ پاراستنی سنووری ئێران و عیراق، کەم بکرێتەوەو ئەوانە لە سەربازخانەی ناوچەکانی بانەو سەقز ئاگادار بکرێنەوە کە نابێ لەو سنوورانەی وا بۆیان دیاری دەکرێن، دەربچن. سەبارەت بە ڕێگەکان، دەبێ لەلایەن هێزەکانی نیگەهبان (ژاندرمەکان)ەوە بپارێزرێن. بەشداریی هێزەکانی کوردیش لەم پاراستنەدا پەسند بکرێ.

فەیرووز ڕایگەیاند: سەبارەت بەم پرسیارە، بڕیار درا پێشنیاری دکتۆر جاوید[1] کە ئەوەیە ئەوەندە هێزی سوپای ئێران ڕابگیرێ لەو ناوچانەدا کە ژمارەیان هێندەی ڕووداوەکانی پێش ئابی ١٩٤١ بێ، شەهریوەری ١٣٢٠، بەڵام جیاوازییەکی تایبەتمان بۆ مەهاباد داناوە، ئەویش ئەوەیە کە سوپای ئێران هێندە لە شوێنەکانی تر سەقامگیر دەبن کە هەست نەکرێ مەترسییان بۆ مەهاباد هەبێ. نابێ تەواوی سوپای دەوڵەتی لەم ناوچەیە لابرێ، چونکە ڕێگە بۆ هەموو ئاژاوەنانەوەیەکی عیراق دەکاتەوە. جگە لەوە، قازی محەمەد خۆی دەتوانێ بەرپەرچی هەموو هێرشێکی دوژمنانە کە لەلایەن هۆزو خانەکانی سەقزو بانەوە بکرێتە سەری، بداتەوە. بەپێی ڕاگەیاندنی فەیرووز، دەبێ ئێستا قازی محەمەد بە مەهاباد ڕازی بێ، چونکە ڕێککەوتننامەی دەوڵەت لەگەڵ ئازەربایجاندا ئەویش دەگرێتەوە[2].

---

[1] جاویدی ئوستانداری تەوریز ئەندامی ڕێبەرایەتیی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان، یەکێك بووە هەر لەکۆنەوە بە نهێنی پەیوەندیی بە کاربەدەستانی تارانەوە هەبوە. ئەو یەکێکی ئەوانە بوو کە تەلگرافی نارد بۆ شاو قەوامو بەڵێنی دا بەربەرەکانیی هاتنی سوپای ئێران نەکرێ‌و پێشوازی لە سوپای ئێران بکرێ" دژی هەڵوێستی پێشەوەری، هەروەها دژی بزووتنەوەی کورد بوو.

[2] فەیرووز وەك جێگری قەوامول سەڵتەنە، دان بەوەدا دەنێ کە کێشەی بەڕێوەبردنی مەهاباد لە چوارچێوەی ئەو پەیمانەدا چارەسەر کراوە کە لەنێوان دەوڵەتی ناوەندیو ئازەربایجاندا بەستراوە، واتە مەهاباد لە چوارچێوەی ئازەربایجاندا بێ‌و قازی فەرماندار بێ، ئەوجا نابێ باسی ئۆتۆنۆمیی کوردستان و کێشەی کوردو کوردستان بکرێ.

هەرچی پێکهێنانی دەزگاکانی بەڕێوەبەرێتییە کە لەلایەن ئەنجومەنی ناوچەییەوە بەڕێوە دەچێ، ئەویش دەگرێتەوە. جگە لەوە، گوتی: بۆ باری ئابووری‌و پەروەردەو کەرەستەی دەرمانیو... هتد بۆ ناوچەی مەهاباد، یارمەتیی قازی دەدرێ. فەیرووز ئەوەی دووپات کردەوە کە هێنانە کایەی کێشەی کورد بەگشتی دەبێ بەرە بەرە بێ؛ دەبێ توانا‌و پێگە بۆ قازی محەمەد دروست بکرێ تا لە ڕێگەی ئەوەوە (قۆناغ بە قۆناغ) لەناو کوردەکانی تورکیا‌و عیراقدا دەست بە پروپاگەندە بکرێ لەو ڕووەوە کە ڕەگەزیان ئێرانییە[1].

من بە فەیروززم گوت: دەبێ پاراستنی سنوورەکان لە ئەستۆی سوپای ئێراندا بێ. سەبارەت بە کێشەکە، بەگشتی گوتم: لەو بارەوە لێکۆڵینەوەی تایبەتم نەبووەو پێویستە لەگەڵ ئەوانەو بەتایبەت قازی محەمەددا ئاشنا بم‌و بدوێم، تا دوایی بتوانم بیروڕای خۆم سەبارەت بەو دەرببڕم.

دوای ئەوە داوام لە فەیرووز کرد سەبارەت بە پێکهێنانی حیزبی دیموکراتی ئێستا وەڵامی پرسیارەکانم ببیستم. فەیرووز گوتی: ئەوان پێیان باش بووە ناوی ئەم پارتە دروستکراوە ببێتە پارتی جووتیاران، بەڵام دکتۆر جاوید کاتی هاتنی بۆ تاران پێشنیاری کرد ناوی پارتی دیموکرات بێ، تا فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان بەرە بەرە بچنە ناویەوە[2].

## ی. سادچیکۆف[3]

---

[1] ڕژێمی ئێران پیلانێکی کۆنی پانئێرانیەکانی دووبارە خستەوە ڕوو کە بەپێی ئەوە کوردەکانی تورکیا‌و عیراق‌و سووریای بە ئێرانی دانا‌و گوتی کورد بە ڕەگەز ئێرانین‌و کوردستان بە هەموو پارچەکانەوە لە کۆنەوە سەر بە ئێران بووەو دەبێ کەڵك لە قازی محەمەد وەربگیرێ بۆ ڕاکێشانی کوردەکانی ئەوێ‌و لکاندنیان بە ئێرانەوە" بۆ ئەم مەبەستەش، دەبێ هەوڵ بدرێ قازی زۆرتر ناو دەربکات‌و بە ڕێبەری هەموو کوردان بناسرێ. دیارە بەپێی ئەم پیلانە، ئەگەر هاتوو سەریش نەگرێ، ئەوا تورکیا‌و عیراق چالاکانەتر لەگەڵ ئێراندا هاوکاریی یەکتر دەکەن بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی کورد، هەروا ئەم دەوڵەتانە زووتر لەیەکتری نزیك دەبنەوەو کێشەکە گەورەتر دەبێ (ئەوکاتە بیانوو بۆ هاوکاریی سوپای سێ دەوڵەتی ناوبراو دژی کورد پەیدا دەبێ).

[2] هەمان سەرچاوە، فۆندی ٠٩٤، ئۆ٣٧، د٥، پ٣٥A، ل١١٨-١١٩.

[3] سادچیکۆف ئیڤان ڤاسیڤیچ باڵوێزی سۆڤیەت لە ئێران لە ١٩٤٦/٢/٢٦ تا ١٩٥٣/٧/١٧، پێش ئەوەی ببێتە باڵوێزی سۆڤیەت لە ئێران، لەساڵی ١٩٤٥ تا ١٩٤٦ باڵوێزی سۆڤیەت بوو لە یۆگۆسلاڤیا، پێشتریش جێگرێکی وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت بوو لە ئێران.

**یاداشتی وتوویژی "سەلومین. و. ی"ی**
**سەرکونسوڵی یەکێتیی سۆڤیەت لە ماکۆ**
**٢٢ی ئابی ١٩٤٦:**

٢ی ئابی ئەمساڵ سەرۆکی دەوڵەتی کوردستان قازی محەمەد لەگەڵ نزیکەی چل کەس کە زۆربەیان پیاوی ئاینی بوون، هاتە ماکۆ. ڕۆژی دوایی قازی هاتە کونسولخانەو لە وتوویژیدا بە کورتی مەبەستی گەشتەکەی خۆی بۆ ناوچەی ماکۆ ڕاگەیاند. مەبەستی ئەو -بەکورتی- ئاشنابوون بە کاروباری حیزبی دیموکراتی کوردستان لە ناوچەکەو چارەسەرکردنی ناکۆکیی گەورەی نێوان سەرکردەی هێزەکانی کوردە. هەروەها چەند کۆبونەوەیەکی ئامۆژگاریانە بە بەشداریی سەرۆك خێڵەکانی کوردو لێپرسراوانی ڕێکخراوەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان ساز دەکات. وەك قازی محەمەد ڕایگەیاند، بەداخەوە تائێستا زۆربەی پیاوە ناودارەکانی کورد هەست بە ئەرکی سەر شانی خۆیان ناکەن و هەر خەریکی کێشەی نێوان خۆیانن بۆ بەشکردنی دەسەڵات و دەست بەسەرداگرتن. کەمکردنەوەو لابردنی ئەو ناکۆکیانە لەخۆبوردنێکی زۆری دەوێ. ئەوانە بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە ئاسۆی بیرکردنەوەیان تەسکەو بەگشتی نەخوێندەوارن، کارکردن لەگەڵیاندا زۆر گرانە، بەتایبەتی کە هێندێ پرسیار سەبارەت بە دامەزراندنی کۆماری دیموکراتی کوردستان یا ئۆتۆنۆمیی کوردستان هاتوەتە گۆڕێ. کۆبوونەوەی ئامۆژگاریانە بۆ ئەوەیە کە ئەو بارودۆخە نوێیەی وا هاتۆتە پێش، بۆیان ڕوون بکرێتەوەو پێیان بگوترێ. ڕاگەیاندنی ئۆتۆنۆمیی کوردستان لە ناوچەکەدا ناتوانرێ باسی لێوە بکرێ. کەواتە پێویستە ئێمە شێوەی کارمان بە تەواوی بگۆڕین و بۆ ئەوە بێ کە ((یەکێتیی هەموو کوردان پتەوترو دۆستایەتیی کوردو ئازەربایجانی بەهێز بکرێ. بەشداری لە کاروباری دەزگاکانی دەسەڵاتی خۆجێییدا بکرێ، بەتایبەت بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی کولتووریی خۆیان، لەوانە گەشەپێدان، پەروەردەو بارهێنان لەناو گەلی کورددا)).

ڕاگەیاندن و وتەکانی قازی محەمەد لە کۆبوونەوەکاندا، بوو بە هۆی نارەزایی و بێباوەڕیی هێندێ گەورە پیاوی کورد، لەبەر ئەوە هاتبوونە کونسوڵخانەی ئێمە تا بۆچوونەکانی قازی ڕوون بکرێنەوە. شتێکی ئاسایی یە کە کاربەدەستانی

کونسوڵخانه پێشنیارو ئامۆژگارییان کردبوون سەبارەت بەو پرسیارانه بچنه لای دەوڵەتی کوردیی خۆیان. جگه لەوە، سەرۆکی دەوڵەت ئێستا له شاری ماکۆیه.

قازی، دوای نانی نیوەڕۆ که ئانالی خاتوونی تەیمووری به شانازییەوە لەبەر هاتنی قازی محەمەد میوانداریيەکی ڕیك خستبوو، له ٤ی ئابدا ڕۆیشتەوە بۆ شاری خۆی. کاتی هاتنی قازی محەمەد بۆ ماکۆ، هیچ هەراوهورياپەك لەلايەن ئازەربايجانیەکانەوە ڕووی نەدا. کاربەدەستانی خۆجێیی ئازەربایجان کاتی هاتنی قازی هەموو هەوڵی خۆیان بەکار هێنا تا پێشوازیو هاتنەکەی قازی محەمەد بەڕێزو شکۆوە بێ[1].

سەلومین[2]

سەرکونسوڵی یەکێتیی سۆڤیەت له ماکۆ

**تەلگرامی ڕێبەری حیزبی دیموکراتی کوردستان بۆ قەوامول سەڵتەنە:**

ڕۆژنامەی "ئیتیلاعات"، بەپێی سەرچاوەی ڕادیۆی تەورێز، دوێنێ ٥ی سێپتەمبەری ١٩٤٦ بڵاوی کردوەتەوە: قازی محەمەد ڕێبەری حیزبی دیموکراتی کوردستان به تەلگرامێك بۆ قەوامول سەڵتەنەی ڕێبەری حیزبی دیموکراتی ئێرانو حیزبی "توودە"و حیزبی ئیرانو حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان ڕای گەیاندووە، حیزبی دیموکراتی کوردستان دەیەوێ بەشداری بەرەی ئەو حیزبه ناوبراوانه بێ[3].

**وتووێژی قازی محەمەد**
**لەگەڵ ڕۆژنامەی "ایران ما"و ڕۆژنامەی "رهبر"ی ئێراندا:**

ڕۆژنامەی "ایران ما" و"رهبر" ناوەڕۆکی وتووێژی ڕۆژنامەنووسانی خۆیان لەگەڵ ڕێبەری حیزبی دیموکراتی کورد قازی محەمەددا که ڕێکەوتی ٣ی ئەیلوول له تەورێز کراوە، بڵاو کردەوە. قازی ڕايگەیاند وتووێژی نێوان ئەو و ئێران له تاران بەهۆی دژایەتیی دارودەستەی دەسەڵاتداری سوپای ئێرانەوە ڕاگیراوە. گوتی: به ڕای

---

[1] هەمان سەرچاوە، فۆندی ٠٩٤، ئۆ٣٧، د٦٥، پ٢٥٩، ل١٧٩-١٨٠.

[2] سەلومین ڤاسیلی یوسفۆویچ کونسوڵی سۆڤیەت له ماکۆ، له شوباتی ١٩٤٥ تا تشرینی یەکەمی ١٩٤٦.

[3] ئەرشیڤی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی کۆماری ڕووسیای فیدراڵ، فۆندی ٥٦B، ئۆ٩، پ١١٦، د١٨١، ل٣٩٨-٤٠٠.

ئەو دوای خۆکێشانەوەی ژەنەڕاڵ ئەرفەع لە ستادی گشتیی سوپای ئێران، هیچ ئاڵوگۆڕێك نەکراوە؛ ئەو دەستنیشانی ئەوەی کرد کە داروودەستەی ستادی گشتی دەورێکی گەورەیان لە ڕاگرتنی وتووێژەکاندا هەبوە. گوتی: من لەو باوەڕەدام هەر ئەم تاقمەن ڕێگرەکان چەکدار دەکەن و پاڵیان پێوە دەنێن دژی دیموکراتەکانی کورد ڕابوەستن. هەروەها ڕایگەیاند ماوەیەك لەمەو بەر لای سەقز سێ ماشێنی باریی پڕ لە چەك و نارنجۆك گیراوە، دەسەڵاتدارانی سوپایی ناردبوویان بۆ دوژمنانی حیزبی دیموکراتی کوردستان.

قازی ڕایگەیاند، پێش گەڕانەوەی لە تاران بڕیار وابوو دوای پێنج ڕۆژێکی تر بۆ درێژەدان بەو وتووێژە بگەڕێتەوە بۆ تاران. بەڵام وتووێژ بە بەشداریی هەندێك لە سەرۆکەکانی سوپایی بێکەڵك بووە، لەبەر ئەوە چاوپۆشیی کردووە لە سەرلەنوێ ڕۆیشتنەوە بۆ تاران. ئەو ڕایگەیاند کوردەکان باوەڕیان بە نیازپاکیی قەوامول سەڵتەنە هەیە، بەڵام هێندێ کەس لە تاران هەن هەوڵ دەدەن قەوام لە کوردەکان دوور بخەنەوەو وتووێژەکان بپچڕێنن.

تا ئەوکاتەی ئەم کەسانە لە پۆستی خۆیاندا بمێننەوە، بە ئەنجام گەیشتنی ئەم وتووێژانە زۆر دوور دەنوێنێ. بەڵام سەرەڕای ئەمە وتووێژەکان بە یەکجاری ڕانەگیراون و بەم زووانە چاوەڕێی هاتنی نوێنەرانی ئێران بۆ کوردستان دەکرێ[1].

١١ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٦

**لێدوانی سەرۆکی کوردەکانی ئێران**

**تاران، ٩ی تەمووز (ئاژانسی تاس):**

ڕۆژنامەی "ڕەهبەر" وتووێژێکی خۆی لەگەڵ قازی محەمەدی سەرۆکی حیزبی دیموکراتی کوردستاندا بڵاو کردوەتەوە، قازیی تێدا سەبارەت بە گفتوگۆکانی لەگەڵ دەوڵەتی ئێراندا دوواوەو گوتوویە: چەند جارێك چاوپێکەوتنی لەگەڵ موزەفەری فەیرووزداو دوو جار لەگەڵ قەوامی سەرۆك وەزیراندا هەبوە. قازی گوتوویە:

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٢٧١.

هەڵوێستی قەوام بەرامبەر بە کوردەکان باشە، بەڵام بەداخەوە وتوویژ بەهۆی نەخۆشکەوتنی قەوامەوە دوا کەوتووە؛ ڕایگەیاند بە گەشبینییەوە دەڕوانێتە داهاتوو و هیوادارە دەوڵەتی ئێران دیموکراسی لە تەواوی ئێراندا بەرقەرار بکات[1].

**هەڵوێستی قازی محەمەد بەرامبەر بە دەوڵەتی ئێران:**

**تاران (ئاژانسی تاس)، ٣٠ی تەمووز:**

ڕۆژنامەی "ئیتیلاعات"، پشت بەستوو بە هەواڵی سەرچاوەی بڕواپێکراوی گەیشتوو لە کوردستانەوە کە هەندێ ناسراوو سەرچاوەی بەناوبانگی تاران سەلماندوویانە، ڕایگەیاندووە: گوایە قازی محەمەدی سەرکردەی کوردەکانی مەهاباد هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بە دەوڵەتی ناوەندی گۆڕیوە. ئێستا سەرکردەکانی کورد دوای وتووێژەکان و گەڕانەوەیان لە تارانەوە بۆ مەهاباد هەڵوێستیان دەرهەق بە دەوڵەتی ئێران چاکە. قازی محەمەد، بەپێی ئەو هەواڵانە کە لە سەقزەوە گەیشتوون، فەرمانی داوە بە هێزەکانی کوردی بەشداری گەمارۆی پادگانەکانی باکووری کوردستان بگەڕێنەوە بۆ مەهاباد[2].

**وتاری قازی محەمەد لە کۆبوونەوەی حیزبی دیموکراتی کوردستاندا**

**تەورێز، ٢٠ی ئابی ١٩٤٦ (ئاژانسی تاس):**

ڕۆژنامەی "کوردستان" دەقی وتاری قازی محەمەدی سەرۆکی کوردەکانی لەو کۆبوونەوەیەدا بڵاو کردووەتەوە. قازی سەبارەت بە گەشتەکەی خۆی بۆ کوردستان و شارەکانی ورمێ، شاپوور، خۆی و ماکۆ دوواوە؛ لە هەموو شوێنێك گوتوویە: ((لەبەر ئەوەی ئێمە خەباتێکی درێژمان لەگەڵ ئازەرییەکاندا کردووە بۆ ئازادی، هەموو زەمینەیەکی لەبار لەئارادایە بۆ هاوکاریی نزیکتر لەگەڵ هاوولاتیانی خۆماندا هەیە. دەبێ کوردەکانی ورمێ و شاپوورو خۆی و ماکۆ لەنزیکەوە هاوکاری لەگەڵ ئازەربایجانییەکاندا بکەن.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ئۆ٩، پ١١٥، د٠١٨٠، ل٢٤٧.

[2] هەمان سەرچاوە، ل٢٤٣.

پاشـان قـازی محەمـەد بەتایبـەت ئـەوەی دەسـت نیـشان کـردووە کـە چـووەتە هەرکوێیەك بە گەرمی پێشوازیی کراوە. لـە گەشتەکانیدا توانیویە هێندێ ناکۆکیی نێـوان کوردەکـان چارەسـەر بکـات. گوتوویـە، ئێمـە ئـاگری دووبـەرەکیمان کوژاندووەتەوەو کەش‌وهەوای دۆستایەتیمان ساز کردووە.

قازی، هەروەها باسی چاوپێکەوتنەکانی خۆیی لەگەڵ "پیشەوەری"دا کردووە لـە خۆی و ورمی. بەقسەی ئەو، پیشەوەری بۆ خەڵکی روون کردوەتەوە کە پەیوەندیی برایەتیی نێوان ئازەربیجانیەکان‌و کوردەکان پێویستە. گوتوویـە، پیـشەوەری پێـی گوتـووم: ((ئێمـە ئامـادەی هـەموو چەشـنە هاوکارییـەکین‌و ئازەربایجانیـەکان ئامـادەن خوێنی خۆیان لەپێناوی برا کوردەکانیاندا برێژن)). ئەویش لە وەڵامدا پێی گوتـووە: ((ئێمە جیاوازییەك لەنێوان کوردو ئازەریدا نابینین، ئامادەین لەپێناوی ئازەربایجاندا هـەموو جـۆرە قوربانییـەك بـدەین. هێزکـانی ئێمـە چەند مانگێك بـوو لـە دەوروبـەری سەردەشت‌و سەقز بوون، بەم پێیە نەك تەنیا سنوورەکانی کوردستان، بەڵکوو هی ئازەربایجانیشیان دەپاراست. سـنوورەکان ئێستایش لەلایـەن هێزەکـانی ئێمـەوە دەپارێزرێن)).

قـازی لـە کۆتاییـدا داوای کـرد لـەو قوتابیـە کوردانـەی وا بـۆ پـشوو لـە بـاکۆوە گەڕاونەتەوە، بزانن چۆن گەلانی پێشکەوتوو ئاسمان‌و زەوی‌و دەریایان بە زانست‌و کولتوور داگیر کردووە[1].

**ڕۆژنامەی "کوردستان"و لەقاودانی**
**درۆودەلەسەی چاپەمەنیە کۆنەپەرستەکان سەبارەت بە کوردەکان**

ئاژانسی تاس، ١٩ی ئابی ١٩٤٦:

لـە تـەورێزەوە ڕاگەیەنـدراوە: ڕۆژنامـەی "کوردسـتان"ی ئۆرگـانی حیزبـی دیمـوکراتی کوردسـتان، کـە لـە مـەهاباد دەردەچـێ، بـە بڵاوکردنـەوەی وتـارێکی دوورودرێـژ درۆودەلەسـەی ڕۆژنامەنووسـانی ئاژانـسی ڕۆیتـەرو ڕۆژنامـەی "دەیلـی تەلگراف" و "مۆرنینگ پۆست"ی لـەقاو داوە، کە بە خراپە لەسەر کێشەی کوردیان

---

[1] هەمان سەرچاوە، دۆسیەی ئاژانسی تاس– بەشی ڕاگەیاندنی ١٩٤٦، ئۆ٩، د١٨٠، پ١١٥، ل٧.

نووسیوەو بۆچوونەکانیان لە ڕوانگەیەکی ئیمپریالیستانەو چەوسێنەرانەوە سەرچاوەیان گرتووەو باوەڕیان بە پێشکەوتنخوازیو ئازادیخوازیی بزووتنەوەی گەلی کورد نییە. گوتوویە: گەلی کورد بڕوای بەو بۆچوونە بێبناغانە نییەو ئاماژەی بە خەباتی گەلانی ئەندەنووزیاو یۆنان داوە کە بۆ ئازادیی خۆیان تێدەکۆشنو بەگژ ئیمپریالیزمدا چوون.

لە وتارەکەدا ئاماژە بە ڕۆژنامەی "ئولوس"ی چاپی تورکیا کراوە کە دژی مەسەلەی کوردو هاوکاریو برایەتیی نێوان گەلی کوردو ئازەربایجانە. هەروەها وەڵامی گوزارشتەکانی ڕۆژنامەی "ئیتیلاعات"ی داوەتەوە، کە لەلایەکەوە دیموکراتەکانی کوردی بە ڕێگرو چەتە داناوە، لەلایەکی ترەوە هەوڵی دووبەرەکی نانەوەی لەناو ڕیزەکانی گەلی کورددا داوە.

ڕۆژنامەی "کوردستان" لە کۆتاییدا گوتوویە: ئێمە ئێرانینو دانیشتووی ئێرانی دیموکراتو ئازادین، لەگەڵ گەلانی تردا نامانەوێ ئەم وڵاتە بفرۆشین بە بێگانەو ئیمپریالیستەکان. ڕۆژنامەکە نووسیویە: دەوڵەتی ئەمڕۆی ئێران، بەپێچەوانەی ڕژێمەکانی پێشووەوە، لەسەر بنچینەی ئیرادەی گەلان دامەزراوە.

ئاژانسی تاس، تاران، ٣ی سێپتەمبەر- ڕای گەیاندووە: چەند ڕۆژێك لەمەوبەر کۆمسیۆنێکی پێکهاتوو لە "جەهانگیری"ی نوێنەری سەرۆك وەزیرانو "پاڵکۆڤنیك مەغرووری"ی نوێنەری ستادی گشتیی سوپای ئێرانو "سەدری قازی"ی نوێنەری پێشووی کوردستان لە مەجلیسی ئێران، بۆ وتووێژکردن لەگەڵ کورداندا، لە تارانەوە کەوتوەتە ڕێ بۆ کوردستان. بە وتەی ڕۆژنامەی "ئیتیلاعات"، ئەو کۆمسیۆنە لە ١ی سێپتەمبەردا گەیشتووەتە سەقزو دەستی بە گفتوگۆ کردووە[1].

ئاژانسی تاس، تەورێز، ٢٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥:

بەپێی هەواڵی گەیشتوو لە شاری مەهابادەوە، قوتابخانەیەك بە هاوکاریی دیموکراتەکان بە پێویستیی نوێوە کراوەتەوە. وتنەوەی وانە یا فێرکردن بە زمانی

---

[1] ئەرشیڤی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی کۆماری ڕووسیای فیدڕاڵ، فۆندیB٥٦، ئۆ٩، پ١١٦، د١٨١، ل٤٢٧.

زگماکـە، لـە زمانـەکانی بیـانی تـەنیا ڕووسـی دەوترێتـەوە. بەشـی نوێنەرایـەتیی بازرگـانیی یـەکێتیی سـۆڤیەت لەگـەڵ ئێرانـدا، دووسـەد کتێبـی فێربـوونی زمـانی ڕووسیی لە شاری تەورێز پێشکەش کردوون.

لەبـەر ئـەوەی دانیـشتوانی مـەهاباد هـیچ خزمـەتێکی فریاکـەوتنی پزیـشکی (تەندروسـتی) وەرنـاگرن و ڕووداوی نەخۆشیی درم لـەم شـارەدا زۆرە، نەخۆشـخانەی سۆڤیەت لە تـەورێز کە خزمەتی هێزەکانی سۆڤیەت دەکات، بڕیاری داوە یارمـەتیی پزیـشکیی دانیشتوانی ئـەم شـارە بـدات و نەشتـەرگەرو پزیـشکی نەخۆشیی هـەناوی بنێرێتە ئەوێ. پزیشکەکان لەو نەخۆشخانە ٢٥ قەرەوێڵەیی‌یە نوێیەدا کە دیموکرات و بازرگانەکانی ئەوێ دروستیان کردووە، کار دەکەن[١].

سەبارەت بە ڕووداوەکانی سیاسیی ناو هۆزەکانی کوردی ناوچەی ماکۆ

لە ١ی نیسان تا ١ی تشرینی یەکەم:

لـە هەواڵنامـەکانی ژمـارە ١٧ی ڕێکـەوتی ١٩٤٦/١/٣٠ و ژمـارە(٦٩)ی ڕێکـەوتی ١٨ی مـارتی ١٩٤٦دا سـەبارەت بـە کـوردان، هێنـدێ ڕاسـتیمان سـەبارەت بـە زۆر بێهێزبوون و هەروەها چەوتیی ناوەندی کوردیی مەهاباد لە بەڕێوەبردنی ڕێکخراوی حیزبی دیموکراتی کوردستان لێرەو هۆزەکانی کوردی جەلالی و میلان و زیلان و شکاك کـە لـە ناوچـەی مـاکۆو خـۆی دەژیـن، دەسـت نیـشان کردبـوو. پاشـانیش هێنـدێ سـەرکردەی هۆزەکـانی نـاوبراو کـە لایـەنگری دیمـوکراتن، بـۆ باشـتربوونی کاروبـاری ڕێکخـراوی حیزبـی و یارمەتیـدانیان لـە بـاری ڕێکخـستنەوە، چـەند پرسـیارو داواکارییەکیان خستوەتە بەردەم کۆمیتـەی ناوەنـدیی حیزبـی دیمـوکراتی کوردسـتان لە مەهاباد، کە وەك ئاگادارمان کردبوونەوە هیچ ئەنجامێکی نەبوو.

ڕێبەرایەتیی مەهاباد زۆر جار گوێی نەداوەتە داخوازیـەکانی ڕێکخراوی حیزبـی دیمـوکراتی ئێرەو هێنـدێ جار لە ناوەنـدەوە نوێنـەری وایـان نـاردووە کـە نـەك تـەنیا نەبوەتـە هـۆی چاکبوونی کاروبـاری ڕێکخستن، بـەڵکوو بـە پێچەوانەوە کاروبارەکـان

---

[١] هەمان سەرچاوە، فۆندی 56B، ئۆ٦، پ٤٣، د٥١، ل٠-١٦.

خراپتر بوون. لەگەڵ ئەمەشدا ناوەندی کوردی لە مەهاباد زۆر جار بڕیاری ناڕاستی داوە کە بە پێچەوانەی پرنسیپە دیموکراتیەکانەوە، دژی پەیوەندیی دۆستایەتیی نێوان خێڵەکانی کوردو دانیشتوانی کوردو ئازەریش بوون، بۆیە بوونەتە هۆی کزبوونی باوەڕ بەیەکترکردن‌و هاریکاریی نێوان دوو ڕێکخراوی دیموکراتیی هەردوو گەل‌و پاڵیان بە کوردەکانەوە ناوە دەست بکەنە تاڵان‌و کوشتنی جووتیارەکانی ئازەربایجان‌و بەم کارەش بزووتنەوەی دیموکراتیی لەپێش چاوی خەڵك سووك بکەن.

دەکرێ، بەگشتی، لەسەر نووسراوی سەرەوە بڵێین:

١- ڕێبەرایەتیی ناوەندیی کوردی لە مەهاباد ئامۆژگاریی سەرکردەی هۆزەکانی کوردی کردووە کە دانیشتوانی ئازەری لە ڕیزی حیزبی دیموکراتی کورد وەرگرن. ئەمانەی خوارەوە بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری ناوبراوی مەهاباد چالاکانە هەڵسووڕاون:

لە شاپوور: ڕێبەری هۆزی شکاك عومەر خان شەریفی، سەرکردەی خێڵی مەمەدی قوتاس ئاغاو سۆفی مەمەدو ڕێبەری خێڵی عەبدی تاهیری خانی سمکۆ؛ لە خۆی: سەرکردەی خێڵی مەمەکانلی، سەیید سوڵتان، سەرکردەی دوودکانلی سولەیمان ئیسمائیل؛ لە ماکۆ: ڕێبەری هۆزی جەلالی عومەر ئاغا خالیدو سەرۆکی خێڵی جینکانلی باقو عەلی‌و سەرۆکی هۆزی شێخ کانلی عەبدوڵڵا ئاغا حاجی کرامان‌و... هتد.

لەو وتووێژانەی کە کاتی جیاجیا سەبارەت بەم پرسیارە لەگەڵ ناوبراواندا کراون، دەردەکەوێ گوایە ئەوانە ئەم کارەیان بە داخوازیی برا ئازەریەکان بۆ هاتنە ڕیزی حیزبی دیموکراتی کوردستان کردووە. بەڵام بە کردەوە وا دەرکەوت سەرکردە کۆنەپەرستەکانی ناوبراوی کورد کە هێندێکیان پەیوەندییان بە دوژمنەکانی بزووتنەوەی کوردەوە هەیە، دەستیان بە کورداندنی ئازەربایجان کردووە بە مەبەستی ئەوەی:

ئـ) تا زۆربەی دانیشتوانی ناوچەی ماکۆو خۆی‌و ڕەزائیە لە باری نەتەوایەتییەوە کوردبن، داوا بکەن ئەم ناوچانە ببنە بەشێکی کوردستان‌و بەڕیوەبەرایەتیەکەشی لەلایەن مەهابادەوە بێ.

ب) ئەگەر فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان بڕیارێك نەدات، کوردەکان دەست بە ئاژاوەنانەوەو سەرکێشی بکەن‌و کێشە لەنێوان دانیشتوانی ئازەربایجان‌و کورددا

پەیدا بێ و زیان بە بزووتنەوەی دیموکراتی بگەیەنرێ، ئەوا نوێنەرانی تاقمی کۆنەپەرست لەناو دانیشتوانی ئازەربایجاندا بۆ بەجێگەیاندنی ئەم ئەرکە پروپاگەندەی وا دەکەن کە: کوردەکان مالیات لە جووتیارەکان وەرناگرن و داوای خزمەتی سەربازییان لێ ناکرێ و ئازەریەکان پشتیوانی دەکرێن لە دژی هەموو دەستدرێژییەك؛ ئەگەر ئەوانە، واتە ئازەریەکان، تەنیا ناویان لە حیزبی دیموکراتی کورددا بنووسن. هەروەها دەڵێن: تێکهەڵچوونی چەکداریی سوپای نێوان تاران و ئازەربایجان بێچەندوچۆنە، پێشی پێ ناگیرێ و ئازەربایجانیەکان تەنیا بەوە ڕزگار دەبن کە بێنە ناو ڕیزی حیزبی دیموکراتی کورد. سەرەڕای ئەم پروپاگەندانەو ترساندنی دانیشتوان، بەشێکی کەم لە ئازەریەکان ناویان لەم حیزبەدا نووسیوە. بەڵام کوردەکان، سەرباری ئەم سەرنەکەوتنە، پەنایان بۆ ئەم ئامرازو ڕێگایانە بردووە بۆ ڕاکێشانی ئازەریەکان دەدەن بۆ ناو حیزبی دیموکراتی کوردستان:

ئ) لە ناوچەی شاپوور، قەرەعەینی، ئاواجیك و زورئاوا، قەرەزێدین و گوندەکانی تر مەڕومالاتیان لە لەوەڕگەو کێڵگەکانی ئەو ناو دارو جووتیارە ئازەریانە بە تالان بردووە کە ئامادە نەبوون ناویان لە حیزبی دیموکراتی کوردستاندا بنووسن.

ب) مەڕومالاتیان لە جووتیارەکان دزیوەو بڵاویان کردووەتەوە کە هێرش دەکرێتە سەر ئەو گوندانەی وا جووتیارەکان ناویان لە حیزبی کورددا نەنووسیوە.

ج) لە ناوچەی زورئاوا "سولەیمان ئیسمائیل"ی دەرەبەگ دەیان جووتیاری گوندە جیاجیاکانی ئازەربایجانی گرتووەو ئازاری داون و داوای هاتنە ڕیزی حیزبی کوردی لێ کردوون.

د) ئازەربایجانیی کۆنەپەرست و تاوانباریان لە حیزبی کوردی وەرگرتووەو ئەوانیان خستووەتە ژێر باڵی خۆیان و پشتیوانییان لێ دەکەن و لە ڕێگەی ئەوانەوە زۆر بۆ جووتیارەکان دەهێنن و هەڕەشەیان لێ دەکەن کە ناویان لە حیزبی کوردیدا بنووسن.

کورتە ناساندنێکی هێندێ لەو ئازەریە بەکرێگیراوو کۆنەپەرستانە:

١. حوسێن عەلەم شاهی: نزیکەی ٣٥ ساڵە، ئازەرە، دانیشتووی گوندی زەنگەلانی خواروو و سەر بە ناوچەی قەرەزەندی سەر بە شاری خۆیە؛ جووتیارێکی دەوڵەمەندە،

کابرایەکی کۆنەپەرستە، بە تاوانی دزیو خراپەکاری لە شاری خۆی زیندانی کراوە. پاش ڕاکردن لە زیندان، پەنای بردە لای عەبدوڵڵا ئاغای حاجی قەهرەمانی کە ناوبراوی لە حیزبی کوردی وەرگرتووەو جلوبەرگی کاپتیانی کوردیی لەبەر کردووەو دژی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانو کاربەدەستانی ناوخۆیی هانی داوە. عەلەم شاهی لە ناوچەی (قەرەزەندی) گاڵتەی بە جووتیاران کردووەو ئازاری داونو بەرتیلی لێ وەرگرتوونو ناچاری کردوون لە حیزبی گوردیدا ناو بنووسن. ناوبراو، بەیاننامەیەکی بە ئیمزای کاپیتان عەلەم شاهی لە ئاواییەکان بڵاو کردوەتەوە، داوای تێدا لە هەموو جووتیاران کردووە بەپێی یاسای کۆن ئیجارە بدەنە خاوەن موڵکەکان.

٢. میر حوسێن مووسەوی: دانیشتوی قەرەزەیدین، گەورەی پێشووی ناوچەی قەرەزەیدینو نوێنەری کۆنەپەرستی بەناوبانگ کامیل پاشا خانە، دڕندانە لەگەڵ جووتیاراندا جووڵاوەتەوەو دەستدرێژیی کردوەتە سەر نامووسی دەیان ژنو کچی جووتیار. عەبدوڵڵا ئاغا، میر حوسێنی لە حیزبی کوردیدا وەرگرتووەو فەرمانی پێداوە کۆمیتەی کوردی لە قەرەزەیدین ڕێك بخات. دواتر ئابی ١٩٤٦ لەنزیکی گوندی قەرەزەیدین بە دەستی جووتیارێك کوژرا.

٣. حوسێنی بەسیری: نزیکەی سی ساڵە، ١٩٤٢ لە تورکیاوە هاتوەتە ئێران، دایكو باوکی لە تورکیا دەژین، خۆی بە لایەنگری تورکیا دەزانێ. ساڵی ١٩٤٤ لە شاپوورەوە چووەتە ڕیزی حیزبی توودەی ئێران، بەڵام دوای ماوەیەك بە هۆی ڕێکخستنی دووبەرەکییەوە دەرکراوە. ساڵی ١٩٤٥ بەسیری لە (خۆی) چووەتە ڕیزی حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان، لەوێش بەهۆی دووبەرەکی سازکردنەوە دەرکراوە. سەعید سوڵتان بەرپرسی کۆمیتەی کوردی، بەسیریی لە حیزبی کوردی وەرگرتووەو کردوویە بە بەرپرسی بەشی پروپاگەندەی کۆمیتەی کوردی لە شاری خۆی. دوای چەند ڕۆژێك لە چوونە ناو ڕیزی حیزبی کوردی، بەسیری لە شاری خۆی بەیاننامەی بڵاو کردووەتەوەو داوای لە ئەرمەنیەکانو ئاسووریەکانی ناوچە کردووە بچنە ڕیزی حیزبی کوردییەوەو خەباتی شانبەشانو باوی ڕابردووی کوردو ئەرمەنو ئاسووریی وەبیر هێناوەتەوە (خەباتی پارتی خۆیبوون بۆ لایەنگریی ئینگلیز بە بەشداریی داشناکەکان ساڵی ١٩٢٩-١٩٣١).

٤. حاجی ئەکبەر: دانیشتووی قەرەعەینی، نزیکەی پەنجا ساڵە، ئازەربایجانییە، برای دیموکراتی دەرکراو حاجی سوڵتانی قەزازە، کۆنەپەرستو سەر بە تورکیاو خاوەن موڵکی بەناوبانگە. حەیدەر ئاغای حەیدەری ئەوی هێناوەتە ڕیزی حیزبی دیموکراتی کوردییەوە. حاجی ئەکبەر زۆر چالاکانە خەبات دەکاتو جووتیارەکان دژی دیموکراتەکانی ئازەربایجان لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەی جۆراوجۆرەوە دەترسێنێ. هەندێك خاوەن موڵكو بازرگان کە چوونەتە ڕیزی حیزبی کوردییەوە، ڕایان گەیاندووە ئامادە نینماڵیات بە کاربەدەستانی خۆجێیی بدەنو گوێڕایەڵی دەوڵەتی ئازەربایجان نابن.

جێیی سەرنجە کوردەکان بە کردەوەو هەوڵدان سیاسەتی بەکوردکردنی دانیشتوانی ئازەربایجانیان گرتووتە بەرو هەوڵیان داوە بە شێوەیەکی یاساییانە جێبەجێی بکەن. ئەوان داخوازییەکی بەم چەشنەی خوارەوە لەو ئازەریانەی کە دەچنە ڕیزی حیزبی کوردییەوە، وەردەگرن:

١- ((من... داوا دەکەم لە حیزبی دیموکراتی کوردی وەرم گرنو پەیمان دەدەم گوێڕایەڵی هەموو یاساکانی دەوڵەتی کوردی بمو هەموو داخوازیەکانی حیزبی دیموکرات جێبەجێ بکەم؛ پەیمان دەدەم ماڵیات بە دەوڵەتی کوردی بدەمو خزمەتی سەربازی بۆ دەوڵەتی کوردی بکەم. لەمەولا ئازەربایجانی نیمو بە ڕەچەڵەك خۆم بە کورد دەزانمو منداڵەکانی من دەرس بە زمانی کوردی دەخوێننو ... هتد)).

سەرەڕای ئەوە، کوردەکان سوێندی ئازەربایجانیەکانیان بە قورئان داوە کە وەفاداری بەجێگەیاندنی پەیمانەکەی خۆیان بن.

٢- بڕیاری کۆمیتەی کوردی: پۆستی چەکداریی کوردی لە ناوەندی کوردیی ئەم شارانەی خوارەوەدا دامەزراوە؛ لە خۆی، شاپوور، ماکۆو لە ناوەندی ناوچەکانی قەرەزەیدین، قەرەعەینی، عەرەبلەر، ئاواجیك، گومرگی ئەو هەموو شتومەکانە دەکەن کە جووتیارەکان بۆ فرۆشتن دەیهێنن. کوردەکان ڕایانگەیاندووە ئەم هەموو پارە کۆکراوەیە دەدرێتە خەزێنەی کوردی لە ناوەند. نزیکەی سێ مانگە پارە لە خەڵك وەردەگرنو زیانێکی گەورەیان بە بەڕێوەبەرێتیی شار گەیاندووە. ئاشکرایە سەرکردەکانی کورد بۆ خۆیان دەستیان بەسەر ئەم پارانەدا گرتووەو بۆ مەهابادیان ناردووە.

٣- کۆمیتەی کوردی کەسانێکی ئازەربایجانی گرتوەتە ژێر باڵی خۆیو پشتیوانییان لێ دەکات، کە تاوانکارنو لە حیزبی کوردیدا ناویان نووسیوەو نەیانهێشتووە کاربەدەستانی خۆجێیی بە یاسایی لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکەنو سزایان بدەن. ئەو کردەوانە بوونەتە مایەی پەرەسەندنو زیادبوونی تاوانکردنو کۆسپ خستنە سەر ڕێگەی کاربەدەستانی خۆجێیی بۆ بەڕێوەبردنی کاری ئاسایی.

٤- سەرەتای ئەمساڵ حاجی سەیید محەمەد نوێنەری کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کورد لە مەهابادەوە هاتبوو بۆ ماکۆ، گوایە ئەرکی یارمەتیدانی کۆمیتەی کوردیی حیزبی دیموکراتو چارەسەرکردنی کێشەی نێوان کوردو ئازەربایجان، هەروەها ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵانەی کە کوردەکان کردوویانە، پێی سپێردرابوون.

سەیید، بە هاتنەکەی لە ماوەی مانگو نیوێکدا، هیچ کام لەم مەسەلانەی چارەسەر نەکردووەو بارودۆخ بەرەو باشی نەچوەتە پێش، بەڵکوو بە پێچەوانەوە پەیوەندیی بە کەسانێکی کۆنەپەرستو خاوەن موڵکو بازرگانو سەرکردەکانی کوردەوە گرتووەو بە بڵاوکردنەوەی بەیاننامە دەستی بە پروپاگەندەی ئیسلامی کردووەو نێوانی کۆمیتەکانی تێک داوەو هەوڵەکانی بە پێچەوانەی داخوازیەکانی زۆربەی دانیشتوانی کوردەوە نایاساییانە بەش کردووە؛ لەسەر ئەمە تێکهەڵچوونو ... هتد لەنێوان خێڵەکانی کورددا ڕووی داوە.

بە بڕیاری ڕێبەرایەتیی حیزبی دیموکراتی کورد قازی محەمەد، حاجی سەیید محەمەد بانگ کراوە بۆ مەهابادو لەباتی ئەو سێ جار نوێنەری ڕێبەرایەتی لە ناوەندەوە بۆ یارمەتیدانی ڕێکخراوەکانی حیزبی دیموکرات نێردراوە بۆ ماکۆو خۆی. ئەم نوێنەرانە نەیانتوانیوە دڵسۆزانە لە کاروباری ڕێکخستندا خۆیان نیشان بدەن، بە پێچەوانەوە هەوڵی دژ بە ڕێکخستنیان داوە بۆ شێواندنی بارودۆخ لە ناوچەکە.

لە ١ تا ٦ی ئابی ئەمساڵ قازی محەمەد لە خۆیو ماکۆ بوو، -بە وتەی خۆی- هاتووە تا شارەزای کاروباری ڕێکخراوو کۆمیتەکانی حیزبی دیموکرات بێ. دانیشتوانی خۆیو ماکۆ، چ کوردو چ ئازەربایجانیو هەروەها دەسەڵاتدارانی خۆیی، بە ڕێزێکی زۆرەوە پێشوازییان لە قازی محەمەد کردووە. بە بۆنەی هاتنی ئەوەوە پەزیان لێ کوشتنەوەو بە تەقەکردنو مەشقکردن پێشوازییان لێ کردووە، هەموو لەو

باوەڕەدا بوون کە قازی محەمەد هێندێ هەنگاوی بۆ سزادانی سەربەخۆیی سەرۆک خێڵە کوردەکان و ڕێکوپێککردنیان و چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانی نێوان کوردەکان و جووتیارەکانی ناوچەکەو نێوان کۆمیتەکان و دەسەڵاتی ناوەندی هەڵگرتووە. بەڵام سەرەڕای هێندێ شکاتکردن لەلایەن نوێنەری فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان و کاربەدەستانی خۆجێیی و جووتیارانەوە، سەبارەت بە هەڵسوکەوتی نادیموکراتیانەو سەربەخۆیی هێندێ لەسەرۆکانی کورد، قازی محەمەد لەسەر ئەمانە هیچ کارێکی بەرامبەر بە وان نەکردووە. ئەو لە شاری ماکۆ، بەپێی شکاتی کوردەکان خۆیان، بڕیاری گرتنی سەرۆک خێڵی جینکانلی "باقو عەلی"ی سەرکێشی داوە، بەڵام پاش دوو سەعات ئازادیان کردووە.

لە شاری خۆی، دوای شکاتی نوێنەرانی ڕێکخراوی خۆجێیی، قازی محەمەد نەك بە تەنیا فەرمانی دەرکردنی عەلەم شاهی و بەسیریی نەداوە، بەڵکوو بە ئاشکرا هەزار ڕیاڵی بە بۆنەی شیعر هەڵگوتنەوە بە سەر قازی محەمەددا پێشکەشی حوسێنی بەسیری کردووە. قازی محەمەد لە هێندێ وتووێژدا لەگەڵ سەرۆک خێڵەکانی کورددا، ئەم ڕوونکردنەوەیەی خوارەوەی پێ گوتوون: ((لەوانەیە مەسەلەی یەکگرتنی کوردستان لەگەڵ ئازەربایجاندا بێتە کایەوە، بەڵام نابێ ئێوە پەسندی بکەن)).

قازی محەمەد ٣ی ئابی ١٩٤٦ لە کونسوڵخانەی سۆڤیەت، لە وتووێژدا لەگەڵ سەرکونسوڵدا، ناڕەزایی خۆی بەرامبەر بە پیشەوەری دەربڕیبوو و ڕایگەیاندبوو پیشەوەری خۆی لە کوردەکان ناگەیەنێ و ئاگاداریان نییەو بڕیاری وەرگرتنی کوردەکانی لە فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجاندا داوە. قازی محەمەد گوتوویە: وەرگرتنی ئازەربایجانیەکان لە ڕیزی حیزبی دیموکراتی کوردستاندا وەڵامدانەوەی بڕیاری پیشەوەرییە سەبارەت بە وەرگرتنی کوردەکانی ناوچەی میاندواو لە ڕیزی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجاندا.

عومەر خانی شەریفی و قوتاس عەمەری لەگەڵ قازی محەمەددا هاتوون، ئەوانە چاوپێکەوتنی گومانلێکراویان لەگەڵ کۆنەپەرستانی سەرۆک خێڵ و هۆزی ناوچەی ماکۆدا هەبوە بۆ ڕێکخستنی نیگەرانیی کورد. قازی محەمەد کە لە ماکۆ بووە، پەیمانی بە کۆمیتەی کوردی لە ماکۆ دابوو چەك و جلوبەرگیان بۆ بنێردرێ. دوای

گەڕانەوەی قازی محەمەد لە ماکۆ، کوردەکان هێرشی چەکدارانەیان بۆ سەر گوندە ئازەریەکان و کوردەکانی تورکیا دەست پێ کردووە.

ماوەی ئاب- ئەیلوول، بەپێی سەرچاوەی ناتەواو، کوردەکان شەش جار هێرشیان کردوەتە سەر کوردی تورکیاو ١٣٩٥ سەر پەزو ٧٢ مالاتی گەورەو ٢٦ ئەسپیان دزیوە. کوردەکان لەو ماوەیەدا ٢١ هێرشیان کردوەتە سەر گوندە ئازەریەکان و جووتیارێکی زۆریان تالان کردووەو ٧ کەسیان لەوانەی کە کاتی تالانکردنەکان بەرەنگارییان کردبوو، کوشتووە. کوردەکان لە زۆر گوندی ناوچەکانی ئاواجی، قەرەعەینی، زەرتاوا، قەرەزەیدین و... هتد، بەزۆر گوندی خاوەن موڵکەکانی ئازەربایجانیان داگیر کردووەو ماڵاتیان لە جوتیاران کۆکردوەتەوەو دەستیان بەسەر جەواڵی گەنمدا گرتووەو سێیەکی دەغڵو دانی کۆنەکراوەیان لەباتی کرێ لە جووتیارەکان ستاندووە بۆ خۆیان و ڕێگەیان لە کاربەدەستانی خۆجێیی گرتووە دانەوێڵە بۆ ئەمبارەکانی دەوڵەت کۆ بکەنەوە. کوردەکان بۆ ڕێگریی دانیشتوانی ناوچە ناوبراوەکان، کە لە هێرشی شەوانەی کوردەکان دەترسن، ئێواران لەگەڵ ئاژەڵی خۆیاندا دەچنە گوندە گەورەکان و بە ڕۆژ دەگەڕێنەوە سەر کێڵگەکانیان. ئەو سەرکردەو سەرۆك خێڵانەی کە لە لاپەڕە دووی ئەم ڕاپۆرتەدا ناویان هاتووە، ڕێبەرایەتیی ئەم ڕێگری و کارانە دەکەن؛ هەروەهایش مستەفا کاڵە، حوسێن تەئار، سەرۆك خێڵەکان حەسۆ خەلەفی، ماروف ڕەشۆ، عومەر تابۆ، خێڵی عەلی مەگولی حەمزە حاجی مەحمود ئاخکۆو جافر ئاجۆیە. تائێستا هیچ هەنگاوێك دژی ڕێگریی کوردەکان لەلایەن نە تەورێزو نە مەهابادەوە نەنراوە.

لە وتووێژێکدا لەگەڵ نوێنەری کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دیموکراتی کورددا، کازم ئاغا بەگی حەسەنی لەبارەی سەرکێشیی کوردەکانەوە بەم شێوەیە ڕای گەیاندووە:

((ئەم دواییانە کە لە تەورێز بووم، بۆ خۆم باسی تالانکاری و ڕێگریی کوردەکانم بۆ قازی محەمەد کردو داوام لێ کرد فەرمان بدات هەنگاو بنرێ دژی تاوانبارەکان. قازی وەڵامەکەی ئەوە بوو: تۆ بەس بە کوردەکان بڵێ بێدەنگ بن. ئەگەر هاتوو بە

**قسەی تۆیان نەکرد، ئەوکاتە ماکۆ جێ بێڵەو وەرە بۆ مەهاباد. بەزۆری ڕێگەی دژایەتیی کوردان‌و تەنگ پێهەڵچنینیان ناگرینە بەر)).**

- **کازم بەگ درێژەی پێداو گوتی: ((ڕاستە دەڵێن ماسی لای سەریەوە گەنیو دەبێ. دوای ڕاگەیاندنی ڕێبەری ئێمە، ئەوە بەسە بە کوردەکان ڕاگەیاندرابێ دەست لە تالانکردن هەڵگرن. من خۆم کوردم‌و بە تەجرەبە دەزانم ڕێگریی کوردەکان هیچ کاتێك بە پروپاگەندەو بەکارهێنانی زۆر نەکراوە))[1].**

---

[1] ڕاپۆرتەکەی مورادیان، کە باسی ناکۆکیی نێوان ئازەری‌و کورد دەکات، دیارە مەبەستی تەنیا ناوزڕاندن‌و تاوانبارکردنی کوردەکانە، گەرچی ناکۆکیی نێوان ئازەرو کورد پێشینەیەکی کۆنی هەیە. لێرەدا تەنیا باسی ئەوە دەکەم کە پاش ڕووخانی ڕەزا شا، زۆربەی ئەو هۆزو خێڵە کوردانەی وا لە زەمانی شادا بۆ ناوچە جیاجیاکانی ئێران دوور خرانەوە یا زیندانی کران، بە دەستێکی بەتاڵ گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان‌و لەوپەڕی هەژاری‌و نەداریدا بوون" مەڕومالاتیان نەمابوو و زەوی‌وزاریان درابوو بە خەڵکی تر، خانووبەرەیان ڕووخابوو. ئەوانە تووشی کێشەیەکی زۆر بوون بۆ وەرگرتنەوەی خانوو و زەویەکانیان. بڕیار وابوو ڕژێمی ئێران بەشێکی ئەو زیانەیان بۆ قەرەبوو بکاتەوە، بەڵام لەگەڵ نە کاربەدەستانی ئێرانی‌و نە ئازەریەکاندا سەری نەگرت. هەروەها تووشی کێشە بوون لەگەڵ هێندێ لە کوردەکانی ئەوێدا. کاربەدەستانی ئازەریش کە دەستیان بەسەر ئەوناوەدا گرت‌و ناوچەکانی خۆی‌و ماکۆو شاپوورو ورمێیان وەك بەشێکی ئازەربایجان هێشتەوە، بواری کوردەکانیان نەدا لە دەسەلات‌و بەڕێوەبردنی ناوچەکانی ناوبراودا دەوریان هەبێ. تەنانەت نووسەری ڕاپۆرتەکە ئەم ڕاستییەی نەشاردووەتەوە، گوتوویە: ((یەك کورد لە کاروباری دەوڵەتیدا بەشدار نەکراوە. وای لێ دێ هاتوچۆی کوردەکان لە ناوچەکەدا بە بێئیجازەی ڕەسمیی کاربەدەستانی ئازەری (وەك زەمانی شا)، نەکرێ. بەڵام بۆیان ناچێتە سەر، لەبەر ئەوەی کوردەکان قورساییەکیان دەبێ‌و چەکدار دەبن‌و هێزێکی زۆریشیان دەبێ، چەند جاریش تووشی تێکهەڵچوون دەبن، ئازەرەکان تێك دەشکێن (سەرەڕای یارمەتیی سوپایی کە لە تەورێزەوە بۆ ئازەریەکان دێ). پێش ئەوەی ئازەرەکان دەسەلاتی خۆیان بەسەر ئەو ناوچانەدا ڕابگەیەنن، دەسەلات بە دەست کوردەکانەوە دەبێ، بەڵام تەنگ بە ئازەریەکان هەڵناچنن. بایەخ نەدانی ڕێبەرانی کورد لە مەهاباد بەو ناوچانە، ڕێگرتنی فەرمانبەرانی سۆڤیەت بۆ دەست بەسەرداگرتنی ناوچەکان لەلایەن کوردەکانەوە، پاشان یارمەتیدانی ئازەرەکان تا دەست بەسەر ئەو ناوچانەدا بگرن" هەموو ئەمانە وای لە کوردەکان کرد زۆر جار، بەبێ ئەوەی پرس بە ڕێبەرایەتیی کورد بکەن، سەربەخۆ بجووڵێنەوە. دیارە هەردوولا هەوڵیان داوە ئەندام بۆ پارتەکەی خۆیان وەربگرن. ئێرانیش لەگەڵ کۆنەپەرستانی ناوچەدا ویستوویە شەڕ لەنێوان هەردوولادا بنێتەوەو هەردوولایش پیاوخراپ‌و بەکرێگیراویان بۆ ئەو مەبەستە دەست کەوتووە. لەلایەکی ترەوە، نەدانی ماڵیات و هتد... دەوری هەبوە. هەردوولا ڕایانگەیاندبوو ئەوەی بێتە حیزبەکەیانەوە، لە ماڵیاتدان‌و سەربازیکردن ئازاد دەکرێ. ئەمەیش بۆ خۆی هۆیەکی ئەم ئاژاوەنانەوە بووە)).

پێویسته ئەوەش بگوترێ کە دەسەڵاتی ناوەندیی ئازەربایجان زۆر جار گوێی نەداونێ، ئەمەش ناڕەزایی لەناویاندا دروست دەکات. هیچ کەسی کوردەکانی ناوچەی ماکۆو خۆی لە ئەنجومەنەکانی خۆجێیی و ناوچەیی هەڵنەبژێردراون و یەك کوردیش لە کاروباری دەوڵەتدا بەشدار نەکراوە. ئەم هەڵسوکەوتانە کوردەکان لە ئازەربایجانیەکان دوور دەخاتەوە. تاقمی کۆنەپەرست و دوژمن کەڵك لەم کردەوانە وەردەگرن بۆ ڕاپەڕینی کوردەکان دژی هەم دانیشتوانی ئازەربایجان و دەسەڵاتدارانی خۆجێیی و هەم پەرەسەندنی بزووتنەوەی دیموکراتی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد. ئەمانە لە ناوچەی سەر بە کونسوڵی ئێمە پێویستن:

ئ) ڕاکێشانی هەندێك کوردی بەناوبانگی دیموکرات بۆ ئیشکردن لە ئۆرگانەکانی دەسەڵاتداریی خۆجێیی.

ب) کوردەکانی ئەم ناوچەیە لە باری بەڕێوەبردنەوە بە تەواوی بخرێنە بەر دەست دەسەڵاتدارانی ناوچە.

پ) پێکهێنانی دەستەی پاسەوانی کورد، سەر بە دەوڵەت بن و مووچەیان بدرێتێ و لەلایەن سەرکردە کوردە بڕواپێکراوەکانیەوە بەڕێوە ببرێن؛ ئەرکی سەرشانیان دابینکردنی ئارامی لەناو کوردان و پێشگیریکردن لە تالانکاریی کوردەکان بێ و لە باری عەمەلیاتەوە سەر بە بەڕێوەبەرێتیی نیگەهبانی ئازەربایجان بن.

ت) دوورخستنەوەی هێندێك سەرکردەی کورد کە تالان و دزییان کردووەو زیانی جووتیارەکان لە تالانکەرەکان بستێندرێتەوە.

ج) کردنەوەی چەند قوتابخانەی سەرەتایی بە زمانی کوردی.

---

مورادیان، قازی محەمەدیشی تاوانبار کردوو کە لەم بارەوە ناڕەزایی بەرامبەر بە پیشەوەری دەربڕیوەو بە سەرسوڕمانەوە باسی کردووە چۆن قازی وێراویە ڕەخنە لە پیشەوەری بگرێ، گەرچی قازی بۆ خۆی زانیویە مورادیان پیاوی باقرۆفەو لەوانەیە ئەو قسانەی نەکردبێ. عومەر خانی شەریفی (شکاك) کە لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی تری کورددا تاوانبار کراوە پەیوەندییان بە ئێران و تورکیا یا ئینگلیز یان ئەمریکاوە هەبوە، ئەوە دەری دەخات کە مورادیان درێغیی لە هیچ شتێك نەکردووە بۆ بەدناوکردنی کوردەکان. هەروا باسی کابرایەك کراوە گوایە ئەندامی سەرکردایەتیی حیزبی دیموکراتی کوردستان بووە، تائێستا ناوی لە هیچ بەڵگەو نووسراوێکدا نەهاتووەو لە زمانی ئەوەوە تاوانی زۆر دراوەتە پاڵ کورد.

سەرەڕای ئەم ڕاپۆرتە، ئەم نامانەی خوارەوە پێشکەش دەکرێن:

١- لیستی ناوی کوردە تالانکەرەکان لە (٧) لاپەڕەدا.

٢- وەرگێرانی هەندێك نامەی ئالوگۆڕکراو لەنێوان کۆمیتەی کوردی لە خۆیو کاربەدەستی خۆجێیی لە (٦) لاپەڕەدا.

٣- بەیاننامەکانی حاجی سەیید محەمەد سەعیدی لە سێ لاپەڕەدا.

٤- وەرگێڕاوی سێ نامەی کۆمیتەی حیزبی کوردی لە ٣ لاپەڕەدا[1].

(ئا-مورادیان)[2]

سکرتێری سەرکونسوڵی سۆڤیەت لە ماکۆ

سەلومین سەرکونسوڵی سۆڤیەت لە ماکۆ لە نامەیەکدا ڕێکەوتی ١١ی ئەیلوولی ١٩٢٦ بۆ بیلیاییێف بەرپرسی سەرۆکی بەشی کونسوڵی وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت کە کۆپییەکەیشی ناردووە بۆ بەشی کادری وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەتو سادچیکۆڤ و باڵوێزی سۆڤیەت لە ئێران کراسنیخ کونسوڵی گەورەی سۆڤیەت لە تەورێز.

گوتوویە: کاتی ناردنی ڕاپۆرتەکەم شتێکی گرنگم لەبیر چووبووەوە، ئەویش سەبارەت بە کەم خوێندەواریو نەزانیی "موردیانو ئەڵلاڤێردییێڤ"ی جووتە سکرتێری کونسوڵی ماکۆ. سەبارەت بەوانە نووسیویە: بە لەبەرچاوگرتنی ڕابردوویان، ئارام قەرەپیتوڤیچ موردیان لە ماکۆ ئیش دەکاتو سێ ساڵ ئەندامێکی بەرزی وەزارەتی ناوخۆی سۆڤیەتو نوێنەری ئەرمینیا بووە لە شوورای بەرزی سۆڤیەت؛ ئەوی تر ئەڵلاڤێردییێڤە. تۆفیق عەلی حەیدەر ئۆغلی کە خولی تایبەتی لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی یەکێتیی سۆڤیەتی دیوە، بە وتەی خۆی، سکرتێری کۆمیتەی ناوەندیی کۆمسۆمۆڵی ئازەربایجانی سۆڤیەت بووەو هێندێکی نەمابوو بڵێ یەکەم کەسی بڕواپێکراوی هاوڕێ باقرۆفە.

---

[1] هەمان سەرچاوە، فۆندی ٠٩٤، ئۆ٣٧، د٦٥، پ٣٥٩، ل١٩٩٠٢١٢.

[2] موردیان ئارام قەرەپیتۆڤیچ لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٦ تا ئەیلوولی ١٩٤٧ لە ماکۆ کونسوڵی سۆڤیەت بووە.

هەموو ئەم شتانە هەر لە ڕۆژی یەکەمی هاتنمەوە بۆ باکۆ، بوو بە هۆی پەرێشانیو دەستەپاچەیی، کە نەمتوانی بە ئاسایی ئیش بکەمو پاش چەند مانگێك توانیم لە ڕووداوەکانی تێبگەمو لێکۆڵینەوەی ڕاستەقینەیان لەسەر بکەم.

سەلومین[1]

سەرکونسوڵی سۆڤیەت لە ماکۆ

لەباتی وەلامی سەلومینو گۆڕان یا لابردنی ئەلاڤێردییێڤو مورادیان کە هەردوکیان پیاوی باقرۆف بوونو دەستێکی گەورەیان لە ئاژاوەنانەوەی دژ بە کورداندا هەبوە، سەلومین گۆڕاوەو مورادیان کراوە بە کونسوڵی سۆڤیەت لە ماکۆ. چەند جاری تر لەلایەن کاربەدەستانی سوپاییو دیپلۆماسیی سۆڤیتەوە ڕەخنە لەو دوو کەسە ناوبراوەو هێندێکی تر گیراوە، بەلام داواکاریەکان بە پاڵپشتی باقرۆف پشت گوێ خراونەوە.

**گۆڕینەوەی تەلگرام لەنێوان قەوامول سەڵتەنەو قازی محەممەددا**

٢٨ی تشرینی دووەمی ١٩٤٦:

قەوامول سەڵتەنە بە ناردنی تەلگرامێك بۆ قازی محەممەد داوای لێ کردووە یارمەتیی هاتنی دەستە تایبەتەکانی سوپای ئێران بدات کە دەنێردرێن بۆ شارەکانی خۆیو شاپوورو ورمێو مەهاباد. وەك ئاشکرایە ئەم شارانە سەر بە ئازەربایجانی ڕۆژئاوان. وەلامی قازی محەممەد بۆ قەوامول سەڵتەنە کە لە ڕێگەی تەورێزەوە وەرگیراوە، بەم چەشنەیە:

((بەپێی بەندەکانی (١٤، ١٦، ١٧، ١٩)ی یاسای هەڵبژاردن، قازی محەممەد لەو بڕوایەدایە کە دەبێ قەوامول سەڵتەنە بە هێزی چەکدار دەست لە کاروباری هەڵبژاردنی ناوچە کوردیەکان وەرنەدات. لەبەر ئەوە ژەنەڕاڵ ئەرفەعو هاوڕێکانی لە

[1] سەلومین، لە تشرینی دووەمی ١٩٤٥ تا تشرینی یەکەمی ١٩٤٦ لە ماکۆ سەرکونسوڵی سۆڤیەت بووە.

شارەکانی سەقزو بانە کابرایەکیان بە ناوی "موحیتی"یەوە ناردە مەجلیسی ئێران، کە بوو بەهۆی سووککردنی گەلی کورد. قازی محەمەد ڕادەگەیەنێ ئارامیو ڕێکوپێکی لە کوردستان هەن، لە ڕۆژی هەڵبژاردنیشدا هەر دەمێننەوە. سەبارەت بە شارەکانی ڕەزائیەو خۆیو ماکۆ، قازی محەمەد دەڵێ: فەرماندەر لەو شارانەدا هەیە، ماوەیەك لەمەوبەر قەوامول سەڵتەنە دایناون. ٢٨ی تشرینی دووهەم، بەگوێرەی ڕاگەیاندنی دوێنێی ڕۆژنامەی "ئێران"، واتە ٢٧ی تشرینی دووهەم، ڕێبەری دیموکراتەکانی کورد قازی محەمەد وەڵامی تەلگرافی قەوامول سەڵتەنەی سەبارەت بە ناردنی سوپای ئێران بۆ کوردستان داوەتەوە.

سەبارەت بە وەرگرتنی تەلگرام، قازی محەمەد نووسیویە: دەبێ کۆنتڕۆڵکردنی هەڵبژاردن، بەپێی یاسای هەڵبژاردن، لە ئەستۆی ئەنجومەنی هەرێمیدا بێ. بەڵێنی بە قەوام دا کە هەڵبژاردن لە کوردستان لە بارودۆخێکی ئازادو دیموکراتیدا بەڕێوە بچێ. ڕایگەیاند: ناردنی سوپای ئێران بۆ ناوچە کوردنشینەکان، هیچ پێویست ناکات، لەبەر ئەوەی دەبێتە هۆی دووپاتکردنەوەی ڕووداوەکانی هەڵبژاردنی دەورەی چوارەمینی مەجلیس. سەرەڕای ئەوە، ئامادەبوونی سوپا دەبێتە هۆی سووکایەتیکردن بە کورد.

**نامەی ڕێبەری دیموکراتەکانی کورد بۆ قەوامول سەڵتەنە:**

٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٦ ڕۆژنامەی "ڕەهبەر" نامەی ڕێبەری کوردە دیموکراتەکان "قازی محەمەد"ی بۆ قەوامول سەڵتەنە، کە ڕێکەوتی ٢٥ی ئوکتۆبەر نووسراوە، بڵاو کردەوە؛ ڕایگەیاند فەرماندەیەکی بەرزی سوپای ئێران بەناوی پاڵکۆنیك "پزشکان"ەوە بە فەرمانێکی نابەرپرسانەی کاربەدەستانی تاران، تاقمێك کوردی مەهابادی دژی دیموکراتە کوردەکانی مەهاباد هان داوە. فەرماندەیەکی تری "ئیرەم" ناو ئەم تاقمەی بانگی سەردەشت کردووە، تا ڕێگە بۆ ئەم شارە پاك بکەنەوەو بە چوارسەد کەسو تۆپو تانکەوە هێرشی کردوەتە سەر دیموکراتەکانی کورد. قازی محەمەد قەوامول سەڵتەنەی لە مەترسیی نائارامی کە لە وانەیە پاش ئەم هەنگاوە ڕوو بدات، ئاگادار کردوەتەوە.

ڕۆژنامەی "آتش" لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦دا نووسیویە: قازی محەمەد بۆ دوو ڕۆژ چووەتە مۆسکۆو دوای وەرگرتنی بڕیاری پێویست گەڕاوەتەوە بۆ ئێران، گوێڕایەڵیی خۆی بۆ دەوڵەتی ئێران ڕاگەیاندووە.

**ڕۆژنامەی "ئیتلاعات"،**
**لەبارەی ئازەربایجانو کوردستانەوە:**

ڕۆژی ٨ی مارتی ١٩٤٧ ڕۆژنامەی"ئیتلاعات" نووسیویە: سەرۆکی پێشووی دەوڵەتی خودموختاری کوردستان "حاجی باباشێخ" بە ڕۆژنامەنووسی ئەم ڕۆژنامەیەی ڕاگەیاند: گوایە کاتێک پێشەوەری و قازی محەمەد لە باکۆ بوون، پێشەوەری و کاربەدەستانی دەرەوە پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت کە کوردستان ببێتە بەشێکی ئازەربایجان و سەر بەوێ بێ. بەڵام قازی محەمەد زۆر بەتوندی دژی ئەو هەڵوێستە ڕاوەستاو بڕیاری لەسەر نەداو ڕایگەیاند ئەگەر بڕیارە کوردستان سەر بە تەورێز بێ، باشتر وایە سەر بە دەوڵەتی ناوەندیی تاران بێ. حاجی باباشێخ گوایە ڕایگەیاندووە ڕێبەرانی کورد لە باکۆ لەژێر گوشارێکی ئەوتۆدا بوونو قازی محەمەد تەنانەت ئامادە بوو خۆی ژارخواردوو بکات. ئەو هەروا ڕایگەیاند: بێگانەکان سەرەنجام بەڵێنیان دا قازی محەمەد ببێتە سەرۆکی کۆماری کوردی، تەنیا لەبەر ئەوە کە لە بەرژەوەندیاندا بوو قازی دژی پیشەوەری بەکار بێننو ئەم هەڵوێستە جێپێی ئەوانی قایم دەکرد.

ڕۆژنامەنووسی "ئیتلاعات" بەردەوام بووەو گوتوویە: نەخشەی کوردستانی مەزن بە زمانی ئینگلیزی لە ژوورەکەی قازی محەمەددا دەبینرا. ناوچەکانی باشووری ئەرمەنستانی سۆڤیەت، فارسو ئەردەهانو ناوچەکانی دەوروبەری گۆمی وانو ناوچە نەوتاویەکانی عیراق، مووسڵ هەروەها دیاربەکرو سلێمانی، لەم نەخشەیەدا خرابوونە سەری. ئەم شارانەی ئێران: ماکۆ، خۆی، شاپوور، ڕەزائیەو میاندواو و تیکابو ناوڵەو گۆمی ورمێ لەناو نەخشەکەدا خرابوونە سەر کوردستان. سنووری کوردستان دەگەیشتە لای هەمەدانو باشووری دەگەیشتە (بووشەهر)، کە هەموو ناوچە نەوتاویەکانی ناوچەی ئەبادانو هەروەها کرماشانو سنەو سەقزو مەهابادو بەشێکی خوزستانو عیراق تا کەنداوی فارسی دەگرتەوە.

ڕۆژنامەی "ئیتلاعات" ئاژاوەگێڕانە ڕایگەیاندووە کە قازی محەمەد لەبەر ئەوە بووەتە سەرۆکی کۆماری کوردستان، چونکە بێگانەکان بەرژەوەندیان لە نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەیە. ڕۆژنامەکە گوتوویە: تەنانەت سروودی نەتەوایەتیی کوردستان -گوایە- باسی بێمافیی کوردان لەسەر بیرە نەوتەکانی ئێرانو عیراقو کرماشانو مووسڵ دەکات، بۆ ئەوەی ناکۆکییەکی نێوان ئازەربایجانیەکانو کوردەکان نەمێنێ.

بێگانەکان لە کۆتایی ٥ی ئەیلوولی ١٩٤٦دا هەواڵی ڕاگەیاندنی پەیمانی دووقۆڵیی نێوان خودموختاریی کوردستانو ئازەربایجانیان ڕاگەیاند. لە درێژەی ئەو نووسراوەدا کە ٩ی مارتی ١٩٤٦ بلاو کراوەتەوە، گوتراوە: کاتی وتووێژی بەهاری ١٩٤٦ی نێوان ئازەربایجانیەکانو دەوڵەتی ئێران لە تاران، جاوید شەبوستەری پێی لەسەر ئەوە داگرت کە ئاشتیخوازانە لەگەڵ دەوڵەت ئێراندا پێک بێن، بەلام پیشەوەریو غولام یەحیا ویستیان وتووێژ کۆتایی پێ بێ[1].

**نامەی (کۆمەڵەی کوردەکان) بۆ وەزیری دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا**

١٧ی نیسانی ١٩٤٧، بەیرووت، ئاژانسی هەواڵدەری تاس:

کۆمەڵەی کوردی لە نامەیەکدا کە بۆ وەزیری دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای ناردووە، گوتوویە: ((گەلی کورد بە پەرێشانییەکی زۆرەوە دەڕوانێتە مەسەلەی بڕیاری یارمەتیدانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تورکیا کە لەلایەن دەزگا یاسادانەرەکانی ئەمریکاوە لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێ. گەلی کورد ٪٤٠ی کەوتووەتە ژێر دەسەلاتی تورکیا سەرنجی ئێوە بۆ بارودۆخی ئەنجامی شوومی ئەو سیاسەتەی ئەمریکا کە لەوانەیە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەدوایەوە بێ، ڕادەکێشێ. پێویست بەوە ناکات سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر بە تورکیا بە گەلانی غەیرە تورکی دانیشتوانی تورکیا کە تائێستا بێگومان ماوەتەوە، لێرە ڕوون بکرێتەوە؛ ئەگەر

---

[1] ئەرشیڤی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی کۆماری ڕووسیای فیدراڵ، فۆندی B٥٦، ئۆ١٠، پ٢٣١، د١٧٣، ل٦٩-٧٠.

یارمەتیی دەوڵەتی تورکیا بدات، ئەوا هەست بە پشتیوانی دەوڵەتی ئەمریکا دەکاتو هەنگاوی زۆرتر بۆ خنکاندنو کوشتاری کورد دەنێ. مێژوو، کوشتارو لەناوبردنی ئەرمەنەکانو ئاسوورییەکان پێشو پاش شەڕی ١٩١٨-١٩٤١، دەخاتەوە بیرمان. ڕەوشتی ڕەگەزپەرستانەو پۆلیسیانەی دەوڵەتی تورکیا کە هەموو چەشنە ئازادییەکی لەناو وڵاتدا خنکاندووە، هەروەها هەڵوێستی بەرامبەر بە کەمە نەتەوەکان، لای بیرو بۆچوونی کۆمەڵەی جیهانی زۆر ڕوونو ئاشکران. چەند بەرپرسی دەکەوێتە سەر شانی ئەمریکا کە یارمەتیی تورکیا بدات. پێڕەویی سیاسەتێکی ئاوا، پێچەوانەی پرنسیپەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانە. ئێمە چەند جارێك ئەوەمان دەست نیشان کردووە.

ئەو کوردانەی کە لە تورکیا دەژین کەمە نەتەوە نین، بەڵکوو گەلێکن بە تەواوی خاوەنی سنووری دیاریکراوی سروشتیی خۆیانن؛ گەلێکن ئێستا لەنێوان تورکیا و ئێرانو عیراقدا دابەش کراون، ئەو دەوڵەتانە ئازاری دەدەنو لەناویشی دەبەن.

کوردەکان، هەم لە شەڕی ڕابردووداو هەم پاش ئەم شەڕەی دوایی، باوەڕیان بە سەرکەوتنی هاوپەیمانەکان بووە. کوردەکان لە ئاڵۆزترین کاتی ئەم شەڕەی دواییدا باوەڕی تەواویان بە دیموکراتیو ئازادی، کە دەسکەوتی مسۆگەری هاوپەیمانان بوون، هەبوە. ئێمە لەو باوەڕەداین کە ئەو یارمەتیانەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بە تورکیایان دەدات، دژی پرنسیپەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان بەکار دەهێنرێن.

## باقرۆڤ و کورد
## لە ئاوێنەی هەندێك بەڵگەنامەدا

باقرۆڤ و پیاوەکانی لە ئێران، دوای ئەوەی سوپاکانی سۆڤیەت و بەریتانیا ئەو وڵاتەیان داگیر کرد، مەترسیی خۆیان لە گەشەکردنی بزووتنەوەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان نەشاردەوە" لە چاوپێکەوتن و ڕاپۆرتیاندا بۆ مۆسکۆ باسی هێنانی چەکی ئینگلیزییان بۆ کوردانی ڕۆژهەڵات، لە ناوچەی ژێردەستی بریتانیا و لە هی سۆڤیەتیش، کردووە، تا دژی دەوڵەتی ناوەندی ڕاپەڕن و وەك ئامرازێکی گوشار خستنە سەر کورد کەڵك لە کورد وەرگرن و هانی جیابوونەوەیان لە ئێران بدەن تا کوردستانی مەزن دامەزرێنن.

گوایە هێنانی چەك و بڵاوکردنەوەی لەناو کورددا و لە هەندێ شوێنیشدا لەناو ئازەریدا، بەو چەشنەیە کە ماشێنی چەکەکان لە جێیەکی نزیکی ئاوایی دادەنرێ و بە خەڵکەکە دەوترێ بڕۆن ئەو شوێنە چەکی لێیە. بیهێنن. باقرۆڤ ناوی شوێنەکانی نەبردووە، تەنیا ئاماژەی بە ڕاپۆرتی پیاوەکانی خۆی لە ئازەربایجان داوە هەروەها گلەیی و گازندەی لەدەست هەندێ فەرمانبەری دیپلۆماسی و سوپایی سۆڤیەت کردووە کە زیاتر بایەخیان بە کورد داوەو پەیوەندیی دۆستانەیان لەگەڵدا هەیە"

گوتوویە: لەکاتێکدا زۆربەی دانیشتوانی ئەوێ، واتە ورمێ و ماکۆ و خۆی، ئازەرین و دەبێ بایەخی زیاتر بە ئازەری بدرێ، کەچی کونسوڵەکان ئازەرییان لەبیرکردووە.

"ئەحمەد یەعقووبۆڤ"ی ڕاوێژکاری باڵوێزخانە سۆڤیەت لە تاران [ئازەرییەکی ڕەگەزپەرست و دژی کورد و پیاوی باقرۆڤ بووە، هەورامی]، لە پەیوەندیدا بە کێشەی کوردانی خۆی و شاپوور و شەرەفخانە و ماکۆوە لەگەڵ دەسەڵاتدارانی خۆجێییدا [کە یەعقووبۆڤ بە سەبەبکاری ڕاوڕووت و کوشتاری کوردان لە گوندە ئازەرییەکانی ئەوێی داناون] بە پەلە ڕۆژی ١٩٤٤/٦/١٦ چووەتە ماکۆ و ١٩٤٤/٥/٢٨ "حەسەنۆڤ"یش [حەسەن حەنۆڤی کونسوڵی سۆڤیەت لە تەورێز] چووەتە ورمێ و لە چەند ڕاپۆرتێکدا کە بۆ باقرۆڤ و باڵوێزی سۆڤیەت لە تاران و وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤیەتی ناردوون، گوتوویە فەرمانبەرانی دیپلۆماسی و سوپایی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا چاوپۆشییان لە کوردەکان کردووە و -گوایە- دەسەڵاتدارانی سوپای ئێران چەکیان داوە بە کوردەکان و تەنگیان بە دانیشتوانی ئازەریی ئەو ناوچانە هەڵچنیوە، بۆیە تاوانباری کردوون. تەنانەت حەسە نۆڤ لە ڕاپۆرتی ١٩٤٤/٧/١١دا بۆ باقرۆڤ نووسیویە: پشتیوانیی فەرمانبەرانی سۆڤێتی لە کوردەکان بووەتە مایەی ناڕەزایی تورکیا و ئینگلیز. هەواڵمان پێگەیشتووە کە ئەفسەرانی سیخوڕی ئینگلیز زۆر جار چاویان بە سەرۆك هۆزەکانی کورد کەوتووە و وتووێژیان لەگەڵدا کردوون. دەسەڵاتدارانی ئێرانیش، لەوانە پارێزگاری ورمێ "مەرزەبان"، بێدەنگن بەرامبەر بە تاوانی کوردەکان دژ بە ئازەرییەکان" پێشنیاری کردووە بە دەوڵەتی ئێران بوترێ هێزی سوپا و ژاندارمەی خۆی لە ناوچەکەدا زیاد بکات بۆ بەرگرتن لە دزی و تاڵانکردنی دانیشتوان، ئەگەنا یەکێتیی سۆڤیەت ناوبانگ و جێوڕێی لەناو دانیشتواندا نامێنن. حەسەنۆڤ گووتویە دانیشتوانی ئازەری هیواو ئومێدێکی زۆریان بە سۆڤیەتە کە یارمەتییان بدات. پاشتر حەسەنۆڤ لە ڕاپۆرتێکی جیاوازدا بۆ باقرۆڤ، باسی هەژاری و برسێتیی دانیشتوانی ئازەریی ناوچەکەی کردووە، گوایە خەریکە لەناو دەچن و برسین و مردن باڵی بەسەردا کێشاون، تەنانەت مردووەکانیشیان بەبێ کفن ناشتووە و بێجلوبەرگ و ڕووتن، بەرگیان لە قوماشی کۆن و هەمەجۆر و پینەکراو بۆ خۆیان دووریوە.

حەسەنۆڤ، باقرۆڤی لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ سەرۆک هۆزەکانی کورددا ئاگادار کردوەتەوە" لەوانە قوتاس بەگو ڕەشید بەگ و نووری بەگ و زێرۆ بەگی دیوە. ناوبراوان کاتی خۆی لە باکۆ چاویان بە باقرۆڤ کەوتووە و گووتویانە: ئێمە هاوڕێ باقرۆڤ دەناسین و بەڵێنی پێداوین دوای بڕانەوەی دووەم جەنگی جیهانی کێشەی کورد چارەسەر بکات و باوەڕمان تەنیا بەو هەیە. ئەوانە گوتیان: ئێمە لە خۆتانین (یا پیاوی ئێوەین)، خۆتان لە ئێمە جیامەکەنەوە. ئەگەر بە قسەمان ناکەن، بە کردەوە تاقیمان بکەنەوە. پاشان گوتوویە: سەرۆک هۆزەکانی کورد پێزانین و سوپاسی خۆیان دەربڕی بەرامبەر بە یەکێتی سۆڤیەت و سوپای سوور کە بە هاتنیان بۆ ئێران، ئیتر کوردەکان لە زوڵموزۆری تاران ڕزگاریان بوو و سەرۆک هۆز و پیاوماقووڵ و نیشتمانپەروەرانی کوردی کە لە زیندان یا تاراوگە بوون، ئازاد کران و گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان. حەسەنۆڤ هەروەها نووسیویە: دەبێ بەبێ ڕەچاوکردنی مەبەستی سۆڤیەت لە ئێران، شانوشکۆی ئازەربایجان لەناو کورداندا بەرز بکرێتەوە" بۆ ئەم مەبەستە تا ٤٠ چل گەنجی کورد کە لە باکۆ دەخوێنن، دەتوانن نەخشێکی بەرچاویان لەم بارەیەوە هەبێ.

باقرۆڤ لە نامەکەیدا بۆ ستالین ڕۆژی ١٩٤٤/٤/١٤ نووسیویە: لە ئەنجامی هێرشی مانگی شوباتی ١٩٤٤ی دەستەکانی کورددا بۆ سەر گوندەکانی میلانلی، تازەکەند، قزل سولوو، قەرە ئاغاج، ئاریخلی، دەرەکەند.... هتد، دانیشتوان بە تەواوی تاڵان کراون و ٣ جووتیار و منداڵێك کوژراون و شەش هەزار سەر مەڕومالات و حەوشە و گاوگۆتاڵ بە تاڵان براون. جێی داخە ئەم هەموو تاوانە بە بەرچاوی فەرماندەکانی سوپای سوورەوە کراون. بۆیە پێویستە فەرمان بدرێتە ئەو فەرماندانە و دیپلۆماتەکانی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا تا ڕێوشوێنی توند بەرامبەر بە سەرۆک خێڵەکانی کورد دابنێن.

پاشان داوای کردووە حیزبی توودە لە ئازەربایجان بەهێز بکرێ و هەنگاو بنرێ بۆ ڕاکێشانی کەسانی چالاك و ناسراوی ئازەری لەو حیزبەدا [کەچی کە دوایی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان لەسەر حیسابی توودە دامەزرێنرا و دژایەتیی توودەی کرد، باقرۆڤ لەم بارەیەوە هەڵوێستی دوژمنانەی بەرامبەر بە توودە نواند،

هەورامی]. هەروەها لە ڕووی ئەو چالاکیانەوە کە لە ئاستی ناوچەکەدا کراون بۆ پشتیوانیی خەڵك لە سیاسەتی سۆڤیەت، داوای کردووە ڕوو لە دەوڵەتی ئێران بنرێ ئیمتیازی نەوت دەرهێنان بداتە سۆڤیەت [ئەوەبوو خۆپیشاندان کرا دژی کابینەی ساعید و تۆمار لە دانیشتوانی کۆ کرایەوە و داوای لابردنی ساعید کرا کە ئامادە نەبوو ئەم پەیمانە لەگەڵ سۆڤیەتدا سەربگرێ، هەورامی].

سەرەڕای ئەوەی کە کوردەکانیش، بە تایبەت لە مەهاباد، لەم ئاژاوەیەوە ئاڵێنران، بەڵام سەرکونسوڵی سۆڤیەت لە ماکۆ [بە ڕەگەز ئازەری و نێردراوی باقرۆڤ بوو، هەورامی] لە ڕاپۆرتێکی ١٩٤٤/١١/٢١یدا بۆ وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت، ژەهرێکی تری لەم ڕووەوە ڕشتووە و نووسیویە: ((کوردەکان کە وەك ئاشکرایە ڕامان نەکێشان بۆ بەشداریکردن لەو چالاکیانەدا کە بەڕێوەیان دەبەین [خۆپیشاندان و داواکردنی نەوتی ئێران دانە سۆڤیەت، هەورامی]، لەبەرئەوەی سروشتی ژیانیان هۆگری دزیو تالان و ڕاوڕووتە و پێیان ڕاهاتووە و هیچ شکۆیەکیان لەناو دانیشتوان و دەسەڵاتدارانی ئێراندا نییە و ناتوانن هیچ دەورێك بگێڕن لە ڕووداوە سیاسیەکاندا و گوشاریان هەبێ. لە ڕاستیشدا ئێمە بە یارمەتیی کوردەکان هەرگیز نەماندەتوانی ئەو سەرکەوتنانەی وا بە یارمەتیی زۆربەی دانیشتوان [ئازەربایجانی، هەورامی] بەدەستمان هێناون، بەدەستیان بهێنین.

میرزا ئیبراهیمۆڤ و حەسەن حەسەنۆڤی کونسوڵی سۆڤیەت لە تەورێز ڕێکەوتی ١٩٤٦/١١/٢٩ بۆ باقرۆڤیان نووسیوە: پەیوەندیی نێوان کورد و ئازەری کێشەیەکی ئاڵۆزە، بە تایبەت لە ناوچەکانی ورمێ و سوڵدوز. هەندێ سەرکردەی کورد دەیانەوێ دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ناوچەکانی سوڵدوزدا کە ٧٠٪یان ئازەربایجانین (قەرە پەپاخ)، هەروەهایش ورمێدا کە تاك‌وتەرا کوردی لێ دەژی، بسەپێنن. ئەم دواییانە بەڵگەیەکی زۆر بەدەستەوەن سەبارەت بەوەی کە نووری بەگ و زێرۆ بەگ دانیشتوانی ورمێیان بەزۆر ناچار کردووە خۆیان لە حیزبی دیموکراتی کوردستاندا ناونووس بکەن. زۆربەی ڕێبەرانی ئەمڕۆی کورد، گەرچی باسی (ئازادیی کوردەکان) و (کوردستانی مەزن) دەکەن، لایەنگری کۆمەڵگەیەکی فیۆدالین و بەرژەوەندیان لە مانەوەی ئەم کۆمەڵگایەدا دەبیننەوە.

"سەلومین"ی جێگری کونسوڵی سۆڤیەت لە ماکۆ، سەرەتای ١٩٤٦ زانیاریی لە بارەی ڕێژەی دانیشتوانی ناوچەی ماکۆوە داوەو وتوویە ٨٥ تا ٨٦ هەزار کەسی، کە ١٨,٥ تا ١٩ هەزاریان کوردن، واتە ٢٢٪، لەوانە دوو هەزار بنەماڵەیان سەر بە هۆزی جەلالی، ١٨٠٠یان هۆزی میلانلی و چوارسەدیشیان هۆزی زیلانین. ئەم ڕاپۆرتە پڕ لە درۆو دەلەسەیەو نووسەرەکەی خۆی خۆ بەدرۆ دەخاتەوە. خۆ ڕاپۆرتی کونسوڵەکانی تەنانەت ڕووسیای قەیسەری و هی کونسوڵەکانی سۆڤیەتیش لە ورمێ، ناوبراو بە درۆ دەخەنەوەو ژمارەی کوردیان لەوێ بە زۆر زیاتر نووسیوە. ئەگەر کورد لەوێ تاکوتەرا بووە، چۆن توانیویە دانیشتوانی ورمێ ناچار بکات خۆیان لە حیزبی دیموکراتی کوردستاندا بنووسن، ئەویش لەکاتێکدا کە ئازەرییەکان دەسەڵاتیان لە ورمێدا زەوت کردبوو.

لەلایەکی ترەوە، ئەو دەرەبەگانەی کورد لە نووسەر باسی کردوون، لە بەڵگەنامەکانی تردا بە پێچەوانەوە ناویان براوەو وتراوە هیوایان بە باقرۆڤە کێشەی کوردیان بۆ چارەسەر بکات و لەناو ئەوانەدا بوون کە سەفەری باکۆیان کردووە و هەر ئەوانیش بە دڵو بە گیان لەگەڵ بزووتنەوەی کورددا بوون. هەرچی قەرە پەپاخەکانە کە ئازەری نین و ژمارەیان ئەوەندە نییە، ڕاستە تورک زمانن، بەڵام خۆیان بە ئازەری نازانن. لە سەرژمێری ناوچەی ماکۆدا، کورد بە ئەنقەست بە کەم نووسراوە، لەکاتێکدا بەپێی بنەماڵە دەگاتە ٤٤٠٠ بنەماڵە، واتە ژمارەکەی زۆر لە ١٩ هەزار کەس زیاترە.

با بزانین هاوڕێ باقرۆڤ کە لە باکۆ بەڵێنی بەو سەرکردانەی کورد داوە، دوای بڕانەوەی دووەم جەنگی جیهانی کیشەی کوردیان بۆ چارەسەر بکات، چ ڕێنوێنییەکی داوەتە پیاوەکانی خۆی (دیپلۆمات و نیزامی و سیخوڕەکانی سۆڤیەت) لە ئێران، لە کاتێکدا وا تازە حکوومەتی میللیی کوردستان ڕاگەیەنراوە، چۆنیش پاشتر ناڕاستەوخۆ دانی بە تاوانەکانی خۆیدا ناوە دەرهەق بە کورد:

باقرۆڤ فەرمانی بە ترۆیکا (سێکوچکە)ی باکۆ لە تەورێز [ئیبراهیمۆڤ و ئاتاکشیۆڤ حەسەنۆڤ کە هەمەکارەی کاروباری ئازەربایجانی ئێران و دانراوی باقرۆڤ بوون، فەرمان و ڕێنوێنییەکانیان لە هی کونسوڵ و فەرماندەی نیزامیەکان و باڵوێزی

سۆڤیەتیش بەرزتر و کاراتر بوون، هەورامی] داوە هەنگاو بنێنن بۆ بەرگریکردن [وشەکە بە ڕووسی لغاوکردنیش ئەگەیەنێ، هەورامی]ی ئەو سەرکردە کوردانەی وا زوڵموزۆر دەنوێنن و دوژمنایەتیی نەتەوەیی دەنێنەوە. ناسر داداشێڤ [بەرپرسێکی ك. گی. بی. بووە، هەورامی]ی فەرمانبەری پێشووی وەزارەتی ناوخۆی ئازەربایجانی سۆڤیەت بە ناوی فەرمانبەرێکی بازرگانییەوە و مەلیك ئەسلانۆڤ [لە دەزگای سیخوڕیی دەرەوە ئیشی کردووە، هەورامی] بەناوی سەرۆکی نەخۆشخانەی سۆڤیەتی بۆ کۆنترۆڵکردنی پرۆسەی ڕووداوەکان، بە فەرمانی باقرۆڤ، نێردرانە مەهاباد.

باقرۆڤ و پیشەوەری، لە بەڵگەیەکی تردا، دژی ڕاگەیاندنی -بەقسەی خۆیان- ئۆتۆنۆمیی کوردستان بوون و داوایان لە سەرکردایەتیی سۆڤیەت کردووە ئۆتۆنۆمیی کولتووری لە چوارچێوەی ئازەربایجاندا بدرێتە کوردەکان، هەزارویەك بڕوبیانووشیان بۆ مەترسیی ڕاگەیاندنی ئەم کۆمارە کوردییە هێناوەتەوە، وەك ئەوەی گوایە کێشەیان [بۆ سۆڤیەت، هەورامی] لەگەڵ ئێران و وڵاتانی دەوروبەرو ڕۆژاواییەکاندا بۆ دروست دەکات، چونکە کوردەکان داوای کوردستانی مەزن دەکەن و ئەم کوردستانە -گوایە- دەبێتە پێگەی ئیمپریالیزم و کوردەکانیش جێی بڕوا نین و ئیمپریالیزم دەستی لەناویاندا هەیە و ئەوانە دواکەوتوون و وەفایان بۆ کەس نییە.

باقرۆڤ گوتوویە: ئازەریەکان بەڵێنیان داوە هەموو مافەکانی کورد لە چوارچێوەی ئازەربایجاندا ڕەچاو بکەن. بەڵام دیارە مۆسکۆ هاوڕای بۆچوونەکانی باقرۆڤ و پیشەوەری نەبوە، چونکە سەرکردایەتیی سۆڤیەت بڕیاری داوە بزووتنەوەی جیاییخوازی نەك هەر لە کوردستان و ئازەربایجان، بەڵکە لە گێلان و خۆراسان و شوێنەکانی تریش ڕێك بخات، بۆ بێهێز کردن یا بە چۆکدادانی حکوومەتی ئێران. جگە لەوە ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان ئەمری واقیع بوو بەرەوڕووی بوونەوەو کورد ئامادە نەبوو بچێتە ژێر دەستی کاربەدەستانی ئازەربایجانەوە. مۆسکۆیش بیروڕای گشتیی کوردی لەبەرچاو بوو، کە بۆچی ئازەربایجان بۆی هەیە و کورد بۆی نییە قەوارەیەك دابمەزرێنێ. ئەمە ئەگەرچی کورد پێشتر چەند ساڵێك بوو لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا ناوچەیەکی ئازادی لەژێر دەستدا بوو، وەك ئازەریەکان ئەوسا

حیزب و بزووتنەوەیەکیان بۆ بەئەنجام گەیاندنی داخوازییە نەتەوەییەکانیان نەبوو، کورد ژێکاف گەلاڵەنامەی داواکانیی خستبوە بەردەست و پێشنیاری کردبوو تا کۆتایی جەنگ ئۆتۆنۆمیی هەبێ و دوای جەنگیش کێشەی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا چارەسەر بکرێ بە یەکخستنی پارچەکان و دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ.

هەرچۆنێك بێ، باقرۆڤ نەیتوانی پاشەکشە بە ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان بکات، بۆیە لەگەڵ پیشەوەری‌دا هەوڵیان دا پرۆسەی سازدانی کۆماری کوردستان بە فرۆفێڵ و مانۆڕ و قسەی خۆش بخەنە ژێر چنگی خۆیان، جگە لە فەرمانبەرانی ناوبراو، ژمارەیەکی تری کادیری سیاسی و سیخوڕی و دیپلۆماسی بۆ سەرپەرشتی و ڕێنوێنیی کوردان بنێرنە مەهاباد، تا بەو چەشنەی وا دەیانەوێ و لەدەستیان دێ، سیاسەت و کاروباری کۆمار بە قازانجی خۆیان بقۆزنەوەو بەڕێوەبەرن.

فەرمانبەرانی ڕەگەزپەرستی ئازەری، لە کۆمەڵە ڕاپۆرتێکدا، ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستانیان بە پیلانی دژی تورکیا و باشووری ئازەربایجان لە قەڵەم داوە. سەلاحەدین کازیمۆڤ کە کوردەکان ناوی "کاکە ئاغا"یان لێ نابوو، وەك نوێنەری بازرگانی لە مەهاباد ئیشی دەکرد تەنیا بۆ کۆکردنەوەی هەواڵ و جێبەجێکردنی ڕێنوێنیەکانی باقرۆڤ و پێشەوەری نێردرایە مەهاباد. کوردی سادەلەوحیش نەك هیچ شتێکی لێ نەشاردەوە، بگرە پرس‌و ڕاوێژیشیی پێ‌کرد، ئەمە جگە لە دەیان کەسی تر کە بە نهێنی یا بە ناوی جیاجیاوە سەری لە مەهاباد و شارەکانی تری کوردستان دەدا یا لێی دەمایەوە.

باقرۆڤ کە ١٩٤٦/٣/٢٨ چاوی بە پیشەوەری و شەبوستەری و دکتۆر جاوید کەتووە لە (جوڵفا)ی ئازەربایجان، دوای بیروڕا گۆڕکێ لەسەر بارودۆخەکە، فەرمان و ڕێنوێنییەکانی مۆسکۆی پێ‌داون، لەوانە: سەرکردایەتیی ئازەربایجان ئەوپەڕی تەنازول بۆ حکوومەتی تاران بکات و لە چوارچێوەی ڕێککەوتننامەی سارچێکۆڤ – قەوامی ١٩٤٦/٣/٢٤دا بکەوێتە مامەڵە لەگەڵ دەوڵەتی ئێراندا. سەرانی فیرقە زۆر لەم فەرمان و ڕێنوێنیانەی مۆسکۆ ناڕازی بوون. باقرۆڤ دوای دیداری لەگەڵ سەرانی ئازەربایجانی ئێراندا، بۆچوونەکانیانی کردووە بە ڕاپۆرتێك و لە ١٩٤٦/٣/٢٩دا

ناردوویە بۆ ستالین. بۆ نموونە، باقرۆڤ نووسیویە سەرانی ئازەربایجانی باشوور بڕوایان بە قەوام نییە و زۆرباش دەزانن بۆ نووسین و پەیمانی مۆرکراویش -پشت بەستوو بە یاسای بنچینەیی ئێران- دواتر لێی پاشگەز دەبێتەوە و دەیسڕێتەوە. لە ڕاپۆرتەکەدا وتراوە: ئەوانە، واتە سەرکردەکانی ئازەربایجان، لە سوپای ئێران ناترسن، بەڵام پێیان وایە قەوام بە کڕینی کۆنەپەرست و دەوڵەمەند و پیاوی دینی شەڕی ناوخۆیان بۆ دەنێتەوە و ئاگری دوژمنایەتیی نەتەوەیی نێوان کورد و ئازەری خۆش دەکات. ئینگلیزەکانیش لەم ڕووەوە یارمەتیی دەدەن. تاقە زامنی ڕاستەقینەی پاراستنی لانی کەمی مافەکانی گەلی ئازەربایجان، بە قسەی سەرکردەکانی ئازەربایجانی باشوور، بە ناوبژیکردنی یەکێتیی سۆڤیەت دەزانن لە پێکهاتن و ڕێککەوتنیاندا لەگەڵ دەوڵەتی ئێراندا.

باقرۆڤ هەواڵێکی ناوخۆشی لە تەورێزو تارانەوە پێگەیشتووە، ئەویش ئەوە بووە کە کوردەکان و دەوڵەتی ئێران کەوتوونەتە وتووێژ. بۆیە کە لە نامەی ڕێکەوتی ۱۹٤٦/۷/٥یدا بۆ ستالین، نووسیویە: ((قەوام لە ڕێی باڵوێزی ئێمەوە [سۆڤیەت] لە تاران، داوای کردووە قەناعەت [یا باوەڕ پێهێنان یا ڕازیکردن یان وا لێکردن، هەورامی] بە قازی محەمەدی ڕێبەری کوردەکان بکرێ بێتە تاران بۆ وتووێژ.

باقرۆڤ لەم بارەیەوە وتوویە: قەوام دەیەوێ بە هەر شێوەیەك بێ کورد دژی ئازەری هان بدات. باقرۆڤ ویستوویە قەناعەت بە ستالین بکات کە قەوام مەبەستی لەم بانگکردن و چاوپێکەوتنە هەمان پیلانە، تا ستالین فەرمان بە باڵوێز بدات لە تاران قازی محەمەد ئاگادار نەکاتەوە ! بەڵام باقرۆڤ ئەمجارەیش داواکەی پشت گوێ خراو سەرشۆڕیی بۆ مایەوە.

مەبەستی باقرۆڤ لەم هەموو پیلانەی دژی کورد ئەمانەی لای خوارەوە بوون:

۱- نابێ کورد و کێشەی سەربەخۆ یا بەجیا لە هیچ ئاستێکدا باس بکرێن. وتووێژی سەربەخۆی کورد لەگەڵ تاراندا، واتە دەرچوونی کوردستان و سەرکردایەتیەکەی لە چوارچێوەی ئازەربایجان و سەرکردەکانی.

۲- دەبێ کورد بەبێ ڕەزامەندی و ئاگاداری و ڕێنوێنیی تەورێز (ئازەربایجان) وتووێژ نەکات.

٣- دەبێ کورد لە تەورێز داوای مافی خۆی بکات.

٤- دەبێ کورد لەگەڵ دەستەی نوێنەرایەتیی ئازەربایجاندا، ئەویش بەناوی وتووێژی دەستەی نوێنەرایەتیی ئازەربایجانەوە، گفتوگۆ لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا بکات، نەك بەناوی دەستەی نوێنەرایەتی ئازەربایجان و کوردستانەوە، وەك چۆن چەند جارێك کردیان و پەیمانیشیان تێدا مۆر کرد.

٥- سەرانی ئازەربایجان چەند جارێك بە ئاشکراو بە نهێنی لە تاران و تەورێز و دەیان جار لەگەڵ باقرۆڤ خۆی و سەدان جاریش لەگەڵ نوێنەرانی سۆڤیەتدا وتووێژیان هەبووەو بگرە پەیمانیشیان مۆر کردووە، نە پرسیان بە کورد کردووەو بۆچوونیان وەرگرتووەو بەشدارییان پێ کردوون، نە لە ئەنجامی وتووێژ و رێککەوتنەکانیش ئاگاداریان کردوەتەوە، سەرەڕای ئەوە بڕیاریان لەبارەی کوردەوە داوەو خۆیان بە نوێنەری زانیوە، یا بە کەمە نەتەوەیەکی دانیشتووی ئازەربایجانیان داناوە [بڕوانە بەرهەمی نووسەر سەبارەت بە پەیوەندیەکانی ئازەربایجان و کوردستان].

٦- بە بۆچوونی باقرۆڤ، کورد کە ڕاستەوخۆ کەوتوەتە وتووێژ، ئیتر سنوور و دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی یا کۆمار یا قەوارەکەی دیاری کراون. واتە بەشێکی کوردستان کە سەر بە ئازەربایجانە، لەو وڵاتە دابڕاوە. بەڵام ئەگەر وتووێژەکانی تەورێز و تاران سەریان بگرتایە، کوردستان لە چوارچێوەی ئازەربایجاندا دەمایەوە.

٧- پاش ئەوەی هەوڵەکانی باقرۆڤ بۆ پەکخستنی دیداری قەوام و قازی محەمەد سەریان نەگرت و ئەو مەسەلەیە بوو بە ئەمری واقیع، دیسانەوە کەوتەوە پیلانگێڕان دژ بە کورد و لەگەڵ کاربەدەستانی تەورێزدا تێکۆشا کورد بە ئازەربایجانەوە ببەستنەوە، ئەویش بەوەی کە نوێنەرێکی کورد لەگەڵ خۆیاندا ببەن یا بەشداریی پێ بکەن لە وتووێژەکانیاندا لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی ناوەندیدا چ لە تاران و چ لە تەورێز، تا ئەگەر دواتر لەگەڵ تاراندا ڕێك نەکەوتن، کورد کە بەشداری ئەو ڕێککەوتنەیە نەتوانێ سەربەخۆ وتووێژ بکات و ئەمەیش ببێتە بەڵگە بۆ ئەوەی کە بوترێ کوردیش ئیمزای کردووە. بەشداریی چەند کوردێك وەك نوێنەری ناوچە کوردنشینەکان لە مەجلیسی ئازەربایجان و

پەیمانەکەی نێوان ئازەربایجان و کوردستاندا، هەر بەو مەبەستەو لە درێژەی ئەو پیلانەدا بووە.

باقرۆڤ زۆرجار داوای لە سەرانی ئازەربایجانی ئێران کردووە ئەو بەڵێنانەی وا داویانن بە کوردەکان بەجێیان بهێنن. بۆ نموونە، لە نامەی ١٩٥٦/٧/١١یدا بۆ پیشەوەری و شەبوستەری و جاوید و پادگان، داوای لێ کردوون چ بەڵێنێکیان پێکەوە بە کوردەکان داوە جێبەجێیان بکەن، واتە: پێنجەم (تفەنگ بە فیشەکی پێویستەوە، بەرامبەر بەو توتنەی وا لێیان کڕیون. لە ڕێی نوێنەری بازرگانیشەوە چەند شەکرو مانوفاکتۆر و کەلوپەلی تریان بۆ دیاری کراوە، بیاندرێتێ. داوای لە هاوڕێیانی بەڕێز کردوە ئاگاداری تەواوی فڕوفێڵ و هێنان و بردن و مانۆڕی قەوام و فەیرووز و ڕەزم ئارا و ئەوانی تر بن سەبارەت بە ڕووبەڕووکردنەوەی کوردەکان لەگەڵ ئازەربایجانییەکاندا و زمانی هاوبەش لەگەڵ قازی محەمەددا بدۆزنەوە و ئەوپەڕی هەوڵ بدەن، نەك تەنیا ئەو یەکێتییە بپارێزن، بەڵکوو بەهێزتریشی بکەن، چونکە چارەنووسی ئەوان و قازی محەمەد و درێژەدانیان بەو سەرکەوتنانە لەوەدایە کە هاوڕێیانی کورد و ئەوان بە یەك نیاز و گیانێکی یەکگرتووەوە تێبکۆشن و نەکەونە ژێر باری هیچ فریوو بەڵێنێکی کاتی و درۆو دەلەسەیەکی تری قەوام و ڕەزم ئارا و فەیرووز و ئەوانەی وا پشتیان دەگرن.

باقرۆڤ لە ١٩٤٦/٧/١٧یشدا بۆ نوێنەرانی سۆڤیەتی لە تەورێز نووسیوە: با قازی محەمەد کە خۆی بە مامەڵە و بازرگانییەوە خەریك کردووە، چیتر لە تەورێز نەمێنێتەوە، بەڵکوو نوێنەرێکی خۆی دیاری بکات و تێبگەیەنرێ کە ئیتر لە بارەگاکەی خۆی [واتە مەهاباد] دوور نەکەوێتەوەو ئەرك و مافەکانی خۆی نەداتە هیچ کەسێك [واتە کەسێکی تر کارەکانی بەڕێوە نەبات، هەورامی]. با تەواوی ئەوانەی کە بە بیانووی جۆراوجۆرەوە لە ناوەند [مەهاباد، هەورامی] کەمو زۆر گومانیان لەسەرە، دووریان بخاتەوە [واتە قازی مرۆڤێکی خۆش باوەڕە، ڕەنگە تووشی بکەن، یا فریوی بدەن و تێبکەوێ، هەورامی].

باقرۆڤ ڕۆژی ١٩٤٦/٧/٢٦ لە نامەیەکدا بۆ ئیمیلیانۆڤ دیسانەوە لە کێشەی کورد دوواوەو نووسیویە: ((دیارە کاروباری کوردەکان بە باشی بەڕێوە ناچێ" بۆ بەشێکی

ئەوە ئازەربایجانیەکان خۆیان تاوانبارن، لەبەرئەوەی ئێمە زۆر جار داوامان لێ کردوون و نەیانکردووە ئەو کۆمەکانەی کە دامودەزگای دەوڵەتی بۆی دیاری کردوون و ڕاگیراون، وەك تفاق و کەلوپەل و پارە و .... هتد، بیاندەنێ و لەگەڵیان بەشیان بکەن و بەو چەشنە دەیانتوانی ورە و باوەڕیان پتەو بکەن [واتە دەسەڵاتدارانی فیرقە لە تەورێز، هەورامی]. ئەوانە هەر بەردەوام بوون قازی محەمەدو تاقمەکەی لە خزمەت و بەردەستی ئازەریەکاندا بن و هەر بە قسە خەریکی دۆستایەتی و پەیوەندیی نزیك بە کوردەکانەوە بوون. پێویستە ئامۆژگاریی ئازەربایجانیەکان بکەن، بکەونە وتووێژ و پەیوەندیی ڕاستەوخۆ و نزیك لەگەڵ کوردەکاندا" بەم پێیە دەتوانن ئەو سەرکردانەی تری کورد کە لەگەڵ قازی محەمەددا زۆر کۆك و ساز نین، بخەنە خزمەتی خۆتانەوە، چونکە ئەوانە دەتوانن بۆ سەردەمێك لە ڕاگرتنی هێمنی و ئاسایشی بارودۆخەکەدا کەڵکیان هەبێ)).

باقرۆڤ لە ١٩٤٦/٩/١١دا، لە نامەیەکدا بۆ پیشەوەری و شەبوستەری و جاوید و پادگان [کە بە چوارینەی تەورێز ناسرابوون، هەورامی] نووسیویە: ((قازی محەمەد ئەم دواییە چەند کێشەیەکی گرنگیشی خستوەتە بەردەمی ئێوە، پەیوەندییان بەو بارودۆخەوە هەیە کە لە کوردستانی ئازەربایجاندا هاتوەتە ئاراوە. چارەسەریان بە ڕێكوپێکی و چاکی، بە بۆچوونی من، بێگومان دەتوانێ ببێتە مایەی بەهێز کردنی پەیوەندیی دوولایەنەی هەردوو گەلی ئازەری و کورد. جگە لەوە، ئێوە وەکو پێویست پێشوازیتان لە پێشنیارەکانی قازی محەمەد نەکردووە و بە داخەوە هێشتا بێ چارەسەر ماونەتەوە؛ لەوانە پێشنیاری قازی محەمەد سەبارەت بە فراوان و بەهێزکردنی هەنگ (پۆلك)ی مەهاباد و کردنی بە بریگاد (تیپ) لەڕێی خستنیە سەر گوردانی ئازەربایجان. ئەم بریگاردە دەبێتە هۆی بەهێزکردنی توانای عەسکەریتان و بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی کوردستان و ئازەربایجانیش پێویستە. کوردەکان پێویستییەکی زۆریان بە یارمەتیی ماددی هەیە" ئەوانە دەبێ لەم بارودۆخەدا پێویستیەکانی ژیانی دوو هەزار کوردی عیراقیش کە بۆ هاوکارییان هاتوون و چالاکانە دژ ی دوژمنی هاوبەش بەشداری و خەبات دەکەن، دابین بکەن. پێویستە داواکەی قازی محەمەد بۆ زیادکردنی ژمارەی نوێنەرانی کورد لە مەجلیسدا، جێبەجێ بکەن. من لەم بارەیەوە هیچ شتێك بەدی ناکەم بەرژەوەندی ئازەربایجانیەکانی تێدا پێشێل بێن.

نازانم ئێوە [چوارینەی تەورێز] هیچ بڕیارێکی دیاریکراوتان لەسەر خواست و بۆچوونە ڕاستەکانی قازی محەمەد دابێ، بەڵام ئامۆژگاریتان دەکەم کە ئێوە لەبەر ئاساییکردنەوەی پەیوەندی و بەرژەوەندی کاری گشتی و هاوبەش، پەیوەندیتان لەگەڵ کوردەکاندا لە چوارچێوەی پەیمانی ئازەربایجان و کوردستاندا و بۆ جێبەجێکردنی ئەو پەیمانە بەهێز بکەن. ئەمە دەکێشێتەوە بۆ ئەوەی کە کوردەکان وا بیربکەنەوە ئازەربایجانەکان نایانخەنە پەراوێزەوەو بۆ داخوازییەکان سەبارەت بەو کێشانە و کێشەکانی تر پشت گوێ ناخرێن و لەبەرچاو دەگیرێن. ئەمەیش مانای ئەوە نییە تەواوی ئیدیعاکانی کوردەکان بەبێ لێکۆڵینەوەو تاوتووێکردن پەسەند و بەجێبهێنن. بەڵام من لایەنگری ئەوەم ئەو کێشانەی وا پەیوەندییان بە هەردوولاوە هەیە و چ کوردەکان و چ ئێوە دەیانخەنە ڕوو، کاتی خۆی بەپێی پێویست و پاش تاووتوێکردن چارەسەریان بکەن و بڕیاریان لێ بدەن. من دەزانم ئازەربایجانەکان و بەتایبەت کوردەکان لەناو کێشەیەکی سەختی ئابووریدا دەژین، بەڵام دەبێ ڕێگەیەکی دۆستانە بەسەریاندا زاڵ بن و هاوکاریی دوولایەنە لەم بارەیەوە پێویستە. دەبێ هەموو هەوڵێك بدرێ تا کوردەکان لە ئازەربایجانیەکان دانەبڕێن، دەنا بە پێچەوانەوە لەوانەیە ئەوانە دژی ئازەربایجانیەکان بەکاربهێنرێن. لەگەڵ سڵاوی برایانمدا ستارشی)) [واتە باقرۆڤ، لە ڕووسیدا ستارشی مانای گەورە، بە کوردی کاکە یا براتان دەگەیەنێ، هەورامی].

باقرۆڤ لە ١٩٤٦/١٠/١٨دا دووبارە لە نامەیەکدا بۆ پیشەوەریی سەرۆکی ئازەربایجانی ئێران، جەختی لەسەر ئەو کێشە سەرەکیانەی وا پەیوەندییان بە دۆستایەتیی کوردەکانەوە هەیە، کردوەتەوە و وتوویە: ((هاوڕێی ئازیز پیشەوەری، هاوپێچ لەگەڵ ئەو بیرهێنانەوەو ئاگاداریانەدا کە پێشتر سەبارەت بە خۆسازدان و ڕێ تێچوونی هێرشی هێزە کۆنەپەرستەکان دژی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان درابوون، پێویستی دەبینم ڕای بگەیەنم کە دەبێ هەر لە ئێستاوە ڕۆژ بەڕۆژ چاوەڕێی هێرشێکی ئەوتۆ بکەن. بۆیە دەبێ ئامادەیی تەواوی نیزامی بەبێ هەراو هوریا و مەترسی وەربگرن. دەرفەتێکی سەرکەوتنتان لە کاروبارەکاندا دۆستایەتیکردنە

لەگەڵ کوردەکاندا. بۆ ئەم مەبەستەیش قازی محەمەد و مەلا مستەفا ئاگادار بکەنەوە دەتوانن چ یارمەتییەکتان بدەن)).

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاپۆرت و پەیام و هەڵوێستانەی باقرۆڤ بەرامبەر بە کورد، چەند سەرنجێك بۆ تێگەیشتنی زیاتر پێویستە:

١- نامەو ڕاپۆرت و پەیامەکان کە باقرۆڤ نووسیونی، ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ دانیان تێدا بە هەڵوێستی نامرۆڤانە و نادۆستانەی خۆی و هاوڕێکانیدا لە سەرکردایەتیی ئازەربایجانی ئێران بەرامبەر بە کورد ناوەو ئەو هەوڵانە پیشان دراون کە کردوویانن (ئەگەر بەتاوان ناویان نەبەین) و باقرۆڤ زیاتر خستوونیە ئەستۆی هاوڕێیانی تەورێزی" لە کاتێکدا هەر خۆی بناغەی ئەو سیاسەتە چەوتەی دانا و لە سەرەتاوە دایمەزراند و لە مێژیش بوو ئەنجامی نالەباری دەرکەوتبوو، بەڵام وەك لە بەڵگەنامەکانیشدا هاتووە درەنگ وەخت‌و ماوەیەکی کورتی بەر لە هەرەسهێنانی هەردوو بزووتنەوەی ئازەربایجان و کوردستان هەوڵی پێداچوونەوە و ڕاستکردنەوەی ئەو پەیوەندیانە دراو پەلەیشی تێدا نەکرا.

٢- دیارە ئەو یارمەتیە کە سۆڤیەت و ئازەربایجان بۆ کوردی دیاری کردبوو، نەیدراوەتێ. تەنانەت ئەو کەلوپەلانەیش کە دەبوو بەرامبەر بە توتن و بەرهەمی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بدرانایە بە کوردەکان، تەورێز ڕای گرتن. ئەو پێنجسەد تفەنگەیش کە باقرۆڤ داوای کرد بدرێتە کوردەکان، نە نێردران، لە کاتێکدا کورد پێویستی پێی هەبوو و —بە قسەی خۆیان— نیوەی پیاوەکانی بارزانی چەکدار بوون (لەبەر نەبوونی چەك). ئەمە جگە لەوەی کە پێشمەرگەکانی کوردستان چەند جارێك لە بەرەکانی شەڕدا بەرەو ڕوی هێرشی دوژمن بوونەوە و پێویستیان بە چەك و تەقەمەنی هەبوو، تا ئەو دەمەیش ئازەریەکان هیچ هێرشێکیان نەکرابوە سەرو تووشی شەڕ نەبووبوون تا هەست بەو پێویستییە بکەن. کوردیش ئەو سەردەمە هیچ سەربازخانە یا پێگەیەکی دوژمنی نەگرتبوو تا چەك و تەقەمەنیی دەست بکەوێ.

٣- باقرۆڤ هەر ئەم دواییانە جەختی لەسەر دۆستایەتی و لێك نزیکبوونەوە و هاوکاریی کورد و ئازەری کردوەتەوە، لە کاتێکدا پێشتر کوردی خستبوە پەراوێزەوە. ئەم ڕێنوێنی و پەیامانەی باقرۆڤ کە چارەنووس و سەرکەوتنی هەردوو گەلیان لە یەکێتی و هاوکاریدا

دیوەتەوە، نیشانەی هەستکردنە بە مەترسیی بارودۆخەکە و بە تەنیا مانەوەی ئازەریەکان، کاتێك سۆڤیەت خەریك بووە پشتیان بەربدات و هێزە بەرهەڵستەکانی تری ئێرانیش هاودەردی و پشتگیریی خۆیان بۆ ئازەربایجان دەرنەبڕیوەو وتووێژی ئازەربایجانیش لەگەڵ تاراندا سەرکەوتوو نەبوەو ڕژێمی ئێرانیش سەرقاڵی خۆسازدان بووە بۆ پەلاماردان.

٥- باقرۆڤ لەلایەکی ترەوە سەرانی تەورێزی ئاگادار کردوەتەوە کە ئەگەر پەیوەندییان بە برا کوردەکانەوە نەگۆڕن، لەوانەیە دوژمن کەڵکیان لێوەربگرێ بۆ لێدانی ئازەربایجانیەکان.

٦- لەو لایەنەوە کە فەرمانی داوە قازی چیتر لە تەورێز نەمێنێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ مەهاباد و خۆ بە مامەڵە و بازرگانییەوە خەریك نەکات و کەسێکی تر وەك نوێنەر لەباتی خۆی ئەو کارانە ڕاپەڕێنێ؛ لە مەهابادیش کەس لەجێی خۆی دانەنێ و نەیارەکانی لە مەهاباد دووربخاتەوە.... هتد.

من لە لێکۆڵینەوەی تردا ڕەخنەم لە قازی گرتووە لەسەر سەفەرەکانی، بەڵام پێموایە هێندە لە تەورێز ماوەتەوە تا پارەی تووتن و خوری و ڕۆن و ئاژەڵ و یارمەتیی بەڵێن پێدراوی سۆڤیەتی وەك چەك و تەقەمەنی و پارە و شەکر و نەوت و... وەربگرێ، لەکاتێکدا ماوەیەکی درێژ بە نامەو ڕاسپاردە نەیتوانیوە دەسەڵاتدارانی تەورێز ڕازی بکات بەجێیان بهێنن. ئەو پێویستە گشتیانە لەو گەمارۆ ئابووریەی ڕژێمی تاران و بێداهاتیی کۆمار و هەژاری و بێکاریی گەلەکەیدا، دەیانتوانی باری ژیان سووك بکەن. یا ڕەنگە قازی هەوڵی کڕینی هەندێ لەو پێویستیانەی دابێ لە تەورێز، چونکە شەکر و قەند و نەوت و چیت ومانوفاکتۆری تری پێداویستی ڕۆژانەی خەڵك ئەو سەردەمە قاتوقڕییان لەسەر بووە. کەچی باقرۆڤ درەنگ فەرمانی داوە بەشی ڕاگیراوی کەلوپەلەکە بدرێتەوە بە کورد. دووریش نییە قازی بۆ سکاڵاکردن بەرامبەر بەم کارە ناڕەوایە، سەری لە نوێنەرانی سۆڤیەت دابێ لە تەورێز، ئەگەنا چۆن سەرکۆمارێك خۆی بەو شتانەوە جەنجاڵ دەکات. گومان لەوەدا نییە کە قازی زۆر جار لەم بارەیەوە سکاڵای کردووە، لەبەرئەوەی خۆی گەیاندووەتە لای باقرۆڤ و فەرمانی پێویست لەم لایەنەوە دراوە. باقرۆڤ، دوور لە هەموو نەریتێکی دیپلۆماسی، گوتوویە بە قازی بڵێن چیتر لە تەورێز نەمێنێتەوە. واتە کە قازی پێویست بووە گوێڕایەڵی بێ.

مەسەلەی دوورخستنەوەی ئەوانەیش کە لەگەڵ قازیدا کۆك نەبوون، پێم وایە مەبەستی باقرۆڤ هەر ئەوانە بووە کە دژی سیاسەتی ئەو و هاوڕێکانی لە تەورێز بوون و هەستیان بەو پەیوەندیە نادۆستانە و نامرۆڤانەیەی ئەوان لەگەڵ کورددا کردووە. ئەگەر زۆربەی کەسانی دەورپشتی قازی جێباوەڕو متمانە و نیشتمانپەروەر و خۆبەختکەر بوون. هیچ زانیارییەکیش لەوبارەیەوە کە قازی ئەوانی دەرکردبێ، بەدەستەوە نییە.

٧- وا دیارە قازی محەمەد گەلێك کێشە و داواو پێشنیاری خستوەتە بەرهەمی سەرانی ئازەربایجانی ئێران لە تەورێز، کە وەکوو پێویست و بە وتەی باقرۆڤ پێشوازییان لێ نەکراوە و خراونەتە پەراوێزەوە، لەم ڕووەوە سەرانی تەورێزی تاوانبار کردووە. بە دەستەوەیە پشت بەستوو بە بەڵگەنامە لێکۆڵینەوەیەك بکەین.

٨- پێشنیاری لەلایەن سەرانی تەورێزەوە وەڵام نەدراوەی قازی سەبارەت بە بەهێزکردنی لەشکری مەهاباد بە هێنانی بەشێکی سوپای ئازەربایجان، ئەمیش پێم وایە قازی دوای هەوڵدانێکی زۆر نەیتوانیوە چەك و تەمەنی لە تەورێز وەربگرێ، ناچار پەنای بردوەتە بەر ئەو تاکتیکە، تا بەو چەشنە لە ڕێی هێنانی ژمارەیەکی هێزەکانی ئازەربایجانەوە پێویستە سوپاییەکانی خۆی دابین بکات" بەو پێیەیش مانۆڕ بەرامبەر بە ڕژێمی تاران بکات تا واز لە هێرشی پەیتاپەیتای خۆی بهێنێ بۆ سەر گەورەترین بەرەی شەڕ، واتە بەرەی سەری ئاوی لای بۆکان. ئەوبەرەیە. لەلایەکی ترەوە، هاوسنووری ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئازەربایجان بوو، دوور نییە قازی بۆ تاقیکردنەوەی پەیمانی نێوان ئازەربایجان و کوردستان کردبێتی. بە هەرحاڵ ئەگەر کورد چەك و تەقەمەنیی پێویست هەبوایە، پەنای نەدەبردە بەر ئەم پێشنیارە. ئەمە لەکاتێکدا بووە کە ژمارەیەکی یەکجار زۆری لاوانی کورد ئامادەی پاراستنی گەل و نیشتمانی خۆیان بوون و داوای چەکیان دەکردو نەبوو بیاندەنێ. تۆ بڵێی نەبوونی تەقەمەنی و چەکی پێویست بووبێتە هۆی هێرش نەکردنە سەر سەردەشت و بانە و سەقز و شارەکانی تری ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ئازادنەکردنیان، یاخود سەرکردایەتیی کورد ئەو سەردەمە باوەڕی بەوە نەبوە کە بەشەڕ کێشەی

کورد چارەسەر بکرێ، چونکە کورد بێپشت و پەنا بوون و ئازەربایجان بە ڕواڵەت هاوپەیمانییەکی درۆی لەگەڵدا هەبوە. گەلێك پرسیار و مەسەلەی تر لەم بارەیەوە هەن، پێویستییان بە شیکردنەوە و لێکدانەوە هەیە. من لە لێکۆڵینەوەی تردا بۆچوونێکی جیاوازم خستووەتە ڕوو.

٩- بەڵگەنامەیەکی تر کە مێژووەکەی ١٩٤٦/٩/١١ە، واتە دوو مانگ کەمتر پێش هێرشی سوپای ئێران بۆسەر ئازەربایجان و کوردستان، نووسراوێکی باقرۆڤە بۆ سەرکردەکانی ئازەربایجان، کە داوای لێ کردوون خواستی قازی محەمەد بۆ نیشتەجێکردنی کوردەکانی عیراق بە سەرۆکایەتیی مستەفا بارزانی لە گوندی (تەقیئاوا) جێبەجێ بکەن، چونکە بارزانیەکان چالاکانە دژی دوژمنی هاوبەش خەباتیان کردووە.

ئاشکرایە بارزانی و هاوڕێکانی ئۆکتۆبەری ١٩٤٥ هاتنە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، واتە ١١ مانگ پێش نووسینی ئەو نامەیەی باقرۆڤ (سەبارەت بە چۆنیەتی هاتنیان و پێشوازی لێکردنیان لەلایەن کاربەدەستانی سۆڤیەتەوە و دوورخرانەوەیان لە مەهاباد و بارودۆخی ژیانیان، بڕوانە ئەم بەرهەمەی نووسەر: بارزانی لە بەڵگەنامەکانی سۆڤێتیدا ١٩٤٥-١٩٥٨، هەولێر، ٢٠٠٢). بەڵام بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم کێشەیە، پێویستە بوترێ: بەڵگەنامەکانی سۆڤیەت دەریدەخەن بارزانی بە بوختانی باقرۆڤ و لایەنی ترو گوشاری سۆڤیەت لەبەرئەوەی گوایە ئینگلیز ناردوویەتە ئەمدیو، فەرمانی دوورخرانەوەی نەك هەر لە مەهاباد، تەنانەت بۆ ناوچەکانی خوار سەقزیش، واتە ناوچەی دەرەوەی دەسەڵاتی سۆڤیەت، کە ئەمە هەروا سەر نەدەچوو. بەشداریی چالاکانە و نیشتمانیە و ئازایەتیی کوردانی عیراق بە سەرۆکایەتیی بارزانی و دەوری کاریگەریان لە پاراستنی دەستکەوتەکانی کورددا، خەتی بەسەر هەموو بۆچوونێکی ناڕەوا و بوختاندا هێنا، چونکە ئەو بارزانییەی کە باقرۆڤ و تەوریز پەراوێزیان خستبوو، باقرۆڤ لە ڕۆژی تەنگانەدا و یازدە مانگ دوای هاتنیان فەرمانی دا داواکاریی قازی سەبارەت بە بارزانیەکان جێبەجێ بکرێ و نیشتەجێ بن، لەکاتێکدا پێشتر فەرمانی دابوو یارمەتیی ماڵی و تفاق و تەقەمەنی و چەك نەدرێنە بارزانییەکان. ئێمە لێرەدا باسی چوونی

بارزانیەکان بۆ یەکێتی سۆڤیەت دوای ڕووخانی کۆماری کوردستان و پێشوازی و ڕەفتاری خراپی باقرۆڤ لەگەڵیاندا ناکەین. ئەو بەرهەمەی پێشووم ئاماژەی تێدا بە هێندێ بەڵگەنامە کراوە لەوبارەیەوە.

١٠- باقرۆڤ ئامۆژگاریی چوارکۆچکەی تەورێزی کردووە پەیوەندییان لەگەڵ کورددا ئاسایی بکەنەوەو لێیان نزیك ببنەوە. کەچی وەك ئاگادارێك لە بارودۆخی دژواری ئابووریی کوردانی ڕۆژهەڵات، داوای لەو چوارە کردووە یارمەتیی بەڵێن پێدراوی خۆیو سەرانی تەورێز بگەیەننە کوردەکان تا لە ئازەرییەکان دانەبڕێن، چونکە مەترسیی پەلاماری سوپای ئێران بۆسەریان زیاتر بووە. بگرە ئاگاداری کردوونەوە پەیوەندی بکەن بە قازی و بارزانییەوە تا هەر پێویستییەکیان هەبێ جێبەجێی بکەن.

١١- خاڵێکی گرنگی جێی سەرنج و سەرسوڕمان کە لەم بەڵگەنامەیە و هی تردا بەدی دەکرێ، ئەوەیە کە باقرۆڤ جەختی لەسەر جێبەجێکردنی داخوازیی قازی سەبارەت بە زیادکردنی ژمارەی نوێنەرانی کورد لە مەجلیسدا کردووە. مەبەست مەجلیسی ئازەربایجانە، کە دەسەڵاتدارانی تەورێز پێنج کورسییان تێدا دابوو بە کورد. ئەوە خۆی لەخۆیدا بەستنەوەی کورد و کوردستان بوو بە ئازەربایجانەوە. جگە لەوە، ئەودەمە ئێران مەجلیسی نەبوو، ماوەی نوێنەرانی خولی ١٤هەمی مەجلیسی ئێران تەواو بووبوو، هێشتا هەڵبژاردن بۆ خولی ١٥هەم ڕانەگەیەنرابوو. لەلایەکی ترەوە، زیادکردنی ژمارەی نوێنەرانی کورد لە پەرلەمانی ئێراندا لە دەستی پیشەوەریدا نەبوە، تا بوترێ ناوبراو توانیویە لەم ڕووەوە نەخشی هەبێ. ئەم ناحاڵیبوونەی کورد و خۆ کردنی بە داوی باقرۆڤ و پیشەوەرییەوە، بەڵگەیەکی تری هێشتنەوەی کورد بووە لە چوارچێوەی ئازەربایجاندا.

١٢- ئەو بەڵگەنامانە و ئەوانی تر سەرچاوەیەکی بڕواپێکراو و گرانبەهان بۆ نووسینەوەی مێژووی پەیوەندیەکانی کورد و ئازەری و سۆڤیەت و مێژووی هەردوو گەلیش بەگشتی لەسەروبەندو پاش دووەم جەنگی جیهانیدا. پێویستە ئەو بەڵگانە ببنە ئەزموونێکی گرنگ بۆ داڕشتنەوە و پێداچوونەوەی پەیوەندیەکانی هەردوو گەلی چەوساوەو هاوسێ بۆ داهاتوو، تا هەردوولا لە خەباتی ڕەوایاندا کەڵکی لێ وەربگرن و بتوانن کێشەی نێوانیان بە گفتوگۆ و ئاشتییانە چارەسەر بکەن. مەبەستی

نووسەریش خزمەتکردنە بە ڕوونکردنەوەی ئەو کێشانە، لەکاتێکدا ئەنجامەکانی سیاسەتی چەوتی بنیاتنراو لەسەر ڕەگەزپەرستی و پێشێلکردنی مافی گەلانی تر، بەدرێژایی مێژوو، جگە لە خوێنڕشتن و هەژاری و ماڵوێرانی هیچ دەستکەوتێکی تری بۆ گەلان نەبوە. مێژووی کورد و گەلانی دراوسێی کوردستان تا ئێستایش پڕن لەم چەشنە کارەساتانە" ڕوونکردنەوەی کێشەکان و گۆشکردنی خەڵك بە سەلماندنی مافی یەکترو یەکسانی و قووڵکردنەوەیان لەناو گەلاندا، لە باریاندایە ڕێ لە دووپاتبوونەوەی تراژیدیاکانی ڕابوردوو بگرن و بکێشنەوە بۆ چارەسەری ئاشتییانەی کێشەکان.

**باقرۆڤ و فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان؛**
**پیلانی نهێنی و ئاشکرایان لە دانانی**
**سنوورەکانی ئازەربایجانی باشووردا**

پیشەوەری و حاجی میرزا عەلی شەبوستەری وسادیقی پادگان و دکتۆر جاوید و بیریا لە سەرانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان و لە ۱۹٤٥/۱۲/۲۳ داوایان لە باقرۆڤی سکرتێری کۆمیتەی ناوەندیی ئازەربایجان کرد هەردوو ئازەربایجان یەك بگرنەوە. سنووری ئازەربایجانی باشوور (ئێران)، بەپێی بۆچوونی ئەوان، لە ڕۆژهەڵات و باشوورەوە بریتی بووە لە بەندەری ئەنزەلی (پەهلەوی) و ئەو ناوچانە کە لە ڕەشت و مەنجیل و قەزوێن و هەمەدان و کرماشانەوە درێژ دەبنەوە تا سنووری عیراق و دانیشتوانیان بە تەواوی لە ئازەری و کورد پێك هاتوون.

ڕێبەرانی فیرقە، وەك دەردەکەوێ، هەر لە هەووەڵین ڕۆژەکانی دەسەڵاتدارێتیانەوە، نەك هەر ڕۆژهەڵاتی کوردستانیان خستبوە سەر ئازەربایجان. بەڵکوو نیشتمان و گەلانی تری باکووری ئێرانیشیان بردابوە سەر نیشتمانی خۆیان و بەم چەشنە کورد و گەلانی تریان لە خۆیان کردبوە دوژمن.

١- لە بەڵگەنامەیەکی تری ۱۹٤٦/۱/۱٦دا بەناوی پێکهێنانی کۆمارێکی دیموکرات و سەربەخۆی ئازەربایجانەوە کە ۱۲ خاڵە و سەرانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان ئیمزایان لێ داوە، لە خاڵی ۱۱هەمدا هاتووە: ئێمە کۆماری نەتەوەیی و دیموکراتیی

ئازەربایجان بەپێی بنەمای مێژوویی و ئەتنۆگرافی و جوگرافیەکان، لە چوارچێوەی ئەم سنوورانە دامەزراندووە. واتە ئەم شارە سەرەکیانە دەخەینە چوارچێوەکەوە کە ٩٥٪ زیاتری دانیشتوانیان ئازەربایجانین: تەورێز، ئەردەبیل، ورمێ، میندواو، مەراغە، سەڵاس، خۆی، مەرەند، ئەنزەلی، ماکۆ، ئەهەر، خیرئاباد، زەنجان، قەزوێن، مەراغە [نەخشەی جوگرافیای کۆمارەکە دراوەتە باقرۆڤ].

٢- پیشەوەری لە نامەیەکی تری ١٩٤٦/١/٢٦دا بۆ باقرۆڤ، سەبارەت بەم کێشەیە نووسیویە: هێشتا سنووری باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەم دەوڵەتە دیاری نەکراوە. بەڵام بەپێی سەرچاوەی مێژوویی و ئەتنیکی و جوگرافی، دەبێ تەواوی تالش بە بەندەری ئەنزەلیشەوە و لەوێشەوە بۆ قەزوێن تا هەمەدان بگرێتەوە. دانیشتوانی تالش و ئەنزەلی داوایان لێ کردووین پشتیان بگرین و بیانپارێزین. دەبێ خۆمان ساز بدەین بۆ گێڕانەوەی هەمەدان وەك پایتەختی کۆنی ئازەربایجان بۆسەر نیشتمانەکەمان، گێڕانەوەیشی بەبێ بەربەرەکانی و کێشە جێبەجێ دەبێ.

لە خاڵی ١٢هەمیدا هاتووە: ئەم نەخشەیە [مەبەست نەخشەی جوگرافیای ئازەربایجانە] کە خراوەتە بەردەستتان، هەرێمی باکووری کوردستانیش [مەبەست باکووری ڕۆژهەڵاتی کوردستانە] دەگرێتەوە، کە سنوورەکانی دوای یەکلاییکردنەوەی کێشەی چۆنیەتیی پێکهێنانی حکوومەتی کوردی لە باکووری کوردستان دیاری دەکرێن.

لێرە بەخێری خۆیان شتێکیان بۆ کورد هێشتوەتەوەو زانیویانە بۆیان سەرناچێ و کورد ئامادە نابێ لە چوارچێوەی جوگرافیای دەسەڵاتی ئەم دەوڵەتە نوێیەی ئازەربایجاندا بێ، چونکە ئەوسا هێشتا کۆماری کوردستان دانەمەزرابوو. ئەگەرچی سەرانی ئازەربایجان پاشتریش بەپێی هێندێ بەڵگەنامەی تر، بە کردەوە وازیان لەو پیلانەی خۆیان نەهێنا و پەشیمان نەبوونەوە لەوەی کە بەشێکی کوردستان بکەنە ئازەربایجانی ڕۆژئاوا، کە لە باری جوگرافییەوە ئەو ناوچانەن وا کورد و ئازەرییان تێدا هاوسێی یەکترن و لە زۆر شوێندا تێکەڵ بوون و کێشەیان هەیە. بەڵام ئازەربایجان لە کوێ و سنە و کرماشان تا سنووری عیراق لە کوێ، کە سەرانی ئازەری

ویستوویانە بیانخەنە ناو چوارچێوەی ئەو کۆمارەی خۆیان بۆ داهاتوویش ویستوویانە لەگەڵ ئازەربایجانی سۆڤیەتدا یەك بگرنەوە. ئەگەر ڕۆژهەڵاتی کوردستان بخرایتە سەر ئازەربایجان دەبوو کورد داوای ئۆتۆنۆمی ئیداری یا کەلتووری بکات لە ئازەربایجان جێبەجێکردنی ئەم پیلانە مەترسیدارەی تەورێز و باکۆ مەحاڵ بوو، چونکە -وەك وتراوە- جگە لە کورد، گەلانی تری باکووری ئێرانیش دژی دەبوون. ئەو بەڕواڵەت دیموکراتانە کە تا دوێنێ بوو توودەیی بوون و وەك هەر حیزبێکی کۆمۆنیست پڕوپاگەندەیان بۆ مافی چارەی خۆنووسین و یەکسانیی گەلان دەکرد و زۆربەیان خوێندکار یا ماوەیەکی درێژ لە یەکیەتی سۆڤیەت ژیابوون و لە قوتابخانەی حیزبیش خوێندبوویان و کۆمەڵگەی ئەوێیان بەچاوی خۆیان دیبوو، گوایە کێشەی گەلان لە سۆڤیەت چارەسەر کراوە، کەچی ئەو ڕۆژە کە ناوی خۆیان گۆڕیبوو بە دیموکرات، بەوپەڕی ڕەگەزپەرستی و نادیموکراتیانە کە قوتابخانەی حیزبییان لە سۆڤیەت تەواو کردبوو، بە پێچەوانەوە کاری تێکردبن. سەرانی ئازەربایجانی ئێران قوتابیی ئەو قوتابخانەیەی باقرۆڤ و میراتگرانی ئەوانە بوون کە نیمچە قەوارەی (کوردستانی سوور)یان لە چوارچێوەی ئازەربایجانی سۆڤیەتدا هەڵوەشاندەوە و کوردەکانی ئەو بەشەی کوردستانیان بە ئاگاداری و ڕەزامەندیی مۆسکۆ بەشێوەیەکی نامرۆڤانە دوورخستنەوە بۆ ئاسیای ناوەڕاست و کازاخستان و سیبریا و تا ئەمڕۆیش نەیانهێشتووە بگەڕێنەوە بۆ نیشتمانی خۆیان. دەبێ سەرانی باکۆ چ دەرسێکی سەرانی تەورێزیان دادابێ [بڕوانە ئەم بەرهەمەی نووسەر: کوردستانی پشت قەفقاس، بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٦].

ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان کە بووە کۆسپی بەردەم جێبەجێکردنی تەواوی پیلانەکەی تەورێز و باکۆ، سەرباری دەستبەردارییی سۆڤیەت لە بزووتنەوەی ئازەربایجان و ڕێك نەکەوتنی لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیی ئێراندا و وازهێنانی لە پلانی یەکخستنەوەی هەردوو ئازەربایجان، هۆی ڕانەگەیاندنی ئەم پیلانە گەورەیەی باکۆ و تەورێز بوون [واتە بڵاوکردنەوەی نەخشەی جوگرافیی باشووری ئازەربایجان]. ئەوانە هەر ئەو تاقمە بوون کە لە ڕێککەوتنیاندا لەگەڵ تاراندا، تەنانەت پاشەکشەیان لە

زەنجان (خەمسە)یش کرد کە -بەقسەی خۆیان- یەك ملیۆن ئازەریی تێدا دەژیا، چۆڵیان کرد بۆ هێزەکانی ئێران. بۆیە دواتر نەیانوێرا باسی ئەو شارانەی باکووری ئێران و سنە و کرماشان و هەمەدان بکەنەوە.

سەرانی فیرقە توانییان بە پشتیوانیی باقرۆڤ داوای تەنیا شارکانی کوردستان بکەن، واتە ئەوانەی وا ناویان لێ ناوە ئازەربایجانی ڕۆژئاوا، ئەویش لەبەر بێدەسەڵاتی و بێهێزی و بێدەنگی و بگرە هەڵەی کورد خۆی. دەنا ئەگەر کورد بەپێی پێویست بجووڵایەتەوە، نەدەبوو جڵەوی کاروباری ئەو شارانە بەدەست ئازەرییەکانەوە بوایە. هەروەها ئەگەر کورد هەڵوێستی بەرامبەر بە داگیرکردنی ئەو شارانە بنواندایە و ڕەخنەی لە ڕێکەوتننانەی تەورێز و تاران بگرتایە و بەشداری و تووێژەکان نەبوایە، زۆر زەحمەت بوو سەرانی ئازەربایجان بتوانن هەنگاو بنێن.

پەیوەندیەکانی کورد و ئازەری، بە پێچەوانەی بۆچوونی هێندێ نووسەری کوردەوە، چ سەردەمی کۆمار و چ پاش ئەوە و تا ئێستایش، هەرگیز ئاسایی نەبوون، هەمیشە ئاڵۆز و لە تەقینەوەدا بوون. بەڵگەنامەکانی سۆڤیەت ئەو ڕاستیەیان دەرخستووە کە دامودەزگاکانی حیزبی و حکوومیی ئازەربایجان و فەرمانبەرانی دیپلۆماسی و عەسکەری و سیخوڕیی سۆڤیەتیش نیگەرانی تەقینەوە و ڕوو لە خراپی کردنی ئەو پەیوەندیانە بوون و ژمارەیەك کاربەدەستی ئازەری سۆڤیەتی ڕاستەوخۆ دانیان بەو کردەوە و سیاسەتە چەوتانەی سەرکردایەتیی ئازەربایجانی ئێراندا ناوە کە بووبوونە سەرچاوەی ئاڵۆزیی پەیوەندیەکانی ئازەربایجان و کوردستان" هەر ئەوانیش بوون بەبێ پرس و ڕەچاوکردنی هەندێ ڕاستی بەشێکی کوردستانیان خستە سەر ئازەربایجان و ژێر دەسەڵاتی خۆیان. ئەمە جگە لەوەی کە بەشدارییان بە کورد نەکرد لە بەڕێوەبردنی ئەو ناوچانەدا کە دەبوو بەپێی ڕێژەی دانیشتوان و پەیمانی نێوان ئازەربایجان و کوردستان کورد هاوبەشی بەڕێوەبردنیان بوایە. دەسەڵاتدارانی ئازەری تەنانەت قوتابخانەیەك یا خولێکی فێربوونی زمانی کوردی یا پڕۆژەیەکیان بۆ خزمەتی گوند و شار و گەڕەکە کوردنشینەکان نەکردەوە. لەپاڵ ئەوەدا، نەك هەر ئازەربایجانی ڕۆژئاوا، واتە وزمێ و خۆی و ماکۆ و خانێ و مەهاباد و بۆکان و سەردەشت و نەغەدە، بەڵکە تا هەمەدانیشیان خستە سەر

نیشتمانی خۆیـان. ئـەو یارمەتیـە زۆر و زەبەنـدەیش دەهـات بـۆ ئازەربایجـان و کوردسـتان، لـە تـەوریز بەشـی مـەهابادی لێ گـل دەدرایـەوەو نـەدەدرا. چـەند بەڵگەنامەیەکی کاربەدەستانی سۆڤیەت و ژمارەیەك سەرکردەی ئازەربایجانی ئێران، تەنانەت باقرۆڤیش، دانیان تێدا بەوەدا نراوە کە کورد پەراوێز خراوەو لەو ڕووەوە ڕەخنە لە پیشەوەری و هاوڕێکانی گیراوە.

پیشەوەری و هاوڕێیانی لەلایەکەوە کەوتە بەرگوشاری ڕەخنەی فەرمانبەرانی سۆڤیەتی و باقرۆڤ، لەلایەکی ترەوە کە هەستی کرد کوردەکان ناڕازین و لێی دوور دەکەونەوە و مەترسیی تێکهەڵچوونی کورد لەگەڵ دەسەلاتدارانی ئازەریدا هەیە لە ورمێ و خۆی و ماکۆ و ناوەندی کوردی لە مەهاباد لە یارمەتی بێبەش کراوەو پاشـەڕۆژی پـەیمانی ئازەربایجـان و کوردسـتان لـە مەترسـیدایە، بـە ڕێنـوێنیی فەرمانبـەرانی سـۆڤیەت و پـێداگرتنی بـاقرۆڤ –ئەگەرچـی درەنگوەختـیش بـوو– ملکەچی هێندێ گۆڕانکاری بووە لە هەڵسوکەوتیاندا بەرانبەر بە کورد و ڕازی بوون بەشێك لەو یارمەتیانە بگەیەننە کورد. بەڵام ڕووداوەکانی هەرەسپێهێنانی ئەزموونی هـەردولا، لەودەمـەدا نزیـك دەبوونـەوە و گۆڕانکاریـەکیش هیچ کردەوەیـەکی بەدواوە نەبوو و پەند لە ڕابردوو وەرنەگیرا.

تەنانەت دوای هەرەسهێنانی هـەردوولایش، سەرانی فیرقە لە ئازەربایجانی سۆڤیەت ڕێییـان نـەدا کـوردانی هـەلاتووی وەك خۆیـان لـەوێ ڕێکخـراوی حیزبـی و چاپەمەنی و چالاکیی خۆیان بەناوی حیزبی دیموکراتی کوردستانەوە هـەبێ و سـەربەخۆ بجووڵێنەوە، بـەڵکوو بواریـان پـێدان لـە چوارچـێوەی دامو دەزگاکـانی فیرقـەدا و وەك بەشـێك لـە ڕێکخراوێکـی ئازەربایجـانی کـار بکـەن و لاپەڕەیـەك یـا دووسـێ لاپـەڕەی ڕۆژنامـەی "کوردسـتان"یـان لـەناو ڕۆژنامـەی "ئازەربایجـان"ی ئۆرگـانی فیرقـەدا ببـێ (ئـەویش وەك پاشکۆی ڕۆژنامەی "ئازەربایجان" تێهەڵکێش کرابوو).

چـەند هەڵوێـستێك لـەناو کاربەدەسـتانی ئازەربایجـانی ئێـران و دەسـەلاتدارانی بـەزۆری ئـازەریی دیپلۆماسـیی سـۆڤیەتدا لـە ئێـران بەگـشتی و لـە ئازەربایجـان و کوردستاندا بەتایبـەتی، سـەبارەت بـە چارەسـەرکردنی گرژیـی پەیوەندیـەکانی نێوان ئازەربایجان و کوردستان بەدی دەکرێ:

١- ژمارەیەکیان هیچ باوەڕیان بە کێشەی کورد و هەبوونی قەوارەی کورد نەبوە، هەوڵی لێدان و سەرکوت و بێبەشکردنی کورد و مانەوەییان لە چوارچێوەی ئازەربایجاندا داوە. هەندێکیان پێشنیاری گرتن و دوورخستنەوە و بگرە کوشتنی کوردانی دژی دەسەڵاتی ئازەربایجانیان کردووە و ئامادەی هاوکاری بوون.

٢- ژمارەیەکیان پابەندی پەیمانی نێوان ئازەربایجان و کوردستان بوون، بەڵام ئەم پەیمانە جێبەجێ نەکرا و نەخرایە کار. ئەوانە خوازیاری بەشداری پێکردنی نوێنەرانی کورد بوون لەگەڵ هی ئازەریدا لە وتووێژەکانی تاراندا، بۆ بەدەستهێنانی باوەڕی کورد یا پێشگرتن لە تەقینەوەی پەیوەندیەکان، بەڵام نەك وەك دەستەی هاوبەش یا ڕێککەوتنی هاوبەش (وتووێژ یا ڕێککەوتنی دەستەی نوێنەرانی هاوبەشی ئازەری و کورد لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا، وای دەگەیاند کە ئەو دوو گەلە هاوبەش و یەکسانن).

٣- تاقمێکی چالاك کە هەم سەردەمی ڕەزا شاو هەم دوای ئەویش خوڵقێنەر یا سەبەبکاری ئاڵۆزیی پەیوەندیەکانی ئازەربایجان و کوردستان بوون، لە چین و توێژی جیاجیا پێك هاتبوون و تەنانەت ڕۆشنبیر و نووسەر و ڕۆژنامەوانیشیان لەناودا بوو، ئەمانە هەموویان لە ڕوانگەی بۆچوونێکی ڕەگەزپەرستانە و شۆڤێنییەوە مامەڵەیان لەگەڵ کورددا کردووە و دریغییان نەکردووە لە بەدناوکردنی کورد و ناونانی بە چەتە و ڕێگر و سەر بە بێگانە و جیاخواز. ئەمانە لە خزمەتی ڕژێمی تاراندا بوون، کە دەسەڵاتی ناوەندیش لە ناوچەکانیاندا نەما، لە ڕێگەی حیزبی توودە و پاشان فیرقەی دیموکراتەوە بۆ هەمان مەبەست تێهەڵچوونەوە. دواتریش پەیوەندییان بە نوێنەرانی دیپلۆماسی و سوپایی سۆڤیەتەوە کرد بەو مەبەستەوە و مەرامیان ئەوە بوو کورد هیچ ئامانجێکی خۆی بەدی نەهێنێ. ئەم تاقمە پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان بە تورکەکان و بە تایبەت کونسوڵی تورکیاوە لە ورمێ هەبوو.

ئەم تاقمە لە ڕووداوەکانی پاش شەهریوەری ١٣٢٠ (ئووتی ١٩٤١)دا نەیانهێشت کوردەکان شارەکانی ورمێ و خۆی و ماکۆ و... بگرن و یارمەتیی سوپای ئێرانیان داو دەسەڵاتدارانی ئێرانیش چەکیان لەناودا بڵاوکردنەوە. هاوکات هەراو هۆریایەکی

زۆریان لە چاپەمەنی و ڕادیۆکانی تاران و مەجلیسی ئێراندا نایەوە، لەسەر ئەوەی گوایە کورد شارەکانی گەمارۆ داوەو ژیانی دانیشتوان بەوهۆیەوە بە تایبەت لە ورمێ، لەبەر تالانکردنی تفاق و خواردەمەنی کەوتوەتە مەترسییەوە، بۆیە داوای یارمەتیی سوپایی و خواردەمەنییان لە تاران کردووە تا فریایان بکەوێ. لەلایەکی ترەوە بیروڕای گشتیی ئێرانیان ئاگادار کردەوە لەوەی کە کوردەکان ئەو بەشەی ئێران جیا بکەنەوەو کوردستانی سەربەخۆ و مەزن پێك بهێنن، ئێران لە مەترسیدایە و دوژمنانی و بێگانەکان یاریدەی کوردیان داوە. هەتا هاواریان بۆ دامودەزگاکانی یەکێتی سۆڤیەتیش برد، وەك کونسوڵخانە و کەرتەکانی سوپای سوور لە ناوچەکە، بگرە دەوڵەتی ئێران و کونسوڵەکانیان لە ورمێ و تەورێز ئاگادار کردەوە کە فریای برا هاوزمان و هاوڕەگەزەکانیان بکەون.

کار گەیشتە ئەوەی کۆنەپەرستانی ئێران و دەوڵەتانیش تێبگەیەنن و نامە و برووسکە و سەرنج بۆ باڵوێزخانە و دەوڵەتانی بەریتانیا و ئەمریکا و سۆڤیەت بنێرن و داوایان لێ بکەن هێز ڕەوانەی ناوچەکە بکەن بۆ گێڕانەوەی هێمنی و ئاسایش لە ناوەوە و پاراستنی سنوورەکان. لەبەرئەوەی گوایە کوردەکان چەك و تەقەمەنیان پێگەیشتووە و دەیانەوێ لە ئێران جیاببنەوە و ئەمەیش پێچەوانەی پەیمانی سێقۆڵیی ئێران و بەریتانیا و سۆڤیەتە کە دەبێ سەروەریی ئێران بپارێزن.

هێندێ لەو کۆنەپەرستانە سۆڤیەتیان تاوانبار کردووە بەوەی کە گوایە ناهێڵێ ئێران هێزی عەسکەری بنێرێتە ناوچەکە بۆ لەناوبردنی ئەو یاخیانە. توودەییەکانیش کە باوەڕ و بەرنامەیەکیان بۆ چارەسەری کێشەی نەتەوەکانی ئێران نەبووە، هەر چەشنە جموجووڵ و چالاکییەکی کوردیان بە یاخیبوونی خێڵ و هۆز و فیودال بە قازانجی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستان و هەندێ جاریش بە دەستکردنی ئەوان داناوە؛ هەتا دژی کۆمەڵەی (ژێکاوە)یش بوون، کە -بە بۆچوونی ئەوان- حیزبێکی ناسیۆنالیست و جیاخواز بووە، لە چینی چەوسێنەر پێك هاتووە و داوای کوردستانی مەزنی کردووە و ڕێبازەکەی لەگەڵ بەرژەوەندی گەلانی ئێران و کرێکاران و جووتیاراندا یەکی نەگرتووە. بۆیە حیزبی ئەوتۆیان بە پێویست نەزانیوە، پێیان وابووە تەنیا حیزبی توودە دەتوانێ بەرژەوەندی ڕەنجدەران و

گەلانی ئێران و سەروەری و یەکپارچەیی وڵات بپارێزێ، چونکە توودە حیزبی هەموو گەلانە. توودە پڕوپاگەندەی زۆری دژی ژێکاف کرد، گوایە نەیهێشتووە کوردەکان بچنە ڕیزی توودەوە و لایەنگرانی توودەی بە زۆر و بە هەڵخەڵەتاندن لە ڕیزەکانی خۆیدا ناونووس کردووە. هەر ئەو توودەییانە کە دواتر بوونە فیرقەیی (ڕێکخراوی هەرێمی ئازەربایجانی توودە بووە فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان) هەڵوێستی دژی کوردیان زیاتر توند بوو و بە پشتیوانیی دیپلۆماتەکانی سۆڤیەت کە زۆربەیان ئازەری بوون، نەیانهێشت کورد هیچ ناوچەیەك کۆنترۆڵ بکات.

کەچی کاتێك بواریان بۆ ڕەخسا، بە هاوکاری و ڕەزامەندیی سۆڤیەت چەکداریان لە تەورێزەوە هێنا و شوێنەواری دەسەڵاتی ئێرانیان نەهێشت و هەموو پێگە و ناوەند و سەربازخانەکانیان چەك کردو هەر جارەی بەشێوەیەك دژی هەوڵی پێنج ساڵەی کورد بۆ ڕزگارکردنی ئەو ناوچانە ڕاوەستان (کەچی بزووتنەوەکەی خۆیان جیایخواز و سەر بە بێگانە و ناسیۆنالیست نەبوو!).

نەخشەیەك ئازەرییەکان کێشاویانە و بریتییە لە ئازەربایجانی باکوور (سۆڤیەتی پێشوو) و ئازەربایجانی باشوور (ئازەربایجانی ئێران) کە شارەکانی ورمێ و نەغەدە و خۆی و ماکۆ و سەڵماس و مەهاباد و پیرانشار و سەردەشت و بۆکان و چەند شارێکی تری گرتوەتەوە، واتە تەواوی ڕۆژهەڵاتی کوردستان. پیشەوەری و سەرکردایەتیی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانی ئێران لە ١٩٤٦دا ئامادەیان کردووە بۆ باقرۆڤ.

### کورتەیەك لە ژیاننامەی
### سەیید جەعفەری پیشەوەری:

پیشەوەری لە ١٨٩٣دا لە گوندی (زاویە سادات)ی سەر بە (خەڵخاڵ)ی ئازەربایجانی ئێران لەدایك بووە، بنەماڵەکەی لە ١٩٠٥دا بووەتە پەنابەری قەفقاسی ڕووسیا و لەو قوتابخانەیە کە خوێندوویە، دامەزراوە. پاشان بووەتە مامۆستا. کاتی ڕاپەڕینی جەنگەڵ لە باکووری ئێران، گەڕاوەتەوە بۆ ئێران و خەریکی چالاکیی

سیاسی بووه و شوورای ناوەندیی یەکێتیی کرێکارانی ڕێکخستووە و ڕۆژنامەی "حەقیقەت"ی بڵاو کردوەتەوە. ساڵی ١٩٣٠ گیراوەو دوای شەهریوەری ١٣٢٠ (١٩٤١)، واتە پاش داگیرکرانی ئێران لەلایەن سوپاکانی سۆڤیەت و ئەمریکا و بەریتانیاوە، لەگەڵ زیندانیە سیاسیەکانی تری ئێراندا ئازاد کراوەو دەستی کردوەتەوە بە چالاکیی سیاسی و ڕۆژنامەی "ئاژێر"ی دەرکردووە. حیزبی توودە کردوویە بە پاڵێوراوی تەورێز بۆ مەجلیسی ئێران و بەشداریی هەڵبژاردنی کردووە و بووەتە نوێنەری تەورێز لە مەجلیس. پاشان بە ڕاسپاردن و یارمەتی و پشتگیریی سۆڤیەت، لەگەڵ ژمارەیەك کەسی تردا فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانی لە ١٩٤٥دا دامەزراندوە، کە لە ڕاستیدا لقی هەرێمی ئازەربایجانی حیزبی توودەیان لەو حیزبە جیا کردووەتەوەو ناوەکەییان گۆڕیوە بە فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانی ئێران. دواتر بووە بە سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی ئازەربایجانی ئێران. دواتر بووە بە سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی ئازەربایجان.

پیشەوەری و چەند کەسێکی تر لە سەرکردەکانی ئازەربایجان خوازیاری بەربەرەکانیی ڕژێمی ئێران و پاراستنی دەسکەوتەکانی گەلی ئازەری و دژی سیاسەتی سۆڤیەت بوون بۆ خۆبەدەستەوەدان. هەڵوێستی پیشەوەری بەرامبەر بە کورد و کێشەکەی، پێچەوانەی بانگەوازەکانی بوو کە بە نووسین و قسە دەریدەبڕین. هەستی بە تاوان نەکرد کە خۆی و هاوڕێکانی دەرهەق بە کورد کردبوویان، بەڵام تا مرد هیچ گۆڕانێك لەم بارەیەوە بەسەر بۆچوونی شۆڤێنیدا نەهات.

باقرۆڤ لە نامەیەکدا بۆ ستالین نووسیویە: پیشەوەری لەدایك بووی ئێرانە و پۆستی حیزبیی لە ئازەربایجانی سۆڤیەت پێدراوە و ساڵی ١٩٢٧ کۆمێنترن ناردوویەتیە ئێران بۆ چالاکیی حیزبی و پاش ماوەیەك گیراوەو ١٠ ساڵ لە زیندانی ئێراندا بووە. کە سوپای سوور لە ١٩٤١ گەیشتە ئەو وڵاتە، ئازاد کرا. دوو برای لە یەکێتی سۆڤیەت بووە، یەکیان کاندیدی زانستی پزیشکی بووە.

باقرۆڤ لە جێیەکی تردا ناوبراوی بە ڕێکخەرێکی بلیمەتی خاوەنی گیانێکی بەهێز و نیشتمانپەروەر و ڕەمزی بزووتنەوەی نەتەوەیی داناوە، زۆر داوای لە سەرانی فیرقەی

دیموکراتی ئازەربایجان و فەرمانبەرانی سۆڤیەتی لە ئازەربایجانی ئێران کردووە، ئاگایان لێی بێ و پاراستنی ژیان و گیانی بگرنە ئەستۆ.

پیشەوەری شەوی ١١-١٩٤٦/١٢/١٢ لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی تری فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانی ئێراندا هەڵات و بەرەو سنووری سۆڤیەت کەوتەڕێ، لەوێ چارەنووسێکی پڕ لە کارەسات و مایەی خەم چاوەڕێی دەکرد. دوای چەند مانگێك کە لە ئازەربایجانی سۆڤیەت بووە، کۆمەڵە نامەیەکی بۆ کاربەدەستانی بەرزی سۆڤیەت نووسیوە، بەتایبەت داوای لێ کردوون وەك بەڵێنیان پێداوە یارمەتیی بدەن بگەڕێتەوە بۆ ئێران و بزووتنەوەی ئازەربایجان دەست پێبکاتەوە. لەو نامانەدا سەبارەت بە کێشەی ئازەربایجان، گلەیی و ڕەخنەی لە کاربەدەستانی سۆڤیەت گرتووە. دەسەڵاتدارانی سۆڤیەتیش بۆ ئەوەی پیشەوەری خاو بکەنەوە، لە مایسی ١٩٤٧دا کۆمیتەیەکی نهێنییان گوایە بۆ ڕێکخستن و ناردنی دەستەکانی فیدایی بە نهێنی بۆ ئازەربایجانی ئێران دامەزراندووە، ژمارەیەکیان لەم دەستە فیدایی‌یە هەڵبژێردراوانە لە دوو ناوچەی سەر سنوور (شەکی) و (حاجی کەند) کۆکردوەتەوە. دواین کۆبوونەوەی ئەو کۆمیتە نهێنیە لە ١٩٤٧/٦/٢٣دا بڕیاری داوە پیشەوەری ئەم دەستە فیداییانە ببینێ کە ئامادەی ناردن دەبن و پاش ڕێنوێنیکردن خواحافیزییان لێ بکات.

دوای ئەمە زۆری پێنەچوو ئێوارەی ١٩٤٧/٧/٣ لە نزیکی شاری (گەنجە)، لە ١٤ کیلۆمەتریی جادەی یەڤلاخ- گەنجەدا بە ڕووداوێکی ماشێن بریندار بوو و دوای چەند سەعاتێك لە نەخۆشخانەی یەڤلاخ گیانی دەرچوو. نەیانهێشت لاشەی پیشەوەری لە باکۆ بنێژرێ، بەبێ دەنگی لە باخچەکەی خۆیدا لە (بوزڤن) نێژراو تەنانەت نەهێڵرا کێل و بەرد لەسەر گۆڕەکەی دابنرێ و گوڵ و گیای لەسەر چێنرا تا شوێنەواری دیار نەمێنێ. ساڵی ١٩٦٠ ئەمجا دوای هەوڵدانێکی زۆری فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان هێشتیان ئێسك‌وپرووسکی لە گۆڕستانی بەناوبانگی باکۆ (ئالین) بنێژرێ.

ساڵی ١٩٥٦ کاتی موحاکەمەکردنی باقرۆڤی سەرۆکی ئازەربایجانی سۆڤیەت، لەسەر پیشەوەری پرسیاری لێ کرا. گوایە هیچ بەڵگەیەك بەدەستەوەنەبووە کە ئەو

کوشتبێتی. "سالیحۆڤ" ناوی بەرپرسی کۆمیتەی حیزبی کۆمۆنیستی ئازەربایجان لە یەقلاخ لە دادگادا ئامادە بوو و وتبووی گومانی لەوەدا نییە کە هەر باقرۆڤ کوشتوویە. "سالیحۆڤ"یش کاتی مەئمووریيەتێکی بۆ مۆسکۆ، لە ڕووداوێکی نەزانراودا مرد یا کوژرا.

گەلێك بۆچوون لەسەر کوژرانی پیشەوەری هەیە، بەڵام هەرچۆنێك بێ کاتێکی وا بەبێ ڕەزامەندیی مۆسکۆ (ئەگەر وای دابنێین فەرمانی کوشتنی لەوێ دەرنەچوە) نەکراوە. ڕووداوێکی وا ساختە و دەستکرد، ئەویش بۆ مرۆڤێکی وەك پیشەوەری کە تاوانی هەرەسهێنانی بزووتنەوەی ئازەربایجانی خستبوە ئەستۆی کاربەدەستانی سۆڤیەت، کارێکی زەحمەت نەبوو بۆ ستالین و ڕژێمەکەی، لە کاتێکدا بە داروودەستەی وەك باقرۆڤیەوە سەدان و هەزاران نەیاری خۆیان بەشێوەی جۆراوجۆر لەناوبرد، ئیتر بە ڕووداوی ماشێن بووبێ یا دەرمانخواردن یا تاوانی بێسەروشوێن کردن و دوورخستنەوە و زینندانیکردن. دۆسیەی تاوانەکانی ئەوانە، ئەمڕۆ بووەتە کۆمەڵە بەڵگەنامە و کتێبی لەچاپدراو. ئەوەی وا مۆسکۆ یا باکۆ پێکەوە دەستیان لەم کوشتنەدا هەبووبێ، یا هەرکامیان بەبێ ئاگاداریی تەوریز لەڕێی دەزگاکانی "کا. گی. بی"یەوە ئەم کارەیان کردبێ، جارێ ڕوون نەبوەتەوە. بەڵام بەوەدا کە کوژران یا مردنی پیشەوەری بەبێدەنگی بووەو گۆڕەکەی شاردراوەتەوە و ئەوانەیش کە زانیارییان لەو بارەیەوە یا پەیوەندییان بەو کوشتنەوە هەبوە بە شێوەی جیاجیا لەناو براون، کەمتر گومان دەهێڵێتەوە کە پیشەوەری بە پیلان نەکوژرابێ. دوور نەبوو ئەگەر قازی محەمەدیش بهاتایەتە سۆڤیەت، چەشنە چارەنووسێکی وەك ئەوەی پیشەوەریی بەشێوەیەکی تر چاوەڕێ نەبوایە. خۆ ئەگەر "بارزانی"ش لە ئازەربایجانی سۆڤیەت نەگوێزرایەتەوە بۆ ئۆزبەکستان و مردنی ستالین و گوللەبارانکردنی باقرۆڤی بەسەردا نەهاتایە، دوور نەبوو لەناو نەبرایە، ئەمە لەکاتێکدا کە هێندێ تۆمەتی ناڕەوا دراوەتە پاڵ بارزانی و گوشاری خراوەتە سەرو سووکایەتیی پێکراوەو لە هاوڕێیانی جیا کراوەتەوە، بە وتەی سودا پۆلاتۆڤ، خەریك بووە خۆی ژەهرخواردوو بکات (بڕوانە: بارزانی لە بەڵگەنامەکانی سۆڤیەتیدا، هەولێر، ۲۰۰۳).

چارەنووسی زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتیی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان و توودە، تەنانەت ئەندامەکانیشیان لە سۆڤیەت، پڕ تراژیدیایە. ژمارەیەکیان خراونەتە زیندان یا دوور خراونەتەوە، هەندێکیان خۆیان کوشتووە یا بێسەروشوێن کراون، یا هەڵاتوون و تووشی تەنگ پێهەڵچنین و نەخۆشیی دەروونی بوون، بۆ وێنە بێریا (محەمەد باقرزادە غولام ئۆغلی).

## کورتەی ژیاننامەی
## میر جەعفەر بابایۆڤیچ باقرۆڤ
(١٨٩٥/٩/٥-١٩٥٦/٥/٧)

لە شاری (کوبە)ی سەر بە پارێزگای (باکۆ) و لە بنەماڵەیەکی جووتیاری ئازەربایجاندا لەدایك بووە. مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بووە. لە ١٩١٧دا جێگری سەرۆکی کۆمیتەی شۆڕشگێڕی شاری کوبە بووە. ١٩١٨ لە کاروباری سیاسی- نیزامیی باکۆدا چالاکیی نواندووە. دوای شکستی دەسەڵاتی سۆڤیەت لە ئازەربایجان، چووەتە ڕووسیا، لە دەزگاکانی دادگای عەسکەریی ناوچەی (ئاستراخان) خەریکی ئیش بووە. ١٩١٩ ڕاپەڕینی ئاستراخانی بە فەرمانی کیرۆڤ سەرکوت کردووە. ١٩٢٠ لەگەڵ سوپای سووردا گەڕاوەتەوە بۆ ئازەربایجان. لە ١٩٢٠-١٩٢٢دا جێگری سەرۆکی کۆمیتەی شۆڕشگێڕی هەرێمی قەرەباخ و کۆمیسەر و سەرۆکی باڵای دادگای نیزامیی سوپای ١١ی سۆڤیەت بووە.

لە ١٩٢١-١٩٢٧دا کراوەتە سەرۆکی بەڕێوەبەرێتی سیاسیی دەوڵەتی (کۆمیتەی تایبەت یا چکاکە کە پاشان بووە گ. پ. و) و کۆمیسەر (وەزیر)ی کاروباری ناوخۆی دەوڵەتی ئازەربایجانی سۆڤیەت. بێریا، واتە لاڤرینتی پاڤلۆڤیچ، لە سایەی سەرکردایەتیی ئەودا بەرزبوونەوەی پلەکەی لە دامودەزگاکانی حیزبی و دەسەڵاتداریێتیی یەکێتی سۆڤیەتدا دەستی پێکرد و لە تەمەنی ٢٢ ساڵیدا بوو بە جێگری باقرۆڤ و لە داهاتووشدا بوو بە سەرۆکی باقرۆڤ خۆی. باقرۆڤ لەنێوان ١٩٢٧-١٩٣٧دا بووە سەرۆکی بەڕێوەبەرێتی شووڕای کوندەگانی پشت قەفقاس.

ئەو ماوەیە خەڵکێکی زۆری لە شاری تفلیس گرت و لەسەر کاری لابردن و ژمارەیەکی زۆریشی لەناوبرد و بە فەرمانی ستالین بووە یەکەم دەسەڵاتداری حیزبی و حکوومیی ئازەربایجان.

ستالین لەو بارەیەوە لە نامەیەکدا بۆ مۆڵەتۆڤ نووسیویە: سەرەڕای تاوان و گوناهەکانی ڕابردووی، دەبێ هەر ئەو دابنرێ. باقرۆڤ تا مردنی ستالین لە ١٩٥٣دا، بە کردەوە هەر یەکەم کەسی کۆماری ئازەربایجان بوو. کاتێ ستالین لە ١٩٤٣دا سەردەمی دووەم جەنگی جیهان کەوتەڕێ بۆ کۆنفرانسی هەرسێ زلهێز لە تاران، لە باکۆ چاوی بە باقرۆڤ کەوت. دانیشتوانی ئازەربایجان بە هەموو چین و توێژەکانیەوە زۆر جار بە نامەو بەڵگە و برووسکە سەبارەت بە گرتن و کوشتن و لابردنی فەرمانبەر و کاربەدەست و بگرە خەڵکی ئاساییش و دەستدرێژیکردنە سەر ناموس لەسەر دەستی باقرۆڤ، هانایان بردوەتە بەر دەسەڵاتدارانی مۆسکۆ، بەڵام "بێریا"ی دۆستی لە مۆسکۆ وەڵامی هیچ سکاڵا و شکاتێکی نەداوەتەوە، بەپێچەوانەوە ئەو کەسانەی تووشی ڕاونان و دەرکردن و زیندان و کوشتن کردووە.

باقرۆڤ دوای شکستی بزووتنەوەی ئازەربایجانی ئێران، لە ١٩٤٧-١٩٤٨دا ویستی بەیارمەتیی ئەو کوردانە کە هەڵاتبوونە ناو خاکی ئازەربایجانی سۆڤیەت (واتە بارزانییەکان)، بارودۆخی ئازەرابیجانی ئێران تێك بدات. دوای مردنی ستالین و گیرانی بێریا (کە باقرۆڤ بە دوژمنی گەل ناوی بردووە، بەڵام ئەوە نەبوە هۆی ڕزگاربوونی خۆیشی)، سەرەتا باقرۆڤ لە حیزب دەرکرا، لە ١٩٥٦/٥/٧دا دوای موحاکەمەکردن گوللەباران کرا (سەرچاوە: نیکۆلای زینکۆڤیچ، سەرکردەکان- فەرهەنگی مێژووی ژیانی مرۆڤە زۆر بەناوبانگەکان، چاپی ڕووسی، مۆسکۆ، ٢٠٠٤، ل٣٦-٣٩).

کتێبێکی تر کە بەناوی (خەباتکارە چالاکەکان لەپێناوی سەقامگیرکردنی دەسەڵاتی سۆڤیەتدا لە ئازەربایجان)ەوە، کە ١٩٦٠ لە باکۆ چاپ بووە، ناوی زۆر کەسی حیزبی و دەوڵەتی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری... تێدایە کە بە فەرمانی باقرۆڤ لەناوبراون. باقرۆڤ لە (ل٧)ی ئەو بەرهەمەدا بە مرۆڤێکی خاوەن لاپەڕەیەکی ڕەش ناسێنراوە. لە (ل٨)دا وتراوە: باقرۆڤ تەواوی ناحەزانی خۆیی بە بیانووی

هەمەجۆرەوە لەناو بردووە" بۆ وێنە، چەك و تەقەمەنیی خستوەتە ناو ماڵ و ژێر زەویی ماڵی ناحەزانی و دوایی ماڵەکەیان پشکنیون و چەك و تەقەمەنیەکەیان دۆزیوەتەوە و خاوەنماڵیان بە بەهانەی بەرهەڵستی و خۆسازدان بۆ ڕاپەڕین دژی قەوارەی سۆڤێتی گوللەباران کردووە. نێرینەی زۆر گوند و ناوچە، لەوانە گوند و ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجانی سۆڤیەتی، بە فەرمانی ئەو، لە منداڵ و ژنیان جیاکراونەتەوە و ژمارەیەکیان خراونەتە زیندان یا دوورخراونەتەوە یان گوللەباران کراون. باقرۆڤ لەکاتی موحاکەمەکردنیدا دانی بە هەندێ تاوانی خۆیدا ناوەو وتوویە دوژمنی حیزب و وڵات نەبوە (بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە کتێبی ڕاستی و تەنیا ڕاستی، مۆسکۆ، ١٩٩١ – بە زمانی ڕووسی). موحاکەمەی باقرۆڤ لە ١٢-١٩٥٦/٤/٢٦ درێژەی هەبوو، کراوە بوو و خەڵك و سکاڵاکەر بەشدارییان تێدا کرد و لە شاری باکۆ بەڕێوە چوو.

دەگێڕنەوە: پیشەوەری، باقرۆڤی بە ئاشبەتاڵ پێکردنی بزووتنەوەی ئازەربایجان تاوانبار کردووە و وتوویە ئەگەر مۆسکۆ فەرمانی خۆبەدەستەوەدانی دابوو، ئەو بۆ ڕازی بووەو هێشتوویە مۆسکۆ گوشار بەکاربهێنێ و لانی کەم بهێڵێ ئەوان خۆیان بڕیار بدەن و دووبەرەکی نەخاتە ناویانەوە. باقرۆڤ، زۆر ڕەخنەی لەم بابەتەی پیشەوەریی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لەملاو لەولاوە بیستووەو قینی لێ هەڵگرتووە. باقرۆڤ لە میواندارییەکدا کە بۆ ڕێبەران و ئەفسەرانی سوپای ئازەربایجانی ڕێکخستووە، لە وتارێکیدا هۆی شکستی بزووتنەوەی باشووری ئازەربایجانی داوەتە پاڵ کەم بایەخدان بە تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانی ئازەربایجان و بە کەم گرتنی یەکێتی ئازەربایجانی باشوور و باکوور کە بە گەورەترین هۆی شکستەکەی زانیوە. پیشەوەری لە وەڵامدا وتوویە: بە پێچەوانەی بۆچوونی هاوڕێ باقرۆڤەوە، گەورەترین هەڵەی ئێمە بایەخ نەدان بوو بە یەکێتیی خەباتی گەلی ئازەربایجان و کۆمەڵانی خەڵکی شوێنەکانی تری ئێران.

باو نەبوە بۆچوونی پێچەوانە یا بۆچوونێکی تر لە کۆبوونەوەی ئاوادا بە بەرچاوی سەرکردەکانی ئازەربایجانی سۆڤیەتەوە، بەتایبەت بەرامبەر بە شاگرد و قوتابیی ستالین و قوتابخانەکەی، دەربڕدرێ" دەبوو بڵێ ڕاست دەفەرمووی یا

بێدەنگ بێ یا بەشێوەیەکی دیپلۆماسیانە بڵێ ئەوەیش بۆ فەرموودەکانی هاوڕێی خۆشەویستمان زیاد دەکەم کە بایەخی پێویستمان بە یەکێتیی گەلی ئازەربایجان و کۆمەڵانی خەڵکی ناوچەکانی تری ئێران نەداوە. دوور نییە کە باقرۆڤ بڕیاری داوە پیشەوەری لەکۆڵ خۆی بکاتەوە، حیزبی توودەیش دەوری زۆری هەبووبێ لە بەدناوکردن و لەناوبردنیدا. لای توودە، تاوانباری یەکەم پیشەوەری بووە، کە ئەو حیزبەی پارچەپارچە و بێهێز کردووە و خستوویەتیە پەراوێزەوە.

**کورتە ژیاننامەیەکی بیریا (محەمەدی باقرزادە غولام ئۆغلی)**

لەدایکبووی ١٩١٤ی هەرێمی تەیرووزە، وەزیری پەروەردەی حکوومەتی میللیی ئازەربایجان بووە. دوای هەرەسی بزووتنەوەی ئازەربایجان لە کۆتایی ١٩٤٦دا، وەك سەرۆکی فیرقە لە ئێران مایەوە. بیریا شاعیر و ئەندامی سەرکردایەتیی فیرقە بووە دوای داگیرکردنی تەوریز لەلایەن سوپای ئێرانەوە، لە نەخۆشخانەی سۆڤیەت لە تەوریز خۆی شاردەوە. مارتی ١٩٤٧ بۆ ئەوەی نەکوژرێ، لە تارانەوە هێنرایە یەکێتی سۆڤیەت. لە باکۆ خرایە قوتابخانەی حیزبی، بەڵام بارودۆخەکەی بەدڵ نەبوو، بەتایبەت هەڵوێستی سیاسیی سەرکردایەتیی سۆڤیەت، بۆیە کۆتایی ١٩٤٧ نیازی بوو بگەڕێتەوە بۆ ئێران. کوژرانی پیشەوەری و بارودۆخی هاوڕێکانی لە ئازەربایجانی سۆڤیەت و ئەزموونی تاڵی ڕابردووی خۆی لە سۆڤیەت، زیاتر هانیان دا بگەڕێتەوە. نەیشاردەوە کە بەتەمایە بگەڕێتەوە بۆلای بنەماڵەکەی لە ئێران. دەزگاکانی کا. گی. بی. ڕازی نەبوون و چاودێرییان کرد، نەوەکا بڕواتەوە ئێران و تەواوی نهێنییەکان بداتە دەسەڵاتدارانی ئێران. چەند جارێك ئاگاداریان کردەوە و تەنانەت لەلاوە هەڕەشەیان لێکرد.

سەرەنجام ١٩٤٧/١٢/٢٧ چووە کونسوڵخانەی ئێران لە باکۆ تا پاسپۆرت و چۆنیەتی گەڕانەوەی بۆ مسۆگەر بکەن. کا. گی. بی. بەبیانووی جاسووسیکردنەوە بۆ دوژمن، گرتی و تا ئووتی ١٩٤٨ لە زینداندا مایەوە، بە ١٠ ساڵ زیندان مەحکووم کرا. لە ١٩٥٠یشدا بەهۆی هەڵسوکەوتی خراپ و هەڵوێستی دژی سۆڤیەتەوە لە زیندان،

دیسانەوە موحاکەمە کراو حوکمەکەی لەسەر زیاد بوو. کە ستالین مردو خرۆشۆڤ هاتە سەر کار و گۆڕانکاری ڕووی دا، ئازاد کراو هەر سوور بوو لەسەر ڕۆیشتنەوە بۆ ئێران. بۆیە سەربەخۆ چووە مۆسکۆ، کاتی چوونە باڵوێزخانەی ئێران گیراو نێردرایە باکۆ و خانووی درایێ و کا. گی. بی. و فیرقەیی و توودەییەکانیش ئاگادار کرانەوە کە ڕێی نەدەن بگەڕێتەوە بۆ ئێران. لە نامە و نووسینەکانیدا بۆ سەرکردایەتیی سۆڤیەت و ئازەربایجانی سۆڤیەت، هەڵوێستی پێشوویی دەرهەق بە نیزامی سۆڤیەت و سیاسەتەکەی و بیری مارکیسیزم –لینینیزم نەشاردووەتەوە. ساڵی ١٩٨٠ گەڕایەوە بۆ ئێران، لە تەورێز دەستبەجێ گیرا، ئەو دەمەو لە سەرەمەرگیدا ئازاد کرا.

شایانی باسە، محەمەدی بیریا بە گوشاری سۆڤیەت لەجێی پیشەوەری بە سەرۆکی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان دانرا و لایەنگری خۆبەدەستەوەدان بوو لەگەڵ دکتۆر جاویەی وەزیری ناوخۆ و شەبوستەریی سەرۆکی مەجلیسی ئازەربایجاندا. ئەوانە نەك تەنیا خوازیاری خۆبەدەستەوەدان بوون، بەڵکوو خۆیشیان بەپیر سوپای سەرکوتکەری ئێرانەوە چوون، تەنانەت داوایان لە خەڵکیش کرد خۆیان بۆ پێشوازیکردن ئامادە بکەن. ئەمانە وەك ئەندامی سەرکردایەتیی فیرقە، چ لە ڕابوردوودا و چ لەکاتی هەرەسهێنانەکە، زۆرترین دەنگیان هەبوو. ئەوانە بەناوی سەرکردایەتیی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان و ئەنجومەنی ئەیالەتی (مەجلیسی ئازەربایجان) و پارێزگای تەورێز (وەزارەتی ناوخۆ)وە، بەجیاو پێکەوە برووسکەیان بۆ شا و قەوام نارد ئامادەی پێشوازیی سوپای ئێران دەبن. پیشەوەری و ئەمانی تر وەلانرابوون یا ڕۆیشتبوون بۆ سۆڤیەت یا خۆیان شاردبوەوە، بڕیاردەر هەر ئەوان بوون، ئەمە جگە لەوەی کە لە بانگەوازەکانیاندا دەریانبڕی ئامادەن دژی ئەوانە هاوکاریی سوپای ئێران بکەن کە دەکەونە بەربەرەکانیی ئەو سوپایە.

جێی سەرسوڕمانە هەر ئەم تاقمە بەرپرسەی ئازەربایجان لە بڕیاری خۆبەدەستەوەدانیان دا، کورد و کوردستانیان بە بەشێکی ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆیان زانیوە، وا کە هەر خۆیان بۆ سەرکردایەتیی کوردی دیاری بکەن چ چارەنووسێکی هەبێ. ئەوەتا جاوید لە برووسکەی ناوبراودا بۆ قەوامی سەرۆك وەزیران کە لە ڕۆژنامەکانی "داد" و "ئازەربایجان" و هی تردا ڕۆژی ١٣٢٥/٩/٢١

(١٩٤٦/١٢/١١) بڵاو بووەتەوە، وتوویە: ((...بەڕێزتان ئاگادارن کە من هەمیشە هەوڵم داوە کێشەی ئازەربایجان بە نیازپاکیی ئێوە بەڕێگەیەکی ئاشتییانە چارەسەر بکرێ، ئەمڕۆیش هەمان بیروڕام هەیە. بەم بۆنەیەوە ڕایدەگەیەنم بە یارمەتیی بەڕێز شەبوستەری پێکەوە توانیمان ئاغایانی پەیوەندیدار [واتە سەرکردە و کاربەدەستانی تری ئازەری، هەورامی] قەناعەت پێ‌بهێنین کە خۆ لە ڕووبەڕووبوونەوە لادەن. ئەم کێشەیەش گەیەنراوەتە لای سەیفی قازی، بۆ ئەوەی خوێنڕێژی و براکوژی نەبێ فەرمان بفەرموێ هێزەکانی واز لە بەرەنگاری بهێنن و...))!.

ڕاپۆرتی ١٩٤٦/١٢/١٢ی کونسوڵی سۆڤیەتیش لە تەورێز تێیدا هاتووە: سەدری قازی ئەوکاتەی لە تەورێز بووە، شەو جاوید ناوبراوی ناردوەتە ماڵی قولییێڤ. سەدری قازی لەوکاتە ئاڵۆز و چارەنووس دیاریکەرەدا لەوێ بووە، تا بزانرێ چی بکرێ، ئیتر لە تاران یا مەهابادەوە نێردرابێ یان بانگ کرابێ، گرنگ نییە، چونکە فەرمانی خۆبەدەستەوەدانی ئازەری و کورد لە مێژ بوو سۆڤیەت پێی دابوون و دەبوو جێبەجێ بکرێ. گرنگ ئەوەبوو هیچ کۆسپێك نەیەتە ڕێی پەیمانەکەی مۆسکۆ و تاران سەبارەت بە نەوت !

جاوید و شەبوستەری کە دوای خۆبەدەستەوەدان برانە تاران، ساڵ‌ونیوێك خرانە زیندان، ئەمجا موحاکەمە کران. بەم چەشنە دادگای زەمانی شەڕ حوکمی دان: ((لەبەرئەوەی کاتی ڕووداوەکانی ئازەربایجان کێشەکەیان بە شێوەیەکی ئاشتییانە کۆتایی پێ‌هێناو هاوکاریی پێویستی نوێنەران و فەرمانبەرانی دەوڵەت و بەتایبەت ئەفسەرانی سوپای ئێرانیان کردووە... هەرکامیان بە دوو ساڵ زیندانی ئینفرادی لەکاتی گرتنیانەوە سزا دەدرێن)). پاشتر شا لێیان خۆش بوو، لەبەرئەوەی گوایە هەر لە هەووەڵ ڕۆژەوە پەیوەندییان بە دەوڵەتی ناوەندییەوە نەپچڕاندوەو دەوڵەتیان لە کاروباری دیموکراتەکان ئاگادار کردووەتەوە (بڕوانە: "کەیهان" و "ایران ما"، ١٣٢٧/٤/١٧).

پێ‌دەچێ ئەو بۆچوونە ڕاست نەبێ، ئەگەنا قازی محەمەد و سەیفی قازیش (سەدری قازی هەر بێ‌تاوان بوو، پۆست و بەرپرسییەکی لە کۆماری کوردستاندا

نەبوو، وەك نوێنەری مەهاباد و بۆكان لە مەجلیسی ئێران لە تاران دادەنیشت) هیچ بەربەرەكانیەكیان دژی سوپای ئێران نەكرد، كێشەیان بە وتەی سەرۆكی دادگا یا لێبووردنی شاهانەی شا –ئاشتیانە بڕاندەوە (سەبارەت بە بارودۆخی پڕ لە كارەساتی ئەندام و لایەنگرانی چالاكی فیرقە و خەڵكی ئاسایی كە بێتاوان كەوتنە بەر هێرشی كوشتن و گرتنی سوپای سەركوتكاری ئێران، بڕوانە بەرهەمی نووسەر: پەیوەندیەكانی ئازەربایجان و كوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٧).

### نوێنەری نێردراوی قەوام بۆ تەورێز و هەڵوێستی بەرامبەر بە كورد

"فەتحعەلی ئیپەكچیان"[١]ی نوێنەری قوامول سەڵتەنە ١٩٤٦/٤/٢١ بۆ ئامادەكردنی وتووێژێكی ترو درێژەدان بە وتووێژەكانی پێشوو و پێكهاتنی نێوان تەورێز و تاران، گەیشتە تەورێز، ناوبراو زیاتر بۆ خافڵاندنی سەركردایەتیی ئازەربایجان و وەرگرتنی هەڵوێستی نوێ بەرامبەر بە كێشەكان، نێردرا.

پیشەوەری بۆ دیاریكردنی كات و شوێنی وتووێژەكان و ئەندامانی دەستەی نوێنەرایەتیی ئازەربایجان بۆ وتووێژ، بە "ئیپەكچیان"ی وتووە پاش تاووتوێكردنی ئەم كێشانە لە پەرلەمانی ئازەربایجانا، ئەمجا دەستەی نوێنەرایەتیی ئازەربایجان دیاری دەكرێن. كێشەكان، پێش كۆبوونەوەی مەجلیس، لە كۆبوونەوەی سەركردایەتیی فیرقەی دیموكراتی ئازەربایجاندا بە بەشداریی (ترۆیكای باكۆ) باس

---

[١] فەتحوڵلا ئیپەكچیان، بازرگان و نوێنەری پێشووی تەورێز لە مەجلیسی ئێران (مەجلیسی چواردەهەم)، دۆستی سۆڤیەت و پیشەوەری و بڕواپێكراوی قوامول سەڵتەنە بووە. لە ١٩٤٣دا بە پشتیوانیی سۆڤیەت و توودە كرایە پاڵێوراوی هەڵبژاردنەكانی مەجلیسی ئێران. بەشداری وتووێژەكانی نێوان تاران و تەورێز بوو" بەپێی بەڵگەنامە و سەرچاوەكانی سۆڤێتی خوازیاری ڕێككەوتنی دەوڵەتی ناوەندی و ئازەربایجان و مۆركردنی ڕێككەوتنی پەیمانی نەوتی نێوان ئێران و سۆڤیەت بوو. ناوبراو بە ڕواڵەت زیاتر لایەنگریی لە بزووتنەوەی ئازەربایجانی كردووە نەك حكوومەتی تاران و ژێر بەژێریش داوای لە سەرانی ئازەربایجان و كاربەدەستانی سۆڤیەت كردووە زیاتر لەسەر هەڵوێستی خۆیان سوور بن. بەڵام پێناچێ ئەوە ڕاست بێ و زۆرتر بۆ تاقیكردنەوەی هەڵوێستی ڕاستەقینەیان بووە، تا كاربەدەستانی ئێران لەوبارەیەوە ئاگادار بكاتەوە. دیار نییە هەڵوێستی ناپاكیشی بەرامبەر بە مەسەلەی كورد لە چ سەرچاوەیەكەوە دەستی پێكردووە.

کران، هەر ئەو ڕۆژەیش لە مەجلیسی میللیی ئازەربایجاندا مشتومڕیان لەسەر کرا..
ئەوەبوو دەستەی نوێنەرایەتیی ئازەربایجان دیاری کرا (بەبێ پیشەوەری و سەرکردایەتیی ئازەربایجان پێ لەسەرئەوە دابگرن کە قەوام بەشداری وتووێژ بێ، پیشەوەریش بەشدار دەبێ. کەچی قەوام موزەفەری فەیرووزی بە جێگری سیاسی و سەرۆکی دەستەی نوێنەرایەتیی حکوومەتی تاران دیاری کردو شوێنی وتووێژەکانیشی، شاری کەرەج، هەر بە پێشنیاری حکوومەتی قەوام بوو، ئازەریەکان پەسەندیان نەکرد و پێشنیاریان کرد لە تەورێز یا تاران بێ. سەرەنجام بڕیار درا وتووێژ لە تاران بەڕێوەبچێ، بۆ ئەوەی دواتر ڕژێمی تاران لە دەستی دەرنەچێ و قەوام خۆیشی بەشداری بێ، جگە لەوە زیاتر دەنگی دەدایەوە. پیشەوەری ئامادەیی خۆی نیشان دا سەرکردایەتیی دەستەی نوێنەرایەتی بکات بۆ وتووێژ لەگەڵ حکوومەتی ئێراندا و بچێتە تاران. محەمەد حوسێنی سەیفی قازیش، بە بڕیاری سەرکردایەتیی ئازەربایجان، وەك نوێنەری کوردان [نەك کوردستان، هەورامی] بۆ دەستەی نوێنەرایەتیی ئازەربایجان بۆ وتووێژ دیاری کرا.

ڕاپۆرتی کاربەدەستانی سۆڤیەت لە تەورێز بۆ باقرۆڤ و لە باقرۆڤیشەوە بۆ ستالین و مۆڵەتۆڤ سەبارەت بە چاوپێکەوتنەکەی ئیپەکچیان و سەرکردایەتیی ئازەربایجان ئەمەی تێدا هاتووە:

((... ئیپەکچیان لە پیشەوەریی پرسی: هۆی چییە قازیتان لەم دەستەیەدا داناوە ؟ پیشەوەری وتی: قازی وەك نوێنەری کوردان ئەندامی دەستەی نوێنەرایەتییە. ئیپەکچیان وتی زۆر زەحمەتە قەوام ئەم پاڵێوراوە پەسەند بکات... ئیپەکچیان وتی لە تاران باسی کوردەکان نەکراوە، قەوام بایەخێکی ئەوتۆی بە نەخش وکێشەی ئەم گەلە نەداوە و پێی‌وایە دوای چارەسەری کێشەی ئازەربایجان کێشەی کورد خۆبەخۆ چارەسەر دەبێ، لەبەرئەوە ئازەربایجانیەکان دوای وتووێژەکان بۆ خۆیان کاروبارەکان لە ئازەربایجان و کوردستان ڕێك دەخەن)). دواجار دەستەی نوێنەرایەتیی ئازەربایجان کە لە سەیید جەعفەری پیشەوەریی سەرۆك وەزیرانی ئازەربایجان و پادگانی سکرتێری فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان و "فەرەیدوونی ئیبراهیمی"ی داواکاری گشتیی ئازەربایجان و "سادقی دیلەمقانی"ی ئەندامی دەستەی بەرزی

سەرکردایەتیی مەجلیسی ئازەربایجان و دکتۆر جەهان شاهلووی جێگری سەرۆك وەزیرانی ئازەربایجان [هاوکات بەرپرسی فیرقە بوو لە زەنجان یا خەمسە، هەورامی] و سەیفی قازیی نوێنەری کوردان و "تەقی شاهین"ی پارێزگاری ورمێ وەك سکرتێری دەستەی نوێنەرایەتیی ئازەربایجان پێك هاتبوو، ڕۆژی ١٩٤٦/٤/٢٤ (١٣٢٥/٢/٨ی هەتاوی) لەگەڵ ئیپەکچیان فەیرووزی فەرمانفەرمایان (نوسرەتو ددەولە) و شێخ حوسەێنی لەنکەرانی و سادق سادقیی موستەشار و ددەولە و موزەفەری فەیرووز و موئەڕەحو ددەولە [ئەم دوانە دواتر گەیشتنە تەورێز]دا کە دەستەی نێردراوی تاران بوون، بە فڕۆکە گەیشتنە تاران.

سەبارەت بە گوزارشتی ئیپەکچیان دەرهەق بە کورد، ڕوونکردنەوەیەك پێویستە:

با وای دابنێین قەوام لە تاران هیچ باس و خواسێکی لەگەڵ "فەتحوڵڵای ئیپەکچیان"ی سەرۆکی شاندی خۆیدا بۆ تەورێز و سەبارەت بە کورد و کێشەی یا بەشدارانی کورد لە وتووێژەکاندا نەبوە و هەروەهایش بووە، ئەگەر قەوام ڕایبسپاردایە وتووێژ لەگەڵ کورد بکات و نوێنەر یا نوێنەرانی کوردیش بخرێنە ناو دەستەی نوێنەرایەتیی ئازەربایجان، بێگومان ئیپەکچیان جێبەجێی دەکرد" یان ئەگەر قەوام بیویستایە وتووێژ لەگەڵ کورددا بکات (بە تەنیا یا پێکەوە لەگەڵ ئازەریەکاندا)، نوێنەری دەناردە مەهاباد، یان بانگی نوێنەرانی کوردی دەکرد بۆ تاران یا تەورێز. بەڵام ئەوەی کە بە سەرسامییەوە وتوویە بۆچی قازی خراوەتە ناو دەستەی نوێنەرایەتیی ئازەربایجان، بێئەوەی قەوام لەم بارەیەوە ئاگادار بکاتەوە و کە بە پیشەوەریی وتووە قەوام بایەخ بە کورد و دەوری کورد نادات و پێیوایە بە چارەسەری کێشەی ئازەربایجان خۆبەخۆ کێشەی کوردیش چارەسەر دەبێ" ئەم هەڵوێستە جێی پرسیار و سەرسووڕمانە. دەبێ ئەم کابرا قین لەدڵ و ناحەزەی کورد بۆچی هەڵوێستێکی وا چەوتی نواندبێ و لە هەموو بارێکدا ویستبێتی کورد بخاتە پەراوێزەوە، نە نوێنەری هەبێ و نە باسی کێشەی کورد بکرێ. دەستەی نوێنەرایەتیی حکوومەتی تاران، یا نێردراوانی قەوام، پەیتا پەیتا ڕۆژانە بە برووسکە و بێتەل بیروڕایان لەگەڵ تاراندا دەگۆڕیەوە و پرسیاریان بە قەوام دەکرد لەو ڕووەوە

که ئازەریەکان چییان وتووە و بڕیار لەچی دراوە. ئەگەنا دیارە قەوام پێی دەوتن با کوردیان لەتەکدا نەبێ. نوێنەرانی سۆڤیەت لە تەواوی وتووێژەکاندا بەشدار بوون و ئەو وتووێژانەیش هەر بە ڕێنوێنی و ڕەزامەندی و ناوبژیکردنی ئەوان ڕێکخراون. سەرکردایەتیی ئازەربایجان بە بەشداریی نوێنەری کورد خۆی بە گەورەتر نیشان داوە و وای داناوە خۆی خاوەنی کێشەی کورد و کوردستانە و دەبێ ئەو کێشەیە لە چوارچێوەی ئازەربایجاندا چارەسەربکرێ.

ئیپەکچیان دوایی وەك بڵێی بۆ کورد و نوێنەری کورد پرسی بە قوام کردووە، وتوویە قەوام پێیوایە دوای چارەسەری کێشەی ئازەربایجان، کێشەی کوردیش خۆبەخۆ چارەسەر دەکرێ، بەڵام نەیوتوە بە نوێنەری کورد بەشدار نەبێ و لەگەڵیاندا نەچێتە تاران و باسی کێشەی کورد نەکرێ. ئیپەکچیان وتوویە ئازەربایجانیەکان (با وای دابنێین ئەمە بۆچوونی قەوام و ئیپەکچیانیشە) پاش وتووێژو پێکهاتن لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا خۆیان کێشەکان لە ئازەربایجان و کوردستان چارەسەر دەکەن. گریمان ئیپەکچیان ویستوویە کێشەی کورد لە چوارچێوەی ئازەربایجاندا چارەسەر بکرێ، نەك پێکەوە لەگەڵ کورددا پێك بێن، ئەی ئازەریەکان چییان بە کورد ڕەوا دیوەو چۆن ئەوەیان کردووە. خۆ بە بۆچوونی ناوبراو بێ، مادامێکی کورد و کوردستان و کێشەکەی بەستراونەتەوە بە ئازەربایجان، ئەمە مافی ئەوە بە کورد دەدات وەك هاووڵاتییەکی ئازەربایجانی بەشداری وتووێژ بێ. دیارە بۆچوونەکانی ئیپەکچیان نە تەورێز و نە تاران و نە سۆڤیەت پەسەندیان نەکردووە.

من لە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتدا بەناوی (پەیوەندیەکانی ئازەربایجان و کوردستان)ـەوە، گەلێك نهێنی و مەسەلەم ئاشکرا کردووە" لەوانە ساکاری و هەڵەی کورد لە گەمەی سیاسیدا و نەبوونی گەلاڵەی سەربەخۆی کورد بۆ خستنەڕووی کێشەکەی لە وتووێژەکانی نێوان ئازەربایجان و تاراندا. ئەگەر کورد ناچاریش بووبێ بەشداری ئەو وتووێژانە بێ، دەبوایە نوێنەری زۆرتری هەبێ و هەموو خاڵەکانی مافو داواکاری و کێشەی کورد لە گەلاڵەی پێشنیاری دەستەی نوێنەرایەتیی ئازەربایجاندا بۆ حکوومەتی تاران جێبکرێنەوە" دەبوو ناوی دەستەکەیش، دەستەی هاوبەشی نوێنەرانی ئازەربایجان و کوردستان بوایە.

خاڵێکی تری جێی قسەی بەڵگەنامەکە، ئەوەیە کە دکتۆر جەهان شاهلووی سەرۆکی کۆمیتەی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانیش لە زەنجان (خەمسە) لەگەڵ دەستەکەدا براوە، تا وای نیشان بدەن کە زەنجانیشیان دەوێ. "تەقی شاین"ی والی یا پارێزگاری ورمێش خراوەتە تەك دەستەکە تا بە ئاشکرا بە کورد و دەوڵەتی ئێران و لایەنە پەیوەندیدارەکانی تر بوترێ ئازەربایجانی ڕۆژاوا (کە بەشێکی کوردستانە)، بەشێکە لە خاکی ئازەربایجان.

ئازەرییەکان هەموو داواکارییەکانی خۆیان لە سەرکردایەتی حیزبو پەرلەمانو حکوومەتی خۆیاندا ئامادەو تاووتوێ کردووەو گەڵاڵەیان کردوون، کەچی کورد نە خواستەکانی دیارن، نە سەرکردایەتیی حیزبی و حکوومەتی و هەیئەتی ڕەئیسەی میللی (دەستەی سەرکردایەتیی نەتەوەیی یا نیشتمانی) کە گوایە دەوری مەجلیسی کوردستانی دیوە، گەڵاڵەیەکی تاووتوێ و ئامادە کردووە و نە ئەندامانی دەستەی نوێنەرایەتیشی دیاری کردووە.

بەداخەوە هەموو سەرچاوەکان وتوویانە محەمەد حوسێنی سەیفی قازی لەلایەن تەورێزەوە بانگ کراوە، بێئەوەی گەڵاڵەنامەیەکی بڕیار لێدراوی پێ بێو لە وتووێژەکانی تاران ئاگادار کرابێتەوە، یا خۆی خواستەکانی کورد بۆ ئەو وتووێژە دابڕێژێتەوە و ئامادەیان بکات، یان گەڵاڵەی پێشنیار کراوی ئازەربایجان بخرێتە بەردەم سەرکردایەتیی کورد تا دەستکاری و لێی کەمو زیاد بکات و بەگشتی خواستەکانی کوردی تێدا ڕەنگ بداتەوە. هیچ گومان لەوەدا نییە کە کورد پێشتر گەڵاڵەکەی ئازەرییەکانی نەدیوە و بۆی نەنێردراوە تا لە ناوەڕۆکی ئاگادار بێتەوە. بەڵام ئایا بۆچی سەیفی قازی ئەوەی پەسەند کرد و چووە تاران (بەناوی دەستەی نوێنەرایەتی تارانەوە) ؟، بۆچی نە ڕەخنەی گرت و نە ناڕەزایی دەربڕی، خۆ پاشتر ئەو گەڵاڵەیە لە چاپەمەنییەکانی ئێران و ئازەربایجاندا بڵاو کرایەوە ؟ بۆچی سەرکردایەتیی حیزب و حکوومەت و... لە مەهاباد لە ئاستیدا بێدەنگ بوو ؟ دواتر کە فەیرووز هاتە تەورێز، هەر ئەو گەڵاڵەیە بە دەستکارییەوە مۆر کرا، ئەویش بە بەشداری و ڕەزامەندیی کورد.

### کۆتایی‌هێنان بە دەسەڵاتی ئێران لە ئازەربایجانی باشوور و چەککردنی سوپا و هێزەکانی تری ئێران

سەرکەوتنێکی بزووتنەوەی دیموکراتیی ئازەربایجان کە مێژوویەکی بۆ خۆی دروست کرد، دەستوبردیی بوو لە کارەکانیدا. هەر ماوەیەکی کورتی پاش دامەزراندنی حیزبەکەیان (کە بە فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانی ئێران ناسراوە)، سوپا و هێزەکانی ئێرانیان لە ئازەربایجان چەك کردو مەجلیس و پاشان حکوومەتیان پێك هێنا لە نوێنەری زۆربەی شار و ناوچەکانی ئازەربایجان کە لەڕێی هەڵبژاردن یا ڕێکەوتن و بەشێوەیەکی دیموکراتیی سەردەمی خۆیان بەشدارییان پێکردوە لە سەرکردایەتیی حیزب و مەجلیس و حکوومەتدا. بەم چەشنە توانییان هەستو پشتیوانیی زۆربەی چین و توێژی کۆمەڵەکەی ئازەربایجان بۆلای خۆیان ڕابکێشن. لە هەمووی گرنگتر، پیلان دانانیان بوو بۆ کۆتایی هێنان بە دەسەڵاتی ناوەندیی تاران لە ئازەربایجان" لە قۆناغی یەکەمدا سەربازخانە و پێگە و ناوەندەکانی پۆلیس و ژاندارمرییان ڕاستەوخۆ بەشداری ڕووداوەکان بوون‌و سۆڤیەت هاندەر و ڕێکخەر و نەخشەداڕێژی کارەکانیان بوو، بەبێ ئەو نەیاندەویست یا نەیاندەتوانی ئەو کارانە بکەن.

ئازەریەکان بەم پێیە مەترسی و هەڕەشەی ڕژێمی تارانیان لەناو وڵاتیاندا نەهێشت دووریان خستەوە بۆ دەرەوەی سنووریان و نیشتمانی پاك‌و بەرینی خۆیان ئازاد کرد. جگە لەوەی کە چەك و تەقەمەنییەکی زۆریان لە سوپای ئێران دەست کەوت، هەر بەو چەك‌و تەقەمەنییە و یارمەتیی سۆڤیەت توانییان سوپایەکی ڕێکوپێك پێك بهێنن و زیانێکی کوشندە لە سوپای شاهنشا بدەن. بەوە ناو و شکۆی خۆیان و مەسەلەی ئازەربایجانیان بەرز کردەوەو ڕژێمی تارانیش ناچار بوو حیسابیان لەسەر بکات و بکەوێتە وتوویژ لەتەکیاندا. ئازەریەکان، بەهۆی ئەو دەغڵ‌ودان و ئاژەڵداری و کارخانە و بەروبوومانەی خۆیانەوە کە پێشتر بەشێکی خۆراك و بژێوی ئێرانی دابین دەکرد، ئیتر گلیان دانەوە بۆ خۆیان و بەشێکیان لێ فرۆشتە سۆڤیەت و بڕێکی پێویستیەکانی وڵاتیان پێ پڕکردەوە. ئەم کارە زیانی بە ئابووریی ئێران گەیاند. لەباری هێزی مرۆڤیشەوە، حکوومەتی ئازەربایجان توانیی

لاوانی ولات ڕابکێشێ و ناونووسیان بکات بۆ ڕیزەکانی سوپا و دەستەکانی فیدایی و کەڵك لە وزەیان وەربگرێ. ئازەریەکان بە ئازاد کردنی ولاتەکەیان بەرەیەکی پاك و فراوانی جەنگیان خستە بەردەم ڕژێمی تاران کە نەیدەتوانی بەئاسانی پەلاماری بدات و بیگرێ، لە کاتێکدا بەرەی کوردستان بەرتەسك و بچووك بوو، هەمیشە لە مەترسیدا بوو لە چەند لایەکەوە هێرشی بکرێتە سەر. کوردیش دەیتوانی دەستپێشخەری بکات و وەك ئازەریەکان سەربازگەکانی ڕژێم پاك بکاتەوە، ئەوسا تاران، تەنانەت سۆڤیەت و ئەمریکا و بەریتانیایش، حیسابێکی تریان بۆ دەکرد. کورد بە حوکمی ئەوەی کە پێش ئازەریەکان بە چەند ساڵێك ناوچەی ئازاد کراو و حیزبی سیاسی و هێزی چەکداری خۆی هەبوو، دەیتوانی لانی کەم شارو ناوچەکانی دەوری مەهاباد، وەك سەقز و بانە و سەردەشت، ئازاد بکات. هەتا تاقیکردنەوە و هەوڵێکیش لەم بارەیەوە نەکرا، تا بۆیان دەربکەوێ چییان پێ‌دەکرێ (نووسەر لە لێکۆڵینەوەیەکدا بەناوی پەیوەندیەکانی ئازەربایجان و کوردستان لە سەردەمی کۆماردا، بە وردی ئەم مەسەلەیەی شی کردوەتەوە).

لەبەرئەوەیە ئەو دەورانە کێشەی کورد لە هەموو بارێکی سیاسی و سوپایی و ئابووری و کۆمەلایەتیەوە، لای کەم لەچاو ئازەربایجاندا، قورساییەکی نەبوو. بۆیە هەرەسهێنانی لەو ناوچە قەتیسکراوەدا پێشبینی دەکرا. خۆ ئەگەر بەرەنگاریشی هەبوایە و یارمەتی بگەیشتایە و ئازەربایجان بە زوویی تەسلیم نەبوایە، هێشتا مانەوەی کۆمار یا لانی کەم دەستکەوتەکانی زەحمەت بوو. مەگەر بڕیاری هەرسێ زلهێز شتێکی بکردایە، بەلام کۆنفرانسی مۆسکۆیش لە دیسەمبەری ١٩٤٥دا سۆڤیەت بوو بە مایەی سەرنەگرتن و هەلوەشانەوەی بڕیاری تایبەت بە ئێران کە ئینگلیز و ئەمریکا بە گەلاڵەنامەیەك پێشنیاریان کردبوو، ئەوسا مافی کولتووری و خوێندن بە زمانی زگماك و خۆبەڕێوەبردن بەپێی یاساکانی ئەنجومەنی ویلایەت و ئەیالەتیی ئێران دەدرایە گەلانی غەیرە فارس و دەوڵەتی ئێرانیش جێبەجێکردنی بڕیاری کۆبوونەوەکەی بەسەردا دەسەپێنرا.

کورد ئەو سەردەمە کاتێك دەیتوانی کێشەکەی خۆی لە مەیدانی سیاسیی ئێران و زلهێزاندا بهێڵێتەوە، کە پەرە بە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی خۆی بدات، واتە شار و

ناوچەکانی تر بە شەڕی پارتیزانی ئازاد بکات، ئەوسا زلهێزەکان ناچار دەبوون، ئەگەر پێشنیارەکانی کۆمسیۆنی هاوبەش سەبارەت بە ئێران لە کۆبوونەوەی دیسەمبەری ١٩٤٥ی مۆسکۆدا جێبەجێ نەکرایە، چارەسەری کێشەی ئازەربایجان و کوردستان بکەن و بڕیاری تایبەتی بۆ بدەن. ئەمە و ئەگەر ئازەربایجان و کوردستان بڕیاری خۆیان هەبوایە، دەیانتوانی بەو هێزە یەکجار زۆرەی خۆیان (کە بەڵگەنامە و سەرچاوەکان هی هەردوولایان بە ٣٠-٤٠ هەزار کەس مەزەندە کردووە) نەك تەنیا پارێزگاریی خۆیان بکەن، بەڵکوو بەرەی شەڕیش بگوێزنەوە بۆ دەرەوەی سنوورەکانی خۆیان. هیچ بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخواز لە مێژوودا نییە ئەوەندە هێزی هەبووبێ و بەرامبەر بە دوژمنەکەی وا بێدەسەڵات بووبێ و بێچەندو چۆن خۆبەدەستەوە بدات و دەسکەوتەکانی خۆی نەپارێزێ.

با وای دابنێین شەڕی بەرەییش نەکرایە، خۆ نیوە یان چارەکێکی ئەو هێزە مەزنە بە شەڕی پارتیزانی قەڵاچۆی دەخستە سوپای هێرشبەری ئێران. بیانووی نەبوونی چەکی قورس و بردنەوەیان لەلایەن سۆڤیەتەوە (گەرچی ئەوە هەر هەبوە کەڵکی لێوەربگیرێ، بە تایبەت ئەوانەی سوپا کە کەوتبوە دەستی ئازەرییەکان)، یا کەمبوونی تەقەمەنی، یان پشت هەڵکردنی سۆڤیەت و شتی تری لەم بابەتە، سەرجەم پینەو پەڕۆ و پاکانە کردنە بۆ ئەوانەی کە سەرکردایەتیی بزووتنەوەکەیان دەکرد لە ئازەربایجان و کوردستان و ئیرادەیان بەسترابووەوە.

### سیناریۆی ئازادکردنی شارەکانی ئازەربایجانی ئێران

فیداییەکانی ئازەربایجان، بەر لە هەڵبژاردنی مەجلیسی ئازەربایجان و ڕاگەیاندنی حکوومەتەکەیان، چەند شار و ناوچەیەکیان ئازاد کرد" لەوانە ١٩٤٥/١١/١٧ نامین، ١١/٢٣ زەنجان، ١١/٢٦ گەرمی، ١١/٢٧ ئاستارا و بیلاسواریان لە سوپا و ژاندرمە و پۆلیسی تاران پاك کردەوە. گەرچی تەورێز لە چنگی دیموکراتەکانی ئازەربایجاندا بوو، بەڵام سەربازخانە و هێزی تری نیزامیی وەك ژاندارمری و پۆلیس هێشتا دەستیان لێنەدرابوو. پارێزگاری تەورێز "بەیات" فەرمانی دان بە سوپا و پۆلیس و ژاندارمریی شار بەرگری نەکەن و پێشگیری لە

خوێنڕشتن بکەن و تەسلیمی دیموکراتەکان بن، لەبەرئەوەی ئەوانە بە هەڵبژاردن هاتوونەتە سەر تەختی دەسەڵات. بەیات تەنانەت ئامادەیی خۆی نیشان دا تا هاوکاریی دیموکراتەکان بکات. ناوبراو کە بە ڕەچەڵەك ئازەری بوو، هەمووی ١٥ ڕۆژ بوو لەلایەن تارانەوە بۆ ئەم پۆستە دانرابوو.

دیموکراتەکان شەوی ١٢-١٩٤٥/١٢/١٣ داوایان لە ژەنەڕاڵ "دەرەخشانی"*ی فەرماندەی پادگان (سەربازخانە)ی تەورێز کرد پادگانیان تەسلیم بکات. ئەویش داوای مۆڵەتی تا سەعات ٩ی ڕۆژی ٩ی ڕۆژی ١٣/١٣/ی کرد، تا هەڵویستی تاران لەم بارەیەوە بزانێ. بەڵام لەو سەعاتەدا وەڵامی نەبوو، پیشەوەری داوای کرد بێتە لای. بڕیار بوو دەرەخشانی سەعات ١٢ی نیوەڕۆ بچێتە لای، بەڵام داوای مۆڵەتی ١,٥ سەعاتی تری کرد، تا بڕیاری یەکجاری بدات. پیشەوەری ئەم دەرفەتەیشی دا، کەچی هەر نەهات. ئەمجا پیشەوەری ئامادە نەبوو بە داواکاریی ژەنەڕاڵ دەرەخشانی ڕازی بێ و تێگەیشت تاران دژی خۆبەدەستەوەدانە، گوایە هەواڵیان پێ دەگات تاران دەیەوێ هێزی یاریدەدەر لە ماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا بنێرێ بۆ سەربازخانەی تەورێز و شارەکە بۆردومان بکات؛ لەلایەکی تریشەوە، پەیوەندی بە دەسەڵاتدارانی سۆڤیەتەوە بکەن، گوشار بخەنە سەر دیموکراتەکان، تا واز لە پلانی خۆیان بهێنن. دەرەخشانی پەیوەندیی بە ژەنەڕاڵ "گلینسکی"ی فەرماندەی سوپای سۆڤیەتەوە لە ئێران کرد و ئاگاداری کردەوە ئەگەر هێرش بکەنە سەریان تەقەیان لێ دەکەن.

پیشەوەری داوای یارمەتیی عەسکەریی کرد لە سوپای سوور، بە ڕواڵەت وەڵامی نەدرایەوە. بەڵام ژەنڕاڵ ئاغا سەلیم ئاتاکشییێڤ کە لە جێگەی وەزیری (کا. گی.

---

* ژەنەڕاڵ (سەرتیپ) دەرەخشانی فەرماندەی لەشکری ٣ی ئازەربایجان ڕۆژی ١٩٤٥/١٢/٣ لە ئاگادارییەکی گشتیدا ڕایگەیاند: بە فەرمانی تاران، جگە لەوەی فەرماندەی لەشکری ٣یە، فەرماندەیی تەواوی هێزەکانی ژاندارمری و پۆلیس و پاراستنی هێمنی و ئاسایشی پارێزگاکانی ٣ و ٤ی پێسپێردراون. هێزێکی زۆریشی بۆ چاوترساندنی خەڵك بردە ناوەندی شاری تەورێز. ڕۆژی دوایی دەرەخشانی و سەرهەنگ وەهرامی سەرۆکی ئەرکانی لەشکری ئازەربایجان بە فەرمانی سەلەشکر ئەرفەع سەرۆکی ئەرکانی سوپای ئێران، دەستەی پرسەدارانی حەزرەتی حوسەینیان گوللەباران کرد، لەبەرئەوەی گوایە نیازیان بووە پەلاماری سەربازخانە بدەن. یەکێك کوژراو ١١یش بریندار کرا. دواتر بە تاوانی تەسلیمکردنی پادگانی تەورێز تاوانبار کرا و بوو بە زیندانی هەتاهەتایی.

بی)ی ئازەربایجانی سۆڤیەتیدا بوو لە تەوریز، فەرماندەی ئۆپەراسیۆنی تایبەت و هاوکاریکی نزیکی باقرۆڤ بوو، فەرمانی دا هێرش نەکرێتە سەر سەربازخانە، بەڵکوو گەمارۆ بدرێ و ئاوو خواردنی لێ ببڕدرێ، لە ئەنجامدا سەربازەکانی ناچار دەبن تەسلیم بن. هاوکات سەرکردایەتیی فیرقەی ئازەربایجان کەڵکی لەوە وەرگرت کە پیاو ماقووڵ و ناسراوانی تەوریز بنێردرێتە لای دەرەخشانی تا داوای لێ بکەن ئاشتیانە خۆبەدەستەوە بدەن و نیشانی بدەن سوورن لەسەر چەککردنیان و بوار نادەن ڕژێمی تاران بە پیلان سوپاکەی لە تەوریز بکێشێتەوە و دەستو بردیان لەو کارە کرد. دەرەخشانی نەیتوانی لەگەڵ تاراندا پێك بێ‌و بە "حەکیمی" [بە ڕەگەز ئازەری، هەورامی]ی سەرۆك وەزیرانی ئێرانی وتبوو: ئەگەر سەعات ۹ی ئێوارەی ۱۹٤٥/۱۲/۱۳ سەربازخانە تەسلیم نەبێ، دیموکراتەکان هێرش دەکەنە سەریان و سوپای سووریش یارمەتییان دەدەن. حەکیمی ناچار بوو فەرمانی بە ژەنڕاڵ "ڕیازی"ی وەزیری جەنگ و "ئەرفەع"ی سەرۆکی ئەرکانی سوپای ئێران بدات فەرمان و ڕێ‌وشوێن بۆ خۆبەدەستەوەدانی سەربازخانەی تەوریز دابنێن.

فەرمانی ناوبراو ئامادە کراو بە ئیمزای "حەکیمی"ی سەرۆك وەزیران نێردرا بۆ ژەنڕاڵ دەرەخشانی و سەربازخانەکە تەسلیم بوو. سەرانی ئازەربایجان داوایان لە دەرەخشان کرد فەرمانێکی ئەوتۆیش بداتە فەرماندەکانی ئەردەبیل و ڕەزائیە تا ئەوانیش تەسلیم بن. بەڵام دەرەخشانی وتبووی ئەوانە ڕاستەوخۆ بەستراونەتەوە بە تاران، ناتوانێ فەرمانێکی وایان بداتێ. دواتر دەرەخشانی داوای لە سەرانی ئازەربایجان کرد، ڕێی بدەن بچێتەوە بۆ تاران. داواکەی ئەو و سەرهەنگ وەهرام و ۷ ئەفسەری تر پەسەند کرا و بۆ تاران بەڕێ‌کرا. زۆری پێ‌نەچوو ئەمجارە فەرمانی چەککردنی سەربازخانەکانی ڕەزائیە و ئەردەبیل لەلایەن باقرۆڤەوە درایە سەرکردەکانی ئازەربایجانی ئێران.

بەدەست بەسەراگرتنی سەربازخانەی تەوریز و بەرزبوونەوە ورەی دیموکراتەکان و زیادبوونی لایەنگرانیان و پشتیوانییان لەلایەن کۆمەڵانی خەڵکەوە، لەباری چەك و تەقەمەنیشەوە بەهێز بوون. سەربازخانەکانی ورمێ و ئەردەبیل چەك کران، ئەمجارە

بە کۆکردنەوەی هێزی زیاتری فیدایی ئازەربایجان و یارمەتیی چەکداری کورد لە ورمێ و پشتگیریی هەمەلایەنەی سۆڤیەت، چەك کران. ورەی سوپای ئێران پاش چەککردنی سەربازخانەی تەورێز دابەزی. ژاندارمری و پێگەکانی پۆلیس لە شار و ناوچەکانی تری کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆیان لە خۆبەدەستەوەدانی ئەو دوو سەربازخانەیەدا هەبوو. بۆ نموونە، ژاندارمری و سەربازەکان لە (هەر) ژمارەیەکیان بەبێ تەقە تەسلیم بوون، تەنانەت داوایان کرد قبووڵ بکرێن هاوکاری و خزمەتی حکوومەتی ئازەربایجان بکەن، ژمارەیەکی تریشیان شوێنی خۆیان چۆڵ کرد. لە ئەردەبیل، تیپی لەشکری ئێران بە چەکەوە خۆیان تەسلیمی دیموکراتەکان کرد. لە میاندواو، کەرتەکانی سوپای ئێران تەسلیمی دیموکراتەکان بوون. لە خۆی، فیداییەکانی ئازەری ژاندارمرییان چەك کرد، لە (موشکین شەهر) هێزەکانی ئێران پاش بەرەنگارییەکی کەم تەسلیم بوون.

بە پێچەوانەی ئەو شارانەوە، چەککردنی سەربازخانە و ژاندارمریی ڕەزائیە (ورمێ) چەند ڕۆژێکی خایاند. "سەرهەنگ زەنگەنە"ی فەرماندەی سەربازگەی ورمێ و "مەرزەبان"ی سەرۆکی ئەرکانی سەربازگەکە و "نووربەخش"ی فەرماندەی ژاندارمری، سەرەڕای ئەوەی کە فەرمانیان لە تارانەوە پێ درابوو، ئامادەی بەرەنگاری و تەنانەت ڕاگەیاندنی حوکمی عورفی و ئابلووقەی شار و گرتن و کوشتنی دیموکراتەکان بوون، بەڵام ورەیان ڕووخا و سەرەنجام ئەوانیش تەسلیم بوون. سەرەتا کونسوڵی سۆڤیەتیان لە ورمێ ئاگادار کردەوە کە ئامادەن تەسلیم بن، بەڵام ١٩٤٥/١٢/١٥ هەڵوێستی بەرەنگارییان نواند و بە ناردنی هێز و تانك بۆ دەرەوەی شار تەقەیان لە فیداییەکان کرد و لەناو شاریش پێنج دیموکراتیان کوشت. بەڵام پارتیزانەکان بە هەمان نەخشە و پلانی گرتنی سەربازگەی تەورێز، گەمارۆی سەربازگەی ورمێیان داو پەیوەندیی سەربازگەیان بە تاران و شارەکانی ترەوە بڕی و پیاوماقووڵ و ناسراوی ورمێیان نارده لای فەرماندەی سەربازگە و ژاندارمری تا خۆبەدەستەوە بدەن. دواجار لە ١٩٤٥/١٢/١٩دا ئەوانیش تەسلیم بوون.

بەڵام کورد لە ئاستی ئەم هەموو ڕووداوانەدا تەماشاکەر بووەو دەستی لەسەر دەست داناوە. سەربازگەکانی سەردەشت و بانە و سەقز کە زۆر لە هی تەورێز و ئەردەبیل و ورمێ بچووکتر و لەباری عەسکەری و جوگرافییەوە بێهێزتر بوون،

وەکوو خۆیان مانەوە، لە کاتێکدا کورد هێزی پێویستی هەبوو پاکیان بکاتەوە، بە تایبەت پاش ئەوەی هەموو هێزەکانی ئێران لە شارەکانی دەوروبەریان بەدەستی ئازەریەکان تەسلیم بوو و سەربازگەکانیان بەبێ هێرش و تەقە پاك کرانەوە. هەر ئەو تەکتیکانە کە ئازەریەکان لە گرتنی سەربازگەکانی ورمێ و تەورێز و ئەردەبیلدا بەکاریان هێنا، ئامادە بوون تەسلیم بن. ئەگەر ئەو شوێنانە بگیرانایە، کورد لە هەموو بارێکەوە، بە تایبەت لەباری چەك و تەقەمەنی و باری سیاسیشەوە، بەهێز دەبوو.

کەچی کورد بەپێچەوانەوە ڕێی تفاق و خواردەمەنی و بگرە چەك و تەقەمەنیشی دا بگاتە سەربازگەکانی سەقز و سەردەشت و بانە و هێزی یارمەتیشیان بۆ بنێردرێ، ئەویش بە بەدرەقە (بەڕێکردن و گەیاندنی تفاق‌و خواردەمەنی) کردنیان لەلایەن هێزی پێشمەرگەی کوردەوە. باسی ئازادکردنی شارەکانی تری کوردستانی وەك سنە و مەریوان ناکەم کە هەر لە بەرنامەدا نەبوون. کورد کە خۆی نەیتوانی بەر لە ئازەریەکان خۆی و ماکۆ و ورمێ و میاندواو بگرێ، کەچی پاشتر یارمەتیی ئازەریەکانی دا بۆ ڕزگارکردنی ئەو شارانە بێ ڕێککەوتن لەگەڵیاندا تا لانی کەم دوای ڕزگارکردن بە هاوبەشی بەڕێوەببرێن. کە ئەمەیش نەکرا، بۆچی دوایی بەپێی پەیمانی مۆرکرا و لەگەڵ ئازەربایجاندا داوای لە حکوومەتی ئازەربایجان نەکرد یارمەتیی کورد بدات بۆ گرتنی بانە و سەقز و سەردەشت.. هتد، بە بیانووی ئەوەوە کە هەبوونی هێزی ئێران لە سەقز و بانە و سەردەشت هەڕەشەیە بۆ هەردوولاو کورد ناوچەیەکی بچووکی بەدەستەوەیە، هەڕەشەی بەردەوامی سوپای ئێرانی لەو شارانەوە لەسەرە.

پرسیارێکی تر ئەوەیە: ئەگەر لایەنی ئازەری بەڕاستی هاوپەیمان و باوەڕی بە کێشەی کورد و ئازادکردنی کوردستان و پەیمانی مۆرکراوی نێوان هەردوولا هەبوو، بۆچی هانی کوردیان نەدا بۆ ڕزگارکردنی ئەو شارانە و شارەکانی تر و یاریدەیان نەخستە بەردەست. ئەگەر ئەوان نەیاندەویست کورد لە چوارچێوەی ئازەربایجاندا بە مافی خۆی بگات، بۆچی هانی کورد یا یارمەتییان نەدا سنە و کرماشان تا هەمەدانیش ئازاد بکات. جگە لەوە، سۆڤیەتیش بۆچی هاندەری کورد نەبوە وەك ئازەربایجان، وڵاتی خۆی ڕزگار بکات. خۆ دواتر کە عومەر خان و بارزانی و ناودارانی تری کورد پێشنیاری ڕزگارکردنی شارەکانی تری کوردستانیان کرد، بۆچی سۆڤیەت و سەرکردایەتیی کورد بەم پیلانە ڕازی نەبوون ؟

ژەنەڕاڵ "ئیڤان ماسلانینکۆڤ"ی فەرماندەی بەشی سوپای هەرێمی باکۆ و یەکێك لە فەرماندەکانی سوپای سۆڤیەت لە ئێران، دەسکەوتی چەککردنی سەربازگە و ژاندارمریی ئێرانی لەلایەن دیموکراتەکانی ئازەربایجانەوە لە ڕاپۆرتی ڕۆژی ١٩٤٥/١٢/٢٧یدا بۆ باقرۆڤ و ژەنەڕاڵ ئیمیلیانۆڤ وا ورد کردوەتەوە: ((... لە ماوەیەکی کورتدا ٥٩٨٣ سەرباز و ئەفسەر چەك کراون، ٤ تۆپ و هەزار گوللە و ٢٠٥ ڕەشاش و ٢٥٧٧ تفەنگ و ٢٢ دەمانچە و ٦ تانك و ٢ تۆپ یا هاوەن و ٣٠٠ مین و ٤٧٠ هەزار فیشەك کەوتنە دەستی دیموکراتەکان)). پێموایە ئەمە هی سەربازگە و ژاندارمریی ورمێ یا تەورێزە. ئەگەنا ژمارەی گشتیی دەسکەوت بەپێی ژمارەی سەرباز و ژاندارم و پۆلیسی تەواوی شارەکانی ئازەربایجان، گەلێك و بگرە چەند قاتی ئەو ژمارەیەیە. ئەمە جگە لە ماشێن و خواردەمەنی و ... کە دەسکەوتیان بووە.

### پێکهێنانی
### فیرقە یا پارتی دیموکراتی ئازەربایجانی باشوور (ئێران)

ئەم حیزبە سەیید جەعفەری پیشەوەری و باقرۆڤی سەرۆکی ئازەربایجانی سۆڤیەت بەبێ ئاگاداری یا ڕەزامەندی و وەرگرتنی بۆچوونی حیزبی توودەی ئێران، ١٢ی شەهریوەری ١٣٢٤/ ئابی ١٩٤٥) لە باکۆ دایانمەزراند. دامەزراندنی ئەم حیزبە بە یارمەتی و پشتیوانی و ڕەزامەندیی هەمەلایەنەی مۆسکۆ (سۆڤیەت) بوو و هەر لە یەکێتی سۆڤیەتیش ئامادەکاری بۆ پێکهاتنی کرا.

پیشەوەری، پێش دامەزراندنی فیرقە، لە تاران ڕۆژنامەی "ئاژێر"ی دەردەکرد. ناوبراو لەگەڵ شەبوستەریدا، "ئەمیر خیزی"ی بەرپرسی ئەوکاتەی حیزبی توودەی ئێرانیان لە ئازەربایجان لابرد و "سادیق پادگان"یان خستە شوێنی (ئەمیر خیزی دژی پێکهێنانی فیرقەی ئازەربایجان بوو). بەم پێیە لەڕێی پادگانەوە توانییان تەواوی ڕێکخراوی هەرێمی ئازەربایجانی حیزبی توودە بکەنە دامەزراوی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان. پاشتر توودە ئەم کردەوەیەی بە کودەتای دژی خۆی لە قەڵەم دا. توودە سەرباری ئەوەی کە بە پێکهێنانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان ناڕازی بوو، بە گوشاری یەکێتی سۆڤیەت، لە بەیاننامەیەکدا دامەزرانی فیرقەی

دیموکراتی ئازەربایجانی ئێرانی پەسەند کرد. بەڵام ناکۆکی و بگرە دوژمانیەنیی نێوان ئەو دوو حیزبە لە مەیدانی سیاسیی ئێراندا هەر بەردەوام بوو. تەنانەت فەرمانبەر و دیپلۆماتەکانی سۆڤیەتیش لە ئێران کەوتنە داوی ئەم دووبەرەکیەوە، ژمارە یەکیان لایەنگری هەڵوێستی توودە و هەندێك تریان هی فیرقە بوون و زۆر جار راپۆرتیان دژی یەکتر ناردووە بۆ مۆسکۆ و باکۆ.

دوا بەدوای دامەزراندنی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان، لە ١٣٢٤/٧/٢٩دا کۆنگرەی گەلی ئازەربایجان ساز کرا و کۆنگرەی گەل یا مەجلیسی دامەزرێنان دەستەیەکی ٣٩ کەسیی بەناوی هەیئەتی میللییەوە هەڵبژارد بۆ هەڵبژاردنی مەجلیسی میللی و حکوومەتی ئازەربایجان. حاجی مستەفا داودی وەك نوێنەری کورد یا کوردستان ئەندامی ئەم هەیئەتە ٣٩ کەسیە بوو. جێی پرسیارە کە بۆچی حاجی داودی بەشدار یا ئەندامی ئەم هەیئەتە بووە ؟ ئەگەر کورد و کوردستان بە بەشێکی ئازەربایجانی ئێران دانرابوو، بۆچی لە ٣٩ کەسدا تەنیا یەك کەس دانراوە ؟ بۆچی بەپێی رێژەی دانیشتوانی کورد هەر کوردێك بەشدار بووە؟ دەکرا وەك نوێنەری میوانی کورد یا کوردستان بەشدار بێ و پەیامی پیرۆزبایی و پشتیوانی و هاوکاریی گەلی کوردی لەگەڵ گەلی ئازەربایجاندا پێ‌بێ. ئەم هەیئەتە تا پێکهێنانی مەجلیس و حکوومەتی ئازەربایجان هەموو بڕیارێکی لەدەستدا بووە، بڕیارەکانی خۆیی لە بەیاننامەیەکی چواردە خاڵیدا ڕاگەیاندووە کە وێنەی بۆ نوێنەرانی سیاسیی ئەمریکا و بەریتانیا و سۆڤیەت و فەرەنسە لە ئێران و بۆ شاو مەجلیسی ئێران و کاربەدەستانی تر نێردراوە و لە خاڵی ١٣هەمیدا هاتووە: کۆنگرەی میللی وتنەوەی زمانی ئازەربایجانی لە تەواوی قوتابخانەکانی ئازەربایجاندا دەکاتە ئیجباری [دەپرسیی: ئەگەر کورد یا کوردستان بەشێکی ئازەربایجان بووە و گوایە نوێنەری لە دەستەی کۆنگرەی میللیدا هەبوە، بۆچی ئاماژە بەوە نەکراوە کە زمانی کوردیش لە کوردستان و ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجاندا –وەك خۆیان وتوویانە – بوترێتەوە ؟ بەپێی ئەم خاڵە، دەبێ زمانی ئازەری لە کوردستانیش ئیجباری و ڕەسمی بێ. ئەم خاڵە کوردی خستوەتە ڕیزی هاووڵاتیانی ئەرمەنی و ئاسووری].

ڕۆژی ١٣٢٤/٩/١٠ هەڵبژاردنی مەجلیسی میللیی ئازەربایجان بەڕێوە چوو و ڕۆژی ١٣٢٤/٩/٢١ مەجلیسی میللیی ئازەربایجانی پێك هاتو پیشەوەری ئەندامانی حکوومەتی میللیی و ئازەربایجانی کە لە ١١ وەزیرێك پێك هاتبوو، ناساند و بەرنامەی حکوومەتەکەی لە ٢٠ خاڵدا ڕاگەیاند. لە خاڵی ١٩هەمدا هاتووە: مافی وەك یەکی یا یەکسانی بۆ هاووڵاتیانی دانیشتووی ئازەربایجانی وەکوو کورد و ئەرمەنی و ئاسووری مسۆگەر دەکرێ (بڕوانە: ڕۆژنامەی ئازەربایجان، ١٣٢٤/٩/٢٢). ئەم هەڵوێستەی سەرانی ئازەربایجان لە زۆر جێدا چەند جارێك دووپات کراوەتەوە. خاڵی ٨ و ٩ی سەردێڕی (بڕیارەکانی حکوومەتی ئازەربایجان) لە ژمارەی ڕۆژی ١٣٢٤/١٠/١٩ی ڕۆژنامەی "ئازەربایجان"، ئەمەی سەبارەت بە زمان و بە ئیمزای پیشەوەریی سەرۆك وەزیرانی ئازەربایجان تێدا هاتووە:

خاڵی ٨: گەلانی تر لە ئازەربایجان دەژین، مافی ئەوەیان هەیە کاروباری خۆیان بە زمانی زکماکی خۆیان بەڕێوە بەرن، بەڵام دەبێ ئەوانە نووسراو و ڕاگەیاندنی ڕەسمییان بە زمانی ئازەربایجان وەك زمانی ڕەسمیی دەوڵەتی و زمانی نەتەوەیی خۆیان بڵاو بکەنەوە.

خاڵی ٩: قوتابخانە تایبەتیەکان [نەك دەوڵەتی، هەورامی] بۆ گەلانی بچووك کە لە ئازەربایجان دەژین، دەرس‌وتنەوەیان تێدا بە زمانی ئازەری لەپاڵ زمانی زگماکیاندا ئیجبارییە.

ئەم بڕیارانە پاشتریش کە پەیماننامەیەك لە نێوان ئازەربایجان و کۆماری کوردستاندا مۆر کرا، حکوومەتی ئازەربایجان پابەندیان نەبوو و لە هەر ناوچە و شارێکی وەك ورمێ و خۆی و ماکۆ...دا کە کەوتنە ژێر دەستی ئازەرییەکان، کاریان پێنەکرا و هەر زمانی ئازەرییان تێدا وترایەوە و زمانی ڕەسمی بوو.

پرسیار ئەوەیە: بۆچی دوای ئەوەی کە مەجلیسی میللیی ئازەربایجانیش پێك هات، حاجی مستەفا داودی هەر بە نوێنەری کوردستان یا ئەندامی مەجلیسی ئازەربایجان لەقەڵەم درا، سەرکردایەتی حدکا یا پاشتر حکوومەتی میللی کوردستان هیچ ڕوونکردنەوە یا وەڵامدانەوەیەکیان لەم بارەیەوە نەبوو ؟ لەبەرئەوە بوو پاشتر چەند لایەنێك داوایان کرد نوێنەرانی کورد لە مەجلیسی ئازەربایجاندا

زیاد بکرێن و له ١ کەسەوە ببنە ٥ کەس. ئایا نەدەکرا کوردیش چەشنە مەجلیس یا پەرلەمانێکی وەك ئەوەی ئازەربایجان دابمەزرێنێ ؟

کاتی وتووێژ لەگەڵ دەستەی نوێنەرایەتیی دەوڵەتی ئێراندا کە مانگی ئۆردیبەهەشتی ١٣٢٥ بەڕێوە چوو و ١٥ ڕۆژ درێژەی کێشا (گەرچی پێك نەهاتن و بڕیار درا دەوڵەت کۆمسیۆنێك بە سەرۆکایەتیی موزەفەری فەیرووز ڕەوانەی تەورێز بکات بۆ تەواوکردنی وتووێژ و ڕێککەوتن)، ئازەریەکان جگە لە پارێزگاکانی ٣ و ٤، داوای زەنجان (خەمسە)شیان کرد. بۆچوونی حکوومەتی تارانیش سەبارەت بە سنوورەکانی ئازەربایجان ئەوە بوو، کە ویلایەتی خەمسە بەپێی دابەشکردنی ئیداریی ئێران بەشێکی ئازەربایجان نییە، چارەسەری ئەو کێشەیە دەدرێتە خولی پانزەهەمی مەجلیسی ئێران. هەردوو بۆ زمانی ئازەری هاودەنگ بوون، خاڵی سێهەمی بڕیاری ١٣٢٥/٢/٢ی حکوومەتی ئێران ئەمەیە: ((زمانی ڕەسمیی ئازەربایجان وەك ناوچەکانی تری ئێران فارسییە. کاروباری نووسینگەکان لە بەڕێوەبەرایەتیەکانی ناوچە و کاروباری دادگاکاندا بە فارسی و ئازەری (تورکی) جێبەجێ دەبن. بەڵام خوێندن تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی لە قوتابخانەکاندا بە زمانی ئازەری دەبێ)). هەردوولا ئەمەیان پەسەند بوو.

بەڵام وتووێژەکانی دەستەی ١٠ کەسیی دەوڵەتی ئێران بە سەرۆکایەتیی موزەفەری فەیرووز جێگری سیاسی سەرۆك وەزیرانی ئێران لەگەڵ دەستەی ئازەربایجاندا بە سەرۆکایەتیی پیشەوەری لە تەورێز کە هەردوولا ڕێك کەوتن و لە ١٣٢٥/٣/٢٣دا پەیماننامەیەکیان مۆرکرد، خاڵی ١٣هەم سەبارەت بە گۆڕینی خاڵی ٣هەم کە لە سەرەوە باس کرا، بەم چەشنەی خوارەوە دەستکاری و ڕوون کراوەتەوە:

خاڵی ١٢: خوێندن لە قوتابخانە ناوەندی و بەرزەکاندا [مەبەست خوێندنی بەرزە، هەورامی]، بەپێی بەرنامەی وەزارەتی پەروەردە، بە هەردوو زمانی فارسی و ئازەری دەبێ.

خاڵی ١٣: دەوڵەت ڕازییە کوردەکانی دانیشتووی ئازەربایجان لە خێروبێری ئەم ڕێککەوتنەدا هاوبەش بن و بەپێی خاڵی ٣هەمی بڕیاری ١٣٢٥/٢/٢ی دەوڵەتی ئێران، دەتوانن تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بە زمانی خۆیان بخوێنن.

تێبینی: کەمە نەتەوەکانی تری دانیشتووی ئازەربایجانیش، وەك ئاسووری و ئەرمەنی، مافی ئەوەیان هەیە تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بە زمانی خۆیان بخوێنن [بڕوانە ڕۆژنامەی "ایران ما"، ١٣٢٥/٣/٢٦]. واتە کورد و کەمەنەتەوەکانی تری ئازەربایجان تا پۆلی پێنجەم، بەڵام ئازەری تا قۆناغی ناوەندی و بەرزیش مافی خوێندن بە زمانی خۆیان پێدراوە.

لە وتووێژی دواتری نێوان تاران و تەورێزدا، هەردوولا پێك هاتن زەنجان لەلایەن هێزەکانی ئازەربایجانەوە چۆڵ بکرێ، بەرامبەر بەوە، ١٠ ڕۆژ دوای چۆڵکردنی زەنجان و تەسلیمکردنی بە دەوڵەتی تاران، ناوچەکانی تیکاب و سەردەشت بدرێنە ئازەربایجان. ئەمە خاڵێکی نهێنی [بە وتەی خۆیان پێکهاتنی زارەکی، هەورامی]ی ڕێککەوتنی تاران و تەورێز بوو، ئەگەرچی لە چاپەمەنیەکانیشدا ڕەنگی دابوەوە (بڕوانە ڕۆژنامەی "ایران ما"، ١٣٢٥/٦/١٩).

"سادچیکۆڤ"ی باڵوێزی سۆڤیەت وەك ناوبژیکەر و لەو وتووێژانەدا بەشدار بوو. ئەگەر ئەم پیلان (ڕێککەوتن)ـە بە ئامادەبوونی سەیفی قازیش ڕێك خرابێ و ڕانەگەیەندرابێ، خۆ پاشتر لە چاپەمەنیدا بڵاوکراوەیە، بۆچی کورد هیچ کاردانەوە و هەڵوێستێکی نەنواند ؟ ڕژێمی تاران کە مامەڵەکەی لەگەڵ ئازەریەکاندا کردووە زەنجانی بدەنەوە، تیکاب و سەردەشتیان بداتێ، یا بیگۆڕنەوە، دوو مەبەستی هەبوە و لە هەردووکیاندا سەرکەوتوو بووە: زەنجانی بەبێ شەڕ دەکەوێتە ژێر دەست، پێشبینیی شەڕ و بەگژداچوونەوەی کورد و ئازەریی کردووە لەسەر ئەو دوو شارە، تیکاب و سەردەشت، کە هەر بە قازانجی تاران دەکەوتەوە. بەڵام ئەگەر سەرانی ئازەربایجان لەگەڵ کورددا نیازپاك بوونایە، ئەوەیان نەدەکرد. بەبێ ئەوە، نەك هەر تیکاب و سەردەشت، بانە و مەهابادیش بەپێی دابەشکردنی ئیداریی ئێران و تەورێز سەر بە ئازەربایجان بوون، ئەم مامەڵەیەش پێویست نەبوو.

بەشداریی باڵوێزی سۆڤیەت لە ڕێککەوتنی تاران و تەورێزدا، جارێکی تر نیشانی دا کە کێشەی کورد هەر لە چوارچێوەی کێشەی ئازەربایجاندا بڕیاری لەسەر دەدرێ. کەچی کورد نەك هەر باسی کێشەی سەردەشت و سەربازگەکەیی نەکردووە و هەوڵی ئازادکردنیی نەداوە و پشت گوێی خستووە، بەڵکوو خەڵکی تر خۆی

کردووه به خاوەنی ! ڕژێمی تاران دەیویست له ڕێگەی حکوومەتی ئازەربایجانەوە، بەپێی ڕێککەوتنی نێوانیان، وای نیشان بدات که سوپای ئازەربایجان بەشێکی سوپای ئێرانه و دەبێ سوپای ئازەربایجان یارمەتیی سەربازگەکانی تیکاب و سەردەشت بدات و پشتیوانیان بێ. بەڵام ڕۆژانی هەرەسپێهێنانی نزیك بووەوه و سەرانی تەورێز فریای جێبەجێکردنی ئەو پیلانه نەکەوتن.

ڕژێم، دوای چۆڵکردنی زەنجان لەلایەن هێزی ئازەربایجانەوە، دەستی کرد به لێدان و گرتن و کوشتنی فیرقەییەکان و هێزێکی زۆری بۆ هێرش بردنه سەر تەورێز بردە ئەوێ. ئەوە پیلانی تارانی زیاتر ڕوون کردەوە. زەنجان به دەروازەی ئازەربایجان دادەنرا، دوای تەورێز دووهەمین شار و هەرێمی ئازەربایجان بوو دەیان ئازەری بۆ ئازادکردنی شەهید کران. به چۆڵکردنی زەنجان لەلایەن فیرقەوە، زەمینەی هێرشی سوپای ئێران بۆ سەرئازەربایجان سازتر بوو. گەورەترین هەڵەی کوشنده و مێژوویی سەرکردایەتیی ئازەربایجان، بەجێهێنانی داخوازیی تاران و چۆڵکردنی زەنجان بوو، له کاتێکدا ڕژێمی تاران هیچ داوایەکی ئازەریەکانی جێبەجێ نەکرد. کاربەدەستانی تاران بەم پێیه زیاتر کۆمەڵانی کوردیان له دۆستایەتی و پەیمانی دووقۆڵییان لەگەڵ ئازەربایجاندا خسته گومانەوە. تیکاب و سەردەشت ئەوسەردەمە له هیچ بارێکەوە، له چاو هەرێمی زەنجاندا، بایەخیان نەبوو. ئەی کەواته سەرانی تەورێز بۆچی ئەوەیان کرد ؟ بۆچی پەرلەمان (مەجلیس یا ئەنجوومەنی ئەیالەتی)ی ئازەربایجان له ١٣٢٥/٨/٢٠دا چۆڵکردنی زەنجانی پەسەند کرد و له ماوەی ١٠ ڕۆژیشدا به تەواوی بەجێی هێشت، واته چەند ڕۆژێك بەر له هێرشی بەربڵاوی سوپای تاران بۆ سەر ئازەربایجان و کوردستان بۆ کۆتایی‌هێنان به ژیانیان ؟!

## کۆبوونەوەی مۆسکۆی نێوان
## ئەمریکاو ئینگلیزو سۆڤیەت
## لە کانوونی یەکەمی ١٩٤٦داو
## تراژیدیای گەلانی ئێران

یەکێك لەو هەنگاوانەی کە ئینگلیزو ئەمریکا پاش دووهەم جەنگی جیهانی بۆ چارەسەری کێشەی گەلانی چەوساوەو بێمافی ئێران هەڵیان گرت، کۆبونەوەی سێ زلهێزی ئەمریکاو ئینگلیزو یەکێتیی سۆڤیەت بوو لە ١٦ تا ١٧ی مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥دا لە مۆسکۆ، کە ناوبانگی بە کۆبوونەوە یان کۆنفراسی مۆسکۆ دەرکرد. ئەو گەلاڵەیە سەرەتا وەزیری کاروباری بریتانیا پێشنیاری کرد، پاشان ئەمریکا پشتیوانیی لێ کرد، بەڵام بەداخەوە لەلایەن سەرانی یەکێتیی سۆڤیەتەوە کە میوانداریی کۆبوونەوەی کرد، ڕەت کرایەوە. پێم وایە ئەوە یەکێك بوو لە تاوانە گەورەکانی سۆڤیەت پاش شەڕی دووهەمی جەنگی جیهانی بەرامبەر بە گەلانی غەیرە فارسی ئێران، بەتایبەت گەلی کورد.

هەروەها ئەم هەڵوێستەی سۆڤیەت تێکدەری هاوکاریی هاوپەیمانەکان بوو پاش ئەو جەنگە. ئەو گەلاڵەیە لەو سەردەمەداو بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی ئاڵۆزی ئێران‌و پەیوەندیە گرژو نائاساییەکانی ئینگلیزو ئەمریکا لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا،

تاقە ڕێگەیەکی لەبارو هەمەلایەنەی چوارچێوەی یاسای بنەڕەتی (قانون اساسی) ئێرانیش بوو.

ئەو سەردەمە، واتە کانوونی یەکەمی ١٩٤٥، کە تەنیا چەند مانگێك بەسەر سەرکەوتنی هەرسێ هاوپەیمانو تێشکانی ئەڵمانیای نازیدا تێپەڕیبوو و هێشتا سێ زلهێز لە ئاستی جیهاندا هاوکارو هاوپەیمانی یەکتر بوونو زۆربەی کێشەکانی جیهانیان پێکەوە چارەسەر دەکرد، سەرەڕای بیرو بۆچوونی جیاوازیان لەمەڕ ئەو کێشانە، بەڵام لە دیاریکردنی ڕێگەچارەکاندا زۆربەی جار ڕێگەو بڕیارێکی لەباری پەسندی هەموولایەکیان هەڵدەبژاردو تەنازولیان بۆ یەکتر دەکرد. ئەو کێشانەی کە هاوپەیمانان سەردەمی شەڕو پاش شەڕ پێکەوە لە کۆنفراسو کۆبوونەوە سێ لایەنیەکاندا چارەسەریان بۆ دێتنەوە، لەبەر زۆرییانو بۆ ئەوەی لە باسەکەش دوور نەکەوینەوە، چاوپۆشی  لە باسکردن یان ناوهێنانیان دەکەین.

کۆبوونەوەی مۆسکۆ سەبارەت بە ئێرانو کێشەکانی تا دەرچوونی هێزەکانی هاوپەیمانانو چارەسەر یا ئەنجامدانی هەندێ ڕیفۆڕم لە ئێران، لە نووسراوو بەرهەمی مێژوونووسو ڕۆژهەلاتناسو تەنانەت کوردناسەکانیشدا ڕەنگی نەداوەتەوە، ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئاشکرانەکردنی بەڵگەو دیکۆمێنتەکانی ئەم کۆنفراسە کە تاوانی کاربەدەستانی سۆڤیەتیان پێوە بووە. لەلایەکی ترەوە، لەبەر ئەوەی بەدناویو ئابڕووچوونێکی وای بۆ سۆڤیەت بەدواوە بوو کە بە کەس پینە نەدەکرا، کەس نەیوێراوە شتێکی لەسەر بنووسێ، بگرە ئێستایش خۆ لە قەرەی نادەن.

کاتێك سۆڤیەت گەلاڵەکەی بریتانیای ڕەت کردەوە، بۆ خۆی ئەڵتەرناتیڤێکی تری بۆ چارەسەری کێشەکانی ناوخۆی ئێران نەبوو. هەرچەندە وەك لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە، سەرەتا نوێنەرانی سۆڤیەت پێشنیاری گۆڕینی هەندێ وشەو ڕستەیان کرد، بەڵام پاشان سەرلەبەری گەلاڵەکەیان ڕەت کردەوە.

گەلاڵە پێشنیارێکی ئەمریکا بۆ چارەسەری کێشەی ئێران خرایە ڕوو، تا ڕادەیەك ئەو بوختانو درۆیانەی کە لەم ڕووەوە خراونەتە پاڵ ئینگلیزو ئەمریکا پووچەڵ دەکاتەوە، بە پێچەوانەوە دەری دەخات سۆڤیەت لەم ڕووەوە زیاتر تاوانبارە. بەڵام هەرچۆنێك بێ ڕۆژئاواییەکانیش کە دەستپێشخەری ئەم گەلاڵەیە بوونو پاشان

دەستیان بەسەر ئێراندا گرتو ڕژێمی ئێران لە چوارچێوەی نەخشەو پیلانو سیاسەتی ئەواندا دەجوولایەوە، بێ تاوان نین؛ بەبێ سۆڤیەتیش دەیانتوانی داوای جێبەجێکردنی گەلاڵەکە لە ڕژێمی ئێران بکەن. ڕۆژئاوا زۆر کێشەی بێپرسکردن بە سۆڤیەت لە ڕێگەی بڕیار لەسەردانی خۆیان یا ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە چارەسەر کرد. کەچی گەلاڵەکەی خۆیان پشت گوێ خستو چیتر تاووتوێ نەکرا. بۆیە بە بڕوای من ئەم گەلاڵەیە لەلایەن ڕۆژئاواوە ئاشکرا نەکرا، چونکە سەرەنجام بەرپرسیی سەرنەگرتنی دەکەوتە ئەستۆی ئینگلیزو ئەمریکا.

پێش ئەوەی بابەتی کۆبوونەوەکە، بەتایبەت گەلاڵەی ناوبراو تاووتوێ بکەین، وەرگێڕاوی گەلاڵەکە دەخەینە ڕوو. پاشان جگە لە هەڵوێستی سێ زلهێزی ئینگلیزو ئەمریکاو سۆڤیەت، باسی بۆچوونی کاربەدەستانی ڕژێمی ئەوکاتەی ئێرانو حیزبی توودەو ناسیۆنالیستەکانی ئێرانیش دەکەینو دەری دەخەین چۆن ئەمانەی دوایی بۆ ئەوەی نەهێڵن کوردو بەلووچو ئازەریو عەرەب... بە مافە سەرەتاییەکانی وەك خوێندنو نووسین بە زمانی زگماك لە قوتابخانەکاندا بگەن، هەموو گرفتو کێشەکانی ناوخۆیان وەلا ناوە. ئیتر باسی مافی دیاریکردنی چارەنووسو تەنانەت ئۆتۆنۆمی تا ئەمڕۆش بەلای ئەوانەوە کوفرە. ڕاستییەکی تریش کە دەبێ ئاماژەی پێ بکرێ، ئەوەیە کە ئەودەم نە توودەو نە سۆڤیەت هیچ بەرنامەو گەلاڵەیەکیان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی گەلانی غەیرە فارسی ئێران نەبوو، تەنیا لە کێشەی ئازەربایجان دەدوان، ئەویش بۆ گوشار خستنە سەر دەوڵەتی ئێران بە مەبەستی بەدەستخستنی نەوتی باکووری ئێران.

گەلاڵەی پێشنیار کراو لە کۆبوونەوەی مۆسکۆدا هەموو گەلانی غەیرە فارسی ئێرانو هەموو ڕۆژهەلاتی کوردستان، نەك تەنیا ناوچەی موکریانی دەگرتەوە. ئەمە جگە لە هەندێ ڕیفۆرمیش بۆ سەرانسەری ئێران. هەرچەندە گەلاڵەکە وەك قۆناغێکی سەرەتایی بە مەبەستی ناچارکردنی ئێران بۆ ئەنجامدانی هەندێك ڕیفۆرم بوو، لە هەر ئاستێکدا بووبێ، لە نەبوون یان خۆبەدەستەوەدانی سەرانی کوردو ئازەری باشتر بوو.

هێنانە کایەی گەلاڵەیەکی ئاوا لەلایەن ڕۆژئاواییەکانەوە لە ئەنجامی کەشوهەوای دوای کۆتایی هاتنی دووهەمین جەنگی جیهانیدا، واتە دیموکراسیو

ئازادیی ڕادەربڕین و هەڵبژاردن و پێکهێنانی حکوومەتی هاوبەش و بەشداریی هێزە سیاسییە جۆربەجۆرەکان بوو کە لە زۆر وڵاتی جیهاندا هاتبوونە کایەوە،

ڕۆژئاوا دەیخواست چەشنە ڕیفۆرمێك هەر لەم چوارچێوەیەدا لە ئێرانیش ئەنجام بدرێ. بەڵام سۆڤیەت، بە ڕەتکردنەوەی ئەم گەڵاڵەیە کێشەی ئازەربایجان و کوردستانی بەلاوە نا. کۆبوونەوەی مۆسکۆو گەڵاڵەی پێشنیارکراو هەلێکی گەورە بوون بۆ سۆڤیەت، دەیتوانی کێشەی ئازەربایجان و کوردستان و کێشەی نەوتیشیان پێ چارەسەر بکات، بەتایبەت کە هێزەکانی هەرسێ وڵات هێشتا لە ئێران بوون. پەسندکردنی گەڵاڵەیەکی هاوبەش و پێکهێنانی کۆمسیۆنێکی تایبەت بۆ چارەسەری کێشەی ئێران لەلایەن سۆڤیەتەوە، ئەو کاردانەوەیەی بەدواوە بوو کە ڕۆژاوا گەڵاڵەی پێشنیارەکانی تری بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتی پەسند نەکرد. بە واتایەکی تر، ڕێك نەکەوتن لەسەر چارەسەرکردنی کێشەکانی ئێران و کێشەکانی تری جیهانی پاش شەڕ بوو. پێشنیارەکانی سۆڤیەتیش دەربارەی کێشەکانی ئەڵمانیا و کۆریای باکوور لەلایەن ڕۆژئاواوە ڕەت کرانەوە.

سۆڤیەت بە پەسندنەکردنی ئەو گەڵاڵەیە هیچ ڕێگەیەکی بۆ بەرژەوەندەکانی خۆی و دەوروبەری لە ئێراندا نەهێشتەوەو دەیزانی هیچ هیوایەك بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەوت و کێشەی ئازەربایجان لە ڕژێمی ئێران بە ڕەزامەندیی ئینگلیزو ئەمریکا ناکرێ، بەو کارە خۆی لە کێشەی ئێران دوور خستەوەو ئێرانیشی خستە باوەشی ڕۆژئاوە.

پاش شەڕ زۆر گەل سەربەخۆیی یان وەرگرت و زۆر دەوڵەت دروست بوون و زۆر دەوڵەتی وەك کۆریاو ئەڵمانیاش دابەش کران، کە بە بەراوردکردن لە دگەڵ ئێراندا فرە نەتەوە نەبوون، بەڵام کێشەی ئێران هەروا بە چارەسەرنەکراوی مایەوە.

گەڵاڵەی پێکهێنانی کومسیۆنی هاوبەش (ئەمریکا و ئینگلیزو سۆڤیەت) بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ئێران، ئەگەر بهاتایە پەسندو جێبەجێ کرابایە، سیستەمی بەڕێوەبەرایەتیی ئێران دەگۆڕا، گەلانی غەیرە فارسی ئێران نەك تەنیا پەرەیان بە کولتوورو زمانی خۆیان دەدا، بەڵکوو ڕێگەیشی بۆ ئۆتۆنۆمی و بەفیدراڵکردنی ئێران هەموار دەکرد. گەر هاتبایە خاڵەکانی ئەو گەڵاڵەیە جێبەجێ کرابان، هەر کامیان دەسکەوتێکی گەورە دەبوو بۆ هەموو گەلانی ئێران، ئەمەیش دەسەڵاتی دەوڵەتی

ناوەندیی ئێرانی نەك تەنیا لە باری كولتوورو زمانەوە، بەڵكوو لە باری بەڕێوەبردنەوە كەم و سنووردار دەكردەوە. جگە لەمە، دەبوایە یاساكانی ئێران بەپێی خاڵەكانی گەلاڵەكە ئاڵوگۆڕیان بەسەردا هاتبایە. لەلایەكی ترەوە، ئەندامانی ئەو كۆمسیۆنە دەسەلاتی پێشنیارو جێبەجێكردن و بەرپرسیارێتیی تریشیان پێ دابوو، بە جۆرێك كە زۆر كێشەی ئێران لە چوارچێوەی ئەو دەسەلاتەدا چارەسەر دەكران. خۆ ئەگەر (بە لەبەرچاوگرتنی هەموو جیاوازیەكان) لەگەڵ پەیمانی سیڤەردا لەبارتر بوو، چونكە هاوكاریی سۆڤیەت لەگەڵ ڕۆژئاوادا پاش شەڕ زۆرتر بوو، جگە لەمە قۆناغەكانی دوای دووهەم جەنگی جیهانی جیاوازییەكی زۆری لەگەڵ سالانی پاش یەكەمین جەنگی جیهانیدا هەبوو. لەلایەكی ترەوە، سۆڤیەت چۆن دوای یەكەمین جەنگی جیهانی و بۆ پشتگیریی توركیای كەمالی ڕۆڵێكی زۆری لە هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی سیڤەردا هەبوو كە لە لۆزان ئەنجام درا، هەمان ڕۆڵی لەسەرنەگرتنی پێكهێنانی كۆمسیۆنی هاوبەشدا بۆ كێشەی ئێران هەبوو.

لە كۆبوونەوەكانی وەزیرانی دەرەوەی ئەمریكاو ئینگلیزو سۆڤیەتدا پاش دووەم جەنگی جیهانی بڕیاری هاوبەش دەربارەی زۆر دەوڵەت درا. سیستەم و ڕژێمی هەندێك وڵاتیان نەك تەنیا گۆڕی، بەڵكوو ئەو وڵاتانەیان بۆ ماوەیەكی درێژ خستە بەر كۆنترۆڵ و چاودێری. بۆ نموونە، ئۆتریش (نەمسا) لە ١٩٤٥ تا ١٩٥٥، واتا بۆ ماوەی دە ساڵ، لەلایەن هێزەكانی چواردە دەوڵەتی ئەمریكا و ئینگلیزو سۆڤیەت و فەرەنساوە بەڕێوە دەچوو، ئەو وڵاتەیان كردە چوار بەشی ژێر دەسەلات و كۆنترۆڵی خۆیان و تەنیا لە ١٩٥٥دا ئەم وڵاتە بە بڕیارێكی نێونەتەوەیی سەربەخۆیی بۆ گەڕایەوەو بە كۆمارێكی فیدراڵ ناسرا.

ئایا نەدەكرا هێزەكانی ئەمریكاو ئینگلیزو سۆڤیەت بڕیارێكی ئاوایان سەبارەت بە ئێرانیش بدایە، بە جۆرێك هێزەكانی خۆیان لەوێ هێشتبایەتەوەو هەڵبژاردنی پارلەمان و پێكهێنانی حكوومەتێكی هاوبەش و ئیئتلافییان لەژێر چاودێری و كۆنترۆڵی خۆیاندا هێنابایە سەر كارو ئەگەر بڕیار بوایە ڕژێمی پاشایەتی لە ئێران بمێنێتەوە، دەسەلاتیان كەم كردبایەوە، بە جۆرێك پاشایەتیی بكردایە نەك حكوومەت.

دەکرا یاسای بنچینەیی ئێران وەك زۆربەی وڵاتان بگۆڕن، بە جۆرێك کە وەڵامدەرەوەی سەردەمی پاش شەڕو خواستی گەلانی ئێران و هێزە دیموکرات و پێشکەوتنخوازەکان بێ، گەلانی ئێران کە هەمیشە لە سەرەتاییترین مافی نەتەوەیی و کولتووریی خۆیان بێبەش بوون، سیستەمێکی فیدراڵ پڕبەپێستی ئەوێ و شایستەیان بوو. سێ زلهێز کە سەرەتا ئێرانیان داگیر کردو تاج و تەختیان لە ڕەزا شا ستاندەوەو شەرمەزارانە لە ئێران وەدەریان نا، کوڕەکەیان کردە پاشایەکی کارتۆنی. ئەو لە پراکتیکدا هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو، ئێران لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە بەڕێوە دەبرا. جا ئەگەر لەکاتی شەڕو لەو بارودۆخە ئاڵۆزەدا کە مەترسیی فاشیزم لەسەر هەموو جیهان هەبوو، ئەو بڕیارانەیان دا کە ئاماژەمان پێ کردن، ئەوا دوای شەڕ کە سەرکەوتوو بوون و چارەنووسی جیهانیان کەوتە دەست، ئەگەر شاو داروودەستەکەی لەبەر تاوانەکانیان سزا نەدرابان، ئەوە لانی کەم دەبوایە حەمە ڕەزا شایش وەك باوکی لە ئێران دەرکرابایە، نەك ٣٧ساڵی تر، واتە تا ساڵی ١٩٧٩ بەسەر گەلانی ئێراندا بسەپێندرایە.

ئایا نەدەکرا هێزەکانی ئەمریکاو ئینگلیزو سۆڤیەت بڕیارێکی ئاوایان سەبارەت بە ئێرانیش بدایە، بە جۆرێك کە هێزەکانی خۆیان بۆ ماوەیەك لەوێ هێشتبایەتەوەو هەڵبژاردنی پارلەمان و پێکهێنانی حکوومەتێکی هاوبەش و ئیئتیلافییان بە چاودێری و کۆنترۆڵی خۆیان بە ئەنجام بگەیاندایە. ئەگەر بڕیار بوایە ڕژێمی پاشایەتی لە ئێران بمێنێتەوە، دەبوو دەسەڵاتیان کەم کردبایەوە، کە شای ئێران پاشایەتیی بکردایە نەك حکوومەت.

دەکرا یاسای بنچینەیی ئێران وەك هی زۆربەی وڵاتان بگۆڕن، بە جۆرێك کە وەڵامدەرەوەی سەردەمی پاش شەڕو خواستی گەلانی ئێران و هێزە دیموکرات و پێشکەوتنخوازەکان بێ. گەلانی ئێران کە هەمیشە لە سەرەتاییترین مافی نەتەوەیی و کولتووریی خۆیان بێبەش بوون، سیستەمێکی فیدراڵی بۆ ئێرانی فرە نەتەوە پێویست بوو. مەرج نەبوو هێزی هاوپەیمانان لە ئێران بمێنێتەوە، دەکرا کۆمسیۆنێکی هاوبەش وەك ئەوەی کە لە کۆبوونەوەی مۆسکۆدا پێشنیار کرا، بۆ ئێرانیش دابنرێ و پرسی پێنەکرێ و جێبەجێکردنی بڕیارەکانیان بەسەریدا

بسەپێنرێ. هەرسێ زلهێز چۆن ئێرانیان داگیر کردو تاج و تەختیان لە ڕەزا شا سەندەوەو شەرمەزارانە لە ئێران وەدەریان ناو کوڕەکەییان کردە پاشایەکی کارتۆنی؛ هەتا شەڕ تەواو نەبوو، هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو، ئێران لە لایەن هاوپەیمانەکانەوە بەڕێوە دەبرا. واتە حەمە ڕەزا شا هەر جێبەجێکەری فەرمانەکانی ئەوان بوو. ئەگەر هاوپەیمانان لەکاتی شەڕو لەو بارودۆخە ئاڵۆزەدا کە هێشتا چارەنووسی شەڕ دیار نەبوو و مەترسیی فاشیزم لەسەر هەموو جیهان هەبوو، ئەو بڕیارانەیان دا کە ئاماژەمان پێکردن، ئەوە دوای شەڕ کە هاوپەیمانان سەرکەوتوو بوون و چارەنووسی جیهانیان کەوتە دەست، ئەگەر شاو داروودەستەکەی لەبەر تاوانەکانیان سزا نەدرابان، دەبوو لانی کەم وەك باوکی لە ئێران دەرکرابایە، نەك ٣٧ساڵی تر، واتە تا ساڵی ١٩٧٩، بەسەر گەلانی ئێراندا بسەپێندرایە. لەکاتێکدا سەرووبەند و دوای دووەم جەنگی جیهانی ڕژێمی پاشایەتی لە زۆر وڵاتی دنیادا لابرا، وەك ڕۆمانیا.

مەبەست لە تاووتوێکردنی کێشەی ئێران و گەلاڵەو پێشنیاری پێکهێنانی کۆمسیۆنی سێ لایەنە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ناوخۆی ئێران لەلایەن ئینگلیزو ئەمریکاوە، لە ڕووی دڵسۆزیو دڵپاکیی ئەوانەوە نەبوو، بەڵکوو نەیاندەویست سۆڤیەت ئێران بخاتە بەر کۆنترۆڵی خۆی، ترسیان لەوە لێ نیشتبوو کە جگە لە هێشتنەوەی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئێران، بزووتنەوەکانی ئازەربایجان و کوردستان و حیزبی توودەیش هەبوون. پاش دەرچوونی هێزەکانی ئەمریکاو ئینگلیز، ئەگەر سۆڤیەت نەشیتوانیایە ڕژێمێکی بن ڕکێفی خۆی بهێنێتە سەر کار، ئەوە بە ئاسانی دەیتوانی ڕژێمی ئێران ناچار بکات نەوتەکەی بداتێ و جێ بە ئەمریکاو ئینگلیز لەوێ لێژ بکات.

وەك لە کۆبوونەوەکەی مۆسکۆدا دەردەکەوێ، زۆر بڕیار لەسەر وڵاتانی جۆربەجۆر دران، بەڵام جێبەجێ نەکران. کۆریاو ئەڵمان بوون بە دوو بەشەوە. بولگاریاو ڕۆمانیاو هەنگاریاو پۆڵەندا لەلایەن سۆڤیەتەوە، کە هێزەکانی لەوێ بوون، دەستیان بەسەردا گیراو ڕژێمی سەر بە سۆڤیەتیان تێدا هێنرانە سەر کار، کە تا هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت هەر لەوێ مانەوە. لەلایەکی ترەوە، یۆنان و ئەندەنووسیاو میسرو فێنلەندو ئیتاڵیا کە هێزی ڕۆژئاواییەکانی لێ بوون، سەرەڕای هێشتنەوەی

ئەو هێزانە، ڕژێمی بن ڕکێفی خۆیان لەم وڵاتانەدا هێنایە سەر حوکم. سۆڤیەت داوای دەرچوونی هێزەکانی ڕۆژئاوای لەو وڵاتانە دەکرد. "مۆڵەتۆف" وەزیری کاروباری دەرەوەی سۆڤیەت، بەرامبەر بە پێداگرتنی ڕۆژئاوا لەسەر دەرچوونی سۆڤیەت لە ئێران، ئەویش داوای دەرچوونی هێزەکانی ئینگلیزو ئەمریکای لە یۆنانو ئەندەنووسیاو هەندێ جاریش داوای دەرچوونی هێزەکانی ئەمریکای لە چین دەکرد. بەم جۆرە کێشە بە تەنیا لەسەر دابەشکردنی هێزو بەرژەوەندیەکانی خۆیان دەبوو کەس باسی کێشە ناوخۆییەکانی ئەو وڵاتانەی نەدەکرد. لە یەکێك لە دانیشتنەکانی بوینو "مۆڵەتۆڤ"دا، مۆڵەتۆڤ گوتوویە ئینگلیزەکان لە یۆنان ئاغایەتی دەکەن. ئەویش وا وەڵامی داوەتەوە کە سۆڤیەتیەکانیش لە بولگاریا کوێخایەتی دەکەن. مۆڵەتۆڤو بێرس (وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەوکاتەی ئەمریکا) لە کێشەیەکی دووقۆڵیدا کە باسی ئێرانیان کردووە، مۆڵەتۆڤ گوتوویە ئێمە هێزەکانمان لە ئێران دەبەینە دەرێ، بەڵام ئێستا زستانەو زۆر زەحمەتە. بێرنس لە وەڵامدا گوتوویە ئێمەش دەتوانین بمێنینەوە، بیانووشمان بۆ ئەمە زۆرە. مۆڵەتۆڤ گوتوویە، ئاخر ئێمە دوو پەیمانمان ١٩٢١و١٩٢٤ لەگەڵ ئێراندا هەیە.

سۆڤیەت، بە بیانووی گەیاندنی چەكو تفاق لە ڕێگەی پۆڵۆنیاوە بە هێزەکانی لە ئەڵمانو لە ڕێگەی بولگارستانو ڕۆمانیاشەوە بە هێزەکانی لە ئۆتریش، پێی لەسەر هێشتنەوەی هێزەکانی خۆی لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات دادەگرت. ئینگلیزیش پاکانەی مانەوەی خۆی لە یۆنان، بەپێی پەیمانی دوو لایەنەی نێوان ئینگلیزو یۆنان، دەکرد. بەهانەی ئەمریکایش بۆ هێشتنەوەی هێزەکانی خۆی لە باکووری چین، یارمەتیدانی چین بۆ پاراستنی هێمنایەتیو دەرکردنی ژاپۆنیەکان لە باکووری ئەو وڵاتە بوو. واتا هەردوولا تا ئەو جێیەی پێیان کراو دەستیان دەڕۆیشت، دەستیان بەسەر وڵاتاندا گرت، سۆڤیەت ئەوروپای ڕۆژاواو ئەمریکاو ئینگلستان وڵاتانی تریان داگیر کرد. تەنانەت هەروەك وترا دەوڵەتانی کۆریاو ئەڵمانیاش بوون بە قوربانیی ئەو ململانێو دژایەتیەی نێوانیان. سەرەڕای ئەمە، هەردوولا لە چەند دانیشتنو کۆبوونەوەیەکدا لەسەر یەکبوونو سەروەریی ئەو وڵاتانە ڕێك کەوتبوونو لیژنەو کۆمسیۆنی هاوبەشیان بۆ یەکگرتنەوەی ئەو وڵاتانە هێنابووە کایەوە. ئەڵمان یەکی گرتەوە، بەڵام

کۆریا تائێستاش بەدەست ئەو دابەشکردنە دەستکردەوە دەناڵێنێ، کە ئەنجامی شەڕی ساردو ململانێی نێوان دوو بلۆك بوو. شایانی باسە، دوای شەڕ زۆر وڵاتی تری وەك چین و ژاپۆن و ئۆتریش لە دابەشبوون ڕزگاریان بوو.

کاتی تاووتوێکردنی ئەم بابەتە، واتە کێشەی ئێران لە کۆبوونەوەی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥ی مۆسکۆدا، گەلێك داواکاری و نامە لەلایەن وڵاتان و گەلانی جیهانەوە ئاڕاستەی کۆبوونەوەکە کراو لە چاپەمەنیەکاندا ئاماژەیان پێ درا. لە ئەرشیفەکانی سۆڤیەتدا چاوم بە چەند نامەو بیرخەرەوەی کوردەکان کەوتووە، هی پێش و هی کاتی کۆبوونەوەکە، داوای چارەسەرکردنی کێشەی کوردیان تێدا لەو سێ زلهێزەو بەتایبەت لەو کۆبوونەوەیە کردووە.

سەرانی سۆڤیەت، نەك هەر لە لە کۆبوونەوەکەدا، بەڵکوو لە چاپەمەنیەکانیشدا ئاماژەیان پێ نەکردووە. ئێمە نامەی کوردەکانی باشووری کوردستان و بەڵگەنامەو نووسراوەکان دەخەینە ڕوو، کە بەداخەوە هیچ نامە یا یاداشت و بیرخەرەوەیەکی سەرانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانیان تێدا نییە. ئەوکاتە پێویست بوو کوردو ئازەری کەڵك لە کۆبوونەوەی ناوبراو وەربگرن و داوای چارەسەرکردنی کێشەکەیان بکەن. بەڵام دیارە سۆڤیەت هەر لە بنەڕەتەوە دژی باسکردنی کێشە ناوخۆییەکانی ئێران بوو لەو کۆبوونەوەیەدا، گەرچی باشترین هەل بوو، نەیانوێراوە کارێکی وا ئەنجام بدەن، چونکە دیار بوو کێشەی ئێران لە کۆبوونەوەکەدا باس دەکرێ و لە چاپەمەنیەکانی ئێرانیشدا بڵاو کرابووەوە.

بەڵام بێدەنگیی سەرانی کوردو ئازەری لەوەوە هاتبوو کە خۆیان لە بەرەی سۆڤیەتدا دەدیتەوەو هەروەك ئەوان نەیاندەویست ڕۆژئاوا دەست لە کاروباری ئێران وەربدات. بەم واتایەی کە بایەخ بە هەڵوێستی ئەمریکاو ئینگلیز نادەن و سۆڤیەتیان کردووەتە سەرپشك و نوێنەرو چاوساغی خۆیان. ئینگلیزو ئەمریکا، بە گەڵاڵە پێشنیاری ناوبراوەوە، دەیانویست نیشانی بدەن دەست لە ئێران هەڵناگرن و هیچ ئاڵوگۆڕێك لەو وڵاتەدا بەبێ پەسندکردنی ئەوان سەر ناگرێ.

لەلایەکی ترەوە، ئەمریکاو ئینگلیز دەیانویست بە دیموکراسی و ئازادی پێشنیاری ئەنجامدانی ئاڵوگۆڕ لە ئێراندا بخەنە بەرچاو و بیسەلمێنن سۆڤیەت

خوازیاری ڕیفۆرم نییه له ئێرانداو ئەوان وەك سۆڤیەت تەنیا داوای ڕیفۆرم بۆ ئازەربایجان ناکەن، بەڵکوو بۆ کوردو تورکمانو بەلووچو عەرەبیشی داوا دەکەن.

نوێنەری سۆڤیەت لە کۆنفراسی مۆسکۆدا سەرەتا دەیخواست هەر لە بناغەدا باسی کێشەی ئێران نەکرێ، بەڵام کاتێك لەلایەن نوێنەرانی ئینگلیزو ئەمریکاوە ناچار کرا هەڵوێستی خۆی لەمەڕ گەڵاڵەی ناوبراو ئاشکرا بکات، داوای گۆڕینی هەندێ وشەو ڕستەی گەڵاڵە پێشنیارەکەی کرد. نوێنەرانی ڕۆژئاوایش بۆ بڕینی بیانووی سۆڤیەت، پێشنیارەکانی سۆڤیەتیان لەم ڕووەوە پەسند کرد. بەڵام پاشان سۆڤیەت بڕو بیانووی تری دۆزییەوە، وەك ئەوەی گوایە ئێرانیەکان لێرە نینو بێ ئەوانیش ناکرێ هیچ بڕیارێك بدرێو دەبێ نوێنەرانی ئێرانیش لەو کۆمسیۆنەدا بەشدار بن، یان بیانووی ئەوەی گوایە بڕیار نەبوە باسی کێشەی ئێران بکرێو ئەو کێشەیە لە دەستووری کاری کۆبوونەوەکەدا نەبوە. سەرئەنجامیش گوتیان ئەگەر بڕیارە کێشەی ئێران باس بکرێ، دەبێ باسی کێشەکانی ئەندەنووسیاو یۆنان... هتد بخرێنە ڕوو. بەم چەشنە دەردەکەوێ سۆڤیەت هەر لە بنەڕەتەوە نەیویستووە باسی کێشەی ئێران بکرێ؛ کێشەی ئێرانیش هەر کێشەی دەرچوونی هێزە هاوپەیمانەکان نەبوە لەو وڵاتە، بەڵکوو کێشەی گەلانی غەیرە فارسو ئەنجامدانی هەندێك ڕیفۆرمو گۆڕانکاریی گرنگ بووە کە قازانجەکەیان بۆ سەرجەم هێزە دیموکراتو پێشکەوتنخوازەکان دەبوو. ئەگەر ئەو گەڵاڵە پێشنیارە پەسند کرابایە، ئێران دەکەوتە بەر جۆرە کۆنترۆڵێکی نێونەتەوەییو ناچار دەبوو ملی بۆ کەچ بکات. ئیتر هیچ زلهێزێکیش نەدەما ئێران بۆ کۆسپ خستنە سەر ڕێی ئەو کۆمسیۆنە هاوبەشە پاڵی پێوە بدات.

جێبەجێکردنی بەرنامەی کۆمسیۆنی هاوبەش لە ئێران، نەك تەنیا گۆڕانکارییەکی هەمەلایەنەی لە ژیانی کوردو ئازەریدا بەدی دەهێنا، بەڵکوو بە سوودی گشت گەلانی غەیرە فارسی ئێرانو هێزە سیاسیەکانی ئەم وڵاتە بوو. کەچی سۆڤیەت تەنیا باسی کێشەی ئازەربایجانو نەوتی دەکرد. پاشان لەبەر وەرگرتنی نەوتەکە، کێشەی ئازەربایجانیش لە چوارچێوەی وتووێژەکانی سۆڤیەت- ئێرانو سیاسەتی ئەم وڵاتەیشدا هەڵگیرا. ئیتر نە سۆڤیەتو نە حیزبی توودەش هیچ گەڵاڵەو

هەڵوێستێکیان بۆ گەلانی ژێردەستەی ئێرانی وەك بەلووچ و تورکمەن و عەرەب و ئازەری و کورد نەبوو. هیچیشیان بۆ ئازادیە دیموکراتیەکان و جێبەجێکردن یا گۆڕینی یاسای بنچینەیی نەبوو.

هەوڵدانی سۆڤیەت و توودە لەو سەردەمەدا زۆرتر بۆ وەرگرتنی نەوتی ئێران و دەرکردنی ئیمپریالیست و شەڕو ئاژاوەنانەوە بوو دژی لایەنگرانیان لەو وڵاتە. لەپاڵ ئەوەدا، گەلاڵەی ئەو کۆمسیۆنە لەوە زۆرتری تێدا بوو کە سۆڤیەت بۆ ئازەربایجانی دەخواست. نوێنەرانی سۆڤیەت لە ئێران کە ناوبژیکەری نێوان تاران و تەوریز بوون، هەر کێشەی ئازەربایجانیان بەلاوە گرنگ بوو. بەهانەی سۆڤیەت لە زاری مۆڵەتۆڤەوە، کە گوایە پێویست بە ئامادەبوونی نوێنەری ئێران دەکات بۆ تاوتوێکردنی کێشەی ئەو وڵاتە، پوچ و بێبنەما بوو، چونکە ئەو کۆنفراسانە کە لەسەردەم و پاش جەنگی جیهانیدا لەلایەن سێ زلهێزەوە بۆ چارەسەری کێشەی گەلێك وڵات سازدران، مێژوو شایەتە نوێنەری زۆربەی وڵاتانی خاوەن کێشە بەشدار نەبوون و زلهێزان خۆیان چۆنیان بە باش زانیوە ئاوا بڕیاریان لەسەر داون. هەر لە کۆبوونەی مۆسکۆدا، نوێنەری هیچ دەوڵەت یان نەتەوەیەك (جگە لە ئەمریکاو ئینگلیزو سۆڤیەت) بەشدار نەبوو. مۆڵەتۆڤ کە هێندە دڵسۆزیی خۆی بۆ ئێران دەردەبڕی، دەیویست چی دەست بخات؟ لەڕاستیدا تاکە مەبەستی ئەو دەوڵەتەی وا ئەو نوێنەرایەتیی دەکرد، ئەمە بوو زەمینەی هیچ بەرژەوەندێك بۆ ڕۆژئاواییەکان نەهێڵێتەوەو هێزەکانیان لە ئێران بچنە دەرێ و بە تەنیا خواست و بەرژەوەندی خۆی چارەسەر بکات (سۆڤیەت کێشەکەی هەر لەسەر نەوت بوو، باسی چارەنووسی گەلانی غەیرە فارسی ئێران تەنیا ئامرازێکی گوشار خستنە سەر ئێران بوو). ئەمە واتای ڕێزنەگرتن لە بیروڕای ئینگلیزو ئەمریکاو هاوپەیمانی، هەروا تێکدانی زەمینەی هاوکاریی سێ زلهێز بوو لەسەر ئاستی جیهان -بەتایبەت- بۆ چارەسەری کێشەکانی دوای دووەم جەنگی جیهانی. سۆڤیەت لە ڕێگەی هەم کێشەی ئازەربایجان (کە کێشەی کوردستانیشی تێخزاندبوو)، هەم هێشتنەوەی هێزەکانی لە ئێران و هاندانی حیزبی تودەوە دژی ئینگلیزو ئەمریکا، دەیویست چۆك بە ڕۆژئاواو ئێرانیش دابدات. بەڵام ئاکامی هەموو پلانەکانی بە پێچەوانەی خواست و ئارەزوەکانی خۆی کەوتەوە. مولەتۆڤ کە

پێنـشیاری بەشـداریی نوێنـەرانی ئێرانـی لـە کۆمـسیۆنەکەدا کردبـوو، نوێنـەرانی ئینگلیزو ئەمریکا دژی ڕانەوەستان.

کۆنفراسـی مۆسـکۆ کـە کـانوونی یەکـەم (دیـسەمبەر)ی ١٩٤٥ لەکاتێکـدا بەسـترا کـە هێشتا کێشەی مانەوەی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئێران ئاڵۆز نەبووبوو؛ کۆماری کوردستان ڕانەگەیـەنرابوو، کێشەی ئازەربایجان تازە هاتبوە ئاراوە و کێشەی نـەوتی نێوان ئێران و سۆڤیەتیش نادیارو چارەسەرنەکراو بوو. ئەوسا پەیوەندیی نێوان سۆڤیەت و ئەمریکا و ئینگلیز ئاسایی بوو. ئێرانیش هێشتا دژی کۆمسیۆنێکی وا هەڵوێستی وەرنـەگرتبوو. چـونکە لەلایەکـەوە نەیـدەوێرا دژی بڕیارێـك ڕاوەسـتێ کـە لەلایـەن سـێ زلهێـزی سـەرکەوتووی شـەڕەوە دەرچـووبێ، لەلایـەکی تریـشەوە نوێنـەری ئینگلیـز پـێش دەستپێکردنی کۆنفرانسەکە بەڵێنی پەسندکردنی ئەو گەڵاڵەیەی لە "حەکیمی"ی سەرۆك وەزیـران وەرگرتبـوو. حکوومـەتی ئێـرانیش کـە ترسـی لـە پارچەپارچـەبوونی وڵاتەکـەی هەبوو، ئامادەی پەسندکردنی بڕیاری سێ زلهێزەکە بوو.

پێشنیارکردنی ئەم گەڵاڵەیە لەلایەن نوێنەری ئینگلیزەوە بە پشتیوانیی ئـەمریکا، واتـای دانـان بـوو بـەو کێشە ناوخۆییانـەی ئێرانـدا کـە هەلومـەرجی دوای شـەڕ لـە چوارچـێوەی چەسـپاندنی دیموکراسـی و نەهێـشتنی دیکتاتۆریـدا پێویـستیی بـە چارەسەرکردنیان دەکرد. لای هـەموان ئاشکرا بـوو کـە ئێـران ڕژێمێکـی دیکتاتۆرییەو گـەلانی غـەیرە فارسـی ئێـران لـە سادەترین مـافی خۆیـان بێبـەش بـوون. بۆیـە کـوردو ئـازەری ڕاپـەڕیبوون و ناوچـەیەکی فراوانیـان ئـازاد کردبـوو و داوای مافـە ڕەواکـانی خۆیان دەکرد. ئەو مەترسییەش لەئارادا بوو کە ئاگری سەرهەڵدان شوێنەکانی تـری ئێرانی وەك بەلووجستان، تورکمەن‌سەحرا، خووزستان و شیراو و... بگرێتەوە. بۆیـە ئامـانجێکی گەڵاڵەکـە چارەسـەرکردنی ئـەو کێـشانەو ڕێگـەگرتن لـە هەڵگیرسـانی شـەڕێکی خوێنـاویی درێژخایـەن بـوو، کـە ڕەنگبـوو پاشـان ببێتـە مایـەی ڕووبەڕووبوونەوەی زلهێزەکان لەسەر ئێران.

ئەگـەر بـەوردی سـەرنجی گەڵاڵەکـە بـدەین، دەبیـنین باسـی جێبـەجێکردنی یاسـای بنـچینەیی بـۆ پێکهێنـانی شـووراکان و بـەڕێوەبردنی کاروبـاری ناوچـەکان بەدەسـت دانیشتوانی خۆیانەوە، هەروا بەکارهێنانی زمانی زگماك بۆ گەلانی غەیرە فارسی ئێران و

خوێندن و فێربوونی زمانی خۆیان و... دەکات. ئیتر باسی نە فیدرالیزم و ئۆتۆنۆمی بۆ ئەو گەلانەو نە پارچەپارچەبوون یا دابەشکردنی ئێران کرا. مۆڵەتۆڤ لە چ ڕوانگەیەکەوە باسی دەستێوەردانی کاروباری ناوخۆی ئێرانی کردووە؟ ئایا ئەوان زۆرتر دەستیان لە کاروباری کوردستان و ئازەربایجان وەردابوو، یا ئینگلیز و ئەمریکا؟

ئەگەر سەرنجی گەڵاڵەکە بدەین، دەبینین دەبێ کاروباری کۆمسیۆنەکە بە پرس و ڕاوێژو شێوەیەکی ئاشتیانەو یاساییانە لەنێوان سێ زلهێزو دەوڵەتی ناوەندیی ئێراندا بەڕێوە بچێ. لێرەدا سەپاندنی دەسەلات یا سیاسەت، پاراستنی بەرژەوەندی ئەم یان ئەو زلهێزە نەبوو. هەروا باسی نەوت و پێگەی لەشکریش نەکراوەو هیچ شتێکیشی دژی سۆڤیەت تێدا نەبوو.

بەلام کە سۆڤیەت ویستوویە هەر خۆی لە ئێراندا خاوەن بڕیارو بەرژەوەند بێ، هیچ گومانێکی تێدا نییە. ئاشکرایە پەسندکردنی ئەم گەڵاڵەیەو پێکهێنانی کۆمسیۆنی هاوبەش، جگە لەوەی کە زۆر کێشەی ناوخۆی ئێران، بەتایبەت کێشەی کولتووریی نەتەوە بندەستەکانی ئێرانی پێ چارەسەر دەکرا، کێشەی نەوتیش بۆ سۆڤیەت چارە دەکراو گەلانی ئێران تووشی ئەو تراژیدیا گەورەیە نەدەبوون کە تائێستایش بەدەستیەوە دەناڵێنن. سۆڤیەت، نەک تەنیا تووشی تێشکان و بەدناوی نەدەبوو لە ئێران و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، بەڵکوو بە پێچەوانەوە ڕۆڵ و دیمەنێکی تری لە ناوچەکەو جیهانیشدا بەدەست دەهێنا. بالادەستی و ڕۆڵی سۆڤیەت لە ئێران، بەپێی هەموو بەڵگەو دیکۆمێنت و تەنانەت دان پێدانانی دیپلۆماتەکانی ئینگلیزو ئەمریکاش، لەوانی تر زۆرترو کاریگەرتر بوون. سۆڤیەت ولاتێکی هاوسێی ئێران بوو، سنوورێکی دوورودرێژی لەگەڵیدا هەبوە، دەیویست بەرژەوەندە کۆنەکانی بپارێزێ. ڕۆژئاواو ئێرانیش بە باشی ئەم ڕاستیەیان دەزانی، هیچ لایەک نکوولیی لەوە نەدەکرد کە پێویستە ڕۆڵ و بەرژەوەندی سۆڤیەت لە ئێراندا بپارێزرێن. ئاشکرابوو کە سۆڤیەتیش ڕێبەپێ بواری ئەوەی دەدا ڕۆژئاواییەکان پێگەیەکی لەشکرییان لەنزیك سنوورەکانیەوە هەبێ و سامانی ناوچەکە، بەتایبەتی نەوتیشیان لەدەستدا بێ. جگە لەوە، پەیمانی ئێران- سۆڤیەتی ١٩٢١ دەستی سۆڤیەتی ئاواڵە هێشتبوەوە بۆ داگیرکردنی ئێران (ئەگەر بیویستایە یا هەستی بە مەترسی بکردایە).

کەواتە چ ئێران و چ ڕۆژئاواییەکان خۆیان لە قەرەی ئەم مەترسییە گەورەیە نەدەدا. باڵادەستییەکی تری سۆڤیەت لەچاو ڕۆژئاواییەکاندا، ئەوە بوو کە بەهۆی نزیکیی سۆڤیەت لە ئێرانەوە بە ئاسانی و ماوەیەکی کورتدا دەیتوانی هێزی خۆی بنرێتە ئێران، یا یارمەتی بە بەرهەڵستکارانی ئێرانی بگەیەنێ.

سۆڤیەت سەردەمی شەڕو پاش دووەم جەنگی جیهانی (جگە لە توودە) بزووتنەوەی ئازەربایجان و کوردستانی جڵەو کردبوو، وەك دوو کارت و دوو فاکتەری گرنگ بەرامبەر بە ڕۆژئاواو ئێران بەکاری دەهێنان. سەرەڕای ئەمە، پێکهێنانی ئەم دوو بەڕێوەبەرێتیەی ئازەربایجان و کوردستان کە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت و بە پشتیوانیی ئەوان پێك هاتبوو، ڕۆڵ و لایەنگریی سۆڤیەتی لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا زۆرتر کردبوون، بەتایبەت گەلانی چەوساوەو بندەستی تری ئێران بە هیوای ئەوە بوون ئەوەی ئازەری و کوردەکان پێی گەیشتوون، سەرەنجام ئەوانیش بگرێتەوە.

هێزە چەپ و دیموکرات و ئازادیخوازەکانی ئێران، هەروا ڕووناکبیران و نووسەران و دەیان گۆڤارو ڕۆژنامەی ئەو سەردەمە کە بە ئاشکرا لایەنگرییان لە سۆڤیەت دەکرد، ڕۆڵێکی بەرچاویان لە پتەوکردنی پێگەی سۆڤیەت لە ئێراندا بینیبوو. ئەمانە هەموو لای دەوڵەتانی ئینگلیزو ئەمریکاو ئێران لە بەرچاو گیرابوون، بۆیە لەو باوەڕەدا بوون بەبێ سۆڤیەت کێشەی ئێران چارەسەر ناکرێ. هەتا هەوڵێکی یەکجار زۆریان دا سۆڤیەت بەشداری ئەو کۆمسیۆنە بێ، چونکە پێیان وابوو پێکهێنانی کۆمسیۆنێکی وایە هەر بڕیارێکی تری سەبارەت بە ئێران، بەبێ سۆڤیەت، مەترسیی زۆری لێ دەکەوێتەوە. ئیتر کاتێك سۆڤیەت گەڵاڵە پێشنیارەکەی ڕەت کردەوە، ڕۆژئاواییەکانیش بۆ ڕێگەگرتن لە پەرەسەندنی باڵادەستیی سۆڤیەت و بەربەرەکانیکردنی، ناچار چاوپۆشییان لە گەڵاڵەکە کردو پشتی دەوڵەتی ئێرانیان گرت و بە چەك و دراو و ڕێگەی دیپلۆماسی و سیاسی بەرامبەر بە سۆڤیەتی ملهوڕ ڕایان وەستان.

سۆڤیەت کە دەستی لە کاروباری ئێراندا بوو و کێشەی ئازەربایجان و کوردستانی هێنابووە ئاراوە، دەبوایە ئەو دەستپێشخەریی پێکهێنانی کۆمسیۆنێکی ئاوا بوایە.

بۆیە لەڕووەوە ڕەخنەی زۆرتر ئاڕاستەی سۆڤیەت دەکرێ. لەلایەکی ترەوە، ئەگەر کێشەی کوردستان و ئازەربایجان تاڕادەیەك چارەسەر کرابایە، ئەمانە خۆیان بە قەرزار دەزانی و وەفادار بە سۆڤیەت دەمانەوە. سەرەڕای ئەمانە، سۆڤیەت باش دەیزانی ئەو ڕیفۆرم و گۆڕانکاریانەی کە دەبوایە کۆمسیۆنی هاوبەشن بیانکات، ڕژێمی ئێران ئامادە نەدەبوو هیچ کامیان بە تەنیا جێبەجێ بکات؛ واتا دەبوو جیاوازییەکی تەواوی لەنێوان دەوڵەتی ئێران و ئەوکۆمسیۆنەدا دانابایە، دەیتوانی هەر لە ڕێگەی نوێنەری خۆیەوە سیاسەت و داخوازیەکانی بباتە پێش و کارو کردەوەی ئەو کۆمسیۆنە لەگەڵ سیاسەت و نیازی ئینگلیزو ئەمریکادا بۆ پێکهێنانی کۆمسیۆنەکە تاقی بکاتەوە. ئەگەر سەری نەگرتبایە، ئەودەمە بۆی هەبوو نوێنەری خۆی لەو کۆمسیۆنە بکێشێتەوەو لەگەڵ ڕژێمی تاراندا بکەوێتە وتووێژ . زۆر جێی سەرنجە، سۆڤیەت نە لەو کۆنفراسەدا و نە پاشانیش هیچ گەڵاڵەیەکی تری پێشکەش نەکرد، واتە ئەڵتەرناتیڤێکی تری نەبوو، هیچ هۆ و بەڵگەیەکی لۆژیکی و یاسایی بەرپەرچدانەوەو پەسندنەکردنی ئەو گەڵاڵەیەی بەدەستەوە نەبوو. گەڵاڵەی کومسیۆنی هاوبەش، هەروەك گوترا، پەیوەندیی بە نەوت و دەرچوونی هێزی هاوپەیمانانەوە، یا هەڵوێستێکی تری دژی سۆڤیەتی تێدا نەبوو، کاروبارو ئەرکی کومسیۆنەکە تەنیا چارەسەری کێشەکانی ناوخۆی ئێران بوو، وا کە پاش دەرچوونی هێزی هاوپەیمانان هەندێك ڕیفۆرم ئەنجام بدرێ. دیارە پێشنیارکردنی گەڵاڵەکە لەلایەن ئینگلیزو ئەمریکاوە بۆ چەند مەبەستێك بوو:

١- ڕۆڵ و بەرژەوەندی خۆیان کە لەلایەن سۆڤیەتەوە هەڕەشەیان لێ دەکرا، بپارێزن.

٢- نەهێڵن سۆڤیەت دەست بەسەر ئێران و لەوێشەوە وڵاتانی دەوروپشت، بەتایبەت ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بیرە نەوتەکاندا، بگرێ و پێش بە بەرفراوان بوون و پەرەسەندنی کۆمۆنیزم لەو وڵاتانەدا بگرن.

٣- ئینگلیزو ئەمریکا ئەو سەردەمە نەیاندەتوانی کۆنترۆڵی ئێران بکەن، دەیانزانی سۆڤیەت بەتەمایە وەك ئەورووپای ڕۆژهەڵات هێزەکانی خۆی لە ئێران بێهێڵێتەوە. سۆڤیەت سەرەڕای هێزەکانی خۆی لە کوردستان و ئازەربایجان، حیزبی توودەشی

لەپشتەوەیەو بەربەرەکانیکردنیان نە لە توانای ئێران و ئەواندا بوو، نە سوپای ئێرانیشیان بە ڕێکوپێکی چەکدار کردبوو.

٤- پێشنیاری کۆمسیۆنی هاوبەش ناوەڕۆکێکی مرۆڤانەو دیموکراتیانەی هەبوو. ئەمەش پێویست بو، چونکە ڕۆژئاواییەکان زۆرتر لەم بارەیەوە هەستیان بە داخوازیو چاوەڕوانیی گەلانی ئێران کردبوو، دەبوو بچێتە ناو ئەو گۆڕانکاریو پرۆسەیەوە کە پاش جەنگ لە جیهاندا دەستی پێ کردبوو.

٥- لە ڕوانگەی ئینگلیزو ئەمریکاییەکانەوە، ئەگەر بڕیار بوایە ڕیفۆرم لە هەرێمێکی ئێرانی وەك هی گەلی ئازەری کە کەوتوەتە ناوچەکانی ژێر دەسەڵات و کۆنترۆڵی سۆڤیەت ئەنجام بدرێو داواکانیان جێبەجێ بکرێ. دەبوو ئەم ڕیفۆرمانە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەوان و بەگشتی تەواوی ئێراندا بەجێ بهێنرێن.

٦- ئەگەر بڕیار بووە سۆڤیەت بەشێك لە نەوتی ئێران ببات (ئینگلیز کە هەیبووە)، ئەوە ئەمریکاش بە مافی خۆی زانیوە داوای بەشی خۆی بکات.

وەنەبێ ئینگلیزو ئەمریکا ئەم گەڵاڵەیەیان لەبەر دڵسۆزیو لەپێناوی چەسپاندنی دیموکراسیو مافی گەلانی چەوساوەی ئێراندا پێشنیار کردبێو لەسەر جێبەجێکردنی سوور بووبن، بەڵکوو ئەوان دەیانویست لەلایەکەوە بە ڕووبەڕووبوونەوەی سۆڤیەت و لەلایەکی تریشەوە بۆ گۆڕینی ئەو بارودۆخە ئاڵۆزەی وا لە ئێراندا هەبوو، چۆن سۆڤیەت بۆ بەدەستخستنی نەوت کەڵك لە بزووتنەوەکانی کوردو ئازەربایجان وەردەگرێ، ئەوانیش ڕیفۆرم بۆ دەستخستنی لایەنگیریی کۆمەڵانی خەڵك ئەنجام بدەن. سۆڤیەت دژی کۆمسیۆنی هاوبەش ڕاوەستا، چونکە چیتر نەیدەتوانی بە تەنیا دەست لە کاروباری ئێران وەربدات؛ پەسندکردنی ئەو کۆمسیۆنەیش بەشداریی ئینگلیزو ئەمریکای لە ڕووداوەکانی ناوخۆی ئێران دەگەیاند. سۆڤیەت ئەو بارودۆخەی ئێرانی لە بەرچاو نەگرت، چونکە هیچ زەمینەیەکی لەبار بۆ شۆڕش و هاتنە سەر مولکی دەوڵەتێکی سەر بە سۆڤیەت لەئارادا نەبوو. ڕۆژاواییەکانیش بەشبەخۆیان پێگەو لایەنگری زۆریان هەبوو، جا هەر لە دەرباری شاو دەوڵەت و مەجلیسی ئێرانەوە بگرە، تا دەگاتە هەندێ هێزی سیاسیو تەنانەت کۆمەڵانی خەڵکیش .

ئەو ڕاستییە ناشارینەوە کە سۆڤیەت جگە لە کێشەی نەوت لەگەڵ ڕژێمی تاراندا، دەیویست کێشەی ئازەربایجانیش چارەسەر بکرێ. هەروەك چەند جار ئاماژەمان پێ کردو لە بەیاننامەو وتووێژەکانی قەوامدا لە مۆسکو هاتووە، کێشەی ئازەربایجانیش وەلا نراو وەك کێشەیەکی ناوخۆی ئێران لەقەڵەم درا. واتە ئیتر سۆڤیەت بۆی نەبوو باسی بکات.

پرسیار دەکرێ: ئایا جگە لە کێشەی ئازەربایجان کە سۆڤیەت قۆستبوویەوەو چارەسەریش بکرایە، کێشەی ئێران هەر چارەسەر نەدەبوو، ئەی کێشەی گەلانی تری وەك بەلووچ، تورکمەن، عەرەب، قەشقایی و کورد چی؟! خۆ خاڵەکانی گەلاڵەی کۆمسیۆنی هاوبەش هەموو گەلانی چەوساوەی ئێران و تێکڕای بوارەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی ئێرانی دەگرتەوە. بەڵێندانی دەوڵەتی ئێران بە سۆڤیەت کە چارەسەری کێشەی ئازەربایجان دەکات، هیچ زامنێکی نەبوو. ئەگەر وای دابنێین چارەسەر دەکرا، ڕۆژاواییەکانیش چارەسەری کێشەی گەلانی ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆیان دەکرد. سۆڤیەت باش دەیزانی کە ئینگلیز خەریکی هاندانی گەلان و عەشایری باشوورو ڕۆژاوای ئێرانە، تا ئەوانیش داوای ئۆتۆنۆمیی وەك ئەوەی ئازەربایجان و کوردستان بکەن. سۆڤیەت و توودە داواکاریی ئەو گەلانەیان کە لە ناوچەکانی ژێر دەستی ئینگلیزدا بوون بە دەستکردی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی ناو دەبرد. کەواتە چارەسەرکردنی هەموو کێشەکانی تر، جگە لە کێشەی ئازەربایجان، ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە ئینگلیزو ئەمریکاوە هەبوو، بێ بەشداریی ئەوان چارەسەر نەدەکرا. ئیتر چۆن سۆڤیەت خۆی بە خاوەنی کێشەی ئازەربایجان دەزانی و هەوڵی چارەسەرکردنی دەدا، ئینگلیزەکانیش خۆیان بەرامبەر بە چارەنووسی گەلان و کێشەی ناوچەکانی ژێر کونترۆڵیان بە بەرپرس و خاوەن دەزانی. بەوپێیە، چارەسەرکردنی ئەو هەموو کێشانە بە لایەنێك جێبەجێ نەدەبوو، دەبوایە لە کۆبوونەوەی مۆسکۆ یا لە کۆنفراس و چاوپێکەوتنەکانی تردا بڕیارێکی هاوبەش لەبارەیانەوە بدرێ. تەنانەت سۆڤیەت پاش کۆبوونەوەی مۆسکۆ، دوای ئەوەی دەرکەوت ئێران نایەوێ نەوتەکەی بداتێ و کێشەی ئازەربایجان چارەسەر بکات، هەوڵی نەدا ئەم کۆمسیۆنە هاوبەشە پێك بێ و دەست بەکار بێ. ئەنجامدانی کارێکی

وا نە پاشگەزبوونەوەو نە شەرمەزاریش دەبوو بۆ سۆڤیەت، بەڵکوو بەرگرتنی ئەو تراژیدیایە دەبوو کە گەلانی چەوساوەو هێزە دیموکراتو پێشکەوتنخوازەکانی ئێران تێی کەوتبوون. دەکرا کێشەی ئێران، نەك بەناوی کۆمسیۆنی هاوبەشی ئەمریکاو ئینگلیزو سۆڤیەتەوە، بەڵکوو بخرایەتە دەستی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانو بەناوی ئەو ڕێکخراوەوە کۆمسیۆن یان بڕیارێك لەسەر ئێران بدرێ. بەڵام دیارە سۆڤیەت باوەڕی بە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیش کە خۆی یەکێك بوو لە دامەزرێنەکانی، نەبوو.

لە بەرچی سۆڤیەت گەڵاڵەی کۆمسیۆنی هاوبەشی سەبارەت بە ئێران لە کۆبوونەوەی مۆسکۆدا پەسند نەکرد؟ ئایا پلانێکی تایبەتی خۆی لەم بارەیەوە هەبوو، یا بە نهێنی لەگەڵ کاربەدەستاندا ڕێك کەوتبوو، یا بەڵێنی بە دەسەڵاتدارانی ئێران دابوو دژی پێکهێنانی ئەو کۆمسیۆنە بێ؟ یا سۆڤیەت وای پێشبینی کردبوو کە بەبێ ڕەزامەندیی ئەو هیچ بڕیارو گۆڕانکارییەك لە ئێران ئەنجام نادرێو ئینگلیزو ئەمریکا ناچار دەبن دەست لە ئێران بەردەنو خۆی لەگەڵ دەوڵەتی تاراندا ڕێك بکەوێ؟ بۆ دەستخستنی وەڵامی ئەم پرسیارانە، دەبێ لە ڕەوتی ڕووداوەکانی پێش کۆبوونەوەی مۆسکۆ لە کانوونی یەکەمی ١٩٤٥دا، لە سەروبەندو پاش کۆبوونەوەکەدا، بۆیان بگەڕێین.

لە ماوەی کۆنفرانسی مۆسکۆدا زۆربەی شارەکانی ئازەربایجان لەلایەن فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانەوە لە دەسەڵاتی ڕژێمی تاران پاك کرانەوەو دەسەڵات کەوتە دەستی فیرقە. پیشەوەری دەوڵەتی ئازەربایجانی ڕاگەیاند. ئازادکردنی شارەکانی ئازەربایجانو ڕاگەیاندنی دەوڵەتی ئازەربایجان شتێك نەبوو سۆڤیەت ئاگای لێ نەبووبێ، بەڵکوو ئەوە دروست ئەو پەیامە بوو کە سۆڤیەت دەیویست بە ڕۆژئاوای ڕابگەیەنێ و نیشانی بدات پلانێکی تری بۆ تاران هەیە. چما سۆڤیەت دروست لەکاتی کۆنفرانسەکەی مۆسکۆدا ئەم کارەی ئەنجام دا؟ ئایا ئەمە تێکدانی کەشوهەوای کۆبوونەوەکەی مۆسکۆ نەبوو.

ئایا ئاڵۆزکردنی پەیوەندیەکانی نێوان ئینگلیزو ئەمریکا لەلایەك و سۆڤیەت لەلایەکی ترەوە نەبوو؟ کردەوەی سۆڤیەت و سەرانی ئازەربایجان بەبێ ئاگاداری و ڕاوێژکردن لەگەڵ ئینگلیزو ئەمریکادا، پێچەوانەی گیانی هاوکاریی هەرسێ هاوپەیمان، واتە ئینگلیزو ئەمریکاو سۆڤیەت، پاش دووەم جەنگی جیهانی؛ پێچەوانەی ئەو پەیمانە بوو کە هەرسێ دەوڵەت لە کۆنفراسی تاراندا سەبارەت بە ئێران دابوویان. ئایا ئەوان چاوەڕێی کاردانەوەی ئینگلیزو ئەمریکایان نەکردبوو، یان پێشبینیی ئەوەیان نەکردبوو کە بەو کردەوەیە ئێران بیانووی خۆهاویشتنە باوەشی ڕۆژئاواییەکانی بۆ پەیدا دەبێ؟ ئیتر ئەمە بوو ئەوانیش ڕاپەڕینەکانی باشووری ئێرانیان ڕێك خست و سکاڵای ئێرانیان گەیاندە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکان و یەکسەر پسپۆرو چەك و تەقەمەنی و دراویان دایە ئێران و لە باری سیاسی و دیپلۆماسیشەوە یارمەتیی ئێرانیان دا، لە هەمان کاتدا هانیان دا هێرش بکاتە سەر ئازەربایجان و پشتگیریی ئێرانیان کرد تا دەسەڵاتی دەستکردی سۆڤیەت لەو هەرێمەدا لەناو بەرێ.

ڕۆژئاواییەکانی‌ش دوور لە هەموو داب‌ونەریتێکی مرۆڤانە، بە بیانووی بەربەرەکانی و نەهێشتنی شوێنەوارو ڕۆڵی سۆڤیەت، قینی خۆیان لە دامرکاندنەوەی بزووتنەوەکانی ئازەربایجان و کوردستاندا بەو دوو گەلە ڕشت. سیاسەتی بانێکەو دوو هەوا، یا دووڕوویی ئینگلیزو ئەمریکا لەم ڕووداوانەدا زۆر باش ئاشکرا بوو. ئەوان کە لە کۆنفرانسی مۆسکۆدا دەیانویست چارەسەرێك بۆ کێشەکانی ناوخۆی ئێران بدۆزنەوەو باسی دیموکراسی و ئازادییان دەکرد، پاش ئەوەی بزووتنەوەکانی کوردو ئازەری تێك شکێنران و دەست بەسەر ئەو دوو هەرێمەدا گیرا، بچووکترین ڕیفۆرم یا تەنانەت خاڵێك لەو گەلاڵەیە کە بۆ خۆیان لە کۆنفرانسی مۆسکۆدا پێشنیاریان کردبوو، جێبەجێ نەکرا. دەیانتوانی ڕژێمی ئێران ناچار بکەن گەلاڵەی کۆمسیۆنەکە (بەبێ سۆڤیەت) جێبەجێ بکات. گەرچی لە هەندێ سەرچاوەدا دەگوترێ ئینگلیزو ئەمریکا پاش سالانی شەڕ، چەند جارێك هەوڵیان داوە گەلاڵەی ناوبراو لەلایەن ڕژێمی ئێرانەوە پەسندو جێبەجێ بکرێ و گوایە ئێران ئامادە نەبوە، بەلام ئەمە جگە لە پاکانەی بێ ناوەڕۆك شتێکی تر

نییە، چونکە سیاسەتی دەرەوەو ناوەوەی ئێران لەلایەن ڕۆژئاواوە دیاری دەکران. ئەگەر بڵێن ئینگلیزو ئەمریکا ئاگاداری کردەوەکانی ڕژێمی ئێران نەبوون یان پەسندیان نەکردووە، خۆ دەیانتوانی پێشی پێ بگرن، یان دەیانتوانی یارمەتیەکانی خۆیان بۆ ئەم وڵاتە ببەستنەوە بە ئەنجامدانی هەندێ ڕیفۆرم. هەروەك دیتمان ئێران بە درێژایی دەسەڵاتی حەمە ڕەزا شا تا ڕووخانی لە ١٩٧٩دا، جێبەجێکەرو بەڕێوەبەری سیاسەتی ڕۆژئاوا بوو لە ناوچەکەدا. لەبەر ئەوەی ئێران ئامادە نەبوو لە کۆنفرانسی مۆسکۆدا هەندێ ڕیفۆرم لە چوارچێوەی گەڵاڵەی پێشنیارکراوی ئینگلیزو ئەمریکادا جێبەجێ بکات، دەیانتوانی یارمەتییان بۆ ئێران ببەستنەوە بە هەندێ ڕیفۆرمەوە.

٣ی تشرینی دووەمی ١٩٤٥، واتە مانگ و نیوێك بەر لە کۆبوونەوەکەی مۆسکۆ، حکوومەتێکی نوێ بە سەرۆکایەتیی ئیبراهیمی حەکیمی هاتە سەر کار، ئینگلیزەکان پێش دەسپێکردنی کۆبوونەوەی مۆسکۆ بە "حەکیمی"یان ڕاگەیاند پێشنیاری کۆمسیۆنێکی سێ لایەنەیان لە کۆبوونەوەی مۆسکۆدا هەیە، حەکیمی بەڵێن و پشتگیریی حکوومەتەکەیی لەو گەڵاڵەیە بۆ نوێنەرانی ئینگلیزو ئەمریکا دەربڕی.

ئەوەبوو نوێنەرانی ئینگلیزو ئەمریکا بە باوەڕێکی تەواوەوە هاتنە مۆسکۆو لە کۆبوونەوەکەدا پێشنیاری ئەم گەڵاڵەیەیان کرد، واتە هەر بۆچوونی سۆڤیەت مابووەوە. وا دیارە ئەمریکاو ئینگلیز پێیان وابوو سۆڤیەت دژی پێکهێنانی کۆمسیۆنی هاوبەش نابێ و تەنیا ڕەنگە هەندێ پێشنیاری تایبەتی خۆی، یا گەڵاڵەیەکی تر، یان هەندێك دەستکاری و گۆڕانکاری لە گەڵاڵەی پێشنیارکراوی ئینگلیزدا بخوازێ. بەڵام بیریان لەوە نەکردبووەوە کە لەوانەیە سۆڤیەت ڕەتی بکاتەوە.

کاربەدەستانی سۆڤیەت پێشتر "حەکیمی"یان بە نۆکەری ئینگلیزو ئەڵقەلەگوێی ئەو دەوڵەتەو حیزبی توودەیش، وەك وتەبێژی سۆڤیەت، حەکیمیی بە تێکدانی پەیوەندیەکانی نێوان ئێران و سۆڤیەت تاوانبار کردبوو. حەکیمی لە کۆنفراسی ئاشتیی پاریسدا ساڵی ١٩١٩ گوتبووی، ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاس پێشتر سەر بە دەوڵەتی پاشایەتیی ئێران بوون و ڕووسیا بەزۆر لە ئێرانی داگیر کردوون، بۆیە داوای گێڕانەوەیانی کردبوو (ئەودەم وسووقودەولەی برای قەوامول سەڵتەنە سەرەك وەزیرانی ئێران بوو). لەبەر ئەمە سۆڤیەت حەکیمیی بە دوژمنی خۆی دەزانی (ئەگەر

کردەوەکانی حەکیمی و قەوام بەرامبەر بە سۆڤیەت بەراورد بکەین، دەبینین سیاسەتی دژی سۆڤیەتی قەوام گەلێك کۆنترو لە هی حەکیمی توندتر بووە. کەچی سۆڤیەت قەوامی بە دۆستی خۆی دەزانی. ستالین ئامۆژگاریی حیزبی توودەی دەکرد تا پشتگیری لە قەوام بکەن)و داوای لابردنی حەکیمیی دەکرد. سۆڤیەتو توودەو ناسیونال شۆڤێنیەکانی ئێران شانبەشانی یەکتر گەلەکۆمەیەکی گەورەیان بۆ لەکارخستنی کابینەی حەکیمی ڕێك خستبوو. بەلاّم حەکیمی بەرامبەر بەو پروپاگەندانە خێرخوازیی خۆی لە ئاستی سۆڤیەتدا نیشان داو بە ئاشکرا ڕای گەیاند: ئامادەیە ئەو وەزیرانە لابەرێ کە سۆڤیەت پێی وایە دژی ئەون. چەند جارێکیش، لەکاتی بەستنی کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەی ئەمریکا و ئینگلیزو سۆڤیەتدا، داوای سەفەری کرد بۆ مۆسکۆ، بەلاّم مۆسکۆ ئامادە نەبوو پێشوازی لە حەکیمی بکات، چ بۆ وتووێژی دووقۆلّی و چ بۆ بەشداری لە کۆبوونەوەی سێ زلهێزدا. حەکیمی چەند وەزیرێکی خۆی کە بە دژایەتیی سۆڤیەت ناسرابوون، لەکار لابرد. بەلاّم سۆڤیەتو توودەییەکان و ڕەگەزپەرستە فارسەکان (ئەوانەی دژی سەرەتاییترین ماف بۆ گەلانی غەیرە فارسی ئێران بوون و خوێندن و نووسین بە زمانی زگماکیشیان پێ ڕەوا نەدەبینین، وەك موسەددیق و بەهار... هتد) وازیان نەهێناو کابینەی حەکیمی کەوت. تاوانی گەورەی لەو سەردەمەدا ئەوە بوو کە گەلاّلەی پێشنیارکراوی ئینگلیزو ئەمریکای بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ناوخۆی ئێرانی پەسند کردبوو.

حەکیمی، جگە لە لابردنی ئەو وەزیرانەی کە دژ بە سۆڤیەت بوون، ئامادەی سەفەرکردن بوو بۆ مۆسکۆ، هەنگاوێکی تریشی بۆ ڕازیکردن و بەهاناوەچوونی سۆڤیەت نا. بەیات کە کابرایەکی لایەنگری سۆڤیەت یا بە دۆستی سۆڤیەت ناسرابوو، پێشتریش سەرۆك وەزیرانی ئێران بوو، کردی بە ئوستانداری ئازەربایجان لە تەورێز. ئەمە کارێك بوو هیچ سەرۆك وەزیرێکی ئێرانی ئامادەی ئەنجامدانی نەبوو (تەنانەت حەکیمی ڕایگەیاند ئامادەیە لایەنگرانی سۆڤیەت بێنێتە ناو کابینەکەی خۆی).

سەرەنجام حەکیمی لە ١٩٤٦/١/١٩دا، واتە پاش دوو مانگ و نیو لەسەرۆك وەزیری، بە گەلەکۆمەی سۆڤیەت (بالّوێزی سۆڤیەتو توودەو ڕۆژنامە

لایەنگرەکانیان)و قەوام‌و موسەددیق و ڕەگەزپەرستانی تری ئێران لەکار خرا، قەوام بە ٥١ دەنگ بەرامبەر بە ٥٠ دەنگی دژ بووە سەرۆك وەزیرانی ئێران، ئەویش بە هەوڵ‌و تەقەلاو کڕینی هەندێ کەس لەلایەن سۆڤیەتەوە ئەو یەك دەنگە زیادەی هێنا. سەرچنگ‌نانی توودەییەکان لەگەڵ ڕەگەزپەرستانی ئێراندا دەورێکی گەورەیان لە لابردنی حەکیمی و هێنانە سەر کاری قەوامدا بینی.

حەکیمی، چ پێش‌و چ پاش کۆبوونەوەی مۆسکۆ، هەوڵی دا بەڵێنی زۆربەی ئەندامانی کابینەکەی‌و مەجلیسی ئێران بۆ پەسندکردنی کۆمسیۆنی هاوبەش بۆ چارەسەری کێشەکانی ئێران وەرگرێ. ژمارەیەك لە ئەندامانی کابینەکەی کە لایەنگری هاوبەندی دژی کۆمسیۆنی هاوبەش یان دژی قەوام بوون، ڕایانگەیاند: ئەگەر بە دەرکردنیشمان تەواو بێ، نایەڵین ئەو بەڵگە تاوانە (گەلاڵەی کۆمسیۆنی هاوبەش) پەسند بکرێ. دکتور محەمەدی موسەددیق ئەندامانی کۆمسیۆنی کاروباری دەرەوەی مەجلیسی ئێرانی کۆکردەوەو هەڕەشەی ئەوەی لە دەوڵەتی حەکیمی کرد کە نابێ دەوڵەت بەبێ ڕەزامەندیی ئەو کۆمسیۆنەو مەجلیسی ئێران هیچ بڕیارێك بدات‌و کابینەی حەکیمی هەر بڕیارێك لەم بارەیەوە بدات بایەخێکی نابێ. پاشان بەیاننامەی موسەددیق لە ڕۆژنامەکاندا بڵاو بووەوە، جگە لە شەرمەزارکردنی دانەران‌و لایەنگرانی گەلاڵەی ناوبراو، ڕایگەیاند زۆربەی نوێنەرانی مەجلیسی ئێران دژی کۆبوونەوەی تاووتوێکردن‌و بڕیاردان لەسەر ئەم گەلاڵەیەن، سیاسەتی حەکیمی شەرمەزارو داوای دەست لەکار کێشانەوەیی کرد؛ گوتی: هەر کەس ئەم بەڵگە تاوانە مۆر بکات، دەبێ سزا بدرێ. حەکیمیش مەنسوورو بەهارو موئتەمەنول مولك‌و موستەشارودەولەی بانگی ماڵی خۆی کرد تا ئەم گەلاڵەیە پەسند بکەن‌و هەوڵ بدەن ئەندامانی کابینەو مەجلیسی ئێرانیش پەسندی بکەن. بەڵام ناوبراوان داوای دەست لەکارکێشانەوەی ئەویان کرد [1].

---

[1] بڕوانە: چاپەمەنیەکانی ئێران، بە تایبەت کۆتایی ساڵی ١٩٤٥و سەرەتای ١٩٤٦و کۆبوونەوەکانی مەجلیسی ئێران کە لەم نووسراوەدا لە ئەرشیڤی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ڕوسیای فیدراڵ وەرگیراوە، بەتایبەت وتەکانی موسەددیق ڕۆژی ١٩٤٦/١/١٠؛ بەرامبەر بە ١٣٢٤/١٠/٢٠.

پاش ئەوەی حەکیمی لابراو بە هەوڵو تەقەلای هەمەلایەنە قەوام هێنرایە سەر حوکم، سۆڤیەتو توودەییەکان دەسەڵاتی قەوامیان بە سەرکەوتنێکی گەورە دەزانیو هیواو خۆشباوەڕیەکی زۆریان پێ بوو کە داخوازیەکانیان لەڕێگەی ئەوەوە بێنە دی. قەوام دەستی ئینگلیزەکانی لە ئێران کورت کردەوە، بەڵام ئەوەیان باش دەزانی کە قەوام زلهێزێکی تر، واتە ئەمریکای لەپشتە (لێکۆڵینەوەیەکی نووسەر لەم بارەیەوە لەسەر هەندێ بەڵگەو دیکۆمێنتی وەزارەتی ئەمریکاو باڵوێزخانەی ئەمریکا نووسراوە).

قەوام لە ١٩٤٧/١/٢٧دا کابینەی خۆی پێك هێناو یەك مانگ پاش ئەمە، بە بانگهێشتنی ڕێبەرایەتیی سۆڤیەت چووە موسکۆو لە ١٩ی کانوونی دووهەمەوە تا ٨ی مارت لەوێ مایەوەو لە ئاستێکی بەرزدا میوانداریی گەرمی لێ کرا، چەند جار ستالینو مۆلەتۆڤی بینیو پەیمانی نەوتی نێوان ئێرانو سۆڤیەتی مۆر کرد. قەوام بەڵێنی چارەسەری کێشەی ئازەربایجانو زۆر بەڵێنی تری دا، هەر بە گەڕانەوەیشی بۆ ئێران دەستی بە چالاکیی دژی ئینگلیز کردو لەگەڵ نوێنەرانی ئازەربایجاندا کەوتە وتووێژەوەو زۆر مانۆڕی تری بە دڵی سۆڤیەتیەکان کرد. بەڵام سەرەنجام نە نەوتەکە بە سۆڤیەت درا، نە کێشەی ئازەربایجان چارەسەر کرا، نە ڕیفۆرمو بەڵێنەکانی تریشی بەجێ هێنا؛ جگە لەو تراژیدیایەی کە بەسەر هەردوو گەلی ئازەریو کوردیدا هێنا، ڕاوە تـوودەو ئانتی سۆڤێتیزم بوو بە سیاسەتی ڕەسمیی دەوڵەتەکە (وە نەبێ قەوام بۆ سۆڤیەت نەناسراو بووبێ، کە ڕابردوویەکی پڕ لە تاوانی بەرامبەر بە گەلانی ئێرانو تەنانەت دژی سۆڤیەتیشی هەبوو). مەبەستی ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیە پێشنیاری گەڵاڵەی کۆمسیۆنی هاوبەش بۆ کاروباری ئێران بوو کە هۆکاری جێبەجێکردنی لەلایەن ئینگلیزو ئەمریکاوە، بە ڕواڵەت سۆڤیەتو پاشانیش قەوامو کابینەکانی تری ئێران بوون. ئەگەر بڕوا بە سەرچاوەکانی ئینگلیز بکرێ، بیرۆکەی ئەم گەڵاڵەیە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٤١ کە ئینگلیزەکان پاش داگیرکردنی ئێران لەلایەن هێزە هاوپەیمانەکانەوە بۆ بەڕێوەبردنو چارەسەری هەندێ کێشەی ناوخۆی ئێران ئامادەیان کردبوو، چونکە دەوڵەتی تاران کۆنترۆڵی زۆربەی ناوچەکانی ئێرانی لەژێر دەستدا نەمابوو. ئەو بیرۆکەیە، وەك لە بەڵگەنامەکانی دوای داگیرکردنی ئێرانو کۆبوونەوەی مۆسکۆدا هاتووە، بە گەڵاڵەی پێشنیاری "بۆین"

وەزیری کاروباری دەرەوەی بریتانیا ناسراوە. دواتر بە گەلاڵەی کۆمسیۆنی هاوبەش سەبارەت بە ئێران ناوی دەرکرد. ئینگلیزەکان دەستپێشخەری گەلاڵەیەکی ئەوتۆ بوون، چونکە یەکەم لەسەردەمی شەڕدا ئێران بایەخێکی تایبەتو زۆری بۆ هاوپەیمانان هەبوو، پێویستی بەوە دەکرد بارودۆخی ئێران ئارام بێ، دەنا لایەنگرانی ئەڵمانیای نازی دەیانتوانی کەڵك لە ناڕەزایی و نائارامیی ئێران وەربگرن. لەلایەکی ترەوە، ئێران ڕێگەیەکی سەرەکیی گواستنەوەی چەكو تەقەمەنی و خواردنو پێویستیەکانی شەڕ بوو لەلایەن ئینگلیزو ئەمریکاوە بۆ سۆڤیەت، کە پێویست بوو ڕێگەکان هەر لە کەنداوی فارسەوە تا سەر سنووری سۆڤیەت ئارام بن. مەبەستی ئینگلیز پاراستنی کۆمپانیا نەوتەکەی خۆی لە باشووری ئێرانو بەرژەوەندەکانی بوو لەم وڵاتەدا.

پاشان دەیانزانی سۆڤیەتیەکان وەك ڕابردوو خەریکی دەست وەردانە کاروباری ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیانن، کە مەترسیی بۆ داهاتووی بەرژەوەندەکانی بریتانیا لە ئێراندا بەدواوە دەبوو. ئیتر بە لایانەوە گرنگ نەبوو وەك چۆن ساڵی ١٩٠٧ ئێرانیان بەسەر دوو ناوچەی ژێر دەستی خۆیاندا بەش کرد، سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیش هەمان سیاسەتە کۆنەکە دووپات بکەنەوە. بەڵام هاوپەیمانێکی تر، واتە ئەمریکا، زیاد بوو، کە دەبوو بەرژەوەندی ئەویش بپارێزرێ. بۆیە ئینگلیز بە باشی زانی لەجیاتی دابەشکردنی ئێران بەسەر دوو یان سێ بەشدا، کۆمسیۆنێکی هاوبەش بۆ کۆنترۆڵکردنی تەواوی ئێرانو کەمکردنەوەی دەسەڵاتی ئێران (کە زۆر بڕوایان پێی نەبوو) پێك بێ.

سەرەڕای ئەمانە، ئینگلیزەکان دەیانویست بەم چەشنە پێش بە دەستدرێژیو جووڵانەوەی سەربەخۆی سۆڤیەت لە ئێران بگرن. بۆیە تا کۆنفراسی مۆسکۆ چەند جارێك لەگەڵ کاربەدەستانی ئێرانو ئەمریکاییەکاندا باسی پێکهێنانی کۆمسیۆنێکی ئەوتۆ، یا لانی کەم جێبەجێکردنی یاسای بنچینەیی ئێرانیان سەبارەت بە شووراکانو ئاڵوگۆڕ لە یاسای بنچینەیی ئێراندا کردبوو.

دەوڵەتی ئەمریکایش، بە وتەی جەعفەری میهدی نیا، چەند ساڵێك دوای شەڕ، واتە سەردەمی سەرۆك وەزیرانی ئێران ڕەزم ئارا، هەوڵی دا ئەم گەلاڵەیە بە

شێوەیەکی تر لەلایەن مەجلیسی ئێرانەوە پەسند بکرێ، بەڵام ئەمجارەیش محەمەدی موسەددیق بوو بە کۆسپی بەردەم پەسندنەکردنی. ئەم پێشنیارەی ئەمریکا لەلایەن قازیی بەناوبانگی ئەمریکا، واتە داگلاسەوە، پێشنیار کرا بە ڕەزم ئارا[1].

فەخرەدینی عەزیمی نووسیویە: سەرۆك وەزیران ئەو سەردەمە فەرمانی بە ئوستانداروو فەرماندارەکانی ئێران دا خۆ ئامادەکەن بۆ هەڵبژاردنی شووراکان[2]. واتە بریتانیا هەر پاش کۆنفراسی تاران هەوڵی بۆ پێکهێنانی ئەو کۆمسیۆنە داوە، تەنانەت بانگەوازی سۆڤیەت و ئێرانیشی کردووە کە لەم کۆمسیۆنەدا بەشداریی بکەن. بەڵام سەری نەگرت و ئێران و سۆڤیەت کەوتنە یەك بەرەو دژی ئەو پێشنیارە ڕاوەستان. هەرچۆنێك بێ، ئێران بە یارمەتیی سۆڤیەت توانیی خۆی لە مەترسییەکی گەورە ڕزگار بکات. هەروەك سیناریۆی ڕووداوەکانی دواتری ئێران نیشانیان دا، کێشەو گرفتە سەرەکیەکانی ئێران بە هۆی ئەمانەوە بوون: مانەوەی سوپای سۆڤیەت و کێشەی نەوتی نێوان ئێران و سۆڤیەت و شکاتی ئێران لە شوورای ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکان و ناردنی سوپا بۆ ئازەربایجان و کوردستان بە مەبەستی گەڕاندنەوەی دەسەڵات بە بیانووی بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنی خولی پانزەهەمی مەجلیسی ئێرانەوەو ئاژاوەگێڕیی ئێران و سەرچنگنانی نەیارانی لەم بارەیەوە.

کێشەکانی ناوخۆی ئێران، واتە کێشەی دیموکراسی و هەڵبژاردنی ئازادو ئازادیی هێزە سیاسیەکان و دەوڵەتی هاوبەندو جێبەجێکردنی یاسای بنچینەیی ئێران و داننان بە مافی کولتووریی گەلانی غەیرە فارس و پشت گوێ خرانی کێشەو ململانێی ئینگلیزو ئەمریکا لەلایەك و سۆڤیەت لەلایەکی ترەوە لەسەر ئاستی ئێران و جیهان، باڵیان بە سەر هەموو کێشەکانی ناوخۆی ئێراندا کێشا.

---

[1] بڕوانە: زندگی سیاسی رزم ئارا، نووسینی جعفر مهدی نیا، تهران، ١٣٦٣، ل٤٩.

[2] بڕوانە: بحران دیموکراسی در ایران، نویشته: فخرالدین عظیمی، ترجمه عبدالرضا هوشنگ مهدوی و بیژن نوذری، تهران، ١٣٧٢، ص١٤٠-١٤١.

**بەڵگەنامەکانی کۆبوونەوەی مۆسکۆی نێوان**
**وەزیرانی دەرەوەی ئەمریکاو ئینگلیزو سۆڤیەت**

١٦-١٩٤٥/١٢/٢٧:

پێش ئەوەی کۆبوونەوەی مۆسکۆ دەست پێبکات بۆ ئامادەکردنی کاری کۆنفراسەکەو ئەو پرسیارو کێشانەی کە دەبێ چارەسەر بکرێن، هەندێك نامەو پێشنیار لەلایەن وەزیران و باڵوێزانی سێ زلهێزی ئەمریکا و ئینگلیزو سۆڤیەتەوە ئاڵوگۆڕ کران، ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین. گاری مەن باڵوێزی ئەمریکا لە مۆسکۆ لە نامەیەکیدا ڕۆژی ١٩٤٥/١٢/٧ بۆ وەزیری کاروباری دەرەوەی سۆڤیەت نووسیویە: بەڕێز بێرنس (وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمریکا) پێشنیار دەکات ئەم پرسیارانەی خوارەوە بخرێنە بەر باس و لێکۆڵینەوەی سێ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا و ئینگلیزو سۆڤیەت کاتی چاوپێکەتنەکەیان لە مۆسکۆ، واتە:

١- لێکۆڵینەوەی پێشنیاری دروستکردنی کۆمسیۆنێکی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ کێشەی کۆنترۆڵی وزەی ئەتۆمی (ناوکی)،

٢- دەستپێکردنەوەی کاری هەم شووڕای وەزیرانی کاروباری دەرەوەی سێ زلهێز، هەم جێگرانی وەزیرانی دەرەوەی سێ زلهێزەکە بۆ ئامادەکردنی پەیمانەکان لە کۆنفراسەکانی تری ئاشتیدا،

٣- دەسەڵاتی شووڕای سێ زلهێز، سەبارەت بە کۆمسیۆنی دالنی وەستۆك (ڕۆژهەڵاتی دوور) دیاری بکرێ،

٤- ڕێکخستنی دەوڵەتی سەربەخۆی کۆریا،

٥- چەککردنی هیزە چەکدارەکانی ژاپۆن لە باکووری چین و گواستنەوەیان بۆ ژاپۆن،

٦- تەسلیمکردنی کۆنترۆڵی مینچۆری (مەنشۆریا) بە دەوڵەتی نەتەوەیی چین،

٧- بردنە دەرەوەی هێزەکانی ئەمریکا و ئینگلیزو سۆڤیەت لە ئێران،

٨- دیاریکردنی ئەو مەرجانەی کە دەبێ دەوڵەتانی ڕۆمانیاو بولگارستانی پێ بناسرێن[1].

---

[1] هەروەك پاشتر دەبینین، ئەمریکاو ئینگلیز بەڕەسمی ناسینی دەوڵەتی ڕۆمانیاو بولگارستان و وڵاتانی تری ئەورووپای ڕۆژهەڵاتیان کە لە لایەن سوپای سوورەوە داگیر کرابوون، بەستەوە بە چەند مەرجێکی وەك بەڕێوەبردنی

بەڕێز بیرنس هیواداره تا چاوپێکەوتنی وەزیرانی کاروباری دەرەوەی سێ زلهێز لە مۆسکۆ ڕەزامەندیی هەمەلایەنەی لەسەر کێشەکانی سەرەوە هەبێ، هەروەها داوا دەکات پێشەکی لەو پێشنیارانەی یەکێتیی سۆڤیەت ئاگادار بێ کە لە کۆنفرانسەکەدا باسیان بکات[1].

سڵاوم،

گاری مەن ڤ. ئا

وەڵامی مۆڵەتۆڤ وەزیری کاروباری دەرەوەی سۆڤیەت، بۆ گاری مەن، وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمریکا لە ڕێگەی باڵوێزخانەی ئەمریکاوە لە مۆسکۆ لە ١٩٤٥/١٢/٧دا:

لە گەڵاڵە پێشیاری بەڕێز بێرنس بۆ کۆنفرانسی وەزیرانی دەرەوەی سێ زلهێز لە مۆسکۆ ڕازیم، ئێمەش لەلای خۆمانەوە ئەم پێشنیارانە دەکەین:

پێشنیار دەکرێ دوای خاڵی ٥ سەبارەت بە چەککردنی هێزەکانی ژاپۆن لە باکووری چین و گواستنەوەیان بۆ ژاپۆن، ئەم دوو پرسیارەش زیاد بکرێ سەبارەت بە دەرچوونی هێزەکانی ئەمریکا لە چین و دووەم دەرچوونی هێزەکانی بریتانیا لە یۆنان[2]. جگە لەمە دەوڵەتی سۆڤیەت پێشنیار دەکات خاڵی یەکەمی گەڵاڵەکە بکرێتە دواین خاڵی کاری ڕۆژانەی کۆنفرانسەکە[3].

لەگەڵ سڵاودا،

مۆڵەتۆڤ. ڤ.م.

---

هەڵبژاردنی ئازاد، بەشداریی هێزە سیاسیەکانی ئەو وڵاتانە لە دەوڵەتێکی هاوبەندا، لێبوردنی گشتی، بەڕێوەبردنی ڕیفۆرم. بەڵام وەك دەبینین سۆڤیەت هیچ کامیانی پەسند نەکردو هەر ویستی حیزبەکانی لایەنگری خۆی دەسەڵاتی ئەو وڵاتانەیان بە دەستەوە بێ، ئەنجامەکەی یەك لەدوای یەك سیستمی تاقە حیزب بوو.

[1] ئەرشیڤی وەزارەتی دەرەوەی ڕوسیای فیدراڵ (سۆڤیەتی پێشوو)، فۆندی سکرتاریەتی مۆڵەتۆڤ، ئۆپیسی٢، دیلای٢، پاپکای٤٢، ل١٣.

[2] تا لێرەدا مەترسیی تێکچوون یا بێئەنجامیی کاری کۆبوونەوەکە سەر هەڵدەدات، هێشتا ئەمریکاو ئینگلیز داوای دەرچوونی هێزەکانی سۆڤیەتیان لە هیچ وڵاتێك نەکردووە.

[3] هەمان سەرچاوە، ل١٧.

لەم دوو نامەیەدا، وەك دەردەكەوێ، سۆڤیەت كێشەی كۆنفرانسەكە بەرەو ئاڵۆزی دەبات، دیارە نایەوێ هێزەكانی خۆی لە ئێران بباتە دەرێ، لەكاتێكدا دەبێ هەرسێ زلهێز بەپێی پەیمانو هەروەها گەلاڵەی پێشنیاركراوی گاری مەن هێزەكانی خۆیان لە ئێران بەرنە دەرێ.

نوێنەرانی سۆڤیەت دەزانن مەبەستی ئینگلیزو ئەمریكا تەنیا بردنە دەرەوەی هێزەكانی سۆڤیەت نییە لەو وڵاتە، بەڵكوو دەبێ خۆشیان ئەو كارە ئەنجام بدەن، چونكە پێشتر هەرسێ زلهێزەكە لەم بارەیەوە پەیمانیان مۆر كردبوو. بەڵام پەیمانێكی ئەوتۆ لەسەر یۆنانو چین لەنێوانیاندا نەبوو. واتە سۆڤیەت دەرچوونی هێزەكانی خۆی لە ئێران بە دەرچوونی هێزەكانی ئەمریكا و بریتانیاوە لە چینو یۆنان بەستوەتەوە، ئەمەش هەروەك ئەوەی ئەمریكاو ئینگلیز وابوو كە داوای دەرچوونی هێزەكانی سۆڤیەتیان (لەو سەردەمەدا) لە تەواوی وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا دەكرد.

با پێش ڕووداوەكان نەكەوینو بزانین هەڵوێستی ڕۆژئاوا لەسەر پێشنیارەكانی سۆڤیەت بۆ كۆنفرانسەكە چییەو ڕووداوەكان بەرەو كوێ دەچن؟

باڵوێزی ئینگلیز لە مۆسكۆ ئارچی بالدكلارك كیێر ١٩٤٥/١٢/١١ لە نامەیەكدا بۆ مۆڵەتۆڤ نووسیویە:

مۆڵەتۆڤی بەڕێز، "بۆین"ی نوێنەری ئینگلیز بە گەلاڵەی بەڕێز بیرنس (ئەمریكا) بۆ كۆنفرنسی ڕازییە، بەڵام ئەو هیچ هۆیەكی پێویست بۆ لێكۆڵینەوەی پرسیاری دووەم، واتە باسكردنی كێشەی دەرچوونی هێزەكانی ئینگلیز لە یۆنان، لە كۆنفرنسەكەدا نابینێ.

لەگەڵ سڵاومدا،

ئارچی باڵد كلارك كیێر[1]

پاشان نوێنەری ئەمریكا لە پێشنیارێكی نارەسمیدا گوتوویە:

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٣٨.

با کۆنفرانسی مۆسکۆ کێشەی دەرچوونی تەواوی هێزی هاوپەیمانان لە هەموو وڵاتانی سەربەخۆ (جگە لە ئەڵمانو ژاپۆن) تاووتوێ بکات. بەڵام مۆڵەتۆڤ ئەم پێشنیارەیشی پەسند نەکردو گوتی هەبوون یان مانەوەی هێزەکانی ئێمە لە هەندێ وڵاتدا بەپێی پەیمان یا داخوازیی ئەو دەوڵەتانەیە لە ئێمە. دیارە مەبەستی مۆڵەتۆڤ مانەوەی هێزەکانیانە لە تەواوی ئەوروپای ڕۆژهەڵاتو ئێران کە نایانەوێ چۆڵیان بکەن. پاشان مۆڵەتۆڤ لە نامەیەکی تردا ڕۆژی ١٩٤٥/١٢/١٣ بۆ باڵوێزی ئینگلیز لە مۆسکۆ، نووسیویە: بیروڕای ئێمە لەسەر یۆنانو باسکردنی ئەو کێشەیە لە کۆنفرانسی مۆسکۆدا پێویستە، چونکە بوونی هێزەکانی ئینگلیز لەم وڵاتەدا ڕەنگدانەوەیەکی خراپی لە بارودۆخی ناوخۆی یۆناندا هەیە. لە ئەنجامدا یۆنان ناتوانێ لەو بارودۆخە ئاڵۆزە بێتە دەرێو دەوڵەتی ئێستای یۆنان [کە سەر بە ئینگلیزە– هەورامی] کۆسپی سەر ڕێگەی دیموکراتی بوونی ئەم وڵاتەیە[1].

لە کۆنفرانسی مۆسکۆدا، جگە لە کێشەی سەرەکیەکان، واتە کێشەکانی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئیتاڵیاو ڕۆمانیاو بولگارستانو مەجارستانو فینلەندا، لەوانە بوو کێشەی ئێرانو کۆریاو ئەندەنووسیایش بێنە کایەوە، بۆیە مۆڵەتۆڤ خۆئامادەکردنی دەستەی نوێنەرایەتیی سۆڤیەتی بۆ کۆنفرانسی مۆسکۆ سەبارەت بە کێشەی ئێران، خستە ئەستۆی سیلین کە زانیاریو هەڵوێستی لەم بارەوەو فەرمانیشی پێ درا گەڵاڵەنامەیەك سەبارەت بە ڕووداوەکانی باکووری ئێران [ئازەربایجانو کوردستان– هەورامی]و دەرچوونی هێزی هاوپەیمانان لە ئێران لە ١٩٤٥/١٢/١دا ئامادە بکات[2].

با بزانین وتووێژە ڕەسمیەکانی وەزیرانی دەرەوەی ئەمریکاو ئینگلیزو سۆڤیەت کە لە ئەرشیفی سکرتاریەتو یاداشتەکانی ڕۆژانەی مۆڵەتۆڤدا دەربارەی کۆنفرانسەکە تۆمار کراون، باسی چی دەکەن.

... بۆ کۆریا پێنشیاری دروستکردنی دەوڵەتێکی دیموکراسیی کاتی کرا. جگە لەوە، بڕیار درا کۆمسیۆنێکی هاوبەش لە فەرماندەکانی هێزی ئەمریکای جێگیر لە

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٣٩، ٤٠.

[2] هەمان سەرچاوە، ل٢٢.

باشووری کۆریاو فەرماندەی هێزەکانی سۆڤیەتی جێگیر لە باکووری ئەو وڵاتە پێك بێت. ئەم کۆمسیۆنە دەبوو بۆ کاروباری خۆی ڕاوێژ لەگەڵ هێزە سیاسیی و دیموکرات و کۆمەڵایەتیەکانی کۆریادا بکات، دەبوو بیرڕاو پێشنیارەکانی خۆی ئاڕاستەی ئەمریکاو سۆڤیەت بکات، پاش پەسندکردنیان بیانداتە دەوڵەتانی ئینگلستان و چین و ئەمریکاو سۆڤیەت[1].

**لە دەفتەری ڕۆژانەی مۆڵەتۆڤ، مۆسکۆ:**

ڕۆژی ١٩٤٥/١٢/١٨ کاتی پێشوازی لە بەڕێز "بۆین"ی وەزیری دەرەوەی بریتانیا کە ویشنسکی (جێگری وەزیری کاروباری دەرەوەی سۆڤیەت) و کیێری باڵوێزی ئینگلستان لە مۆسکۆ، بەشداری بوون، بۆین گوتی: دەیەوێ لەسەر کێشەی یۆنان لەگەڵ مۆڵەتۆڤ بدوێ، بزانێ بۆچی ئەو کێشەی یۆنانی لە لەندەن هێنایە کایەوە. گوتی: من لە لەندەن وا بیرم دەکردەوە کە مۆڵەتۆڤ کێشەی یۆنانی داوەتە دەست ئینگلستان. مۆڵەتۆڤ دەڵێ: ڕووداوەکانی یۆنان لە ئاڵۆزیدان، یۆنان لەو قەیرانە دەوڵەتیە کە تێی کەوتووە، ڕزگاری نابێ. ئەم قەیرانە لە وڵاتانی تر نییە.

بۆین گوتی: بارودۆخی وڵاتانی تر جیاوازە لە هی یۆنان. ئەمیان لەلایەن ئەڵمان و ئیتاڵیاوە دەستدرێژیی کراوەتە سەر، لە ئەنجامی هێرشەکەیاندا بۆ سەر یۆنان، تەواوی دامودەزگاکانی بەتایبەت سوپاو پۆلیسی ئەم وڵاتەی تێدا لەناوچوون.

مۆڵەتۆڤ: لەمێژە ئەڵمانی و ئیتاڵی لە یۆنان نەماون.

بۆین گوتی: ئەو دەتوانێ یەکێك لەم دوو خاڵەی خوارەوە هەڵبژێرێ: یۆنان یا وەك ڕژێمێکی دیکتاتۆری بناسرێ و خەبات لەدژی بکرێ، یان ناچار بکرێ ڕێگەیەکی دیموکراسیانە هەڵبژێرێ. ئەم ڕێگەیەی دوایی -بە بۆچوونی من- باشترین ڕێگەی چارەسەر یا ئەڵتەناتیڤی کێشەی یۆنانە.

لەبەر ئەوەی سەرەتا هێزە چەپەکان مەترسی و هەڕەشەی گەورەیان لە یۆنان دەکرد، ئەم مەترسی و هەڕەشەیە بەرە بەرە یۆنانی گەیاندە شەڕی ناوخۆ. ئێستاش ئەم مەترسییە لە هێزە ڕاستڕەوەکانەوە دێت. بۆین هەوڵی زۆری دا هەڵبژاردنێکی

---

[1] هەمان سەرچاوە. فۆندی سکرتاریەتی مۆڵەتۆڤ، ئۆپیسی٢، دیلای٧، پاپکای٤، ل٢٣-٢٤.

ڕاستەقینەو ئازاد لە یۆنان ئەنجام بدرێ. کاتێکیش دەوڵەتێکی دیموکراتیو بەهێز بێتە سەر حوکم، ئیتر هێزەکانی بریتانیا لەوێ نامێننەوە.

مۆڵەتۆڤ: ئێستا خەڵکێکی زۆر لە لەندەن بەرامبەر بەو بارودۆخەی یۆنان ناڕازین، هەروا لەسەر ئاستی دەوڵەتیش سەرکوتکردنی هێزە دیموکراتیەکانی یۆنان کە دژی ئەڵمان شەڕیان کردووە، بەردەوامە. خەڵکی یۆنان ئەم قسانە دەکەن.

بۆین: ئەم زانیارایانەی ئێوە زۆر ڕاست نین. ئەگەر شتێکیش لەم بارەیەوە هەبێ، هێزەکانی ئینگلستانی تێدا بەشدار نینو پەرەشیان پێنادەن.

مۆڵەتۆڤ: هەرچونێك بێ، یۆنانیەکان خاوەنی یۆنان نین.

بۆین: ئەی کێ خاوەنی یۆنانە؟

مۆڵەتۆڤ: ئینگلیز خاوەنی یۆنانە.

بۆین: هەروەك ڕووسەکان کە لە بوڵگارستان خۆیان بە خاوەن ماڵ دەزانن.

مۆڵەتۆڤ: لە بوڵگارستان هەڵبژاردن کرا. دەوڵەتی سۆڤیەت دان بەوەدا دەنێ کە دەسەڵاتێکی کەمی لە بوڵگارستان نییە. ڕووسیا دووجار یارمەتیی ئەم دەوڵەتەی داوە. دەبێ بۆ دەرکردنی بێگانەکان لە بوڵگاریا ئەم خاڵەش لەپێش چاو بگیرێ کە یۆنان ئەندامی هاوپەیمانییەکی دژی هیتلەر بووە، بەڵام بوڵگارستان ئەندام نەبوە. بوونی ئێمە لەوێ بەپێی پەیمانێکە ئینگلیزو ئەمریکاش ئیمزایان کردووەو بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتییە لەم وڵاتە [لێرەدا بۆ ئەوەی خوێنەران لە درێژەی وتووێژی کۆنفرانسی مۆسکۆ دانەبڕێن، ئاماژە بە چەند خاڵ دەکەین، لەمانە قەیرانی دەوڵەتی ئێران کە سەردەمی شەڕ ٦ جار حکوومەتی تێدا گۆڕاو گەلێك لە یۆنان قووڵترو ئاڵۆزتر بوو. دەوڵەتی شا لە ڕووی دیکتاتۆریو دواکەوتوویییەوە لەگەڵ یۆناندا هەر بەراورد ناکرێ. سۆڤیەت دەیتوانی وەك چۆن گوتوویە ئێمە دەسەڵاتو بەرژەوەندیمان لە بوڵگارستان هەیە، هەمان شت بۆ ئێرانیش بکات، بەتایبەت بیگوتایە بزووتنەوەکانی ئازەربایجانو کوردستان دۆستی ئەوانن، یا پێشنیاری هەڵبژاردنێکی گشتیی بە چاودێریی هەرسێ زلهێز بکردایە، یان لانی کەم داواکاری زامنکردنی چارەسەری ئەم دوو کێشەیەی ئازەربایجانو کوردستانی بوایە. جگە لەمانە، ڕووسیا چەند جارێك یارمەتیی ڕژێمی ئێرانی داوە بۆ دەرکردنی بێگانەو

هاوسنووری سۆڤیەتو پەیمانییان لە نێوانیاندا هەبوە. سۆڤیەت باسی ئاڵۆزیی بارودۆخو شەڕی ناوخۆی یۆنانی کردووە، خۆ شەڕی ناوخۆ لە ئێران پێشو کاتی دووەم جەنگی جیهانی لە کوردستانو باشووری ئێرانو ئینجا ئازەربایجانو ناوچەکانی تر هەر بەردەوام بوو. گەلانی بێمافی ئێران دژی ڕژێمی تاران هەر لە ڕاپەڕینو سەرهەڵداندا بوون. هەر ئەم گەلانە بوون دژی ڕەزا شای سەر بە ئەڵمانیای نازی پێشوازییان لە هێزەکانی هاوپەیمانان کردو پشتی ڕەزا شایان نەگرت تا دژی هاوپەیمانان شەڕ بکەن. هەر ئەو گەلانەی ئێران، بەتایبەت گەلی کورد، خاكو خەڵکەکەی لە خزمەتی هاوپەیمانانی دژی هیتلەردا بوونو بەشێکی زۆری دەغڵودانو بەرهەمی ئاژەڵداریی خۆیان دابووە هێزەکانی ئینگلیزو ئەمریکا، یان هەر لەلایەن ئەوانەوە دەستیان بەسەردا گیرابوو. لە ئەنجامدا خەڵك تووشی برسیەتیو قاتوقڕیو مردنی بەکۆمەڵ بوون- هەورامی].

دەچینەوە سەر کۆنفرانسی مۆسکۆ؛

بۆین: هێزەکانی ئینگلیز، بەپێی پەیمانێك لەگەڵ دەوڵەتی یۆناندا، لەو وڵاتەن.

مۆڵەتۆڤ: دەکرێ بڵێین ڕۆژانە حکوومەت لە یۆنان دەگۆڕدرێ، ئینگلیز پەیمانی لەگەڵ کام حکوومەتی یۆناندا بەستووە؟ جگە لەمە ئەو پەیمانەی وا ئێوە باسی دەکەن، لە چاپەمەنیەکاندا بڵاو نەکراوەتەوە. هەروا پەیمانی ڤارکیزی نێوان پارتی دیموکراتی یۆنان بە سەرۆکایەتیی بریتانیا، بێ بەشداریی دەوڵەتی سۆڤیەت، هێشتا جێبەجێ نەکراوە.

بۆین: دەبێ پەیمانی ڤارکیز ئاڵوگۆڕی تێدا بکرێ، پاشای یونان بگەڕێتەوەو پاشان هەڵبژاردن بکرێ.

مۆڵەتۆڤ: ئەی بۆچی هێزە دیموکراتەکان بەشداری لە دەوڵەتی ئێستای یۆناندا ناکەن؟

بۆین: ئێمە لە یۆنان زۆر دەستمان دەڕوات، بەڵام با بەڕێز مۆڵەتۆڤ بزانێ کە من فەرمان بە یۆنانیەکان نادەم کام لە حیزبەکان بەشداری لە حکوومەتدا بکەنو هەڵبژاردن بکرێ.

مۆڵەتۆڤ: دەبێ حکوومەتێکی دیموکراتی بێتە سەرکار.

بۆین: من دەمەوێ مانگی مارت هەڵبژاردن لە یۆنان بکرێ، بەڵام یۆنانیەکان بۆ خۆیان دەیانەوێ ئێستا ئەوە بکرێ.

مۆڵەتۆڤ: کام حکوومەت هەڵبژاردن بەڕێوە دەبات؟ زۆربەی یۆنانیەکان بڕوایان بە دەوڵەتی ئێستای ئەو وڵاتە نییە.

بۆین: ئەم شتە تەواوی وڵاتانی باڵکان دەگرێتەوە.

مۆڵەتۆڤ: وڵاتانی باڵکان شەڕیان کرد دژی هاوپەیمانان، لەکاتێکدا یۆنان ئەندامی هاوپەیمانان بوو.

بۆین: پێشنیار دەکەم هێزەکان لە نەمسا کەم بکرێنەوە [هەروا بۆین داوای کرد هێزەکان لە بولگارستان و پۆڵەندا دەربچن و ویستی کێشەی ئێرانیش وەبیر بێنێتەوە؛ باسی دەرچوونی هێزەکانی هاوپەیمانانی کرد لە ئێران، گوتی: ئینگلیزەکان تەنیا شەش هەزار کەسی هێزی سوپاییان ماوە، لە باشووری ئێرانن. بەڵام بەپێی زانیاریەکانی دەوڵەتی بریتانیا، ژمارەی هێزەکانی سۆڤیەت لە باکووری ئێران دەگاتە (٣٠) سی هەزار کەس. بۆین ویستی ئاڵوگۆڕی بیروڕا لەگەڵ مۆڵەتۆڤدا بکات سەبارەت بە ئێران، لەبەر ئەوەی هەندێ ناوچەی وەك یۆنان و تورکیا و ئێران، یەکێتیی سۆڤیەت و بریتانیا بەرژەوەندیان تێیاندا هەبوو. جا نەك لەو ناوچانەدا شەڕو تێکهەڵچوون لەنێوان سۆڤیەت و ئینگلیزدا دروست بێن، بەڵکوو دەیویست کێشەو گرفت نەیەنە ئاراوە. بۆیە گوتوویە ئێران یەکێکە لەو وڵاتانە کە پێویستە هۆشیارنەو بە بەرپرسییەکی تایبەتەوە ڕەفتاری لەگەڵدا بکرێ .

مۆڵەتۆڤ سەبارەت بە ئەندەنووسیا پرسیاری لە بۆین کرد، بۆین لە وەڵامدا گوتی: کێشەی ئێمەو ئەندەنووسیا زۆر سادەیە. کاتێك هۆڵەندا دژی ژاپۆن شەڕی ڕاگەیاند، ژاپۆن ئەو وڵاتەی داگیر کرد، ئەمە لەکاتێکدا کە هۆڵەندا خاوەنی ئەندەنووسیا بوو. بۆیە دوو ئەرك کەوتنە سەر شانی ئینگلیز:

یەکەم: خۆبەدەستەوەدانی ژاپۆن، دووەم: چەسپاندنی دیموکراسی و هێنانە سەر کاری دەوڵەتێکی مەدەنی لەم وڵاتەدا. دەوڵەتی ئینگلیز چەند هەزار دیلی نیزامی و ٣٠ هەزار کەسی ڕاگیراوی لەوێ هەن، ئەورووپایش لەناویاندا هەیە. بەڵام هەرچۆنێك

بێ دەوڵەتی ئینگلیز ناخوازێ تاسەر لەوێ بمێنێتەوە. سەبارەت بە هیندستانیش، بڕیارە مانگی مارت هەڵبژاردنی تێدا بکرێ.

[ئینگلیزو ئەمریکاو سۆڤێت تا هێزەکانیان لە ئێران مابوون، دەیانتوانی لەم کۆبوونەوەیەو کۆبوونەوەکانی ڕابردوو و تەنانەت کۆبووونەوەکانی داهاتوویشدا پێکەوە بڕیاری هەڵبژاردنی ئازادانەو دیموکراتیو هێنانە سەر کاری حکوومەتێکی هاوبەش بدەن. هەرچەندە حەمە ڕەزا شای ئێرانیشیان لە شایەتی نەخست (هەق وابوو خۆیو باوکیشی بە کۆڵێ تاوانەوە بدرێنە دادگاو حوکمی مەرگیان بەسەردا بدرێ)، بەڵام دەیانتوانی دەسەڵاتی کەمو سنووردار بکەن، یا ڕژێمی کۆماری لە ئێران دابمەزرێننو دەستوورێکی بنچینەیی بۆ دابڕێژن. بە پێچەوانەوە، هەرسێ زلهێزەکە پێشبڕکێیان دەکرد بۆ لە ئامێزگرتنی شاو ڕژێمەکەی، هیچ لایەکیان هەوڵی گۆڕینی ئەو ڕژێمەیان نەدا- هەورامی].

مۆڵەتۆڤ: مانەوەی ئێمە لە پۆڵەندا، لەبەر ڕێکخستنو گەیاندنی تفاقو خواردەمەنیو یارمەتیی هێزەکانمانە لە ئەڵمانیا. لەلایەکی ترەوە، ئێمە هێزمان هێشتووەتەوەو دوای شەڕ داومانەتەوە بە پۆڵەندا. ئێمە هێزەکانی خۆمان بە دەسپێشخەریی خۆمان بردە دەرەوە. بەڵام سەبارەت بەو هێزانەی کە لە بولگارستانو ڕۆمانیا هێشتومانەوە، لە لەندەن لەگەڵ وەزیرانی کاروباری دەرەوەی ئەمریکاو ئینگلیزدا بڕیارمان دا هێزەکانی سۆڤیەت بۆ دابینکردنو پاراستنی ڕێگەوبانەکان لە ڕۆمانیاوە بۆ نەمسا بمێننەوەو بڕیاری سێ لایەنەی لەسەر بووە. هەرچی هێنانە دەرەوەی هێزەکانیشمانە لە ئێران، ئەم کێشەیە دوو جار لە لەندەنو بەرلین باس کراو لە هەردوو جێگە بڕیار درا پەیمانی سێ لایەنەی ئینگلیزو سۆڤیەتو ئێران ڕەچاو بکرێ. بۆیە دەوڵەتی سۆڤیەت وەفادارە بەم پەیمانەو بە پێویستی نازانێ دیسانەوە ئەم کێشەیە باس بکرێتەوە. بەڵام ئەوەی پەیوەندیی بە ڕووداوەکانی باکووری ئێرانەوە هەیە، ئەوەیە کە ئەم چەشنە ڕووداوانە لە بارودۆخەکانی دوای شەڕدا شتێکی ئاسایین [ئاشکرایە ئەگەر ئەم بزووتنەوەیە ناوەڕۆکێکی دژی سۆڤیەتی هەبوایە، دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەت نەیدەتوانی لە ئاستیدا بێلایەنو تەماشاکەر بێ. ئاخر باکۆ هێندە لەو ناوچەیە دوور نییە]. گەرچی ڕووداوەکان لە

ناوچە سنووریەکانی ئێمەوە نزیکن، بەڵام دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەت دەستی لە کاروباری ئەوناوە وەرنەداوە، لە داهاتووشدا کارێکی وا ناکاتو بە کاروباری ناوخۆی ئێرانی دەزانێ.

لە درێژەی وتووێژەکاندا، باسی بوونی هێزەکانی سۆڤیەت لە نەمسا کرا. هەروەها مۆڵەتۆڤ گوتی: هەڵبژاردن لە ئێرانو بۆلگارستانو مەجارستانو فینلەندە کراوە، گەرچی ئەنجامی ئەو هەڵبژاردنانە جیاواز بوون. سۆڤیەت دەستی لە کاروباری ئەم وڵاتانە وەرنەداوە. بەڵام ئەوەی کە پەیوەندیی بە هیندستانەوە هەیە، دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەت دەزانێ ئەم وڵاتە بایەخێکی زۆری بۆ ئینگلیزەکان هەیە. ئێمە لەسەردەمی شەڕدا زۆر قایمکارانە لەگەڵ ئەم کێشەیەدا دەجووڵاینەوە.

بۆین: هیندستان بایەخێکی ژیانیی بۆ ئێمە هەیە. دەبێ ئەمەیش بگوترێو لە بەرچاو بگیرێ کە ئیمپراتۆریای بریتانی جێگەیەکی هەستیاری لە ڕۆژهەڵاتدا هەیە، بۆیە نابێ هەنگاوی نابەجێو ناعەقڵانی لەنێوان یەکێتیی سۆڤیەتو ئینگلیزدا هەڵبگیرێ.

مۆڵەتۆڤ: سەبارەت بەو دەوڵەتانەی کە ئیمپراتۆریای بریتانی پشتیوانیانەو هاوسنووری یەکێتیی سۆڤیەتن، بەداخەوە دەبێ بڵێم هەڵوێستو بەرژەوەندی یەکێتیی سۆڤیەت لە هەندێ شوێنو کاتدا ڕەچاو ناکرێن.

بوین: مەبەستی بەڕێز مۆڵەتۆڤ کام دەوڵەتە؟

مۆڵەتۆڤ: بۆ وێنە ڕۆمانیا، کە هێرشی کردە سەرمان، هێشتا هەر لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمێکی داگیرکەردا دەژیا و پەیمانی ئاشتی مۆر نەکرابوو. یەکێتیی سۆڤیەت ناتوانێ ڕژێمی دەوڵەتێکی نەیار دەر بباتا، کە تەنانەت گەلەکەی خۆیشی پشتیوانیی لێ ناکات. بەڵام کە حکوومەتێك لە ڕۆمانیا دامەزراو لەلایەن گەلی ڕۆمانیاوە پشتیوانیی لێ کرا، بریتانیا بە شێوەیەکی خراپ بەرەوڕووی بووەوە. ئەمە یەکێکە لەو نموونانە[1].

---

[1] ئەرشیڤی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی کۆماری ڕووسیای فیدراڵ (سۆڤێتی پێشوو)، فۆندی سکرتاریەتی مۆڵەتۆڤ، نۆپیسی٢، دیلای٤، پاپکای٤، ل١٦-٢٦.

باسی کێشەی چینیش کرا. کە ئەمریکا هێشتا هێزەکانی خۆی لە باکووری چین هێشتووەتەوە بۆ یارمەتیدانی دەوڵەتی چین و سەقامگیرکردنی هێمنایەتی و دەرکردنی ژاپۆن. بە قسەی نوێنەری ئەمریکا، نزیکەی ٢٢٥ هەزار سەربازی ژاپۆنی لەوێ بووە.

سیاسەتی ئەمریکا سەبارەت بە چین کە ١٩٤٥/١٢/١٥ لەلایەن کۆشکی سپییەوە ڕاگەیاندرابوو، بەم چەشنەیە کە ئەمریکا دەیەوێ شەڕی نێوان هەردوو هێزی لەشکری چین و لەشکری کۆمۆنیستی کۆتایی پێ بێ؛ هەروا داوای بەشداریی پارتە سیاسیەکانی چین لە دەوڵەتی چین و هەڵوەشاندنەوەی سوپای کۆمۆنیستیش دەکات.

لە ٢٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥دا مۆڵەتۆڤ نوێنەری سۆڤیەت و بێرنس نوێنەری ئەمریکا لە کۆنفرانسی مۆسکۆدا ڕایانگەیاند: هێشتنەوەی هێزەکانی خۆیان لە چین لەسەر داخوازیی دەوڵەتی چین بووە.

پێنجەمین کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەی ئینگلیزو ئەمریکاو سۆڤیەت لە ٢٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥دا وەزیری دەرەوەی ئەمریکا گەڵاڵەیەکی تێدا ئاڕاستەی مۆڵەتۆڤو بوێن کرد، کە بەو چەشنەیە:

١- هەرسێ زلهێز پێشنیاری سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی دەوڵەتی بولگاریا بکەن و ئەم دەوڵەتە نوێیەش لەلایەن ئەوانەوە بە ڕەسمی بناسرێ و ڕێگەی پێ بدرێ بەشداری لە کۆبوونەوەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکاندا بکات. دەبێ پێکەوە ئەو دەوڵەتە ڕاوێژ لەگەڵ ڕێکخراوە سیاسی و کۆمەڵاتیەکان و نوێنەری سێ دەوڵەتی زلهێزو تەنانەت کۆمۆنیستەکانیشدا بکات.

٢- هەڵبژاردنی ئازاد لە ماوەی شەش مانگدا بەڕێوە بچێ.

٣- دەبێ سنوور بۆ پەرلەمانی ئێستای بولگارستان دابنرێ لە یاساداناندا.

٤- لێبوردنی گشتی لە بولگارستان ڕابگەیەنرێ[١] [دەبوایە پێشنیارێکی ئاوا بۆ ئێرانیش بکرایە].

---

[١] هەمان سەرچاوە، فۆندی کۆنفرانسی مۆسکۆ، ئۆپیسی١، دیلای٧، پاپکای٢.

شیاوی باسە، هەر لە ٢٠ی کانوونی یەکەمدا گەلاڵەیەکی تری نوێنەری ئەمریکا بۆ کێشەی ڕۆمانیاش پێشکەش بە مۆڵەتۆڤ بوێن کرا، داوای تێدا کرا:

١) هەرسێ زلهێز وەڵامی نامەی بەڕێز "میخای"ی شای ڕۆمانیا بدەنەوەو پەسندی بکەن،
٢) دەبێ شا ڕازی بێ بە پێکهێنانی حکوومەتێکی نوێ لە حیزبە سیاسیەکانی ڕۆمانیا، تا ئەوکاتە پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ڕۆمانیادا ببەسترێو ئەو وڵاتە ببێتە ئەندامی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان،
٣) هەڵبژاردنێکی ئازاد لە ڕۆمانیا بکرێ،
٤) لێبوردنی گشتی ڕابگەیەنرێ[1].

نوێنەری ئەمریکا لە جێیەکی تردا پێنشیاری کردووە کە دەبێ نوێنەرانی هەرسێ زلهێز، بۆ وتوویژ لەگەڵ دەوڵەتی ئێستای ڕۆمانیاو شادا، سەر لە بوخارست بدەن تا بڕیارەکان جێبەجێ ببن.

هەروەك لە ١٩٤٥/١٢/١دا فەرمان بە هاوڕێیان سیلین‌و سیچێڤ درابوو گەلاڵەیەك سەبارەت بە کێشەی ئێران بۆ کۆنفرانسی سی زلهێز ئامادە بکەن، دیارە دەوڵەتی سۆڤیەت پێش کۆنفرانسی مۆسکۆ لە کانوونی یەکەمی ١٩٤٥دا دەیزانی وەزیرانی دەرەوەی ئەمریکاو ئینگلیز باسی کێشەی ئێران دەکەن‌و سۆڤیەت شتێکی وای نەدەویست، بەڵام پێی وابوو ئەگەر هاتوو کێشەی ناوبراو باس کرا، ئەوە سۆڤیەت پێشەکی گەلاڵەیەك لەسەر دوو تەوەر ئامادە دەکات کە بەم جۆرەیە:

یەکەم: لەسەر ڕوداوەکانی ئازەربایجان‌و کوردستان کە بە ڕووداوەکانی باکووری ئێران ناو دەبرێن.

دووەم: سەبارەت بە دەرچوونی هێزی هاوپەیمانان لە ئێران.

١- لەسەر ڕووداوەکانی باکووری ئێران:

---

[1] هەمان سەرچاوە.

یەکێتیی سۆڤیەت پێی وایە ڕووداوەکانی باکووری ئێران کێشەیەکی ناوخۆی ئێرانن و وەزارەتی دەرەوەی یەکێتیی سۆڤیەت، بە ڕە چاوکردنی ئەم تێڕوانینە، هیچ بنەمایەك بۆ دەستێوەردانی دەوڵەتانی بێگانە لە کاروباری ئەم وڵاتەدا نابینێ[1].

سیچیێڤ و سیلین

١٩٤٧/١٢/٥

٢- سەبارەت بە دەرچوونی هێزی هاوپەیمانان لە ئێران:

بە لەبەرچاوگرتنی پەیمانی ئینگلیز- سۆڤیەت- ئێران سەبارەت بە دەرچوونی هێزی هاوپەیمانان لە ئێران، دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەت بە پێویستی نازانێ بڕیارێکی نوێ لەم بارەیەوە بدرێ[2].

**ڕوونووسێك لە یاسای بنچینەیی ئێران**
**کە مەجلیسی ئێران لە ١٩٠٦/١٢/٣١دا پەسندی کردووە:**

سەبارەت بە شووراکانی ئەیالەتی (هەرێمی) و ویلایەتی (ناوچەیی).

ماددەی ٩٠: شوورای هەرێمی و ناوچەیی بەپێی یاساکانی تایبەتی دەوڵەت، لە هەموو وڵاتدا دادەمەزرێن.

ماددەی ٩١: دەبێ ئەندامانی شووراکانی هەرێمی و ناوچەیی ڕاستەوخۆ بەپێی یاساکانی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی هەڵبژاردن لەلایەن دانیشتوانەوە هەڵبژێردرێن.

ماددەی ٩٢: شووراکانی هەرێمی و ناوچەیی مافی تەواوی کۆنترۆڵکردنی هەموو کاروباری دەزگاکانی دەوڵەتیان لە ڕووی بەرژەوەندی دانیشتوانی ناوچەکانیانەوە هەیە، بە مەرجێك پێچەوانەی یاساکانی تری دەوڵەت نەبن.

ماددەی ٩٣: تەواوی داهات و خەرجیی هەرێم و ناوچەکان لەلایەن شووراکانیانەوە دیاری و پەسند دەکرێن.

[پێشکەشکردنی ئەم چوار ماددەیەی یاسای بنچینەیی ئێران بە کۆنفرانسی وەزیرانی دەرەوەی ئینگلیزو ئەمریکا و سۆڤیەت، بایەخێکی گرنگی هەبوو. سەرەڕای

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، فۆندی سکرتاریەتی مۆڵەتۆڤ، ئۆپیسی٢، دیلای١٦، پاپکای٥، ل١٢.

[2] هەمان سەرچاوە، ل١٣.

تێپەڕبوونی چل ساڵ بەسەر دەرکردنی ئەم یاسایەدا، کەچی تا ئەوکاتە نەکرابوو، ئەنجامی خەباتێکی دووروودرێژو قوربانیدانێکی زۆری گەلانی ئێران بوو، کە ڕژێمی ئەو سەردەمەی ئێرانیان ناچار کرد مل بۆ داخوازیەکانی گەلانی ئێران بدات؛ لەلایەکی ترەوە، ئەم ماددانە ئاڕاستەی کۆمسیۆنی سێ لایەنە (ئینگلیزو ئەمریکاو سۆڤیەت) کران، کە بڕیار بوو لە کۆنفرانسی مۆسکۆدا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی گەلانی ئێران بەپێی یاسای بنچینەیی ئێران پێك بێت، بەڵام بەهۆی هەڵوێستی نوێنەرانی سۆڤیەتەوە پەسند نەکراو ڕێکخستنی کۆمسیۆنەکەش سەری نەگرت.

ئەم چوار ماددەیە، بەپێی یاسای ئێران، گەورەترین فاکتەرێك بوون کە یاسای ئێران نەیدەتوانێ سەرپێچی لە جێبەجێکردنیاندا بکات. ئەمە، بە پێچەوانەی وتە بێبناغەکانی مۆڵەتۆڤەوە، هیچ دەستێوەردانێك نەبوو لە کاروباری ناوخۆی ئێراندا.

دیارە ئەگەر هاتبایە ئەرك‌و مافی شووراکانی هەرێمی‌و ناوچەیی، هەروا یاساکانی هەڵبژاردن جێبەجێ کرابان، گەلێك داخوازی‌و کێشەکانی گەلانی ئێران چارەسەر دەبوون. گەلی کوردیش، جگە لە بواری بەکارهێنان‌و فێربوونی زمانی کوردی لە قوتابخانەکاندا، بەڕێوەبردنی دام‌ودەزگاکانی دەوڵەتی دەکەوتە دەست. نوێنەرانی دەسەڵاتی ناوەندیش تا ڕادەیەکی زۆر لە کوردستاندا سنووردار دەبوون. لە ڕووی ئابووریشەوە، زۆربەی داهاتەکانی کوردستان بۆ دانیشتوانی کوردو ئاوەدانکردنەوەو پێشخستنی ناوچە کوردیەکان تەرخان دەکرا– هەورامی]

**ڕاگەیاندن سەبارەت بە کۆنفرانسی مۆسکۆ**
**(کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەی ئەمریکاو ئینگلیزو سۆڤیەت)**
**٢٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥:**

لەبارەی کۆریاو چین‌و ئەمسا (ئۆتریش)و ژاپۆن‌و ڕۆژهەڵاتی دوور ئامادەکردنی پەیمانی ئاشتی‌و وزەی ئەتۆمییەوە، بڕیار درا:

**١- کۆریا:**

هەرسێ زلهێز پێکەوە پەیمانێکیان سەبارەت بە بەڕێوەبەرێتییەکی یەکگرتوو بۆ کۆریاو هەوڵدان بۆ وەرگرتنی کۆریا وەك دەوڵەتێکی یەکگرتووی سەربەخۆ بە ئەندام

لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانداو دروستکردنی دەوڵەتێکی دیموکراتیی کاتی، ئیمزا کرد. هەروەها بڕیار درا هەرچوار دەوڵەتی ئەمریکاو ئینگلیزو سۆڤیەتو ژاپۆن ببنە سەرهەڵوێست (مانداتێر)ی کۆریا بۆ ماوەی پێنج ساڵ، تا ئەو وڵاتە بۆ خۆبەڕێوەبردنێکی تەواوو سەربەخۆی نەتەوەیی ئامادە دەکرێ. جگە لەوە، بڕیار درا نوێنەرانی سەرکردایەتیی سوپای ئەمریکاو سۆڤیەت، کە لە کۆریا جێگیرن، بە هاوئاهەنگی کۆنفرانسێك بۆ چارەسەری کێشەکانی بەڕێوەبردنو ئابووریی کۆریا ببەستن[1].

[بەداخەوە ئەو بڕیارانەی وا لەبارەی کۆریاوە دران، تائێستایش جێبەجێ نەکراون؛ جگە لەوەی کە کۆریا کرا بە دوو بەشەوە، ساڵانی ١٩٥٠-١٩٥٣یش شەڕێکی خوێناوی لەنێوان هەردوو کۆریادا قەوما. دابەشکردنی ئەو وڵاتو گەلە بە شێوەیەکی دەستکردو بەبێ ڕەزامەندیی دانیشتوانی، تراژیدیایەکی گەورەی بەدواوە بوو، بەجۆرێك کە دایكو باوكو خوشكو براو منداڵو خزمان ماوەی زیاتر لە پەنجا ساڵ لەیەکتر دابڕان، تەنانەت مۆڵەتی چاوپێکەوتنو ئاڵوگۆڕی نامەو سەردانی یەکتریشیان نەدرا. ئەو شەڕە هی گەلی کۆریا نەبوو، شەڕی جووتە بلۆکی ڕۆژاواو ڕۆژهەڵات بوو. ڕۆژاوا یارمەتیی ڕژێمی دەستەمۆی خۆیی لە باشوور دەدا، سۆڤیەتو چینو وڵاتانی تری سۆشیالیستیش هی ڕژێمەکەی خۆیان لە باکوور. جگە لەوەی کە میلیتاریزمی ژاپۆنیش لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا زیانێکی قورسی گیانیو ماددیی پێ گەیاندن. گەلی کۆریا هەر دوو قەوارەی هەبوو، لەکاتێکدا گەلی کورد بەسەر پێنج دەوڵەتدا دابەش کراو هیچ قەوارەیەکی نەبوو. دابەشکردنی کوردستانو تراژیدیای گەلی کورد مێژوویەکی زۆر خوێناویترو خەمباری هەیە، بەتایبەت بۆ ئەو خێڵو بنەماڵەو کەسوکارانە کە بەسەر ئەو دەوڵەتانەدا دابەش کران، یا بەزۆر دوور خرانەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی ئێران یا ڕۆژاوای تورکیا. هەرچۆنێك بێ، گەلی کوردو کوردستانیش وەك ئەڵمانیاو یەمەن هەر یەك دەگرنەوەو ڕۆژێك دێت ئەو سنوورە دەستکردانە هەڵدەگیرێنو نامێنن- هەورامی]

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٨٧-٨٩.

**کەڵاڵەی پێشنیارکراو سەبارەت بە دەسەڵاتو**
**ئەرکەکانی کۆمسیۆنی هاوبەشی سێلایەنە بۆ کێشەی ئێران:**

لـە "بـۆین" وەزیـری کاروبـاری دەرەوەی بریتانیـاوە بـۆ بـەڕێزان "مۆلـەتۆڤ"ی وەزیـری دەرەوەی یـەکێتیی سـۆڤیەتو "بێـرنس"ی وەزیـری کاروبـاری دەرەوەی ئەمریکا (نۆهەمین دانیشتنی کۆبوونەوەی مۆسکۆ، ١٩٤٥/١٢/٢٣).

١- کۆمسیۆن لە کاروباری خۆیدا ئەو ڕاستییەی لەبەر چاو بێ کە ماوەی مانـەوەی هێزەکانی هاوپەیمان لـە ئێران، ئابووریو دامودەزگاکانی ئەم وڵاتـە تووشی زیـانو پەیوەندیی نێوان دەوڵـەتی ناوەنـدیو دانیشتوانی هەنـدێك لـە هەرێمەکانی دوچاری گیروگرفـت بـوون. هەرسـێ دەوڵـەت دان بـەوەدا دەنـێن کـە لـەم بارەیـەوە تاڕادەیـەك بەرپرسن، بۆیە دەبێ هەوڵی یارمەتیدانی دەوڵەتی ئێران بدرێ، تا هەلومەجێکی لـەبار بۆ ڕازیکردنی تەواوی کۆمـەڵانی خـەڵکی ئێرانو پەیوەنـدیی دۆسـتانەی ئێـران لەگـەڵ وڵاتانی تردا برەخسێ.

٢- کۆمـسیۆن، بـە مەبەسـتی دابەشنـەبوونی دەوڵـەتی ئێـرانو نەهێشتنی هۆکـانی ئاڵۆزیو کێشەکانی نێونەتەوەیی، دەبێ خەریکی ئاسانکردنی کێشەی لـە ماوەیـەکی کورتدا دەرچوونی هێزی هاوپەیمانان بێ لە ئێران و پێشنیارو ئامۆژگاریەکانی خۆی لەم بارەیەوە بداتە سێ دەوڵەتی زلهێز.

٣- کۆمسیۆن دەبێ ئەم خاڵانەی لەبەر چاو بن:

ئـ) بەڵێنو گفتـی بریتانیـاو سـۆڤیەت لـە پـەیمانی ١٩٤٢دا سـەبارەت بـە ڕێزگـرتن لـە سەربەخۆیی سیاسیو سەروەریی تەواوی خاکی ئێران،

ب) بەیاننامەی سەرۆك کۆمار ڕۆزڤێڵتو ژەنـەڕاڵ سـتالینو بـەڕێز چەرچڵ کـە کـاتی کۆنفرانسی تاران سەبارەت بە ئێران داویانە.

٤- کۆمـسیۆنی هاوبەشـی سـێ لایەنـە هـەوڵ بـدات بـۆ پێکهێنـانو ئاشـتکردنەوەی دەوڵەتی ناوەندیو هەندێ ناوچەی ئەو وڵاتە کە کێشەیان بۆ دروست بووە. دەبێ ئامۆژگـاریو یارمـەتیی خۆیـان بدەنـە دەوڵـەتی ئێـران بـۆ پێکهێنـانی شـووڕای هەرێمەکان بەپێی یاسای بنچینەیی ئێران.

٥- پێشنیارەکانی کۆمسیۆن، کە پێویستە لەلایەن دەوڵەتانی ئینگلیزو ئەمریکاو سۆڤیەتەوە پەسند بکرێن، ئینجا بدرێنە دەوڵەتی ئێران، دەبێ بۆ سەرتاسەری ئێران بن، بە ئازەربایجانیشەوە.

٦- یاساکانی ئێستای ئێران بەپێی ماددەکانی یاسای بنچینەیی ئێران، ئەوانەیان کە پەیوەندییان بە شووراى هەرێمەکانەوە هەیە، زیادو ڕێکوپێكو تەواو دەکرێن. ئەو پێشنیارانەی کە بۆ هەر چەشنە گۆڕینێکی شووراکانی خۆجێیی بن، دەبێ مافو بەرپرسیی ئەم شوورایانە دیاریو پێویستییان لە باری ماڵییەوە دابین بکرێن.

٧- دەبێ کۆمسیۆن ئامۆژگاریەکانی خۆی سەبارەت بە کەڵکوەرگرتن لە زمانی کەمە نەتەوەکانی وەك: عەرەبی، تورکی، کوردی... بۆ فێربوونو خوێندنو مەبەستەکانی تری ئەو گەلانە بخاتە بەرچاو.

٨- دەبێ کۆمسیۆن، لە پرۆسەی ڕێکخستنی پێشنیارو ئامۆژگاریەکانی خۆیدا، هەمیشە لەگەڵ دەوڵەتی ئێرانو نوێنەرایەتیی تەواوی کۆڕو کۆمەڵانی خەڵکدا لە ڕاوێژدا بێ.

٩- دەبێ هەرسێ زلهێز تەواوی هەوڵو تەقەلای خۆیان بۆ دەوڵەتی ئێران بخەنە گەڕ، تا ئەو ئامۆژگاریو پێشنیارانەی کۆمسیۆن ناوەڕۆکی یاسایی وەربگرنو جێبەجێ بکرێن.

١٠- نابێ کۆمسیۆن پێشنیاری وا بکات کە بناغەی یەکپارچەیی دەوڵەتی ئێران بێهێز بکات.

١١- دەبێ یەکەمین هەڵبژاردنی هەرێمەکان بە چاودێریی کۆمسیۆن بێ[1].

**هەشتەمین دانیشتنی کۆبوونەوەی مۆسکۆ**
**سەبارەت بە بولگاریاو ڕۆمانیا**

٢٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥:

مۆڵەتۆڤ: ماوەیەك لەمەوبەر هەڵبژاردن لە بولگاریا بەڕێوە چوو، بە شێوەیەکی نهێنیو ڕێکوپێك پەرلەمانیان هەڵبژارد. ئاشکرایە هێزی بەرهەڵست لە بولگاریا

---

[1] هەمان سەرچاوە، فۆندی کۆبوونەوەی مۆسکۆ، ئۆپیسی١، دیلای٨، پاپکای٢، ل٧، ٨..

هەن، ئەمەیش دیاردەیەکی ئاسایی‌یەو لە هەموو وڵاتێکدا هەیە. ئەگەر ئێمەی سێ زلهێز پاش هەڵبژاردن دەست لە کاروباری ئەم وڵاتە وەر بدەین، ئەوە کارێکی بێکەڵك و بێ مانایە.

بێرنس: ئێمەی سێ دەوڵەتی زلهێز لە کۆنفرانسی یاڵتا بەڵێن و بڕیارمان دا هاوکاریی یەکتر بکەین بۆ هێنانە سەر کاری ڕژێمی دیموکراتی لەو وڵاتانەدا کە پاش شەڕ ئازاد کراون، وا کە گشت هێزە سیاسیەکانی ئەو وڵاتانە بەشداری لە حکوومەتی داهاتوویاندا بکەن. کاتێ ئەمریکا ڕایگەیاند بە هیچ شێوەیەك ئامادە نییە دەوڵەتەکانی ڕۆمانیاو بولگاریا بە ڕەسمی بناسێ، ئێمە پێشنیارەکانی سۆڤیەتمان سەبارەت بە کۆریا پەسند کرد، گەرچی ژمارەیەکی زۆری ئەو پێشنیارانەمان بەدڵ نەبوو.

مۆلەتۆڤ: ئێمە لە کۆنفرانسی یاڵتادا باسی دەست وەردانە کاروباری ناوخۆی وڵاتانمان نەکردووە، دەبێ بگوترێ شای ڕۆمانیا کێشەیەکی زۆری بۆ ئەم وڵاتە دروست کردووە. مانەوەی هێزەکانی ئێمە لە بولگاریاو ڕۆمانیا بەپێی پەیمانی ئاشتییە. هەروەها ئێمە هێزمان لە مەجەرستان و بەشێکی خاکی نەمسادا هەیە، لەو وڵاتەیشدا هەڵبژاردن کراوە. ئێمە دەستمان لە کاروباری ناوخۆی ئەو وڵاتانەی سەرەوە وەر نەداوەو پشتیوانیی هیچ حیزبێکی سیاسییشمان نەکردووە.

بێرنس: ئێمە سەبارەت بەو وڵاتانەی کە ناو براون، هەڵوێستمان بەپێی لێکۆڵینەوەی نوێنەرانمان وەرگرتووە. هەروەك دەڵێی، ئێمە هانی شای ڕۆمانیامان نەداوە.

بێرنس: ئەوەندەی پێوەندیی بە یۆنانەوە هەیە، ئەوەیە کە دەوڵەتی یۆنان لەکاتی بەڕێوەبردنی هەڵبژاردندا داوای لە ئەمریکا کردووە نوێنەرانی خۆی بۆ چاودێریی هەڵبژاردن ڕەوانەی یۆنان بکات، ناردوومانە. ئەم داوایە لە سۆڤیەتیش کراوەو چاودێری خۆی ناردووە. ئێمە ئێستا کە نوێنەرانی خۆمان بۆ بولگاریا و ڕۆمانیا ناردووە، بۆ لێکۆڵینەوەو تاووتوێکردنی بارودۆخی ئەم وڵاتانە نێردراون، نەك بۆ ڕەخنەگرتن. دەمانەوێ ڕێگەچارەیەك بۆ ئەم وڵاتانە بدۆزینەوە. گەر ئەم دوو دەوڵەتە بە ڕەسمی بناسین، ئەمریکا یارمەتیی ئابووریان پێشکەش دەکات (ئەگەر هاتوو

هێزەکانی سۆڤیەتیش لەویَ کەم کرانەوە). ئێمە ئاگادارین بارودۆخی ئابووریی ئەو وڵاتانە ئاڵۆزە.

مۆلـەتۆڤ: ئێمـە دەزانـین ئەمـساڵ بـەروبوومی کـشتوکاڵی لـە تـەواوی وڵاتـانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا کەم بووە.

بێرنس: ئەمریکا ناتوانێ ئەو دوو دەوڵەتە بە ڕەسمی بناسێ.

مۆڵەتۆڤ: ئەمریکاو ئینگلیز کە (یۆنان)یان بەڕەسمی ناسیوە، وەرن با بەراوردی بارودۆخی ئەم وڵاتە لەگەڵ هی بولگاریا و ڕۆمانیادا بکەین، کە بەراوردیش ناکرێ؛ هێمنی لە ڕۆمانیا و بولگاریا بەرقەرارە، بەڵام شەڕی ناوخۆو سەرکوتکردنی هێزە دیموکراتیەکان لە یۆنان هەروا بەردەوامە.

بۆین: ئێمە ئەو قسانە بەدرۆ دەخەینەوە کە گوایە ئینگلیز پشتیوانی لە شای ڕۆمانیا دەکات و ئەو پیاوە دەستەمۆی ئینگلیزە. ئەگەر ئێمەی هاوپەیمان فەرمان بە شای ڕۆمانیا بدەین کە دەبێ هەڵبژاردن بکرێ و لەم بارەوە یارمەتیی بدەین، کێشەی ڕۆمانیا چارەسەر دەبێ.

مۆڵـەتۆڤ: دەوڵـەتی ئـەمریکا چـاوەڕێی ئـەنجامی هەڵبژاردنەکـەی نـەکردو دەستبەجێ ئەو دەوڵەتەی بە ڕەسمی ناسی، بەڵام بۆ بەڕەسمی ناسینی بولگاریا و ڕۆمانیا دەڵێ: دەبێ هەڵبژاردنیان تێدا بکرێ. ئێمە دژی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجامی هەڵبژاردنـەکان و سـەرلەنوێ هەڵبژاردنـەوە نـین. پەرلـەمانی نـوێی بولگاریـا کـە بـە دەنگـدان هەڵبـژێردراوەو حکوومـەتی نـوێی هەڵبـژاردووە، ئـەمریکا دەتوانـێ دان بەوانەدا بنێ. ڕاستە هەڵبژاردن لە ڕۆمانیا نەکراوە، بەڵام دەوڵـەتی ئێستای ئـەم وڵاتـە ئامادەیە لە هاوینی داهاتوودا هەڵبژاردن بکات.

بێـرنس : دەوڵـەتی یۆنـان هاوپـەیمانی ئـەمریکا بـووە ، کاتـێ ئـەم دەوڵەتـەی بەڕەسمی ناسیوە کە شا دەسەڵاتداری ئەم وڵاتە بووە.

کەواتە بۆ بەڕەسمی ناسینی یۆنان لەلایەن ئەمریکاوە, وەك بولگاریا و ڕۆمانیا، کێـشەیەك لـەئارادا نـەبوە. سـەبارەت بـە ڕۆمانیـا، ئێمـە پێـشنیاری سـەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی حکوومـەتی ئـەم وڵاتـە بە بەشداریی هێزە دیموکراتیـەکان دەکـەین،

دەبێ گۆڕانکاری لە وەزارەتی ناوخۆی ڕۆمانیادا بکرێ، تا زەمینەی هەڵبژاردن و بڕواپێهێنانی خەڵك بۆ بەشداری لە هەڵبژاردندا خۆش بکرێ. بە بۆچوونی ئێمە، نوێنەرانی حیزبی لیبڕاڵ و جووتیاران لە دەوڵەتی ئەمڕۆی ڕۆمانیادا بەشدار نین، واتە ئەو حیزبانەی کە دژی ڕژێمی شای لایەنگری فاشیزم خەباتیان دەکرد.

مۆڵەتۆڤ: لە زۆربەی ئەو وڵاتانەدا کە هەڵبژاردنیان تێدا کراوە، وەك مەجەرستان، کەس داوای نەکردووە سەرەتا وەزیری ناوخۆ دەست لە کار بکێشێتەوەو دواتر هەڵبژاردن بکرێ، لە فینلەندو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت و نەمسا (ئۆتریش)یشدا هەروا بووە. جگە لەوە، چاودێرو کۆنتڕۆڵ لە هەڵبژاردنەکانی ئەم وڵاتانەدا نەبووەو گوشاریش نەخراوەتە سەر هیچ لایەنێك. بۆیە ئێمە وەك چاودێر بەشداریی هەڵبژاردنی یۆنانمان نەکرد، بارودۆخی ئەوێ بۆ ئێمەو بۆ هێزە دیموکراتیەکانیش قبووڵ نەکراوەو بەدڵمان نەبوە، یەکێتیی سۆڤیێت ڕێز لە پەیمانی ڤارکیزی نێوان ئینگلیزو یۆنان و هێزە دیموکراتیەکان دەگرێ.

زۆر هێزی ئۆپۆزیسیۆن لە بولگاریا نایانەوێ بەشداری لە هەڵبژاردندا بکەن، ئەگەر هاوپەیمانان ئەو هێزانە ناچار بکەن بەشداری دەوڵەتی ئێستا بن، ئەمە بە پێچەوانەی بەیاننامەی یاڵتاوەیە. لە ڕۆمانیا کە هێشتا هەڵبژاردن نەکراوە، دەبێ ڕاوێژ بە شاو دەوڵەتی ڕۆمانیا بکرێ، هەڵبژاردن بە بەشداریی نوێنەرانی هەرسێ زلهێز بەڕێوە بچێ (ئەگەر دەوڵەتی ڕۆمانیا دژی ئەم پێشنیارە نەبێ).

بێرنس: دەبێ هەڵبژاردنی ڕۆمانیایش وەك وڵاتانی تری دنیا بەڕێوە بچێ.

مۆڵەتۆڤ: هەڵبژاردن لە فینلەندو مەجەرستان و بولگاریا و نەمسا، بەبێ دەستێوەردانی هێزی دەرەکی، بەڕێوە چووە. بۆچی دەبێ هاوپەیمانان دەست لە کاروباری ڕۆمانیا وەربدەن، ئەمە بەلای ئێمەوە وەك یەکێتیی سۆڤیەت بە هیچ جۆرێك پەسەند نییە. بۆ ئاگاداریتان، نوێنەرێکی حیزبی لیبڕاڵ و نوێنەرێکی حیزبی جووتیاران ئەندامی ئەنجومەنی وەزیرانی دەوڵەتی ڕۆمانیان[١].

---

[١] هەمان سەرچاوە، فۆندی کۆبوونەوەی مۆسکۆ، ئۆپیسی٢، دیلای١، پاپکای١، ل١٤٣-١٥٢.

**کۆبوونەوەی ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥**
**(ڕاگەیاندنی نوێنەری سۆڤیەت)**
**سەبارەت بە هێزەکانی ئەمریکا لە چین:**

تائێستا نزیکەی نیو ملیۆن چەکداری سوپای ژاپۆن لە چین چەك نەکراون. مانەوەی هێزەکانی ئێمە بەپێی ئەو پەیمانەی کە لەگەڵ دەوڵەتی چیندا بەستوومانە، بۆ چەککردن و بەدیلگرتنیان هێناومانن بۆ سۆڤیەت. مانگی شوبات دەستمان کرد بە کێشانەوەی هێزەکانمان، بەڵام دەوڵەتی چین داوای لێ کردین کێشانەوەی هێزەکانمان دوا بخەین بۆ مانگێکی دیکە، هەرچەندە ئەمریکایش هێزی لە وڵاتی چین هەیە. ئێمە داوامان کردووە هێزەکانی ئێمەو ئەوانیش لە یەك کاتدا پاشەکشە بکەن.

تا ئەوکاتەی هێزەکانی ژاپۆن (چەکدارو بێچەك) لە چیندان، ئێمە نامانەوێ پاشەکشەیان پێبکەین. کەشتیەکانی ئێمە ڕۆژانە سێ هەزار ژاپۆنی بەرەو سۆڤێت دەگوازنەوە، تائێستا توانیومانە ٦٠-٧٠ هەزار ژاپۆنی بگوازینەوە، هێشتا زیاتر لە دوو سەد هەزار ژاپۆنی لە چین ماونەتەوە. ئێمە کەشتیمان بەپێی پێویست نییە بۆ گواستنەوەی ئەوانە. هەرچەندە ژاپۆنیەکان لە چین بەرنگارییان نەکرد، مانەوەو شەڕی ئێمە لە چین دژی ژاپۆن نییە، بەڵکوو بۆ چەککردنیانە. بۆ ئاگاداریتان هێشتا ژمارەیەکی زۆری ژاپۆنیەکان چەك نەکراون[1].

**یازدەهەمین دانیشتنی کۆبوونەوەی مۆسکۆ،**
**سەبارەت بە ئێران**

٢٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥:

بێرنس: سێهەمین کێشە کە دەبێ ئاشکرا باسی بکرێ، کێشەی ئێرانە.

بۆین: ئەم ڕۆژانە من بەڵێنم بە ژەنەڕاڵ ستالین دا لەم پرسیارە بکۆڵمەوە. ئێستاش دەمەوێ یاداشتەکەی خۆم لەم بارەوە ئاڕاستەی هاوکارانم بکەم بۆ تاووتوێکردن.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٦٤، ١٦٥، ١٨١، ١٨٣.

بێـرنس: مۆڵـەت بـدرێ نیـو سـەعات پـشوو بـدەین تـا ئـەم دیکۆمێنتانـە بخوێندرێنەوە[1].

**سەبارەت بە ئێران:**

بێرنس: با باسی کێشەی ئێران بکەین.

بـۆین: یەکـەم ڕاسـتکردنەوە کـە مـن لـە پاشـکۆی ژمـارە (٤)م وەرگرتـووە، ئێـوە پێشنیار دەکەن کۆمسیۆنێکی تایبەت سەبارەت بە کێشەی ئێران پێك بهێنرێ.

مۆڵـەتۆڤ: ئەمـە ڕاسـتکردنەوەی مـن نییـە، بـەڵکوو پێـشنیاری ئێوەیـە. ئێمـە ڕاستکردنەوەی ئێوە دەخەینە بەر باس.

بۆین: ئەوەندە ناهێنێ لەسەری بوەستین.

مۆڵەتۆڤ: ڕاستە.

بیرنس: دەوڵەتانی ئینگلیزو ئەمریکاو سۆڤیەت پێك هاتوون لەسەر پێکهێنانی کۆمسیۆنێکی سێ لایەنە.

مۆڵـەتۆڤ: دەوڵـەتی بریتانیـا پێکهێنـانی ئـەم کۆمـسیۆنە دەبەسـتێتەوە بـە ڕەزامەندیی دەوڵەتی ئێرانەوە.

بـۆین: مـن پێـشنیاری فۆرمـۆلێکی نـوێ دەکـەم لـەم بـارەوە (پاشـکۆی ژمـارە ٥). پێشنیار دەکەم هیچ گۆڕانکارییەك لە خاڵی یەکەمدا نەکرێ. ئێـوە لـە خـاڵی پێنجەمـدا ئەمـەتان لێ زیـاد کـردووە (تـا ئـەو جێگـەیـە کـە بـوار هـەبێ). مـن پێـشنیار دەکـەم ئـەم دەسـتەواژەیە لابـبرێ. هـەروا ئێـوە شـتێکی نوێتـان سـەبارەت بـە مـاوەی دیـاریکردنی دەرچوونی هێزەکان لێ زیاد کردووە.

مۆڵەتۆڤ: دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەت ڕاستکردنەوەکەی خۆی بە ڕاست دەزانێ.

بۆین: ئێوە ڕازی نین دەرچوونی هێزەکانمان لە ئێران تا ٢ی مارتی ١٩٤٥ تەواو بێ.

مۆڵەتۆڤ: ئێمە لەم بارەوە ڕازی نین.

بۆین: ماوەی دەرچـوونی هێزەکانمـان بەپێی پەیمانەکە تا ٢ی مـارتی ١٩٤٥ـە. ئێوە بۆچی پێشنیار دەکەن دەستەواژەی (تا ئەو جێگەیەی کە بوار هەبێ)ی بۆ زیاد بکرێ؟

مۆڵـەتۆڤ: ئێمـە ئـەم کێـشەیە دەخـەینـە ئەسـتۆی کۆمـسیۆن، بـا کۆمـسیۆن تاووتوێی بکات.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٩٢.

بۆین: ئێوه پێشنیار دەکەن ئەم کاره بخرێته ئەستۆی کۆمسیۆن؟

مۆڵەتۆڤ: بەڵێ، با کۆمسیۆن لێکۆڵینەوه لەم بارەیەوه بکات.

بیرنس: کۆمسیۆن چۆن دەتوانێ بڕیار لەسەر دەرچوونی زووتری هێزەکان له ئێران بدات؟ کۆمسیۆن هەرگیز ناتوانێ ئەم کێشەیه چارەسەر بکات. لەبەر ئەوه من پێم وایه دەستەواژەی (تا ئەو جێگەیەی که بوار هەبێ) گونجاو نییه. ئەگەر ئێمه له گەڵاڵەکەدا ئاماژه به ٢ی مارت بکەین، ئەوه دەکرێ چارەسەری ئەم کێشەیه بخەینه پێشەوه، به پێچەوانەوه بۆ ماوەیەکی دیارینەکراو دەمێنێتەوه.

بۆین: من لەسەر ئەم کێشەیه کەوتوومەته بارودۆخێکی نالەبارەوه. من و بەڕێز مۆڵەتۆڤ لەم بارەوه بیروڕامان ئاڵوگۆڕ کردو بڕیار درا دوای کۆتایی هاتنی شەڕ هێزەکانمان له ماوەی شەش مانگدا ئێران بەجێبهێڵن.

بێرنس: ئەگەر ئێمه ماوەی دەرچوونی هێزەکانمان دیاری کردووه، باشتر ئەوەیه باسی (تا ئەو جێگەیەی که بوار هەبێ) نەکرێ.

مۆڵەتۆڤ: دەبێ بارودۆخەکەیش لەبەر چاو بگیرێ، هێزەکان له وەرزی زستاندا دەرناچن.

بۆین: بەڵام دەکرێ ماوەی دەرچوونی هێزەکان تاڕادەیەك کەم بکرێتەوه.

مۆڵەتۆڤ: کۆمسیۆن ڕێك دەخرێ، با کۆمسیۆن تاووتوێی کێشەکه بکات. پێشتر کۆمسیۆن نەبوو، بەڵام ئێستا که بڕیاره ڕێك بخرێ، با ئەو لەم پرسانه بکۆڵێتەوه.

بێرنس: من دەتوانم ئەمه پەسند بکەم که وشەی مانگی مارت لابرێ. بەڵام ناتوانم ڕازی بم به دەستەواژەی (تا ئەو جێگەیەی که بوار هەبێ)ی گەڵاڵەکه.

مۆڵەتۆڤ: ئەوکاته زۆر کەس دەپرسن. کەی و چۆن؟ ئێمه بۆ ئەوەی بۆچوونێکی نادروست لەم بارەیەوه نەیەته ئاراوه، دەبێ ڕوونکردنەوەیەکمان بۆ دەستبەکاربوونی کۆمسیۆنەکه هەبێ.

بۆین:دەشێ لەجیاتی (تا ئەو جێگەیەی که دەکرێ)، ڕستەی (به زووترین کات) لەگەڵاڵەکەدا بگونجێنرێ.

بۆین: بێگومان ڕوونکردنەوەو تێگەیشتنێك له ڕستەی (به زووترین کات)دا هەن.

مۆڵەتۆڤ: من دژی ئەو فۆرمۆلەی ئەمریکا نیم له چین. ئێمه لەم بارەیەوه زۆرمان گوتووه. بەڵام لێرەدا نابێ داواکارییەکی ئەوتۆ بکرێ که جێبەجێ نەبێ، یان

بۆچوونێکی وا دروست بکات کە ئێمە لە ماوەی ٥ مانگدا جێبەجێی دەکەین. با کۆمسیۆن تاوتوێی ئەم کێشەیە بکات.

بێرنس: من تێناگەم چین چ پەیوەندییەکی بەم کێشەیەوە هەیە؟

مۆڵەتۆۋ: من فۆرمۆلەکەی ئێوەم لەسەر چین وەبیر خستەوە.

بێرنس: ئەگەر داوامان لێ بکەن هێزەکانمان بهێڵینەوە، ئێمە دەتوانین نەیار نەبین.

مۆڵەتۆۋ: بەڵام ئێمە دوو پەیمانمان لەگەڵ دەوڵەتی ئێراندا هەیە، پەیمانی ١٩٢١و١٩٢٤. خاڵەکانی ئەم دوو پەیمانە بخوێننەوە. پێویستیش ناکات داوای دەقەکانی ئەم پەیمانانە لە دەوڵەتی ئێران بکەن، چونکە لە چاپەمەنیەکاندا بڵاو بوونەتەوە.

بۆین: یەکێتیی سۆڤیەت بۆ خاڵی چوارەمی گەڵاڵەکە، پێشنیار دەکات لەباتی وشەی ناوچە (هەرێم) بەکار بهێنرێ. من نازانم ئایا ئەمە وشەیەکی باوە بەکار دێت و واتایەکی تایبەتی لە ناوچەکەدا هەیە، وا ئێوە پێی لەسەر دادەگرن؟ شووڕای هەرێمی یان ئەیالەتی بەکار هاتووە. بۆیە دەستەواژەی شووڕای هەرێمی لەباتی ناوچە هاتووە.

بۆین: من هیچ دژی ئەم شتە ناڵێم، تەنیا ڕاستکردنەوەیەکم سەبارەت بە کەمە نەتەوەکان هەیە. لە ڕاستکردنەوەکەی گەڵاڵەکەی سۆڤیەتدا باسی زمانی کەمە نەتەوەکان دەکرێ. زمانی ڕەسمی لە دەوڵەتی ئێران فارسییە، هەروەك چۆن زمانی ڕەسمی لە ڕووسیا ڕووسییە. کەواتە پێویستە بزانرێ بواری بەکارهێنانی چ زمانێکی تر هەیە. لە گەڵاڵەکەی ئێوەدا وا دەردەکەوێ زمانەکانی خۆجێیی لە ئاستی زمانی فارسیدان کە زمانێکی دەوڵەتییە، بۆیە من داوا دەکەم گەڵاڵەکەی ئێمە پەسند بکرێ.

مۆڵەتۆۋ: بەڕێز بۆین دەڵێت زمانی ڕەسمی لە یەکێتیی سۆڤیەت ڕووسییە، کە وا نییە. شانزە کۆمار کە شووڕای یەکێتیی سۆڤیەتیان پێك هێناوە، هەرکامیان زمانی دەوڵەتیی خۆیان هەیە. ئۆکرانیەکان زمانی ئوکرانی، بیلە ڕووسیا زمانی بیلە ڕووسی و کۆماری ئۆزبەکستان زمانی ئۆزبەکی و... .

بۆین: بەڵام زمانی دەوڵەتی لە ئێران فارسییە. من دەمەوێ ئەم مافە بۆ دەوڵەتی ئێران، واتە زمانی فارسی زمانی دەوڵەتی بێ، بمێنێتەوە.

مۆڵەتۆۋ: ئێمە دەڵێین مافی کەڵك وەرگرتن لە زمانی نەتەوەیی هەبێ. ئێوە بۆ خۆتان دەنووسن: دەکرێ کەڵك لە زمانی تورکی و کوردی و زمانەکانی تر وەربگیرێ.

بۆین: کەوابوو ئێوە باسی زمانی دەوڵەتی ناکەن؟

مۆڵەتۆڤ: من باسی زمانی کەمە نەتەوەکان دەکەم.

بۆین: ئێوە تەنیا باسی بەکارهێنان و ئازادیی ئەم زمانانە دەکەن؟

مۆڵەتۆڤ: بەڵێ.

بۆین: لێرەدا ڕەنگە ئەمە هەندێك بۆچوونی خراپی بەدواوە بێ.

مۆڵەتۆڤ: نابێ پێش لە بەکارهێنانی زمانی نەتەوەیی بگیرێ و جێی شەرم بێ. ئێمەی ئۆکرانی شەرم لە بەکارهێنانی زمانی خۆمان ناکەین.

بۆین: کێشەی کەڵك وەرگرتن و بەکارهێنانی زمانی نەتەوەیی یا زمانە نافارسیەکان، دەکرێ کۆمسیۆنەکە بڕیاری لێ بدات.

مۆڵەتۆڤ: نابێ پێش لە تورك و کوردو عەرەب بگیرێ، یا وایان لێ بکرێ شەرم لە کەڵك وەرگرتن لە زمانی خۆیان بکەن.

بۆین: ئەگەر بە شێوەیەکی ئازادانە باسی بەکارهێنانی زمان بکرێ، ئەوکاتە نەتەوەی واش هەن کە بایەخێکی پلە دوویان هەیە. ئەوانە فێری زمانی خۆیان دەبن، بەڵام دەبێ فێری زمانی دەوڵەتیش بن. ئێوە پێشنیار دەکەن مافی کەڵك وەرگرتن و بەکارهێنانی زمانی کەمە نەتەوەکان لە گەڵاڵەکەدا بگونجێندرێ.

مۆڵەتۆڤ: دەبێ پشتیوانی لەو بیرە بکرێ کە کەمە نەتەوەکان ئازادانە کەڵك لە بەکارهێنانی زمانی خۆیان وەربگرن. بۆ نموونە، فێربوونی زمانی ڕووسی لە ئۆکرانیا شتێکە گومانی لەسەر نییە، بەڵام لەپاڵ زمانی ڕووسیادا تەواوی خوێندن و فێرکردن بە زمانی زگماك، واتە ئۆکرانییەو لە گورجستانیش زمانی گورجییەو...، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا زمانی ڕووسی ناچاری و پێویستە. ئەم کارە پێش بە کێ دەگرێ؟ لای ئێمە پێش بە کەس ناگرێ.

بۆین: دەکرێ پێشنیار بکرێ مافی کەمە نەتەوەکان هەبێ.

مۆڵەتۆڤ: لێرە شتێك دەبێتە هۆی خراپ لەیەکتر تێگەیشتن؟ زمانەکان لای ئێمە زۆرترن تا لە ئێران. بەڵام هیچ خراپ لەیەکتر تێگەیشتنێك لەئارادا نییە. کۆمسیۆن دەتوانێ کاری زۆرتر لەسەر ئەم پرسە بکات.

بۆین: بەڵام کاری کۆمسیۆنەکە سنووردار دەکرێ.

مۆڵـەتۆڤ: ئەمـە سـنووردارکردنی کـاری کۆمـسیۆنەکە نییـە، بـەڵکوو دەبێتـە دەستوورێك بۆ کاروباری کۆمسیۆنەکە.

بۆین: بەڵام نابێ لەبیر بکرێ کە دەبێ ڕەزامەندیی دەوڵەتی ئێرانیش وەربگیرێ بۆ ئەم پەیمانە. نابێ ئێمە گرفتی زۆرتر بۆ خۆمان دروست بکەین. بەڵام من دەمەوێ بە هانای ئێوەوە بێم‌و پێشنیار بکەم کەڵك وەرگرتن لە زمانەکانی غەیرە فارسی ئازاد بێ.

بۆین: واتای ناسیۆنالی، نەتەوەیی چییە؟

مۆڵەتۆڤ: لای ئێمە وشەی کەمە نەتەوەکان بەکار دێت.

بۆین: بەڵام ڕەنگە بۆچوون‌و لێکدانەوەی نادروست بۆ وشەی کەمە نەتەوەکان هەبن.

مۆڵەتۆڤ: زمانی کەمە نەتـەوەکان بـۆ خوێنـدن‌و پـەروەردە بـەکار دێـت. لای ئێمە کەمە نەتەوەکان شتێکی ڕوون‌و ئاشکرایە. واتـە زمـانی ڕووسـی زمـانی کـەمـە نەتـەوە نییـە، ئەمـە لای ڕووسـەکانیش ئاشـکرایە. ئەگـەنا دیـار نـەدەبوو مەبەسـت لـە کەمـە نەتـەوەکان چییە. مـن پـێم وایـە زمـانی ئینگلیـزی ئەوەنـدە نـەرم‌و نیانـە، دەکـرێ بـە ئاسانی ئەم وشەیەی پێ ڕوون بکرێتـەوە. دەکرێ لـە تێکستە ئینگلیزیەکەدا وشـەی (کەمایەتیەکان)و بە ڕووسی (کەمە نەتەوەکان) بێ.

بۆین: باشە.

مۆڵـەتۆڤ: کەواتـە وشـەی ئـازاد لادەبـرێ. ئەمـە بـەو واتایەیـە کـە هەرکـەس بێ‌شەرمکردن کەڵك لە زمانی خۆی وەربگرێ.

بۆین: ئێـوە پێشنیارەکەی منتـان بـۆ گونجانـدنی وشـەی (مـاف) لـە پێشنیارەکەدا پەسند کرد؟

مۆڵەتۆڤ: وەرن با کێشەکە بە ڕاشکاوی باس بکەین.

بۆین: ئەمە هەموو ڕاستکردنەوەکانی ئێوە بوو. ئێستا کێشە تـەنیا سـەبارەت بـە بەکارهێنانی دەستەواژەی (تا ئەو جێگەیەی بوار هەبێ) ماوە. ئایا باشتر نییـە لـەباتی دەستەواژەی ناوبراو (ئەگەر بکرێ زووتر) بە بەکار بهێنرێ؟

مۆڵەتۆڤ: هەرگیز ناتوانم بەمە ڕازی بم.

بۆین: بۆ ئەوەی ڕێگەیەکی مامناوەندی‌و ئاشتیانە هەڵبژێرین، من ئامادەم وشـەی ئـازاد بـەکار بهێنـرێ، ئەگـەر بـەڕێز مۆڵـەتۆڤ پێـشنیارەکەی مـن سـەبارەت بـە ماوەکـە پەسند بکات.

مۆڵەتۆڤ: نابێ شتێك پەسند بکرێ کە ڕاست نییە، ئێمە پێشنیار دەکەین کۆمسیۆن ئەم کێشەیە تاووتوێ بکات، واتە لەسەر دەرچوونی هێزەکان تا ئەو جێگەیەی کە بوار هەبێ.

بۆین: وشەی (زووتر) یان پێشخستن هیچ ماوەیەکی بۆ دانانرێ، یان پێوە نابەسترێتەوە. من پێم وا نییە ڕستەی (تا ئەو جێگەیەی کە بوار هەبێ)، ڕستەیەکی گونجاو و باش بێ.

مۆڵەتۆڤ: من ناتوانم بە شتێکی ناڕاست ڕازی بم. ئاڕاستەکردنی هەرسێ دەوڵەت مەرجەکانیان بەرامبەر بەیەك ڕاگرتووە، هەر لایەنە دەخوازێ هی خۆی بگونجێنێ، واتە نابێ ئەم غاردانی ئەسپە بکرێ. با کۆمسیۆن لەم کێشەیە بکۆڵێتەوە. نوێنەرانی ئەمریکاو سۆڤیەت و ئینگلیز لە کۆمسیۆندا هەن. ئەوانە لەگەڵ ئەم کێشەیەو هەلومەرجەکانیدا ئاشنان و لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن. بەکارهێنانی ڕستەی (بە زووترین کات پێش بخرێ) واتای چییە؟

بۆین: ئەمە بەو واتایەیە کە هێزەکانی سێ دەوڵەت دەست بە کشانەوە دەکەن و بەرە بەرە سەربەخۆیی ئێران دەچێتەوە بارودۆخی ئاسایی و باوەڕ بە سەقامگیربوونی ئاشتی و بە کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی زۆرتر دەبێ. بێگومان لێرەدا هەندێك خراپ لەیەکتر تێگەیشتن هەیە کە زەحمەتە نەهێڵرێ.

مۆڵەتۆڤ: وەرن با تەواوی کێشەکانی سەر بە ئێران وەلا بخەین و وازیان لێ بهێنین.

بۆین: ئەی کەی و چ کاتێك لە کێشەی ئێران بکۆڵینەوە؟

مۆڵەتۆڤ: من پێم وایە مەرج نییە ئەم کێشەیە لەم کۆنفرانسەدا چارەسەر بکەین، بەڵکوو دەکرێ پاشان چارەسەری بکەین.

بۆین: ئەگەر ئەم کێشەیە چارەسەر نەکەین، ئەی کەی بێتە ئاراوە؟ من زۆر حەز دەکەم ئەم پرسە هەر لێرە چارەسەر بکرێ.

مۆڵەتۆڤ: ئێمە دژی ئەمە نین. ئێمە گەڵاڵەکەی ئێوە بە هەندێك ڕاستکردنەوەوە پەسند دەکەین. بەڵام ئێوە پێشنیار دەکەن ئەو گەڵاڵەیە بێ ڕاستکردنەوەو ئاڵوگۆڕ پەسند بکەین. ئێوە دەتانەوێ بیسەپێنن، سەپاندنیش نابێ هەبێ. ڕاستکردنەوەکانی ئێمە زۆر کەمن.

بۆین: ئەم پرسە هەڵدەگرین بۆ سبەینێ.

مۆڵەتۆڤ: باشە[1].

**دوازدەهەمین دانیشتنی کۆنفرانسی مۆسکۆ**

**١٩٤٥/١٢/٢٦ (پاشکۆی ژمارە ٣).**

**تێکستی بڕیار لەسەر ڕۆمانیا:**

هەرسێ زلهێز ئامادەن ئامۆژگاریی "میخای"ی پاشای ڕۆمانیا بکەن، ناوبراو لە نامەکەی ڕێکەوتی ٢١ی ئابی ١٩٤٥یدا داوا دەکات پێکهاتەی دەوڵەتی ڕۆمانیا فراوانتر بکرێ. پێشنیار بە پاشا دەکرێ کەسێك لە پارتی نەتەوەیی پاشایەتیی ڕۆمانیاو کەسێك لە پارتی لیبراڵی بخرێتە ڕیزی کابینەی وەزیرانەوە.

کۆمسیۆن دەبێ ئەو لایەنانەی کە لە خوارەوە ناویان هاتووە، قەناعەتت پێ بکات کە:

١- ئەوانەی بە ڕاستی نوێنەرانی ئەو گرووپ و پارتانەن کە لە دەوڵەتی ئێستای ڕۆمانیادا بەشدار نین،

٢- ئەوانە بۆ کارکردن لەناو دەوڵەتی ڕۆمانیادا لەبارو پێویستن و بە نیازپاکی و بێلایەنانە ئامادەی کارن لەگەڵ دەوڵەتدا.

هەرسێ دەوڵەتی زلهێزیش دەبێ ئەمەیان لەبەر چاو بێ کە دەبێ بە ڕێکخستنەوەی سەرلەنوێی دەوڵەتی ڕۆمانیا، ئەو دەوڵەتە ڕابگەیەنێ هەڵبژاردن بە شێوەیەکی گشتی و نهێنی بەڕێوە ببات. دەبێ تەواوی پارتە دیموکرات و دژی فاشیستەکان مافی بەشدارییان لەم هەڵبژاردنەداو پاڵێوراوی خۆیان هەبێ. کە دەوڵەتی نوێش دروست بوو، دەبێ بەڵێن بدات چاپەمەنی، مافی بیروڕا دەربڕین، دین و کۆڕو کۆمەڵ ئازاد بن.

بەڕێزان ویشینیسکی ئا. یا گاری مەن. گ. ن. و سێر ئا. کلارك کێر، وەك ئەندامانی کۆمسیۆن پێیان ڕاسپێردراوە بە زووترین کات بۆ ڕاوێژکردن لەگەڵ "میخای" پاشای ڕۆمانیاو ئەندامانی دەوڵەتی ئێستای ڕۆمانیادا، بە مەبەستی جێبەجێکردنی ئەو ئەرکانەی وا باس کران، بڕۆنە بوخاریستی پایتەختی ڕۆمانیا.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٢٤٠-٢٤٥.

کاتێك ئەم ئەركانە جێبەجێ و چارەسەر كران، بەڵێنەكانی دەوڵەتی ڕۆمانیا لەلایەن ئەمریكاو بریتانیاوە بەڕەسمی ناسران و پەیوەندیی دیپلۆماسی بەرقەرار بوو، دەوڵەتی ڕۆمانیا لەلایەن ئەمریكاو ئینگلیزەوە بە ڕەسمی دەناسرێ و پەیوەندیی دیپلۆماسیی پێوە دەبەستن[1].

**دوانزەهەمین كۆبوونەوەی كۆنفرانسی مۆسكۆ**

**ژمارە ٣٩، ٢٥ی كانوونی یەكەمی ١٩٤٥**

(**پاشكۆی ژمارە٤**):

نێردراوە بۆ دەستەی نوێنەرایەتیی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و بریتانیا

دەستەی نوێنەرایەتیی یەكێتیی سۆڤیەت پێشنیار دەكات ئەم ڕاستكردنەوانە سەبارەت بە دەسەڵاتی كۆمسیۆنی سێ لایەنە لەسەر ئێران لە گەڵاڵەكەدا بگونجێنرێ.

١- سەردێڕی گەڵاڵەكە بەم شێوەیە چاك بكرێ ((سەبارەت بە كۆمسیۆنی سێ لایەنە بۆ كێشەی ئێران)).

٢- گەڵاڵەكە سەرەتا بەم ڕستەیە دەست پێ بكات: ((دەوڵەتانی بریتانیاو سۆڤیەت و ئەمریكا بڕیاری پێكهێنانی كۆمسیۆنی سێ لایەنەیان بۆ كێشەی ئێران دا)).

٣- خاڵی سێهەمی گەڵاڵەكە بەم چەشنە بێ: ((بە مەبەستی نەهێشتنی مەترسیی دەوڵەتی ئێران لە پارچەپارچەبوونی وڵاتەكەی، هەروەها ئەو هۆیانەی كە بوونەتە مایەی ئاڵۆزیی بارودۆخی نێونەتەوەیی، دەبێ كۆمسیۆن كێشەی دەرچوونی هێزەكانی هاوپەیمان لە ئێران تا ئەو جێگەیەی كە بوار هەبێ خێراتر بكات و پێشنیارەكانی لەم بارەیەوە ئاڕاستەی سێ دەوڵەتی زلهێزەكە بكات)).

٤- لە خاڵی پێنجەمدا لەبری دەستەواژەی ((هەندێك ناوچەی ئێران))، بنووسرێ ((هەندێك هەرێمی ئێران)).

٥- خاڵی حەوتەم بەم چەشنە ڕاست بكرێنەوە: ((كۆمسیۆن دەبێ پێشنیاری بەكارهێنانی ئازادانەی زمانی كەمە نەتەوەكان وەك زمانی عەرەبی، توركی، كوردی... بۆ پەروەردەو خوێندن و مەبەستەكانی تر فەرهەم بكات)).

٢٥ی كانوونی یەكەمی ١٩٤٥[2]

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٢٤٠-٢٥٠.

[2] هەمان سەرچاوە، ل٢٥٠.

**دوانزەهەمین دانیشتنی کۆنفرانسی مۆسکۆ**

(پاشکۆی ژمارە ٥)، ٢٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥

**بۆین داویە بە بەڕێزان مۆڵەتۆڤ و بێرنس:**

کۆمسیۆنی سێ لایەنە سەبارەت بە کاروباری ئێران، دەوڵەتانی بریتانیا و یەکێتیی سۆڤیەت و ئەمریکا لەسەر پێکهێنانی کۆمسیۆنی سێ لایەنە ڕێک کەوتن. ئەم ڕێککەوتنە بۆ پەسندکردن دەدرێ بە دەوڵەتی ئێران[1].

**سیانزەهەمین دانیشتنی کۆنفرانسی مۆسکۆ**

١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥:

دەستەی نوێنەرایەتیی یەکێتیی سۆڤیەت

مۆڵەتۆڤ. م

ویشینسکی. ئا. یا

گۆسیڤ. ف.ی

مالیك. یا. ئا

دەستەی نوێنەرایەتیی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا:

بێرنس. د

گاری مەن. ئا

کۆین. ب

بۆلین. چ

دەستەی نوێنەرایەتیی بریتانیای گەورە:

بۆین. ئی

کیێر. ئا

کادۆگان. ئا

کیمپ بیم. ر

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٢٥١.

[دوای تاووتوێکردن و لێکۆڵینەوەی کێشەکانی بولگاریاو نەمساو چین و کۆریا، کێشەی ئێرانیش بەم جۆرەی خوارەوە باس کرا. ئەم دانیشتنە ڕۆژی پێش تەواوبوونی کۆنفرانسەکەیەو دەبوایە بۆ ڕۆژی دوایی بڕیارەکانی کۆنفرانسەکە، لەوانە کێشەی ئێرانیش، بخرێتە ناو بڕیارەکانی کۆتایی کۆنفرانس. بەڵام با بزانین کێشەی ئێران چۆن باس کرا؟- هەورامی]

مۆڵەتۆڤ: وەرن با پرسەکانی تر تاووتوێ بکەین، ئەگەر ئێوە نەیار نەبن.

بیرنس: باشتر بوو کێشەی ئێران تاووتوێ بکەین ئەگەر ئامادەیە.

٢- سەبارەت بە ئێران

مۆڵەتۆڤ: دەکرێ سەرەتا کێشەی ئێران تاووتوێ بکرێ، ئەمجار بچینە سەر کێشەی نەمساو ئەڵمان. بەڵام ئێرانیەکان لێرە نین و هیچ شتێك بەبێ ئەوان سەر ناگرێ.

بۆین: ئیتر ئەمە بڕیاری دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەتە؟

مۆڵەتۆڤ: دیارە تەنیا کێشەی ئێران لە پرۆگرامی کاری ڕۆژانەی ئێمەدا نییە.

بێرنس: سەرەتا کێشەی ئێران لە بڕیاری پرۆگرامی ڕۆژانەدا گونجێندرابوو.

مۆڵەتۆڤ: لە یەکەم دانیشتنی کۆنفرانسەکەدا گوتمان، کام لەم کێشانە لە پرۆگرامی کۆنفرانسەکەدا بگونجێنین.

بێرنس: ئێمە بڕیارمان دا کێشەی بردنە دەرەوەی هێزەکانمان لە ئێران لابەرین، بەڵام پاشان بڕیارمان دا ئەم کێشەیە دووبارە باس بکرێتەوە.

بۆین: دەبێ بگوترێ کێشەکانی نەمساو ئەڵمانیاش لە بڕیاری کاری ڕۆژانەماندا نەبوون. ئەم کێشانەیش وەك کێشەی ئێران لە بارودۆخێکی وەهادان. ئێمە بڕیارمان دا ئەم کێشانە بە شێوەیەکی نارەسمی تاووتوێ بکەین.

مۆڵەتۆڤ: بەڕێز بۆین، ڕاست دەکات. ئێمە بە ڕاستی بڕیارمان دا ئەم کێشانە بە شێوەیەکی نارەسمی تاووتوێ بکەین.

بۆین: بەڵام من دەمەوێ کێشەی ئێران لە کاتی وتووێژە ڕەسمیەکاندا چارەسەر بکرێ.

مۆڵەتۆڤ: ئێمە قسەمان لەسەر ئێران کردو هەڵوێستی خۆمان ڕوون کردەوە. بەڵام ئێستا ناتوانین ئەم کێشەیە چارەسەر بکەین.

بێرنس: من وا تێدەگەم هیچ کاتێك نۆرەی چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە ناگات.
مۆلەتۆڤ: ژیان ڕێڕەوی خۆی دەبڕێ[1].

بۆین: من زۆر نیگەرانی ئێرانم. وەك تێگەیشتم دەولەتی یەکێتیی سۆڤیەت ئێستا بواری ئەوەی نییە باسی کێشەی ئێران بکات. کێشەکە لێرە هێنرایە کایەوە، لێرەش تاووتوێ کراو وا تێگەیشتم ژەنەڕاڵ ستالین پەسندی کردووە. لەلایەکی ترەوە، من کەموزۆر بەشی هەرە زۆری ڕاستکردنەوەکانی پێشنیارکراوم بۆ گەلاڵەی کۆمسیۆنی سێ لایەنە سەبارەت بە ئێران پەسند کرد. تەنیا ئەوەم دەوێ ڕەزامەندیی دەولەتی ئێرانیش لە گەلاڵەکەدا بنووسرێ، دەنا ڕەنگە خراپ تێگەیشتن بێتە ئاراوە. ئەگەر ئێوە ناتوانن ئەمە پەسند بکەن، من پێشنیار دەکەم ئەم ڕستەیە لە بڕیارنامەی کۆتایی کۆنفرانسەکەدا بگونجێنرێ: ((دەربارەی کێشەی ئێران، بیروڕا لەنێوان وەزیرانی دەرەوەی یەکێتیی سۆڤیەت و ئەمریکا و ئینگلیزدا ئاڵوگۆڕ کراو بڕیاری لەسەر درا)).

پێم وایە هەر ئەوەندە بەسە بنووسرێ بیروڕا ئاڵوگۆڕ کرا. ئێمە هێشتا هیچ بڕیارێکمان نەداوەو هیچ ئامادەکارییەك نەبوە. ئەم پرسەمان لە بڕیاری کاری ڕۆژانەی کۆنفرانسەکەشدا نەگونجاندبوو. بۆیە -بە بۆچوونی من- نابێ لە بڕیاری کۆتایی کۆنفرانسەکەدا ئاماژە بەم کێشەیە بکرێ.

بۆین: ئێستا من نازانم چی بکەم؟
مۆلەتۆڤ: ئێوە زۆر باش دەزانن. پێشنیار دەکەم بڕیاری کۆتایی کۆنفرانس تاووتوێ بکرێ.
بۆین: ئێستا من لە هەڵوێستی ئێوە تێگەیشتم.
مۆلەتۆڤ: گومانم نییە تێدەگەن.
بۆین: لەم بارەوە زۆر بەداخم. وام دەزانی ئەمە هەنگاوێك دەبێ بۆ نەهێشتنی خراپ لەیەکتر تێگەیشتن کە پێویست بوو لەنێوان دەولەتەکانماندا نەهێڵرێ.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٢٦٢، ٢٦٣.

بیرنس: پێشنیار دەکەم ئێستا پشوویەك بدرێ. داوا لە کۆمسیۆنی ڕێکخستنی ئەنجامی بڕیارەکانی کۆنفرانس بکەین تێکستەکەمان بداتێ[1].

### چوارەهەمین دانیشتنی کۆنفرانسی مۆسکۆ
(دواین کۆبوونەوە)

٢٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٤:

بیرنس: پێشنیار دەکات کۆبوونەوەی دوایی لە واشینگتۆن و کاتەکەشی دیاریکراو بێ.

بۆین: ئامادەم بە مەرجێك لە لەندەن نەبێ.

مۆلەتۆڤ: لە لەندەن میوان زۆرە، جێگە نابێتەوە.

بۆین: ئێمە جێگەی زۆرمان بۆ هەموو کەس هەیە، باشتر دەبوو بۆ جێگەیەك بڕۆیشتینایە کە نە تالون [کۆپوونی وەرگرتنی خواردەمەنی کە مەبەستی سۆڤیەتە- هەورامی] و نە کارت [واتا ئەمریکا]ی لێ بێ.

مۆلەتۆڤ: ئامادەم.

پاشان نوێنەرایەتیی سۆڤیەت داوای لە نوێنەرانی ئەمریکاو ئینگلیز کرد هەر مەرجە پێنشیاکراوەکان سەبارەت بە بولگاریا و بڕیاری هەرسێ زلهێز لەم بارەیەوە بگرنە ئەستۆی خۆیان. واتە هەلبژاردن بکرێ و پارتە سیاسیەکان لەو دەولەتەدا بەشدار بکرێن و... بۆ ئەوەی ئەمریکا و ئینگلیز ئەم دەولەتە بەڕەسمی بناسن[2]. بەلام نوێنەرانی ئەمریکاو ئینگلیز ئامادە نابن تا کاتێك ئەم دەولەتە مەرجەکان جێبەجێ نەکات، بەڕەسمی بیناسن.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٢٦٢-٢٦٩.

[2] گەرچی گەلاڵەکە سەبارەت بە ئێران بە هۆی تەگەرەی سۆڤیەتەوە پێشنیار نەکرا، تەنانەت ئەو ڕستەیەشیان پەسند نەکرد کە لەسەر ئێران بیروڕا ئالوگۆڕ کراوەو هەرسێ زلهێز لەم بارەیەوە تێگەیشتنیان هەیە، وا کە لە کۆبوونەوەی داهاتوودا باس بکرێ و بڕیاری لەسەر بدرێ. کەچی ئینگلیزو ئەمریکا پێشنیاری سۆڤیەتیان لەسەر بولگاریا پەسند کردو چارەنووسی ئەو وڵاتەیان خستە دەستی سۆڤیەت، ئەویش گفتی بەجێهێنانی مەرجەکانی پێشنیارکراوی ئەوانی دا. ئایا نەدەکرا سۆڤیەتیش بەرامبەر بەو هەڵوێستەی ئەوان لەسەر ئێران، بە دەنگیەوە چووبایە؟!

بۆین: دەمەوێ پرسیارێك بكەم، ئایا بڕیارو بەڵگەیەك سەبارەت بە ئێران هەیە بۆ ئەوەی لەگەڵ بڕیارەکانی ئەنجامی کۆنفرانسەکەدا بگونجێندرێن؟
مۆڵەتۆڤ: جارێ شتێکی گونجاو نییە. لەوانەیە پاش ماوەیەکی تر هەبێ.

مۆڵـەتۆڤ، دوای مـۆرکردنی بڕیـاری ئەنجامـەکانی کـۆنفرانس لەلایـەن وەزیرانـی کاروباری دەرەوەی هەرسێ زلهێزەوە، گوتوویـە ئێمـە کـارێکی زۆرمـان کـرد، هیوامـە درێژە بە سەرکەوتن بدەن[1].

ئێستا با بزانین هەڵوێستی لایەنە بەشدارەکانی کێشەی ئێران چۆنە؟ وتـارێکی ڕۆژنامـەی" پراڤـدا"ی زمـانی حـاڵی سیاسـەتی سـۆڤیەتو ڕۆژنامـەکانی ئێـرانو کەسـێتیی ڕێبـەرانی ئێـران کەسـێکی بەتایبـەت وەك محەمـەدی موسـەددیقیـان بـە مرۆڤێکـی نیشتمانپەروەرو پێشکەوتوو و دیموکراتخـواز نـاو بـردووە. بـەڵام هەسـتی شۆڤینیو ئێرانچێتی ئەو پیاوەی کوێر کـردووە، تەنانـەت مافی ئاخـاوتنو خوێنـدنو فێرکـردن بـۆ گـەلانی بندەسـتی ئێـران بـە زمـانی زگمـاکی خۆیـان، واتـە ئـەو مافـە سەرەتاییانەی کە لە یاسای بنچینەیی ئێرانیشدا هەبوون، بە ڕەوای نەدیون، تـەنیا ئازادیو مافی بۆ نەتەوەی باڵادەست -واتە فارس- ویستووەو گەلانی تری غـەیرە فارسی ئێرانی وا داناوە هەر بندەست بنو بتوێنرێنـەوەو بـۆ خزمـەتکردنو پاراستنو ئاوەدانکردنەوەی ئێران بن، جێبەجێکردنی یاسای بنچینەیی ئێران، یان ڕێکخستنی کۆمـسیۆنی سـێ لایەنـەی بـۆ لێکۆڵینـەوەو چارەسـەرکردنی کێـشەی ئێـران بـە پارچـەکردنی ئێـران زانیـوە. موسـەددیقو هاوبیرەکـانی زۆر بـوونو تائێـستاش لایـەنگرانی ئـەو ڕێبـازە کـە ٩٥ سـاڵ بەسـەر دامەزرانـدنی یاسـای بنچینەییی سـاڵی ١٩٠٦ی ئێراندا تێدەپەڕێ، هەر لە زۆربووندان. کاربەدەستانی ئێرانو کەسانی وەك موسەددیق ئـەو خزمەتـە گەورەیـەی سۆڤیەتیان نەشاردوەتەوەو سوپاسو پێزانینـی خۆیان ئاراستەی سۆڤیەت کردووە کە جارێکی تر ئێرانی لـە دابەشبوون ڕزگـار کـردو لەم بارەیەوە خۆیان بە قەرزاری سۆڤیەت داناوە.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٢٧٤، ٢٧٥.

یاسـای بنـچینەیی (قـانون اساسـی)ی ئێـران، پەسـندکراوی سـاڵی ١٩٠٦، تـا شۆڕشی ١٩٧٩ی گەلانی ئێرانیش لە ئێراندا هەر جێبەجێ نەکراو لەگۆڕ نرا. کۆماری ئیسلامیش، سەرەڕای تێپەڕبوونی ٢٨ ساڵ بەسەر ئەو شۆڕشەدا، هێشتا ماددەی ١٥ی یاسای بنچینەیی ئێرانی سەبارەت بە بەکارهێنانی زمانی زگماکی گەلانی غەیرە فارسی بەجێ نەهێناوە. کوردو گەلانی غەیرە فارسی ئێران تائێستا ڕێیان نەدراوە بە زمانی خۆیان بخوێنن‌و بنووسن؛ داواکردنی ئەو مافەیان هەمیشە بە ئاگرو ئاسن وەڵام دراوەتەوەو شەڕی خوێناویی لێ کەوتوەتەوە.

بەوپێیە دەردەکەوێ کۆنەپەرستانی ئێران‌و سۆڤیەت چ هەلومەرجێکیان بۆ سەرنەگرتنی چارەسەری کێشەی ئێران‌و پێکهێنانی کۆمسیۆنی سێ‌لایەنە لە کۆنفرانسی مۆسکۆدا ساز کردووەو نەیانهێشتووە ئەو هەنگاوە گرنگە بنرێ‌و بخرێتە قالبێکی نێودەوڵەتی‌و یاسایی‌یەوەو وەك چارەسەری زۆربەی کێشەی دوای دووەم جەنگی جیهانی لەلایەن هەرسێ زلهێزو ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، بە چارەسەر بگات. لێرەدا ڕەخنە هەر لە دەسەڵاتدارانی شۆڤێنیی ئێران‌و یەکێکی وەك موسەددیق ناگیرێ، کە مێژوویان لەم ڕووەوە گەلێك ڕەشەو ڕابوردوویەکی خوێناوییان لە سەرکوتکردنی گەلانی ئێراندا هەیەو تا شۆڕشی ١٩٧٩ هیچ کامیان دەست پێشخەری جێبەجێکردنی ئەو کێشانەو یاسای ناوبراو نەبوون؛ بەڵکوو ڕەخنەی زۆر لە ڕێبەرایەتیی سۆڤیەت دەگیرێ کە مۆڵەتۆڤی نوێنەری لەو کۆنفرانسەدا دژی تاووتوێکردنی کێشەی ئێران‌و پێکهێنانی کۆمسیۆنی سێ‌لایەنەو چارەسەری هەندێ داخوازیی گەلانی غەیرە فارسی ئێران بوو، بۆ ئەوەی ئێران نەوتەکەیی بداتێ؛ بگرە لەو کۆنفرانسەدا، وەك وتەکانی لە بەڵگەنامەکاندا جێ کراونەتەوە، بەتوندی بەرگریی لە ئێران کردو جەختی کردەوە کە پێکهێنانی ئەو کۆمسیۆنە دەست وەردانە لە کاروباری ناوخۆی ئێران‌و بڕیاری وەهایش نادرێ، چونکە نوێنەری ئێران بەشداری کۆنفرانسەکە نییە. سۆڤیەت بەم چەشنە دەیویست لەلایەکەوە ڕاستگۆیی‌و نیازپاکی‌و خزمەتی خۆی نیشانی دەسەڵاتدارانی تاران بدات، لەلایەکی ترەوە دەری بخات ڕۆژئاواییەکان نیازیان بەرامبەر بە ئێران خراپەو دژی بەرژەوەندەکانی دەجووڵێنەوە، ئەوە سۆڤیەتە بەر بە پیلانی ئەوانە دەگرێ‌و ئێران مادام سۆڤیەتی لەپشتە نابێ بترسێ. جگە لەوە، هەڵوێستی سۆڤیەت

کێشایەوە بۆ ئەوەی کە ئێران دژی پێکهێنانی ئەو کۆمسیۆنە بێ. دووریش نییە سۆڤیەت پێش دەست پێکردنی کۆنفرانسەکە دەسەڵاتدارانی ئێرانی دڵنیا کردبێتەوە کە هەردوولا پێکەوە هەوڵی پووچەڵکردنەوەی پێکهێنانی ئەو کۆمسیۆنە سێلایەنە دەدەن.

ئاشکرایە کێشەکانی جێی باسی ناو کۆنفرانسی مۆسکۆ، سەرجەم نوێنەرانی هەرسێ زلهێز بە نهێنی تاووتوێیان کردوون و بڕیاریان لێ دراون، نوێنەری نە ئێران و نە هیچ وڵاتێکی تر بەشداری کۆبوونەوەکانی نەکراون. دەکرێ بڵێین تەنیا نوێنەری سۆڤیەت توانیویە باس وخواسی کێشەی ئێران و پێکهێنانی کۆمسیۆنی سێلایەنە بدا بە گوێی کاربەدەستانی ئێراندا، تا بیکەنە هەراو هوریاو ناڕەزایینامەو بیرخەرەوەی خۆیان بگەیەننە کۆنفرنس. بۆیە کاربەدەستانی ئێران و کەسانێکی وەك موسەددیق ئەم خزمەتە گەورەیەی سۆڤیەتیان نەشاردوەتەوە و پێیان زانیوەو لەم ڕووەوە خۆیان بە قەرزاری سۆڤیەت داناوەو سوپاسیان کردووە کە جارێکی تر ئێرانی لە دابەشبوون ڕزگار کرد.

سۆڤیەت، نەك تەنیا دژی هەڵوێستی ڕۆژئاواییەکان (ئینگلیزو ئەمریکا) بوو بۆ پێکهێنانی کۆمسیۆنی سێ لایەنە بۆ چارەسەری هەندێك کێشەی گەلانی غەیرە فارسی ئێران، بەتایبەت ئازەربایجان و کوردستان، کە بە خۆیەوەی بەستبوونەوە، بەڵکوو کێشەی ئازادییە دیموکراتیەکان و هەڵبژاردنیشی لە ئێراندا هەر باس نەکرد.

دەبوو سۆڤیەت، ئەو وڵاتەی کە بانگەوازی پشتیوانیی گەلانی چەوساوەو ئازادی و مافی چارەنووس و...ی دەکرد، دەست پێشخەری هێنانە بەرباسی کێشەیەکی ئەوتۆ بوایە. کەچی دەبینین بەپێچەوانەوە نوێنەرانی ئەمریکاو ئینگلیز پێشنیاری گەڵاڵەیەکیان کرد بۆ چارەسەری نەك تەنیا کێشەی کوردو ئازەری، بەڵکە گەلانی تری غەیرە فارسیش کە بارودۆخی ئێرانیان بەرەو ئاڵۆزی بردووە، تا هێندێ ڕیفۆرمیان لە باری کولتووری و بەڕێوەبردنەوە بۆ بکرێ.

دەبوو سۆڤیەت پێشوازیی لە دەست پێشخەریی بریتانیاو ئەمریکا بۆ پێکهێنانی کۆمسیۆنی سێلایەنە بکردایە، تا کێشەکانی ناوخۆی ئێران بەگشتی و کێشەی ئازەربایجان و کوردستان بەتایبەتی بە دەستێوەردان و بڕیارێکی هەمەلایەنەی

نێودەوڵەتی باشتر چارەسەر بکرایەو دەوڵەتی ئێران ناچار بوایە مل بۆ داخوازیەکانیان کەچ بکات. ڕێککەوتن هەر لەنێوان سۆڤیەت و ئێراندا زامنکردنەکەی کەم دەبوو؛ ئێران یا ئامادەی کردنی نەدەبوو، یان لێی پەشێمان دەبوەوە. بەڵام وەکی تر ئێران نەیدەتوانی لە بڕیاری هەرسێ زلهێز لابدات. سۆڤیەت لە هەموو بارێکدا ئەگەر پێکهێنانی کومسیۆنەکەی پەسند بکردایە، بە قازانجی خۆی دەکەوتەوەو پێگەی قایمتر و شان‌وشکۆی لە ناوچەکەدا بەرزتر دەبوو، بەتایبەت ئەگەر بهاتایە هێندێ ڕیفۆرم بۆ کوردستان و ئازەربایجان بکرایەو پێ‌بەپێ ڕێ‌وشوێن بۆ چارەسەری کێشەی کولتووری و بەڕێوەبردنی گەلانی تری وەك بەلووچ و عەرەب و تورکمەن و... دابنرایە.

کاریگەریی خراپی سۆڤیەت بۆ کێشەی ئێران تەنیا لەم کۆنفرانسەدا نەبوو، بەڵکوو لە تەواوی دانیشتن و کۆنفرانسەکانی تردا بوو، کە هیچ گەلاڵە یان پێشنیارێکی تەنانەت بۆ چارەسەری کێشەی ئازەربایجان و کوردستانیش نەبوو. تەنیا یەك جار نەبێ، کاتێك قەوام سەردانی مۆسکۆی کرد، داوای چارەسەرکردنی کێشەی ئازەربایجان (نەك کوردستان)یان لێ کرد. پاشانیش ئەم قسەیەیان وەرگرتەوەو کێشەی ئازەربایجانیان بە کێشەیەکی ناوخۆی ئێران داناو ڕایانگەیاند سۆڤیەت دەست لە کاروباری ناوخۆی ئێران وەرنەدات. ئەوەبوو لە پەیمانی نێوان سۆڤیەت و ئێراندا لەسەر نەوت، هەر بە یەکجاری کێشەی ئازەربایجان وەلا نرا. شەڕو بەربەرکانێ یا ململانێی نوێنەرانی سۆڤیەت لەگەڵ ئینگلیزو ئەمریکای نەیارانیدا، کە دەست پێشخەری چارەسەری کێشەی ناوخۆی ئێران بوون، لەوەدا نەبوو کە دژی بێ و بەرەنگاریی بکات، یا جێی شەرم بێ بۆی، یان خۆی بیەوێ لەگەڵ ئێراندا پێکەوە ئەو کێشەیە چارەسەر بکەن. ڕەوتی کۆنفرانسەکەو وتووێژەکانی دوولایەنەی نێوان ئێران و سۆڤیەت نیشانیان دا سۆڤیەت ئەو سەردەمە کێشەکانی ناوخۆی ئێران، بەتایبەت کێشەی گەلانی چەوساوەی بە کوردو ئازەریشەوە بەلاوە گرنگ نەبوە، هەر مەسەلەی نەوت شوێنی بایەخی بووە. تەنانەت دەستە خوشکەکەی خۆی، واتە حیزبی توودەشی کردە قوربانی بەرژەوەندو سیاسەتی نەوتی خۆی و بواری نەدا سەرکردەکانی حیزبی توودەو ئازەربایجان و کوردستان بە سەربەخۆیی بڕیار بدەن، بەڵکوو بەڵێنی تەسلیمکردنەوەیانی بە دەسەڵاتدارانی تاران دا.

ئەم وتانە بۆ ئەوە نین ئاو بکەین بە دەستو پێی ئەمریکاو ئینگلیزداو پاکانەیان بۆ بکەین، بەڵکوو ئەوانیش لە ماوەی ٣٧ ساڵی تەمەنی دەسەڵاتی حەمە ڕەزا شادا کە پاڵپشتو یارمەتیدەری بوون، بەرپرسی ئەو گشت کارەساتو تراژیدیانەن کە ئەو ماوەیە بەسەر گەلانی ئێراندا هاتوون، ئەوان لە ماوەیەکی دووروودرێژدا، واتە تا ساڵی ١٩٧٩، هەوساری سیاسەتی ناوخۆو دەرەوەی ئێرانیان بەدەستەوە بوو. پاشانیش میراتەکەی ڕژێمی بنەماڵەی پەهلەوییان بۆ دوای ئەو هێشتەوە گەلانی چەوساوەی بندەستی ئێران تائێستا لە سەرەتاییترین مافی خۆیان بێبەش کراون. هەر دەوڵەتانی ڕۆژئاوا بوون یارمەتیی سیاسیو دیپلۆماسیو ئابووریو لەشکری... ڕژێمە داڕزاوەکەی پاشایەتیی ئێرانیان دا، بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەکانی ڕزگاریخوازیی گەلی کورد، بەتایبەت کۆماری کوردستان.

ئاشکرایە ئەگەر پشتگیریی ئەوان نەبوایە، سوپا بێورە و لێکهەڵوەشاوەکەی شا توانای سەرکوتکردنی ئەو بزووتنەوەیەی نەبوو. جگە لەمە، هەر لە سەرەتای داگیرکردنی ئێرانەوە لەلایەن هێزە هاوپەیمانەکانەوەو ڕاکردنی ڕەزا شا، بزووتنەوەی ئازادیخوازی گەلانی تر خۆی نواند، بەڵام هەڵوێستی وڵاتانی ڕۆژئاوا ماوەی دووەم جەنگی جیهانیو پاش شەڕیش نامرۆڤانەو ناحەزو پێچەوانەی بزووتنەوەی ڕەوای گەلی کورد بوو کە بە دەستکردی سۆڤیەتیان دانا. بەڵگەو دیکۆمێنت لەو بارەیەوە زۆرن کە سۆڤیەت دەرهەق بە ئێران کەمتەرخەمیو درێغیی نەکردووە، هەر لە سەرنجو بیرخەرەوەی دەوڵەتەکانیانو ڕاگەیاندنی دەسەڵاتدارانیانو چاپەمەنیەکانیانەوە بگرە، تا دەگاتە داوای ناردنی هێزە سەرکوتکەرەکانی ئێران بۆ گێڕانەوەی هێمنایەتی لە کوردستانو ئازەربایجانو دانانی پلانی عەسکەری بۆ هێرشبردنە سەر ئەو دوو هەرێمە. سۆڤیەت تەنیا جارێك لە وتووێژەکانی نێوان نوێنەرانی کوردو حکوومەتی تاراندا دەوری ناوبژیکەری نەدیوە، یا گوشاری نەخستوەتە سەر ڕژێمی شا بۆ جێبەجێکردنی هەندێ داخوازیی گەلی کورد، وەك بەجێهێنانی ماددەکانی ٩١-٩٤ی یاسای بنچینەیی ئێرانو داواکردنی پێخوێندن بە زمانەکانی کوردیو ئازەریو عەرەبی... لە ماوەی شەڕ و بگرە پاش شەڕیشدا تا کۆنفرانسی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥ لە ئێران. ڕێبەرانو کاربەدەستانی ئەمریکاو

ئینگلیز لەلایان شاراوە نەبوو کە کێشەی نەتەوە زوڵم لێکراوەکانی ئێران مێژوو و ڕەگ‌وڕیشەیەکی قووڵی هەیە. ڕەوایە بۆ ئەو گەلانە هەر لایەن و دەوڵەتێك دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکات بۆ بێ‌هێزکردن و بەچۆکدادانی ڕژێمی تاران، تا داخوازیی گەلانی ئێران پەسند بکات. بۆ نموونە، کەڵکیان لە هەبوونی سوپای سۆڤیەت بینیوە کە لە ئازەربایجان و کوردستان بووە. ئەمە نە تاوان بووەو نە ناڕەوا، گەلی کوردو ئازەر دەرگایەکی تر یا وڵاتێکی تریان نەبوە ڕووی تێ‌بکەن. سەرکوتکردنی بزووتنەوەکانی ئازەربایجان و کوردستان، نە سەرکەوتنی ئەوان بەسەر سۆڤیەتدا، نە سزادانی سۆڤیەت بووەو تاوانێکی گەورەی دژ بەم دوو گەلەو مرۆڤایەتی و پشتگیریی تاوانەکانی ڕژێمی تاران بوون، بۆ لەناوبردنی خەباتگێڕانی ڕێی ئەو ئازادی و دیموکراسییەی کە ئەمریکا و ئینگلیز دەهۆڵ و زوڕنایان بۆ لێ دەدا. کردەوەو سیاسەتەکانی ئەوان، بە واتای پەسندکردنی سیاسەتی پێشووی ڕەزا شاو کوڕە میراتگرەکەی بوو.

ئەگەر سەردەمی دووەم جەنگی جیهانی دەرفەتی لەبار بۆ ئەو دیموکراتی و ئازادییەی ڕۆژئاوا نەڕەخساوە، ئەوا دوای شەڕو بگرە دوای کشانەوەی هێزەکانی سۆڤیەت دەرفەتەکە لەبار بووە. کەچی بە پێچەوانەوە دەبینین چاوپۆشییان لەو هەموو تاوانانەی ڕژێمی شا بەرانبەر بە گەلانی چەوساوەو هێزە پێشکەوتوەکان کرد، تا شای ئێران ساڵی ١٩٧٩ شەرمەزارانەتر لە باوکی ئێرانی بەجێ‌هێشت.

ئەو گەلاڵەنامەیەی کۆمسیۆنی سێ‌لایەنەی ئەمریکاو ئینگلیز کە ساڵی ١٩٤٥ خستیانە بەردەم کۆنفرانسی مۆسکۆ، سۆڤیەت پەسندی نەکردو وەلای نا، دەکرا بخرایەتە بەردەمی ڕێکخراوی نەتوە یەککگرتوەکان، یا سەرلەنوێ بەناوی کۆمسیۆنی هاوبەشی ئەمریکاو ئینگلیزەوە بهێنرایەتەوە مەیدان و جێبەجێ بکرایە، کە دەیانویست هێندێ ڕیفۆڕم لە ئێراندا بکرێ. بەم جۆرە دەردەکەوێ خستنە ڕووی ئەم گەلاڵەنامەیە بەڵگەی نیازپاکیی ئەمریکا و ئینگلیز نەبوە، هەروەك بەندەکانی پەیماننامەی سیڤەر لەسەر کاغەز مایەوە، یا بە مردوویی لەدایك بووە. مەبەستم ئەوەیە بڵێم: کەس ناتوانێ پاکانە بۆ ئەمریکا و ئینگلیز بکات کە هۆی سەرنەگرتن و

پەسندکردن و جێبەجێنەکردنی سۆڤیەت بووە. دواتریش دەوڵەتی ئێران ڕازی نەبوو بە پێکهێنانی کۆمسیۆنەکە. بەڵام هەڵوێستی نامرۆڤانەو بێجێی نوێنەرانی سۆڤیەت لە کۆنفرانسی مۆسکۆدا، بیانووی دا بە دەستی ئینگلیزو ئەمریکاوە کە چیدی خۆیان بە کێشەی ناوخۆی ئێرانەوە سەرقاڵ نەکەن و مۆسکۆ بە تاوانبارو بەرپرسی دابنێن. هاوکات هەردوولا دەستی ڕژێمە سەرکوتکەرەکەی تارانیان بۆ هێرشکردنە سەر دەسکەوتەکانی گەلی کوردو ئازەری ئاواڵە کرد، پێبەپێ پاداشتی گەلانی ئێران و بەتایبەت کوردیان دایەوە کە وڵاتەکەو سامان (نەوتی کەرکووک)و دانیشتوانەکەییان لە ماوەی دووەم جەنگی جیهانیدا خستە بەر خزمەتی هاوپەیمانان. ئەو تراژیدیایەی کە کوڕی ڕەزا شای لایەنگری فاشیزم بەسەریدا هێنان، لەبری لابردنی ڕژێمی کوڕەکەی یا سزادانی لە دادگایەکی نێودەوڵەتیدا، یا لانی کەم ناچارکردنی بە گۆڕانکاری لە هەلومەرجی دوای شەڕداو کەمێك ڕیفۆڕمکردن، ڕژێمەکەی بەهێزتر کرا.

گەلاڵەنامەی کۆمسیۆنی هاوبەشی سێ زلهێزەکەی کۆنفرانسی مۆسکۆ دوای دووەم جەنگی جیهانی، هەروەك پەیمانی سیڤەری پاش یەکەم جەنگی جیهانی بوو، هەردوکیان هەوڵدان و هەنگاوێکی نێونەتەوەیی بوون بۆ چارەسەری کێشەی گەلان، هەردوو جارەکە سۆڤیەت دەورێکی تایبەتی لە تێکدان و سەرنەگرتنی ئەو پەیمانەدا هەبوو. سۆڤیەت بە پشتگیریی هەمەلایەنەی لە ڕژێمی ئەتاتورك، بەتایبەت لە ئاستی نێونەتەوەییدا کە لە (لۆزان) هەوڵی پووچەڵکردنەوەیی دا، بە هەمان شێوە لە کۆنفرانسی مۆسکۆیشدا بە لابردن و پەسندنەکردنی ئەو گەلاڵەیە گەورەترین خزمەتی بە ڕژێمی پاشایەتیی ئێران کرد. تاووتوێکردن و بەراوردکردنی سیاسەتی سۆڤیەت پاش هەردوو جەنگی جیهانی، بەڵگەنامەی زۆریان لەسەرە. سیاسەتی ڕۆژئاویش لەم بارەوە بێتاوان نییە، چونکە ئەوان زیاتر دەستیان لە کێشە نێونەتەوەییەکاندا هەبوە، ئێرە جێی لێکۆڵینەوەو باسکردنی نییە.

هەڵوێستی سۆڤیەت لەسەر پێکهێنانی کۆمسیۆنی هاوبەش بۆ چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆییەکانی ئێران لە کۆنفرانسی مۆسکۆدا، دوای چەند مامەڵەیەکی دوو لایەنەی نێوان مۆسکۆو تاران بووە، کە سەرجەم بە زیانی سۆڤیەت و بەرژەوەندی دەسەڵاتدارنی تاران شکاوەتەوە.

سیناریۆی ئەو ڕووداوانەم لە گەلێك دەرفەتی دیکەدا بە وردی باس کردووە، لێرەدا تەنیا ئاماژەیان پێدەکەم. ڕووداوەکان ئەو ڕاستییە تاڵە دەردەخەن کە پاشەکشە لەدوای پاشەکشەی سۆڤیەت بەرانبەر بە ئێران، کێشایەوە بۆ ئاشبەتاڵ‌و شکستی تەواوی سیاسەتی سۆڤیەت نەك هەر لە ئێران، بەڵکوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا. سەرەتا کێشەی کورد لەسەر داخوازیی ئێران لە تەواوی وتووێژو چاوپێکەوتنەکاندا لابرا، تەنیا کێشەی ئازەربایجان هێنرایە کایەوە. دواتر کێشەی ئازەربایجانیش هەر داخوازیی ئێران بوو، بەهۆی بەستنی پەیماننامەی نەوتەوە بووە کێشەیەکی ناوخۆی ئێران. سەرەنجام کێشەی ئازەربایجانیش سڕدرایەوە. پاشان هەر بۆ ئەوەی کۆسپ نەخرێتە بەر پەسندکردنی پەیماننامەی نەوت‌و ئێران لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکاندا شکات لە سۆڤیەت نەکات، تا هێزەکانی لە ئێران بباتە دەر، بەڵێنی بەدەستەوەدانی سەرانی کوردو ئازەری‌و بەرهەڵستی‌نەکردنیانی بە کاربەدەستانی ئێران ا.

سۆڤیەت ڕازی بوو، ئەگەر پەرلەمانی ئێران پەیماننامەی نەوتی پەسند کرد، هێزەکانی خۆی لە ئێران بباتە دەر. بەوە هیچ کاغەزێکی مامەڵەکردنی بەدەستەوە نەما، جگە لە بێدەنگی‌و چاوەڕوانی! کەچی پاش تێپەڕبوونی زیاتر لە ١٠ مانگ بەسەر هەرەس پێهێنانی کۆماری کوردستان‌و ئازەربایجان، ئەنجومەنی ئێران لە ٢٢ی ئۆکتۆبەری ١٩٤٧دا پەیماننامەی ئێران- سۆڤیەتی ڕەت کردەوە.

دوای یەك مانگیش لەم بڕیارەی پەرلەمانی ئێران، واتە لە ٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٤٧دا، یاداشتی ناڕەزایەتی دژی بەجێ‌هێنانی بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش درایە دەوڵەتی ئێران، لەکاتێکدا پەیمانی هاوبەشی دەرهێنانی نەوتی ئێران ٤ی نیسانی ١٩٤٦ لەنێوان ئێران‌و سۆڤیەتدا مۆر کرابوو. ئەوەبوو ئێران پێشێلی کرد. ئەودەمەی چارەنووسی پەیماننامەی نەوتەکە دیار نەبوو، سۆڤیەت بەرامبەر بەو هەموو تاوانەی کە ڕژێمی ئێران لە دژی ئازەربایجان‌و کوردستان بەتایبەت‌و ئازادیخوازانی ئێران بەگشتی کردی، یاداشتێکی ناڕەزایەتیی نەدایە دەوڵەتی ئێران. وەنەبێ ئەمریکاو ئینگلیزیش پێشیان بە تاوانەکانی ڕژێمی ئێران گرتبێ، کاتێ هێرشی بردە سەر ئازەربایجان‌و کوردستان‌و ڕێیان نەدابێ سەرکردەکانی کورد لەدار بدات، یا تەنانەت

نارەزايەتییەك دەربــبڕن. لێــرەدا پووچــەڵیی نــاوەڕۆكی گەلاڵەنامــەی كۆمــسیۆنی هاوبەشی كۆنفرانسی مۆسكۆ ئاشكرا دەبێ.

**ڕەنگدانەوەی كۆنفرانسی مۆسكۆ**
**لەناو كۆڕو كۆمەڵو ڕۆژنامەكانی ئێراندا:**

ڕۆژنامەی "دەریا"، ١٩٤٥/١٢/١١/١٠ ژمارەیەكی تایبەتی سەبارەت بە كۆنفرانسی وەزیرانی دەرەوەی ئەمریكاو ئینگلیزو سۆڤیەت بڵاو كردووەتەوە. ڕووی لە ئەنجومەنو شاو دەوڵەت كردووەو نووسیویە: ئەم كۆنفرانسە كێشەی ئێران چارەسەر دەكات، بەڵام پێدەچــێ بــەبێ بەشــداریی نوێنــەری ئێــران، بگــرە تــا دابەشــكردنی ئێــران لــەنێوان زلهێزەكاندا (ناوچەی ژێر دەسەڵاتی وەك ساڵی ١٩٠٧) كۆتاییـیەكی خەمباری هەبێ. ئەگەر ئینگلیز نەتوانێ دەور و دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئێراندا مسۆگەر بكات، دەسبەجێ ئامادە دەبێ ئێران لەنێوان زلهێزەكاندا دابەش بكرێ.

ڕۆژنامــەی"دەریــا" ئامۆژگــاریی دەســەڵاتدارانی ئێرانــی كــردووەو نووســیویە: پێویــستە دەوڵــەتی ئێــران تــا ١٩٤٥/١٢/١٥، وادەی كۆبوونــەوەی هەرســێ وەزیــری كاروباری دەرەوەی ئەمریكاو ئینگلیزو سۆڤیەت لە مۆسكۆ، ئاڵوگۆڕێك لە سیاسەتو یاساكانی خۆیدا بكات، تا هەرسێ زلهێزەكە ڕووبەڕووی ئەمری واقیع ببنەوەو ئێران نیشانیان بدات كە بە ڕاستی سەربەخۆیەو بۆ خۆی بڕیار دەدات. ڕۆژنامەكە داوای كردووە "حەكیمی"ی سەرۆك وەزیرانو بەشداریی لابرێو كەسێكی بێلایەن ببێتە سەرۆك وەزیرانو بەشداری لە كۆنفرانسی مۆسكۆ بكات، تا كێشەی ئێران بەبێ نوێنەری ئێران چارەسەر نەكرێ.

ڕۆژنامــەی "فــەردا" ســەبارەت بــە كۆبوونــەوەی ئەنجومــەنی ئێــران لــە ٢٢ی دیسەمبەری ١٩٤٥دا نووسیویە: ئەنجومەنی ئێران سەرقاڵی كۆكردنەوەی ئیمزایە بۆ دوو ڕاگەیانــدن، یەكــەمیان بــۆ دەســت لەكاركێشانەوەی حــەكیمیی ســەرۆك وەزیرانــی ئێران، دووەمیان بۆ هاتنە سەركاری قەوامول سەڵتەنەیە. بۆ یەكەمیان ١٠ دەنگ، بۆ دووەمیشیان ٢٥ دەنگ كۆكراوەتەوە. ئەوانەی ئیمزایان كردووە، فراكسیۆنی توودەو دۆستانی "محەمەدی موسەددیق"ن.

ڕۆژنامەی"باختەر" لە ١٩٤٥/١٢/٣٠دا لە زمانی موسەددیقەوە لە ئەنجومەن ڕایگەیاند: موسەددیق پێشنیاری ڕیفراندۆمی بۆ سیستمی فیدراڵی لە ئێران کردووە، گوتوویە دەبێ زیاتر لە نیوەی دانیشتوانی ئێران دەنگی پێبدەن، نەك لە پانزە ملیۆن ئێرانی سەد هەزار کەس دەنگی پێبدات.

هەروەها حەکیمیی سەرۆك وەزیران لە ئەنجومەنی ئێران ڕایگەیاندووە: ئامادەیە لەگەڵ وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێراندا سەر لە مۆسکۆ بدات؛ یاداشتێکیشی سەبارەت بە داواکاریی ئێران بۆ کۆبوونەوەی مۆسکۆ ناردووەو داوای کردووە هێزەکانیان لە ئێران دەربچن. محەمەدی موسەددیق و دکتۆر ڕادمەنیش و لەنکەرانی لە ئەنجومەنی ئێران دژی حەکیمی قسەیان کردووە.

بەهار، یا "مەلیکول شوعەرا"، کە وەزیری پەروەردەی کابینەکەی قەوامول سەڵتەنە بوو، لە ڕۆژنامەی"یەغما" (ژمارە ٩٤٣، ساڵی ١٩٤٥)دا ڕوو بە فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان نووسیویە: ئێوە دەڵێن زمانی ئازەری زمانی زگماکی خۆتانە، دەبێ لە قوتابخانەکانی ئازەربایجان بخوێندرێ، کەواتە دەبێ قوتابخانەکانی خوزستان، لەبەر ئەوەی لەوێ بە عەرەبی قسە دەکەن، زمانی عەرەبییان تێدا بگوترێتەوە. ئەگەر لە بەلووجستان منداڵەکان بە بەلووجی و ئەرمەنیەکان بە زمانی ئەرمەنی و کورد بە زمانی کوردی و لوڕی بە زمانی لوڕی و... هەموو ناوچەکانی دیکەی ئێران بە زمانی خۆجێیی خۆیان قسە بکەن، ئەوکاتە دەبێ بیهێنیتە پێش چاو کولتووری ئێمە دوچاری چ ئاژاوەو پشێوییەك دەبێ.

<u>نهێنی</u>

لاپەڕە (٥-٥٤)

ئاژانسی تاس، ١٠ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦

**بەیاننامەی باڵوێزی ئێران لە قاهیرە سەبارەت بە ئازەربایجان**

ئەمڕۆ ٨ی کانوونی دووەم، باڵوێزی ئێران لە قاهیرە ئەم بەیاننامەیەی لە ڕۆژنامەی "الاهرام"دا بلاو کردەوە: چەند سەدەیەکە ئازەربایجان بەشێکی ئێرانە، لە

ڕووی جوگرافیاوە لە چوارچێوەی ئێراندایە، مێژوەکەیشی بە ئێرانەوە بەستراوەتەوە. دانیشتوانی ئازەربایجان هەر ئەو دین و زمانەیان هەیە کە لە شوێنەکانی دیکەی ئێراندا هەن، داب و نەریت و ئەدەبی ئازەربایجان بە درێژایی مێژوو هەر بە ئێرانەوە گرێ دراون. ئەوان عەباس بە شای خۆیان، فیردەوسی و سەعدی و خەیام بە شاعیری خۆیان و نەورۆز بایرام بە جەژنی خۆیان دادەنێن. ئازەریەکان، لە ماوەی ئەم چەند سەدەیەی دواییدا، داب و کولتوور و نەریت و ئەدەبی خۆیان نەبوە، ئەوان هیچ جیاواز نەبوون لە ئێرانیەکانی دیکە. ڕێنیسانسی سەردەمی ئەمڕۆی ئازەربایجان، گەر بکرێ ناوێکی ئاوهای لێ بنێن، هەموو دانیشتوانی ئازەربایجان ناگرێتەوە، بەڵکوو هەموان ناچار دەکەن بەشداری بن. ئەمە لە ئەنجامی جووڵەیەکی زۆرەملێوە بووە. بە کۆتایی هاتنی دەستێوەردانی دەرەوە، کاتێك دانیشتوانەکە هەست بە مەترسی ناکەن، ئەو دەمە نیشتمانپەروەرییان دەمێنێتەوە.

ئەگەر جیهان دەیەوێ یەکسانی و ئازادی سەر بکەون، دوای ئەوەی خوێنی دەیان ملیۆن قوربانی لەوپێناوەدا ڕژاوە، گەر جیهان دەیەوێ لە بارودۆخی ئازەربایجان بەئاگا بێ، با کۆمسیۆنێکی بێلایەن بۆ سەقامگیری و ئارامی ڕەوانە بکەن بۆ ئەم هەرێمە. ئەم ورووژاندن و ئاژاوە درۆزنانەیە کە ناوی دیموکراسیی لێ نراوەو خەڵکی پێ فریو دەدەن، لە ڕاستیدا جگە لە یاخیبوونێکی دەستکرد کە هێزێکی داگیرکەر ڕێبەرایەتیی دەکات دژ بە دەوڵەتی ئێران ڕاپەڕیوە، شتێکی دیکە نییە. بە داخێکی زۆرەوە ئەم تاوانانە لەکاتێکدا ڕوو دەدەن کە هێشتا ئەو مەرەکەبەی وا بەیاننامەی ئاقلانێکی پێ نووسراوە، وشك نەبوەتەوە[1].

<u>نهێنی</u>

لاپەڕەی (٥-٣٣)

ئاژانسی تاس، ١٣ی کانونی دووەمی ١٩٤٦

**وتەی نوێنەرانی ئەنجومەنی ئێران**

**سیقەتول ئیسلامی و موسەددیق**

**لە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ئێراندا**

---

[1] هەمان سەرچاوە، نۆ٩، د١١٣، پ١٧٢، ل٢٠٤.

تاران-٩ی کانونی دووەمی ١٩٤٦، سیقەتول ئیسلامی لە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ئێراندا ڕایگەیاند، ئامادەیە تەنانەت سەد کۆمیسیۆنیش بێن بۆ ئێرانو بە چاوی خۆیان ببینن ئازەریەکان لە چ بارودۆخێکی دژواردا دەژینو چۆن کەوتوونەتە ژێر چەپۆکی هێندێ نەناسراوو چەکدارەوە.

ئەگەر کۆمیسیۆن ئەرکی ئەوە بێ زمانی ناوچەکان بە ڕەسمی بناسرێ، یا دەست لە کاروباری سیاسەتی دەرەوەی ئێران وەربدات، نابێ بە هیچ جۆرێ ڕێ بە هاتنیان بدرێ. ئێران تاقە زمانێکی هەیە کە فارسییە.

دواتر دکتۆر محەمەد موسەددیق کەوتە قسەکردنو گوتی: پەسندکردنی پێکهێنانی کۆمسیۆنێکی سێ لایەنەی ئینگلیزو ئەمریکاو سۆڤیەت، بە واتای نوێکردنەوە یا زیندووکردنەوەی پێشنیاری پەیماننامەی (١٩٠٧)ە بە شێوەیەکی خراپتریش. موسەددیق گوتی: پێشنیاری پێکهێنانی کۆمسیۆنێکی ئەوتۆ کە گەلاڵەکەی لە یانزە خاڵ پێك هاتووە، لەوانە بەپێی خاڵی شەشەم، کۆمسیۆن چەند ریفۆرمێکی ڕاسپاردووە کە بە پێویستی دەزانێ دەوڵەتی ئێران سەبارەت بە ڕێکخستنی ئەنجومەنی ناوچەکان جێبەجێیان بکات؛ بەپێی خاڵی حەوتەم، کۆمسیۆن پێشنیارو ئامۆژگاریی کردووە کە سوود لە زمانی کەمە نەتەوەکانی ئێران، وەك عەرەبیو تورکیو کوردیو...، وەربگرێ؛ بە پێی خاڵی نۆیەم، هەرسێ دەوڵەتی زلهێز بە هەموو هێزیانەوە هەوڵ دەدەن قەناعەت بە دەوڵەتی ئێران بکەن تا پێشنیارەکانیان بە شێوەیەکی یاسایی جێبەجێ بکات.

دواتر موسەددیق لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: نابێ دەوڵەتانی ئینگلیزو ئەمریکا لە ناوچەکەدا دووبەرکی بخەنە ناو ئەو گەلانەوە کە جیاوازییەکی ئەوتۆیان لەنێواندا نییە. گەلی ئێران سوپاسی یەکێتیی سۆڤیەت دەکات کە ئامادە نەبوو بەشداری کۆمسیۆنێکی ئاوها ببێ. بە بۆچوونی موسەددیق، هەر دەوڵەتێك لە نیشتمانپەروەران بێ، نابێ پێشنیارێکی ئاوهای پێ قبووڵ بێ، دەبێ ڕەتی بکاتەوە. یەکێتیی سۆڤیەت، بەپێی ڕادیۆی لەندەن، یەکێك لەو دەوڵەتانەیە کە بەشداری لە پێکهێنانی کۆمسیۆنێکی ئاوادا ناکات. بەمجۆرە دوو دەوڵەت دەمێننەوە، پێشنیارەکەیش ئەو دوو دەوڵەتە ئامادەیان کردووە. موسەددیق باسی ئوستانداری

ئازەربایجان "دادوەری"ی کرد کە کاتی خۆی لەبەر ئەوەی گوتبووی دەبێ ئیمتیازی دەرهێنانی نەوتی ئێران بدرێ بە سۆڤیەت، لەسەر کار لابراوە، هەروەها لەبەر ئەوەی شارەداری تەوریزیش لە مامەڵەیەکدا چەند هەزار تمەنی زیان بە شاری تەوریز گەیاندبوو، ئەویش خراوەتە لاوە. موسەددیق مەبەستی لە فەقێ زادە بوو، پرسیاری کرد، بۆچی سیاسەتی دەوڵەت بە دەست کەسێکەوەیە کە پەیماننامەی نەوتی ئێران- ئینگلیزی بۆ ٣٢ ساڵی دیکە درێژ کردەوە، زیانی ١٦٠٠ ملیۆن تمەنی بە ئێران گەیاند؟ بۆچی دەبێ ئەو کەسە نوێنەری دەوڵەتی ئێران بێ لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکاندا؟ دواجار موسەددیق پێشنیاری دەست لەکارکێشانەوەی دەسبەجێی "حەکیمی"ی سەرۆك وەزیرانی کرد[1].

**ئاژانسی یونایتد پرێس**

**سەبارەت بە سیاسەتی چارەسەرکردنی**

**کێشەی نێوان سۆڤیەت و ئێران**

**نیویۆرك- ٤ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦ (تاس)**

ئەم ئاژانسە لە نیویۆرك ڕیگەیاند: بەپێی ئەو زانیاریانەی وا پێی گەیشتوون، ئەمریکا لە هەوڵی ئەوەدایە ئاڵۆزیی نێوان سۆڤیەت و ئێران تا کاتی دەستپێکردنی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان کە بڕیارە لە ١٠ی کانوونی دووەمدا ببەسترێ، کەم بکاتەوە. سکرتێری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ڕێی کەناڵە دیپلۆماسیەکانەوە چالاکانە لە هەوڵدایە بە زووترین کات ئەو کۆمسیۆنە سێ لایەنە ڕێك بخات کە یەکێتیی سۆڤیەت ڕێی نەدا لە کۆنفرانسی مۆسکۆدا سەر بکەوێ. هەروەها باڵوێزەکانی ئەمریکاو ئینگلیز لە ئێران ڕادەگەیەنن کە ئێستا خەریکی وتووێژن لەگەڵ دەوڵەتی ئێراندا، تا گەڵاڵەنامەیەك ڕێك بخەن و بیخەنە بەرچاوی مۆسکۆ. وا چاوەڕێ دەکرێ هێندێ ڕیفۆرم لەم گەڵاڵەنامەیەدا پێشنیار بکرێ، وا کە یاساکان و هەڵبژاردنی هەرێمەکان و ناوچەکان و یاسای زەوی و پەروەردەی تێدا بگۆڕدرێن. هەروەها وڵاتە یەکگرتووەکان بە هیوان گەر ئەم

---

[1] هەمان سەرچاوە، ئۆ٩، د١١٣، پ١٧٢، ل١٨٨-١٨٩.

گەلاڵەنامەیە سەر نەگرێ، ئێران ئەم کێشەیە بۆ لێکۆڵینەوە بخاتە بەردەم ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکان.

**دەوڵەتی ئێران و تاووتوێکردنەکەی بۆ پێشنیاری ئەمریکاو ئینگلیز سەبارەت بە ناردنی کۆمسیۆنێکی نوێنەرانی هەرسێ دەوڵەتی زلهێز بۆ ئێران:**

وەك ئاشکرا بوو لە لەندەن،" حەکیمی"ی سەرۆك وەزیرانی ئێران باسی هاتنی ئەو کۆمسیۆنەی لەگەڵ وەزیرانی کابینەکەیدا کردووە کە لە ئەندامانی سێ دەوڵەتی زلهێز پێك هاتووە. حەکیمی وا دیارە بۆچوونی سەبارەت بەم پێشنیارە کە لە کۆنفرانسی مۆسکۆدا لەلایەن "بۆین"ەوە کراوەو "بۆرینس" پشتیوانیی لێ کردووە، بەڵام یەکێتیی سۆڤیەت دژی وەستاوەتەوە، باش و ئیجابییە.

<u>نهێنی</u>

لاپەڕەی (٥-٤٨)

لەلایەن ئاژانسی تاسەوە، ١٣ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦

گۆڤاری "ئیکۆنۆمسیت"ی ئینگلیزی سەبارەت بە باردودۆخی ئێران لە لەندنەوە نووسیویە (١١ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦).

نیشانەو بەڵگەی زۆر لەبەر دەستدان کە ڕووسەکان بە ئۆتۆنۆمی بۆ ئازەربایجانی گوێلەمستیان ڕازی نابن، چونکە تەواوی وتووێژەکانیان لەبارەی نەوتەوەیەو هەر لە ساڵی ١٩٤٤ـەوە تائێستا ئەو ڕاستییە تێناگەن کە ئینگلیزەکان لەمێژە، واتە بەر لە داگیرکردنی ئێران لەلایەن هێزە هاوپەیمانەکانەوە، سوودیان لە نەوتی باشووری ئێران وەرگرتووەو لەچاو سۆڤیەتدا دەستێکی باڵایان لە ئێراندا هەبوە. ڕووسەکان هێشتا نەیانتوانیوە ئیمتیازی نەوتی ئێران لە ناوچەکەدا دەست بخەن، بۆیە ڕووسیاو هێزە لایەنگرەکانی ئێران لە داهاتوودا هەوڵ دەدەن دەرهێنانی نەوتی ناوچەیەکی ئێران بخەنە دەستی خۆیان و تا پێیان بکرێ لە ناوچەیەکی بەربڵاو و بەریندا بێ.

لەوانەیە پێکهێنانی کۆمسیۆنی هاوبەش بۆ تاووتوێکردنی کێشەی ئێران، ئێرانیەکان بە گەلاڵەنامەیەکی ناتەواوی دابنێن:

یەکەم: هەر پیلانێک کە مۆری ئینگلیزی پێوە بێ، هێشتا بە سیاسەتێکی ئیمپریالیستانەی سەدەی نۆزدەهەم دادەنرێ.

دووەم: ئێرانییەکان زۆر بڕوایان بە ڕاوێژکارانی ڕۆژئاوا نییە. بۆیە تا بەمجۆرە بیر بکەنەوە، ڕاوێژکارانی ڕۆژئاوا لە ئێران سەرکەوتوو نابن.

بۆیە ئەگەر پلانی ڕۆژئاواییەکان لە ئێران سەر نەگرێ، پارتە لایەنگرەکانی سۆڤیەت لە ئێرانو سۆڤیەتی پشتیوانیان بەم سیاسەتە سەرکەوتوو دەبن.

**کابینەی وەزیرانی ئێرانو ڕازیبوونی بە پێکهێنانی کۆمسیۆنێکی هاوبەشی نوێنەرانی ئەمریکاو ئینگلیزو سۆڤیەت بۆ چاودێریی کاروباری ئازەربایجانو ئێران**

**٧ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦ "تاس"**

ئەنجومەنی وەزیرانی ئێران، لە کۆبوونەوەیەکی درێژی ٤ی کانونی دووەمدا، پێشنیاری بۆ باڵوێزانی ئەمریکاو ئینگلیز کرد بۆ پێکهێنانی کۆمسیۆنێکی هاوبەش لە نوێنەرانی ئەمریکاو ئینگلیزو سۆڤیەت بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشەی ئازەربایجان بەتایبەتو کێشەکانی ئێران بەگشتی. سەرباری دژایەتیی ژمارەیەك لە وەزیران، ئەنجومەنی وەزیران بڕیاری دا ئەم کۆمسیۆنە پەسند بکات. ئەم کێشەیە ٥ی کانوونی دووەم لە کۆبوونەوەی کۆمسیۆنی ئەنجومەنی ئێراندا سەبارەت بە کاروباری دەرەوەی ئێران تاووتوێ کرا، زۆر لە ئەندامانی ئەم کۆمسیۆنەی ئەنجومەن دژی ئەو پێشنیارەی سەرەوە دەنگیان دا.

ڕۆژنامەکانی "نوروز ایران"و "فروغ"و "نجات ایران"و ڕۆژنامە دیموکراتیەکانی دیکە دژ بە پێشنیاری ناوبراوی "بولاردۆ میری" وتاریان نووسی، پێیان وایە ئەوە دژی سەربەخۆیی ئێرانو سەروەریی ئەم وڵاتەیە، بە توندی ڕەخنەیان لە "حەکیمی"ی سەرۆك وەزیران گرت کە ڕازی بووە بە دەستتێوەردانی دەوڵەتانی بێگانە لە کاروباری ناوخۆی ئێراندا. هەر سەبارەت بەم کێشەیە، نوێنەرانی کۆنەپەرستی ئەنجومەن دوو هەفتە لەمەوبەر لە ماڵی دەوڵەت ئابادیو ئەمیری تەیووریی نوێنەرانی ئەنجومەنی ئێراندا کۆبوونەتەوەو سەبارەت بە بارودۆخی

ئەمڕۆی ئێران قسەیان کردووە. لەم کۆبوونەوەیەدا پێشنیار کراوە دەوڵەتی ئێران‌و ئەنجومەنی ئێران داوا لە ئەمریکا بکەن بۆ ماوەی بیست ساڵ سەرۆکاری (ماندات)ی ئێران بکات. لە کۆڕو کۆمەڵی سیاسیی تاراندا دەڵێن: هەڵوێستی حەکیمی سەبارەت بە پێشنیارەکەی بولاردۆ میری، ئەنجامی ئاسایی بیروباوەڕی ناو کۆبوونەوەی نوێنەرانی ئەنجومەن لە ماڵی دەوڵەت ئابادی‌و ئەمیری تەیمووری. تاقمی سەر بە زیائەددین‌و ڕۆژنامەکانیان بەردەوامن لەسەر هەڵمەتی پروپاگەندەی خۆیان بۆ مانەوەی دەوڵەتی حەکیمی[1].

ڕۆژنامەی "ایران" لە ١٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥ (٢٤ی ئازەری ١٣٢٤ی هەتاوی) وتەکانی حەکیمیی سەرۆك وەزیران‌و "موسەددیق"ی بڵاو کردووەتەوە، کە دوو ڕۆژ لەمەوبەر لە مەجلیسی ئێراندا کردبوویان، نوێنەرانی ئەنجومەنیان ورووژاندبوو. دکتۆر محەمەدی موسەددیق وتارێکی درێژی لە ئەنجومەنی ئێراندا خوێندبووەوە، ڕەخنەی تێدا لە دەڵەوت گرتبوو، بەتایبەت لە وەزیری ناوخۆی ئێران. دواتر هێندێ سکاڵای خەڵکی ئازەربایجان‌و فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانی نیشان دابوو. ڕۆژنامەی "ایران"یش ئاماژەی  بە وتەیەکی موسەددیق کردووەو نووسیویە: موسەدیق لەو بڕوایەدایە لەبەر ئەوەی تەواوی خەڵکی ئێران وەك ئازەربایجان ڕانەپەڕیون‌و ئامادە نەکراون بۆ داواکردنی مافەکانی خۆیان، نابێ بە داخوازیەکانی خەڵکی ئازەربایجانیش ڕازی بین.

ڕۆژنامەی "ایران ما" لە وەڵامدا نووسیویە: هیچ کاتێك شۆڕشێکی ئازادیخواز لە هەموو شوێنێك بەیەکەوە هەڵنەگیرساوە، بەڵکوو هەمیشە داخوازیەکانی خەڵکی ناوچە بوونەتە هۆی ڕاپەڕینی خەڵکی ئەو ناوچەیە تا شۆڕش بکەن. بۆ وێنە، شۆڕشی مەشرووتە لە ئازەربایجان دەستی پێ‌کرد، دواتر گوێزرایەوە بۆ ناوچەکانی تری ئێران. پاشان ڕووی لە "حەکیمی"ی سەرۆك وەزیران کردووەو نووسیویە: شۆڕشی مەشرووتەی ئێران کە سەرۆك وەزیران خۆی بە لایەنگرو بەشداری دەزانێ، ئایا یاسای مەشرووتەی یاسای بنچینەیی ئێوەو دەوری ئێوە لە ژیانی عەشایرو چیانشینەکانی فارس‌و بەلووجستاندا هیچ ئاڵوگۆڕێکی کردووە.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ئۆ٩، د١١٣، پ١٧٢، ل٢٢٧-٢٢٨.

ڕۆژنامەی "مۆند" ١٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥ (فەرەنسا- پاریس) لە وتارێکدا سەبارەت بە ئێران نووسیویە: قەیرانی ئێران لەبەر ئەوەیە کە دەوڵەتی ئێران داخوازیەکانی سۆڤیەتی سەبارەت بە ئیمتیازی دەرهێنانی نەوتی باکووری ئێران پەسند کردووە. لە کۆتاییدا مۆند نووسیویە: دەوڵەتی ئێران داوای لە ڕێبەرانی سێ دەوڵەتی گەورە کردووە، چارەنووسی ئێران لە کۆبوونەوەی مۆسکۆدا دیاری بکەن، لەکاتێکدا چارەنووسی بەوانەوە بەستراوە. لەوانەیە ئێران دوو ڕێی لەبەردەمدا بێ: یەکیان گەڕاندنەوەی سەربەخۆیی بۆ ئێران، ئەوی دیکەیان گەڕانەوەیە بۆ ستاتووسی کۆ (ئەمری واقیع)، واتە دابەشکردنی ئێران بەسەر ناوچەی ژێر دەسەلات، باکوور بۆ سۆڤیەتو باشوور بۆ ئینگلیز وەك ساڵی ١٩٠٧.

وتاری ڕۆژنامەی پراڤدا، ١٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥

کێشە سەرنجڕاکێشەکان: نووسینی زاسلاڤسکی

هەواڵنێری "ڕۆیتەرز" چەند ڕۆژێك لەمەوبەر لە تارانەوە ڕایگەیاندووە: ئیبراهیمی حەکیمی سەرۆك وەزیرانی ئێران لە وتووێژێکدا لەگەڵ نوێنەرانی چاپەمەنیەکاندا کێشەی چوونە دەرەوەی هێزەکانی سێ دەوڵەتی گەورەی لە ئێراندا باس کردووە. ئیبراهیمی حەکیمی باسی کێشەیەکی تری نەکردووە کە بێگومان بۆ ئێستای ئێران گرنگو ڕۆژانەیەو بایەخێکی زۆری هەیە، ئەویش کێشەی بزووتنەوەی نیشتمانی- دیموکراسییە کە لە ئێراندا پەرەی سەندووە.

ئێرانیش هەروەك ئەو وڵاتانە وایە کە ڕژێمە سیاسییە داڕزاوەکانیان مەیدانو بوار بە گەشەسەندنی هێزە نوێو دیموکراتیەکان نادەن، لەوێش ئەو هێزانە بەزۆر سەرکوت دەکرێن. لەناوچوونی فاشیزمی ئەڵمانو ئیمپریالیزمی ژاپۆن، تەکانێکی توندی بە بزووتنەوەی دیموکراسیی وڵاتان، بە ئێرانیشەوە، داوە. مەبەست لەو هەراو هوریایەی کە داردەستە کۆنەپەرستەکان سەبارەت بە دەرچوونی هێزە هاوپەیمانەکان لە ئێران ڕێکیان خستووە، هەر خەڵەتاندنو سەرلێ شێواندنی بیروڕای گشتییە بەرامبەر بە سیاسەتی پۆلیسیانەی خۆیان دژی بە بزووتنەوەی دیموکراسیخوازانەی ئازەربایجان.

یەکێك لەو سێ وڵاتە گەورانەی کە حەکیمیی سەرۆك وەزیر ئاماژەی بۆ کردووە، یەکێتیی سۆڤیەتە. وەڵامی کێشەی مانەوەی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئێران زۆر ئاسانە. پەیماننامەی ئینگلیزو سۆڤیەتو ئێران لە ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٤٢دا، ئەرکو مەرجو کاتی مانەوی هێزەکانی سۆڤیەتی لە ئێران بە ئاشکرا دیاری کردووە، ئەویش بەگوێرەی پەیماننامەی ئێرانو سۆڤیەت لە ٢٤ی شوباتی ١٩٣١دا، کە یەکێتیی سۆڤیەت بەوپێیە دەتوانێ هێزەکانی خۆی بهێنێتە خاکی ئێرانەوە. کەواتە وەڵامی ئەو پرسیارانە سەبارەت بە هێزەکانی سۆڤیەتو کاتو چۆنیەتی دەرچوونیان زۆر روونو ئاشکراو کورتە، بەپێی پەیماننامەی نێوانیان مانەوەی هێزەکانی سۆڤیەت لە وڵاتانی دیکەیش هەر بەو چەشنە روونو ئاسانە.

دەوڵەتێکی دیکەیش کە بەڕێز حەکیمی لە وتەکانی خۆیدا ناوی هێناوە، بریتانیای گەورەیە، بەڕواڵەت مانەوەی هێزەکانی ئەم دەوڵەتەیش دەبێ بەپێی پەیماننامەی ١٩٤٣ روون بێ. بەڵام بەدوای ئەم پرسیارەدا، پرسیاری دیکە دێنە ئاراوە. بۆ وێنە، ئایا هێزەکانی ئینگلیز تا پێش بەستنی پەیماننامەی ١٩٤٣ هاتوونەتە ناو خاکی ئێران؟ ئایا ئێستا ماونەتەوە؟ ئەگەر هەن، کەیو بۆچی هاتوونو لەکوێ مۆڵیان خواردووەو ژمارەیان چەندە؟ چی دەکەن؟ ئایا مەرجەکانی پەیماننامەی ١٩٤٣ ئەوانیش دەگرێتەوە؟

ئێمە وەڵامی ئەم پرسیارانە نابیستین. ئەم جۆرە پرسیارانە جگە لە ئێران، لەسەر وڵاتانی تر دەکرێنو زۆریشن. دەکرێ بڵێین چاپەمەنیەکانی میسر ڕۆژانە باسی ئەم کێشەیە دەکەن کە بریتانیای مەزن سەرەنجام هێزەکانی خۆی لە میسر دەباتە دەرێ؟

جگە لەوە هۆی مانەوەی هێزەکانی زەمینیو هەواییو دەریایی ئینگلیز لە فەلستین چییە؟ هەموان دەزانن لەوێش کەوتوونەتە مانۆڕو تەقەکردنو گرتنی دیل، بەڵام بۆچی فەلەستینیان کردووەتەوە گۆڕەپانی شەڕ؟ ئەوانە چەند پرسیارێکن، دانیشتوانی ئەم وڵاتە دێرینە لە ئینگلیزی دەکەنو وەڵامیان نییە.ئەی هێزەکانی ئینگلیز لە سووریاو لوبنان چوونەتە دەرێ؟ ئایا مانەوەیان لە سووریاو لوبنان هیچ بناغەیەکی یاسایی هەیە؟

هێزەکانی ئینگلیز لە یۆنانیش هەن، وەك هەموان دەزانن بێکار دانەنیشتوون، بەڵام بیانوو و مەبەستیان چییە، ئەوانە لەگەڵ کام تاقمدا دەست لە کاروباری ناوخۆی یۆنان وەردەدەن؟ ئەم کردەوەیەیان لە هیچ پەیماننامەیەکدا هاتووە؟ گەلانی دنیاو ژمارەیەك لە نوێنەرانی پارتی کرێکار دەپرسن: هێزەکانی ئینگلیز لە ئەندەنووسیا، کە بە ڕواڵەت وڵاتێکی بێگانەیە، چی دەکەن‌و چۆن لەوێ سەریان دەرهێناوە؟ بۆچی شارەکانی ئەندەنووسیا گوللەباران دەکەن؟ ئێمە سەبارەت بە بەلجیکاو فەرانسەو هۆڵەنداو دانیمارك‌و نەرویج گەلێك پرسیارمان هەن، مەبەستمان ئەوەیە هێزەکانی ئینگلیز لەو وڵاتانە چی دەکەن‌و بۆچی ماونەتەوە؟ هیچ وەڵامێك نابیستین.

سەرەنجام سێیەم دەوڵەتی گەورە کە بەڕێز حەکیمی قسەی لەبارەوە کردووە، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، بەڵام تا ئەو جێگەیەی کە هەموان دەزانن ئەمریکا لەگەڵ ئێراندا پەیماننامەی هێشتنەوەی هێزی خۆی لەم وڵاتە مۆر نەکردووە، هێزەکانیشیان هەن. ئەم هێزانە کەی‌و بۆچی هاتوون‌و لەکوێن‌و ژمارەیان چەندە، سەرەنجام بۆچی لە ئێراندا ماونەتەوە، بەتەمان کەی بڕۆن‌و ئایا بەنیازن ئێران بەجێ بهێڵن؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە نییە، تەمومژ ئەم پرسیارانەی داگرتووە، ئەو تەمومژەیش سروشتی نییە. سەبارەت بە چین، هەمان پرسیار دەکرێ، لەوێش پەیماننامەیەك لەنێوان چین‌و ئەمریکادا نییە، بەڵام سوپای ئەمریکا لەو وڵاتەدا هەیە. جەنەڕاڵەکانی ئەمریکا لە چین ئامادەی چالاکین، بەڵام بۆچی‌و بۆ کام مەبەست‌و ژمارەیان چەندەو تاکەی‌و بۆچی هێزەکانی ئەمریکا لە میسر دەمێننەوە؟ چەندین پرسیار لەم بارەیەوە دەکرێن، کە بوونەتە مایەی پەرۆشیی هەموولایەك، بەڵام وەڵامیان نییە. وا باوە کە نەریتی دیموکراسیی ڕاستەقینە وەڵامی پرسیارەکانی خەڵکی دەداتەوە. بەڵام هێندێك لە سیاسەتمەداران کە دەم لە دیموکراسییەوە دەدەن، تەنیا کاتێك پێڕەوی شێوازی دیموکراسیی ڕاستەقینە دەکەن کە بە قازانجیان بێ، بەڵام کاتێ بە قازانجیان نەبێ، بێ‌نەزاکەتانە خۆیان لە وەڵامی پرسیارە تاڵەکان لادەدەن‌و دەڵێن ئەم کارە هیچ پەیوەندییەکی بە ئێوەوە نییە، لەکاتێکدا ئەوە لەڕاستیدا کاری خەڵکە.

[وەڵامی ئەم پرسیارانەی ڕۆژنامەی "پراڤدا"ی زمانی حاڵی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەت، لە کۆبوونەوەی مۆسکۆ و پەیماننامەکانی سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا دراونەتەوە. کەس قۆڵی ئەو هێزانەی سەردەمی شەڕی بۆ بەربەرەکانیی فاشیزم لەگەڵ هێزکانی سۆڤیەتدا ڕانەکێشاوە، تا بنێردرێن و لە وڵاتان جێگیر بن. بەڵام باسی مانەوەی هەرسێ زلهێزەکە لەو وڵاتانە، بەتایبەت هێزەکانی سۆڤیەت لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات و چین و کۆریا و ئێران و... نەکراوە. وەك بینرا چەند مانگ بەر لە هێزەکانی سۆڤیەت، هێزەکانی ئینگلیزو ئەمریکا ئێرانیان بەجێهێشت، دەوری چارەنووسسازیان لە گەیاندنی چەك و تەقەمەنی و تفاقدا بینی. بۆ دەبێ ئەوە خەتی بەسەردا بهێنرێ- هەورامی].

ئەحمەدی کەسرەوی سەبارەت بە کۆمسیۆنی هاوبەش و گەڵاڵەنامەی ئەم کۆمسیۆنە بۆ چارەسەری کێشەکانی ئێران، گوتوویە: ئەگەر ئەم داخوازیانە (داخوازیەکانی ئازەربایجان و کوردستان) جێبەجێ بکرێن، کەمە نەتەوەکانی دیکەی ئێرانیش، بەتایبەت ئەرمەن و ئاسووری و عەرەب و گێلانی و مازەندەرەکانیش، ئەم داخوازیانەیان دەبێ، ئەوکاتە هیچ لە ئێران نامێنێتەوە!

لە ڕوانگەی چەپ و ڕاست و دینی و ڕەگەزپەرستەکانی ئێرانەوە، کۆمسیۆنی سێ لایەنە پیلانێکی گەورەی ئیمپریالیستەکان بوو، بۆیە دەرباری شا و ئەنجومەن و زۆربەی ئەندامانی کابینەکانی دەوڵەتی ئێران لەگەڵ فەرماندەکانی سوپای ئێراندا هاودەنگی سۆڤیەت و حیزبی توودەی دەستە خوشکی بوون؛ هەلومەرجێکی وایان لە ئێران پێك هێنابوو، کەس نەیدەوێرا باسی ئەو گەڵاڵەنامەیە بکات. ڕۆژنامە بەناو دیموکرات و پێشکەوتنخوازەکانیش، نەك هەر باسی دەسکەوتەکانی ئەم گەڵاڵەنامەیەیان بۆ تەواوی گەلان و کۆمەڵگا نەدەکرد، بەڵکوو ببوونە بڵندگۆی ئەو تاقم و لایانانەی سەرەوە. سەرکردایەتیی ئازەربایجان و کوردستانیش لە ترسی فەرمانبەرانی سۆڤیەت نەیاندەوێرا پشتگیری لەم گەڵاڵەنامەیە بکەن، لەکاتێکدا کێشەی ئەم کۆمسیۆن و گەڵاڵەنامەیە بەهۆی ڕووداوەکانی هەردوو ناوچەکەوە هاتبووە کایەوە، گەلێك لە داخوازیەکانیان لە چوارچێوەی ئەم گەڵاڵەنامەیەدا جێبەجێ دەبوو.

لەوانەیە بێدەنگیی ئەوان [ڕەنگیشە دژایەتیی ئەوان بێ، لەم بارەوە بەڵگەنامەیەك بەدەستەوە نییە] لەبەر ئەوە بووبێ کە سۆڤیەت دژی بوو، ئەوانیش بە سۆڤیەتەوە بەسترابوون. لەلایەکی ترەوە، لەبەر ئەوە بوو کە ئەو پێشنیارو دەستپێشخەرییە لەلایەن ئینگلیزو ئەمریکاوە کرابوون [هەردوکیان ئارەزوویان بوو سۆڤیەتیشی تێدا بەشدار ببێ]. لەبری ئەوەی پێشوازی لەو گەڵاڵەنامەیە بکەن‌و گوشار بخەنە سەر سۆڤیەت‌و قەناعەتی پێبکەن کە ئەوان بەو گەڵاڵەنامەیە دەتوانن قۆناغێکی شۆڕشەکەیان ببڕن‌و گەرەنتیش هەیە هەندێ لە داخوازیەکانی گەلانی ئازەربایجان‌و کوردستان مسۆگەر ببێ، چونکە ئەوان دەتوانن بەشداری ئەو کۆمسیۆنە بن‌و بە بەشداریی سۆڤیەت دەتوانن داوا بکەن بەزوویی خواستەکانیان جێبەجێ بکرێ‌و دەسەڵاتی کۆمسیۆن فراوانتر بکرێ‌و دەتوانن بە سێقۆڵی (سۆڤیەت- ئازەربایجان- کوردستان) زیاتر لەو کۆمسیۆنەدا دەور ببینن. جێبەجێکردنی هەندێ داواکاریی ئازەری‌و کورد لەلایەن ڕژێمی تارانەوە، تەنانەت گەر بەڵێنی جێبەجێکردنیشیان بدات، هێشتا مسۆگەر نییەو زامن ناکرێ. بەڵام دەکرا ڕژێمی تاران لە ڕێی کۆمسیۆنێکی نێودەوڵەتییەوە ناچار بکرێ‌و چۆك بە بڕیاری زلهێزەکان دابدات. ئەودەم کۆمسیۆن بەرپرس دەبوو یا بەرەو ڕووی ڕژێمی تاران دەبوەوە، گەر هەر کێشەیەك بۆ سەرکردایەتیی ئازەری‌و کورد بهاتایەتە پێش، هەر لە ڕێی کۆمسیۆنەوە چارەسەر دەکرا. فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان‌و حیزبی دیموکراتی کوردستانیش بەشدارییان لە هەڵبژاردنی پەرلەماندا دەکردو بەشداری دەوڵەت‌و بەڕێوەبردنی کاروباری شارو ناوچەی هەرێمەکانیان دەبوون. کۆمسیۆنی هاوبەشیش لە ئازەربایجان‌و کوردستان ڕاوێژیان لەگەڵ هەردوو پارتەکەدا دەکرد، چونکە بەرەوڕووی ئەمری واقیع یا دوو دەسەڵاتی دیفاکتۆ دەبوونەوە، لەکاتێکدا بێبەشداری و بێڕاوێژی ئەوان نە کاری کۆمسیۆنەکە و نە کاروباری دەوڵەتیش دەچوە پێش. ڕێبەرانی سۆڤیەت‌و ئازەربایجان‌و کوردستان، دەبوایە بە پەسندکردنی پێکهێنانی ئەم کۆمسیۆنە سیاسەتی ئینگلیزو ئەمریکایان تاقی بکردایەتەوە، ئەوسا لە ماوەیەکی کورتدا ڕاستی‌و دروستی‌و کاریگەرێتیی ئەم کۆمسیۆنە دەردەکەوت. پاش تاقیکردنەوەی کاروباری کۆمسیۆنەکە، گەر ڕیککەوتن‌و دەسکەوتێك نەبوایە،

ئەودەم نەك تەنیا سەرکردایەتیی ئازەربایجان و کوردستان، بەڵکوو گەلانی تریش بۆیان هەبوو بە شێوەیەکی تر تاڕادەیەك بە خەباتی چەکدارانە دژی دەوڵەتی ناوەندی بجووڵێنەوەو پاکانەیشیان بۆ دەکرا؛ سێ زلهێز، بەتایبەت سۆڤیەت، بۆیان هەبوو دەستی تێوەربدەن.

دەبوو سۆڤیەت و سەرکردایەتیی ئازەربایجان و کوردستان ئەو ڕاستیەیان بزانیایە کە لەبری ئەوەی بکەونە وتوویژ لەگەڵ تاراندا، کەوا دیار نەبوو داخوازیەکانیان جێبەجێ دەکات یا نا، ئەو ڕژێمە زیاتر لە ٣٨ ساڵ تێپەڕی بەسەر یاسای بنچینەییدا بۆ هەڵبژاردنی شووراکان و جێبەجێی نەکرد، نیازیش نەبوو جێبەجێی بکات. ئایا وتوویژکردن لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا کە بێئەنجام بوو، باشتر بوو، یا هەوڵێکیان لەگەڵ کۆمسیۆنی هاوبەشدا بدایە؟!

پێکهێنانی ئەم کۆمسیۆنە هاوبەشە کاری سۆڤیەت و سەرکردایەتیی ئازەربایجان و کوردستانی ئاسانتر دەکرد، ڕژێم و ڕۆژئاواییەکان نەیاندەتوانی ئەوەندە لەدژیان بکەونە پروپاگەندەکردن و تاوانباریان بکەن و کۆمەڵانی خەڵك دژ بە بزووتنەوەی ڕەوای ئەو دوو گەلە هان بدەن. گومان لەوەدا نەبوو، گەر سۆڤیەت دژی پێکهێنانی ئەو کۆمسیۆنە نەبوایەو تێیدا بەشدار بوایە، پەیماننامەی نەوتی ئێران-سۆڤیەت لەلایەن ئەنجومەنی ئێرانەوە پەسند دەکراو ناوچەیەکی پان و بەرینی ئێرانیش لە سنووری تورکیاوە تا سنووری ئەفغانستان دەکەوتە ژێر نفوزی سۆڤیەت و پلان و داخوازیەکانی دیکەی سۆڤیەت لە ئێران کە جگە لە نەوت بریتی بوون لە هەندێ پڕۆژەی ئابووری و پیشەسازیی وەك ڕێگەی ئاسن و پیشەسازیی ماسی و... لە باکووری ئێران، مسۆگەر دەبوون؛ هەروەها پێوەندیەکانی بازرگانی و هی تر لەگەڵ ئێراندا مسۆگەر دەکران. ڕاستیەکەی ئەوە بوو سۆڤیەت بە دژایەتیکردنی پێکهێنانی کۆمسیۆنی هاوبەش بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە، ئاڵتەرناتیڤێکی دیکەی نەبوو.

ئەو ئەڵتەرناتیڤەی وا هەوڵی زۆری لەپێناویدا داو هەر لەسەرەتاوە دیار بوو سەر ناگرێ، بەوەی وا هەر خۆی بە تەنیا لەگەڵ ڕژێمی ئێراندا ڕێك بکەوێ، بەو جۆرە

هەردوو نەیارەکەی واتە ئینگلیزو ئەمریکا لە ئێران دەربکات. تەنانەت دەستبەرداری کێشەکانی ئازەربایجان و کوردستان و هێزە دیموکراتییەکانی ئێران و حیزبە دەستەمۆکەی خۆیشی (حیزبی توودە) بوو. جگە لەوە، سەران و فەرمانبەرانی سۆڤیەت پێکهێنانی کۆمسیۆنەکەیان بە شێوەیەکی ئاژاوەگێڕانە دژ بە سەروەریی ئێران دادەنا، بەردەوام جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە سۆڤیەت لایەنگری ئێرانێکی یەکپارچەو سەربەخۆو بەهێزەو ڕۆژئاواییەکانیش هەوڵی خەوشدارکردنی سەربەخۆیی ئێران و بەستنەوەی بە خۆیانەوە دەدەن.

لە ڕوانگەی مەنتیقی سەرانی سۆڤیەتەوە، دەرپەڕاندنی ڕۆژئاواییەکان لە ئێران دەبوە هۆی سەربەخۆبوونی، بەڵام گەر پەیوەندیی بە سۆڤیەتەوە باش بوایەو نەوتی بدابایەو چەکی لێ بکڕیبایەو بچوایەتەوە بەگژ ئینگلیزو ئەمریکادا، نەك هەر سەربەخۆ دەبوو، بەڵکوو دەبووە وڵاتێکی پێشکەتووخوازیش.

سەرانی سۆڤیەت پێشبینیی ئەوەیان نەکردبوو کە ئەگەر ڕژێمی ئێران بەگوێرەی سیاسەتی ئەوان بجووڵێتەوە [هیچ نیشانەیەك لەم بارەیەوە نەبوو]، دەوڵەتانی ڕۆژئاوا- بەتایبەت ئینگلیزو ئەمریکا- ئامادە نەدەبوون دەست لە بەرژەوەندی خۆیان لەم وڵاتەدا هەڵبگرن، نە گوێیان بە ڕژێمی ئێران دەدا، نە هەڕەشەو مانۆڕەکانی سۆڤیەت دەیترساندن، وەك ئەورووپای ڕۆژهەڵاتیش ڕێیان بۆ چۆڵ نەدەکرد. سۆڤیەت بە ڕێزنەگرتنی لە گەڵاڵەنامەی پێشنیارکراوی کۆمسیۆنی هاوبەشی چارەسەرکردنی کێشەکانی ئێران، کارێکی کرد دوو زلهێز، واتە دوو هاوپەیمان، کەوا بڕیار بوو هەموو کێشەکانی جیهانی پاش جەنگ پێکەوە چارەسەر بکەن، ئەوانیش ڕێز لە پێشنیاری سۆڤیەت نەگرن بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی دیکەی جیهان و ڕەتی بکەنەوە، بگرە تۆڵەیشی لێ بستێنن. هەروایش کەوتەوە.

جگە لەو فاکتەرانە، توانای ئابووریی سۆڤیەت لەچاو ئابووریی ئینگلیزو ئەمریکادا دوای شەڕ بەراورد نەدەکرا، لەوەدا نەبوو بە یارمەتیدانی ئێران و کڕینی دەسەڵاتدارانی بەرەبەرکانێیان لەگەڵدا بکات. ئەمە سەرباری پێشینەی مێژوویی پەیوەندیی نێوان ئێران و ڕووسیا لە سەدەکانی ڕابردوودا، گەر دوژمنایەتیی لەگەڵدا

نەبووبێ، ئەوا بێمتمانە بووەو دۆستانە نەبوە. بەڵام لەگەڵ ئینگلیزو بەتایبەت ئێراندا تەواو بە پێچەوانەوە بووە.

ئەو ڕاستییەیش ناکرێ بشاردرێتەوە کە کابینەکەی حەکیمی لایەنگری پێکهێنانی کۆمسیۆنی سێ لایەنە بوو، سۆڤیەتو توودەو چەپو ڕاستی ئێران خستیانە بەر هێرش. ئیتر حەکیمی بە یارمەتیی ئەوان لەسەر کار لابرا، قەوامول سەڵتەنە بە کڕینو گوشارو سەرچنگ هێنانو ئاژاوەگێڕی بە یەك دەنگ زیاتر لە "پیرنیا"ی نەیاری هێنرایە سەر دەسەڵات. کەواتە سۆڤیەتو هاوبیرەکانی لەگەڵ نوێنەرانی شۆڤێنیزمی فارسدا، نەك تەنیا دژی پێکهاتنی کۆمسیۆنی سێ لایەنە بوون، بەڵکوو کەوتنەخۆ بۆ لابردنی کابینەکەی حەکیمی کە بەڵێنی دابوو پشتگیری لە پێکهێنانی کۆمسیۆنی سێ لایەنە بکات.

سۆڤیەت کە ئامادەی سەفەری مۆسکۆی حەکیمی نەبوو، بە هاتنە سەرکاری قەوام، لە ئاستێکی بەرزداو بۆ ماوەیەکی درێژ پێشوازیی لە جێگری حەکیمی (واتە قەوام) کردو بەڵێنی کشانەوەی هێزەکانی لە ئێران پێ داو تەنیا کێشەی ئازەربایجانی لەگەڵدا باس کرد (جگە لە مەسەلەی نەوتو گۆڕینی باڵوێزی سۆڤیەت لە ئێران). دواتر کێشەی ئازەربایجانیش بە کێشەیەکی ناوخۆی ئێران دانراو باسی نەکرایەوە، بەڵام کۆمسیۆنی سێ لایەنە مافی کولتووریی پێنج گەلی چەوساوەی ئێرانی لە بەرچاو گرتبوو، سەرباری پێکهێنانی شووراکانو هێندێ ڕیفۆرمی دیکە.

سەرانی سۆڤیەت بە لابردنی حەکیمی، پەسندنەکردنو پێکنەهێنانی ئەو کۆمسیۆنەیان مسۆگەر کرد، لەوەیش دەترسان کابینەکەی حەکیمی بەبێ بەشداریی سۆڤیەت ئەم کۆمسیۆنە پێك بهێنێ، دەوڵەتو ئەنجومەنی ئێران پاڵپشتی بنو پەسندی بکەن.

لەڕاستیدا، کشانەوەی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئێران سەرکەوتنی سەفەرەکەی قەوام نەبوو بۆ مۆسکۆ، بەڵکوو دیارییەکی سۆڤیەت بوو بۆ قەوامو بەهێزکردنی دەوڵەتەکەی، چونکە پێش هاتنە سەر کاری قەوام، سۆڤیەت دەیتوانی ئەم بەڵێنە بە حەکیمیو دەوڵەتەکەی بدات.

چاپەمەنیەکانی سۆڤیەتو لایەنگرەکانیان، بەتایبەت "توودە"ی ئەو سەردەمە، هەنگاوە پێشکەوتوەکانی قەوامیان پاش سەردانی مۆسکۆ بە ئاووتاوو چێژێکی تایبەتەوە باس کرد. ئەو داخوازیانەی کە سۆڤیەت لەمێژبوو داوای کردبوون، قەوام کە گەڕایەوە، تەباتەبایی و جەمالی ئیمامو دەشتی و جەنەڕاڵ ئەرفەع کە لایەنگری ئینگلیزو دوژمن بوون، هەموویانی گرت. ئەو ڕۆژنامانەیشی داخست کە دژی سۆڤیەت بوون؛ بەڕواڵەت لەگەڵ تەورێزدا کەوتە وتووێژو سێ وەزیری توودەیشی کردە ئەندامی کابینەکەی خۆیو موزەفەری فەیرووزی لایەنگری سۆڤیەتی کردە جێگری خۆی. موزەفەری فەیرووزی لایەنگری سۆڤیەتی کردە جێگری خۆی. ئەللەیاری ساڵح لە حیزبی ئێران کە لەگەڵ حیزبی توودەدا بەرەی پێك هێنابوو، هەڵوێستی بەرامبەر بە سۆڤیەت باش بوو، کرایە وەزیرو بێبەزەییان کەوتە سەرکوتکردنی عەشایەری باشووری ئێران، لەبەر ئەوەی گوایە سەر بە ئینگلیز بوون.

بەڵام زۆری پێنەچوو قەوام دەستی کرد بە دەرکردنی ئەو وەزیرانەو ئازادکردنی گیراوەکانی لایەنگری ئینگلیز؛ بەپێچەوانەوە هێرشی کردە سەر توودەییەکان. بە ڕێنەدانی دەرچوونەوەی ئەو ڕۆژنامانەی کە دژ بە سۆڤیەت بوونو ڕێك نەکەوتن لەگەڵ ئازەربایجانداو پەسندنەکردنی پەیماننامەی ئێران- سۆڤیەت، تەواوی پلانو خۆشباوەڕیەکانی سۆڤیەتی مایەپووچ کرد.

سەرانی سۆڤیەت پێیان وابوو دەتوانن سەرەتا جێ بە ئینگلیز لێژ بکەن، دواجاریش بە ڕێکخستنی مانگرتنو خۆپیشاندان لە کۆمپانیای نەوتی ئێران- ئینگلیز لە باشووری ئێران، ئینگلیز ناچار بکەن ئێران بەجێ بهێڵێو دواتر نۆرەی ئەمریکا بێت، کە بەهۆی بێئەزموونییانەوە لە ئێران بە ئاسانی دەردەکرێن.

گەر بە وردی سەرنجی سیاسەتی سۆڤیەت لەو سەردەمەدا، بەرامبەر بە ئەمریکا بدەین، بەڕوونی دیارە کە سۆڤیەت زۆر خۆی لە قەرەی ئەمریکا نەداوە، بەڵکوو ویستوویە ئەمریکا بکاتە هاودەنگی خۆی دژ بە ئینگلیز، گوایە ئەمریکاو ئینگلیز ناکۆکنو دەبێ ئەو ناکۆکییە قووڵ بکرێتەوە. سەرباری ئەوە، ئەمریکاییەکان لە ڕوانگەی سۆڤیەتەوە پێگەیەکیان لە ئێران نەبوو، بەڵام دیسان دیپلۆماتەکانی سۆڤیەت بەهەڵەدا چوون، چونکە ئینگلیزو ئەمریکا نەك تەنیا لە ئێران بەڵکوو لە

ئاستی جیهانیشدا دژی سۆڤیەت یەکیان گرتبوو، لە ئێرانیش نەك هەر بەرژەوەندەکانی خۆیان پاراست، بگرە سۆڤیەتیان دەرکردو ئێران بووە پێگەیەکی دژی سۆڤیەت.

شایانی بیرهێنانەوەیە، پاش ئەوەی هەموو هەوڵێکی ئینگلیز بۆ پێکهێنانی کۆمسیۆنی سێ لایەنە، بەرانبەر بە سیاسەتی سۆڤیەت بێئاکام بوو، لەکاتێکدا دەیویست لەڕێی کێشەی ئازەربایجان و کوردستانەوە گوشار بخاتە سەر ئێران، هەر خۆی ڕاپەڕینی عەشایرەکانی باشوورو ڕۆژئاوای ئێرانیشی، بەتایبەت هی کوردەکانی کرماشانی بە سەرۆکایەتیی قوبادیانی کورد ڕێك خست کە لە باشووری ئێران چەند شارێکی وەك (بووشەهرو کازرون)یان گرت و بەتەواوی پێگەو پادگانەکانیان چەك کردن. دواتر ئەم ڕاپەڕینە بە ناوی بزووتنەوەی باشوورەوە ناوبانگی دەرکرد، هەر ئەوانیش دژ بە توودەییەکان لە کۆمپانیای نەوتی ئێران- ئینگلیزدا مانیان گرت و کەوتنە خۆپیشاندان و قەڵاچۆکردنی توودەییەکان و ژمارەیەکی زۆری کرێکارانی نەوتی کۆمپانیای نەوتی ئینگلیز- ئێران بوونە قوربانی ئەم سەرچڵییە.

***

ئارتۆر چ. میلسپو (Millspaough) ماوەیەکی درێژ بەرپرسی بەشی دارایی ئێران بووە، قەوامول سەڵتەنە بانگی کردووە بۆ ئێران. ناوبراو، لەلایەن ئەمریکاوە ڕەوانەی ئێران کراوەو دەورێکی دیاری لە بەڕێوەبردنی سیاسەتی ئەمریکادا بینیوە، تەنانەت ڕۆزڤێڵت لەکاتی کۆنفرانسی سێ زلهێزەکەدا لە تاران لە گەڵ چاوپێکەوتندا پرسی پێ کردووە. باڵوێزەکانی ئەمریکایش لە ئێران بەبێ پرس و ڕاوێژی میلسپو لەو سەردەمەدا هەنگاوێکیان نەناوە. بۆیە لایەنگرانی سۆڤیەت لەڕێگەی حیزبی توودەوەو (پێش توودەش حیزبی کۆمۆنیستی ئێران) داوایان کردو هەوڵیان دا لە ئێران بچێتە دەرەوە، هەتا سۆڤیەت بە ڕووسی داوای لە ئێران کرد دەری بکات. میلسپو کتێبێکی بەناوی (ئەمریکاو ئێران)ەوە نووسیوە، ساڵی ١٩٤٧ لەلایەن وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤیەتەوە وەرگێردراوە بۆ زمانی ڕووسی و چاپ نەکراوە، بەڵام بە دەستنووسی لە ئەرشیفی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤیەتدا

هەڵگێراوە بۆ کەڵك وەرگرتنی خۆیان؛ بەرهەمێکی گرنگو پڕبایەخە، مێژوو و سیاسەتی زلهێزەکان لە ئێرانی سەرەتای سەدەی بیستەوە تا ساڵی ١٩٤٧ تاووتوێ دەکات. نووسینەکەی میلسپۆ زیاتر سەبارەت بە ململانێی زلهێزەکانە لە سەردەمو دوای دووەم جەنگی جیهانیدا، بەتایبەت ئەوەی کە ئێمە مەبەستمانە دەربارەی کۆنفرانسی مۆسکۆ لە کانوونی یەکەمی ١٩٤٥دا هەندێ زانیاریی باشی تێدایە. هەروەها باسی دیکتاتۆریو دزیو تاڵانکاریی ڕەزا شاو بنەماڵەو دەوڵەتو حکوومەتەکەیی کردووەو نووسیویە: باشترین زەویوزار موڵکی ڕەزا شا بوو، بێبەزەییانە ڕاپەڕینەکانی گەلانی غەیرە فارسی ئێرانی بە پشتیوانیو بێدەنگیی هەرسێ زلهێزەکە سەرکوت دەکرد، لەکاتێکدا هەرسێکیان دەستیان لە هێنانە سەر کارو مانەوەی ڕەزا شادا هەبوو. ڕەزا شا خوێندەوارییەکی ئەوتۆی نەبوو، بەشداریی هیچ شۆڕشێکی نەکردبوو، شۆڕشو یاسای بنچینەیی بۆ ئەو مانایەکیان نەبوو، تەنانەت ڕەحمی بە کەسانی دەوروبەری خۆیشی نەدەکردو ژمارەیەکی زۆری کوشتن (لاپەڕەی ٢٩و٤٧).

میلسپۆ پێی وایە چارەسەری کێشەکانی ئێران بە پێکهاتنو بەستنی پەیماننامەیەکی هاوبەشی نێوان سێ دەوڵەتە زلهێزەکە دەبێ، نووسیویە: دەکرێ سەروەریو یەکێتیی خاکی ئێران بە بڕیارێکی نێودەوڵەتیی ئەوتۆ بپارێزرێ کە ئێران لە پارچەپارچەبوونو پێکهێنانی حکوومەتی ئۆتۆنۆمی لە ئازەربایجانو سەربەخۆیی دەوڵەتێکی کوردی ڕزگار بکاتو زامن بێ (ل٢٥٦).

هەروەها نووسەر نووسیویە: سۆڤیەتیەکان دەیانەوێ هەر خۆیان بە تەنها مامەڵەیان لەگەڵ ئێراندا هەبێ، بەڵام نازانن ڕەوتی ڕووداوەکانی ئێران بەپێی پلانەکانیان ناچێتە پێش. پێدەچوو ڕووسیا حیسابێکی بۆ هەڵوێستێکی توند یا وەڵامدانەوەی ئەمریکا لە بەرانبەریدا سەبارەت بە کێشەی ئێران نەکردبێ، یا وای دانابێ ئەمریکا بێلایەنەو زۆر بایەخ بە کێشەی ئێران نادات.

بە بۆچوونی سۆڤیەت، کێشەی ئێران دژایەتیی نێوان کۆمۆنیزم (سۆشیالیزم)و ئیمپریالیزم (کۆلۆنیالیزم)، واتە ئینگلیز بووە. بەڵام لەڕاستیدا کێشەو دژایەتیی سۆڤیەت (ڕووسیا)و ئینگلیز لەسەر ئێرانو دەستبەسەراگرتنی ئەم وڵاتە، مێژوویەکی دووروردرێژیان هەبوو، ئەوسا سۆڤیەت بەم دروشمانە دەری دەبڕین (ل٢٧٢).

پێویست بوو ئەمریکا هێزو دەسەڵاتی خۆی نیشانی دەسەڵاتدارانی مۆسکۆ بدایە کە سەربەخۆ دەجووڵانەوە. ئێمە لە ڕێی دیپلۆماسیی و ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە کارێکمان کرد ڕێمان نەدا ئێران بەرانبەر بە سۆڤیەت چۆك دابدات. گەرچی کێشەی ئێران بەشێکی کەمی کێشە ئاڵۆزەکانی جیهانە، نابێ چاوەڕێی هاوکاریی سێ زلهێزەکە بین لە ناوچەیەکی جیهان (مەبەست کێشەی ئێرانە)، تا هاوکاری لە ناوچەکانی تری جیهان پەیدا نەبێ، بۆ وێنە، ئەڵمانیاو کۆریاو چین. کەواتە دەبێ هەوڵ بدرێ گومان لەنێوان سێ زلهێزەکەدا بڕەوێتەوە، تا پێکەوە هاوکاری بکەن بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان (ل٢٧٣).

میلسپۆ ئەو ڕاستییەی نەشاردوەتەوە کە ئەمریکاییەکان مەترسییان لە دەور و نەخشی سۆڤیەت هەیە لە ئێران؛ ئەوەیشی نەشاردوەتەوە کە ئەمریکا بە تەنیا نەیتوانیوە ڕژێمی ئێران بپارێزێ، بەڵکوو لەگەڵ بریتانیادا پێکەوە پێشنیاری کۆمیسیۆنی هاوبەشیان کردووەو لە کۆنفرانسی مۆسکۆدا هێناوەیانەتە کایەوە. نووسەر وەك پسپۆڕو شارەزای کاروباری ئێران‌و سیاسەتی نێونەتەوەیی‌و وەك کاربەدەستێکی ئەمریکا، لایەنگری هاوکاریی سێ زلهێزەکە بووە بۆ چارەسەری کێشەکانی جیهان، بەتایبەت کێشەی ئێران؛ پێی وابووە گەر بڕیارێکی هاوبەش لەبارەی ئێرانەوە بدرێ، سەبارەت بە کێشەکانی دیکەی جیهانیش بڕیاری هاوبەش دەدرێ. هەروەها نووسەر لایەنگری پاراستنی بەرژەوەندەکانی سێ زلهێزەکە بوو لە ئێران، دژ بە سەرگرتنی پەیماننامەی نەوتی ئێران- سۆڤیەتیش نەبوە، بە مەرجێك بەرژەوەندی ئەمریکایش لە یەکێ لە ناوچەکانی ئێراندا پارێزراو بێ.

میلسپۆ نووسیویە: دوای دوەم جەنگی جیهانی هیچ کێشەیەکی جیهان، بە کێشەی ئێران‌و ئەورووپا‌و ئەسیاوە (بۆ وێنە کێشەکانی ئەڵمانیاو کۆریا)، بەبێ بەشداریی سۆڤیەت چارەسەر نەکراوە، بەڵام سۆڤیەت مەبەستی بووە ئینگلیزو ئەمریکا لەو وڵاتە دەربکات‌و دەستی بگاتە ئاوە گەرمەکانی کەنداو. (هـ. س.، ل١٧٩).

**بەیاننامەی وەزارەتی ڕاگەیاندنی ئینگلستان**
**سەبارەت بە کێشەی ئێران ٢٩/١٢/١٩٤٥:**

کۆمەڵانی خەڵکی بریتانیا سەبارەت بە بارودۆخی ئێران، بەتایبەت پاش ڕووداوەکانی ئەم چەند ڕۆژەی ڕابردوو، زۆر بەپەرۆشن. دەوڵەتی نەتەوەیی (داوانەکراو یا سەربەخۆ) لە ئازەربایجان ڕاگەیەندراوەو داوای ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی ئێراندا دەکات. بەڵام بەپێی یەکەم بەیاننامەی، هیچ دەستوورو فەرمانێکی دەوڵەتی ناوەندیی ئێران جێبەجێ ناکەن، گەر بە پێچەوانەی ئۆتۆنۆمیی ئازەربایجان و تەواوی ماف و داخوازیەکانی گەلەوە بێ. هەروەها دەسەڵاتدارانی ئازەربایجان ڕایان گەیاندووە کە بزووتنەوەکە گەیشتووەتە هەرێمی گیلان لە دەوروبەری کەناری دەریای خەزەر، واتە نێوان ئازەربایجان و تاران.

ئەم شۆڕشە لەو ناوچانە ڕوویان داوە کە هێزەکانی سۆڤیەتیان تێدایە. دەوڵەتی سۆڤیەت بەرهەڵستیی ناردنی هێزەکانی ئێرانی کردووە بۆ ناوچەکە، تا سەرکوتی ڕاپەرینەکە بکات. ئێستا دەوڵەتی ئێران لەڕێی باڵوێزی خۆیەوە لە لەندەن بە ئاشکرا دەوڵەتی سۆڤیەتی بە لادان لە ڕێککەوتننامەی ١٩٤٢ تاوانبار کردووە، کە سۆڤیەت بەڵێنی پاراستنی سەروەری و سەربەخۆیی ئێرانی تێدابوو. دەوڵەتی بریتانیا سێیەمین لایەنە ئەو ڕێککەوتننامەیەی ئیمزا کردووە. جگە لەوە، دەوڵەتی ئێران ڕایگەیاندووە: یەکێتیی سۆڤیەت نەك تەنیا لە بەڵێن و بەرپرسیی خۆی بەرامبەر بە سەربەخۆیی ئێران پەشمیان بووەتەوە، بەڵکوو بێبەڵێنیی خۆی بەرانبەر بە لایەنی سێیەمی پەیماننامەکەیش- واتە ئینگلستان- ئاشکرا کردووە. بەو مانایە کە دەوڵەتی بریتانیا ڕاستەوخۆ کێشراوەتە ناو کێشەی نێوان ڕووسیاو ئێران، ئەمەیش پێبەپێ دەیسەلمێنێ زیاتر ئومێدیان بە کۆبوونەوەی مۆسکۆ هەبێ بۆ چارەسەری کێشەی ئێران و هەوڵی بۆ بدرێ. ئەو کێشە ئاڵۆزەی سەبارەت بە ئێران بە جێبەجێکردنی پەیماننامەی ١٩٤٢ دەبێ، بەوەی وا بوونی هێزە هاوپەیمانەکان لەم وڵاتەدا مسۆگەر بکرێ، پەیماننامەکە مەودای مانەوەیانی دیاری کردووە. ئاشکرایە دەوڵەتی ئێران، پاش ئەو وتووێژە بێئەنجامانەی، سیاسەتێکی ئاشکرای گرتووەتە بەر، بەپێی ئەو ڕاگەیاندنەی سەرەوەی بەڕێز عەلیی باڵوێزی ئێران لە لەندەن و وەك

سەرۆك وەزیرانیش لە ئەنجومەنی ئێران ڕایگەیاندووە، دەوڵەتی ئێران هیچ کاتێك ئامادە نابێ دەوڵەتێك بەناوی ئازەربایجانەوە بەڕەسمی بناسرێ، وەك ڕابردوو سەرۆك وەزیران لەسەر ئەو هەڵوێستەیە کە سەر لە مۆسکۆ بدات، تا لەوێ ڕاستەوخۆ تاووتوێی ئەم کێشانەو چارەسەریان بکات. دەوڵەتی ئێران ڕۆژی ١٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥ ڕادەگەیەنێ ئەوانەی وا سەرهەڵدانی ئازەربایجانیان ڕێك خستووە، ئەو کۆمۆنیستە ڕووسانەن کە لە باکۆوە هاتوون. لێکۆڵەرەوەکانی لەندەن پێیان وایە، دەبێ کێشەی ئێران لە کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەی سێ زلهێزەکەدا لە مۆسکۆدا باس بکرێت و ڕێگەچارەیەکەیشی بدۆزرێتەوە[1].

ئەم ڕاگەیاندنەو ڕاگەیاندنەکانی دیکەی ئینگلیزو ئەمریکا لەکاتی کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەی سێ دەوڵەتی زلهێزی ئەمریکاو ئینگلیزو سۆڤیەتدا لە مۆسکۆ لە دیکابری ١٩٤٥دا، کە بڕیار بوو بۆ کێشەی ئێران هەم دەرچوونی هێزەکانیان لەماوەی دیاریکراودا پێش بخرێ، هەم گەڵاڵەنامەکەیش سەبارەت بە چارەسەری کێشەکانی ناوخۆی ئێران، بە کێشەی ئازەربایجانەوە، پەسند بکرێ، بە هەڵکەوت بۆ گرژکردن و ئاڵۆزبوونی پەیوەندیی نێوان سێ زلهێزەکە نەبوو، بەڵکوو بۆ ئەوە بوو هاوکات لەگەڵ کۆبوونەوەی مۆسکۆدا، سوپای ئێران لە سەرتاسەری ئازەربایجانی ئێران چەك بکرێ و دەست بەسەر هەموو شارو شارۆچکەکانیاندا بگیرێ و سۆڤیەت ڕاستەوخۆ دەستی تێدابێ. هەروەك گوترا سەرکردایەتیی ئازەربایجان بەبێ ئاگاداری و ڕەزامەندیی سۆڤیەت ئەو هەنگاوەیان نەناوە، کە بە لای ئەمریکاو ئینگلیزی هاوپەیمانی سۆڤیەتەوە جۆرێك بووە لە سووکایەتی پێکردن و دەستدرێژیکردنە سەریان.

نوێنەرانی سۆڤیەت لە کۆبوونەوەی مۆسکۆدا ئامادە نەبوون باسی کێشەی ئێران بکرێ و بڕیاری لەبارەوە بدرێ، بەڵام لەملاوە ڕووداوی ئاوایان لە ئازەربایجان دەقەوماند. واتە سۆڤیەت بە تەنیا بڕیاری دابوو سەرانی ئازەربایجان کارێکی وا بکەن، لەکاتێکدا کۆبوونەوەی مۆسکۆ ساز دەکرا. دیارە گەر ئەو ڕووداوانە لەپێش یا

---

[1] هەمان سەرچاوە، ئۆ٦، د٤٨، پ٥١، ل٨٣-٨٤.

دوای کۆبوونەوەی مۆسکۆ روویان بدایە، ئەوەندە ئەمریکاو ئینگلیزیان شێتگیر نەدەکرد. بەو مانایە کە سۆڤیەت ئامادە نەبوو هێزەکانی خۆی لەگەڵ هێزەکانی ئەمریکاو ئینگلیزدا نە پێش وەختی دیاریکراوو نە لەکاتی دیاریکراودا بباتە دەرێ. لەلایەکی دیکەوە، نەیدەویست ئینگلیزو ئەمریکا بەشداری لە چارەسەری کێشەکانی ناوخۆی ئێراندا، بە کێشەی ئازەربایجانیشەوە، بکەن. ئەم هەنگاوەی یەکێتیی سۆڤیەتو سەرانی ئازەربایجان گەورەترین هەڵەیان بووە، تێگەیشتنو هاوکاریی نێوان سێ زلهێزی بۆ کێشەی ئێرانو کێشە نێودەوڵەتیەکان تێک داو بێباوەڕیو ئاڵۆزیی نێوانیانی پەرە پێدا. سۆڤیەت بە کێشەی ئازەربایجان، ئینگلیزو ئەمریکای بەرەوڕووی ڕاستییەکی ڕووداوو دەستکردی خۆی کردەوە. ئەمریکاو ئینگلیز هەر بە یەکجاری کەوتنە دژایەتیی بزووتنەی ئازەربایجانو لە پەنای ئەویشدا کێشەی کورد، بەیەکجاریش پشتی ڕژێمی ئێرانیان گرتو بە هەموو توانایەکیانەوە کەوتنە بەرپەرچدانەوو بەربەرەکانیی سۆڤیەت، نەک هەر لە ئێران، بەڵکوو لە ئاستی نێودەوڵەتیشدا.

**ڕووداوەکانی ئازەربایجان**
**لە چاپەمەنیەکانی فەرانسەدا:**

هەواڵدەری تاس-پاریس، ١٩٤٦/١٢/٢٥

سەرچاوە، چاپەمەنیەکانی فەڕانسەو ئەمریکاو ئینگلیز

مۆند ئاشکرای دەکات کە ڕاگەیاندنی ئەنجومەنی ئازەربایجان سەبارەت بە بەڕەسمی ناسینی دەسەڵاتداریێتیی شا لە ئێران، لەلایەن تارانەوە بە مانۆڕ وەرگیراوە، مەبەستی تێدا ڕاکێشانی ئەو شۆڕشەیە بۆ شوێنەکانی دیکەی ئێرانو کۆنترۆڵکردنی دەوڵەتی ئێرانە. نیشانەی زۆر بەدەستەوەن کە بزووتنەوەی یاخییەکان هەر تەنیا بۆ ئازەربایجان نییە، بەڵکوو ئەوانە ڕادەگەینن کە ئازەربایجان دەبێ ببێتە سەرچاوەو نموونە بۆ هەرێمەکانی دیکەی ئێران.

ڕۆژنامەی" کامبو"و ڕۆژنامەکانی دیکە دەنووسن: ئازەربایجان لە دەست ئێران دەرچووە؛ لە داهاتوودا دەوڵەتی ناوەندی قووت دەدا، ئەگەر بۆی نەکرێ، ئازەربایجانی ئێران لەگەڵ یەکێتیی سۆڤێتی هاوسێدا یەک دەگرێتەوە.

گۆڤاری "مۆرس نۆڤیل" نووسیویە: کێشەی ئازەربایجان کێشەی دیموکراسی نییە، بەڵکوو کێشەی نەوتەو مایەی شەڕە، لەبەر ئەوە ئاشتیی جیهانی خستووەتە مەترسییەوە. هەڵپەی یەکێتیی سۆڤیەتیش ئەمڕۆ لە جیهان، لە دەوڵەتەکانی پێش خۆی کەمتر نییە.

ڕۆژنامەی "کلارتی" نووسیویە: پێدەچێ پێشڕەویی رووسیا لە ئێران، مەترسیی زیاتری بۆ ئەمریکاو ئینگلیز هەبێ. رووسەکان بە ئاسانی دەتوانن، لە ڕێگەی تەورێز- مووسڵەوە، پەیوەندی بە جیهانی عەرەبەوە بکەنو دەستیان بەو جێگایانە بگات.

دەبێ ئەمریکاو ئینگلیز داوا لە سۆڤیەت بکەن مەبەستی خۆی لە ئازەربایجانو ئێران ڕوون بکاتەوە؟ ئایا بەرگریکردنە لە چاڵە نەوتەکانی باکۆ؟ یا بۆ پێشڕەویکردنە بەرەو ئاوە گەرمەکانی کەنداوی فارسو هیندستان؟ پێشڕەویی سۆڤیەت لە ئازەربایجانو کوردستانی ئێرانەوە بۆ کوردستانی تورکیا، دەوڵەتی تورکیایشی نیگەران کردووە[1].

هەواڵدەری "تاس" ٢٢ی تشرینی دووەم (نۆڤەمبەر)ی ١٩٤٥

چاپەمەنیەکانی ئەمریکا نووسیویانە: یەکێتیی سۆڤیەت دەوڵەتێکی کاتیی کۆماری سۆشیالیستی کوردستان لە " ئیرەڤان"پێك هێناوە، تا لەوڕێیەوە سیاسەتی خۆی لەناو کوردەکانی ئێرانو عیراقدا بباتە پێش، بە نیازە زانستگەیەکی کوردی بۆ ڕاهێنانو پەروەردەکردنی لاوانی کورد بە بیروباوەڕی کۆمۆنیستی دابمەزرێنێ، تا بەهۆی ئەوانەوە جێپێی خۆی لە وڵاتانی ڕۆژئاوای ئاسیادا قایم بکات. ئینگلیزەکانیش، بۆ کۆنەپارێزەکانی ئێرانی جووتە دوژمنی سۆڤیەت وەردەگرن بۆ دژایەتیی کوردەکان (ل٧٠). یەکێتیی سۆڤیەت پێویستیی بە ئێران هەیە، لەبەر ئەوەی ئێران لە کەنداوی فارسو دەریای هیندو وڵاتانی عەرەبییەوە نزیکە، لەوێشەوە باکووری ئەفریقا بە سۆڤیەتەوە دەبەستێتەوە[2].

---

[1] هەمان سەرچاوە، ئۆ٦، د٤٣، پ٥١، ل٤٧-٥٠.

[2] هەمان سەرچاوە، ئۆ٦، د٤٢، پ٤٨، ل٧.

[ڕاگەیاندن و نووسراوی لەم جۆرە لەسەر کوردستان زۆرن، لە جێگەیەکی تایبەتدا ئاماژەیان پێ دەکەین. هێندێ جار نووسیویانە کوردەکان لە سۆڤیەت کۆمارێکی تایبەتیان هەیە، دەمێك ئیرەڤان و دەمێ نەخچەوانیان کردووە بە پایتەختی ئەو کۆمارە کوردییە. بەڵام تۆ بڵێی ئاژانس و سیخوڕەکانی ڕۆژئاوا لە ئەنفالی ساڵی ١٩٣٧و ١٩٤٤ی کوردەکانی سۆڤیەت بێئاگا بووبن و نەیانزانیبێ کوردستانی سوور ساڵی ١٩٢٩ لەلایەن ستالینەوە هەڵوەشێنراوەتەوە، کوردو خاکەکەی بە بیانووی دابەشکردنی ناوچەکان، لە جوگرافیادا سڕانەوەو بەسەر ناوچەکانی ئازەربایجاندا دابەش کران! تۆ بڵێی ئەمریکاو ئینگلیز لەڕێی فەرمانبەرو سیخوڕو کونسوڵ و باڵوێزەکانیانەوە نەیانزانیبێ سۆڤیەت لایەنگری هیچ جۆرە قەوارەیەکی کوردی لە ئێراندا نەبوەو کێشەی کوردی خستووەتە ناو چوارچێوەی ئازەربایجان، تەنیا مافی کولتووریی پێ ڕاوە بینیوە! ڕێی نەداوە لە ماوەی چوار پێنج ساڵدا دەسەڵاتی کورد لە ناوچەی موکریان واوەتر بچێ، لەڕابردووشدا کارێکی بۆ کورد نەکردووە!- هەورامی].

**بیرخەرەوەی وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران**
**بۆ باڵوێزخانەی یەکێتیی سۆڤیەت لە تاران**
**١٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥، ژمارە ٦٣١٨:**

وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران، وێڕای ڕێزی بۆ باڵوێزخانەی سۆڤیەت، بە شانازییەوە ڕادەگەیەنێ: وەك ئاگادارن هاتنی هێزی هاوپەیمان بۆ ئێران کە بووە مایەی وەستان و تێکچوونی هەموو کاروبارێکی ئەم وڵاتە، کێشایەوە بۆ دەست بەستنی دەوڵەتی ئێران تا نەتوانێ ئەو وێرانکارییانە ئاوەدان بکاتەوە کە لە ئەنجامی دووەم جەنگی جیهانیدا تووشی ئێران هاتن.

دەوڵەت ئەو توانایەی نەبوو ئازادانە بکەوێتە جێبەجێکردنی پلان و بەرنامەکانی خۆی تا ژیانی دانیشتوان بەرەو باشتر ببات. بۆیە پێویستە باسی ئەم مەسەلەیە لە کۆنفرانسی وەزیرانی کاروباری دەرەوەی ئەمریکاو ئینگلیزو سۆڤیەتدا، کە بەم زانە لە مۆسکۆ دەبەسترێ، بکرێ و نەخرێتە پشت گوێ. بەپێی خاڵی شەشەمی پەیماننامەی سێ لایەنە لە ٢٩ی یانوەری ١٩٤٢دا، گشت کێشەو پرسیارو بڕیارێك کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە بەرژەوەندی ئێرانەوە هەیە، مەرجە لەو کۆبوونەوەیەدا

بـه ڕەزامەنـدیی دەوڵـەتی ئێـران بـاس بکـرێن. هـەروەها دەوڵـەتی ئێـران، بـە لەبەرچـاوگرتنی بەیاننامـەی سـێ زلهێزەکـە سـەبارەت بـە ئێـران لـە ١ی کـانوونی یەکەمی١٩٤٣دا، پێی وایە پێویستە باسی پرسی ئێران لەم کۆنفرانسەدا بکرێو بڕیار لەوبارەوە بدرێ کە هێزەکانی هەرسێ وڵاتی دۆستو هاوپەیمان دەستبەجێ لە تـەواوی خـاکی ئێـران دەربـچن. لەبـەر ئـەوەی هێـزی بێگانـە لەسـەر خـاکی ئێـران سەربەخۆیی ئەم وڵاتەیان پێشێل کردووە، ڕووداوی خەمبارو کێشەی زۆری بەدواوە بووە، کە کۆمـەڵانی خـەڵکی لـە ئاسایشو ئارامیو وڵاتیشی لـە هێمنایـەتی بێبەش کـردووە. بـۆ وێنـە، ڕووداوە خـەمبارەکانی ئازەربایجـان وێنەیـەکی زینـدووی هـۆی هـاتنی هێزەکـانی بێگانـەن بـۆ ئـەم وڵاتـە. بۆیـە هـیچ پاسـاوێکی عەسـکەری یـا هـەر پاساوێکی دیکە بۆ مانەوەی هێزە هاوپەیمانو دۆستەکان، تەنانەت بۆ یەك ڕۆژیش، لەناو خاکی ئێراندا نییە.

کەوایە بۆ ئەوەی دەوڵەتی ئێران لە هەوڵەکانی بۆ سەقامگیرکردنو پاراستنی هێمنو ئاسایشی خۆی دوانەکەوێ، بۆ ئەوەی ئاڵۆزیو شڵەژانی زیاتر ڕوو نەدەن، داخـوازیی یاسـاییو ڕەوای دەوڵـەتی ئێـران لـە کۆنفرانـسی وەزیرانـی کاروبـاری دەرەوەی هەرسێ دەوڵەتی زلهێزدا دەخرێتە بەرچاو کە دەرچوونی هێزی بێگانەیە لـەم وڵاتـەی وا تائێستایش بـەردەوامن لـە کۆسـپ نانـە بـەر هاتوچۆی دەسـەڵاتدارانی دەوڵەتی ئێرانو ناردنی هێزەکانی بۆ پاراستنی ئەو بەشەی وڵات[1].

لەلایەن هاوڕێ یاکووبۆڤەوە

لە ١٩٤٥/١٢/١٦دا وەرگیراوە.

**بیرخەرەوەی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران**

١٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥:

وەزارەتـی کاروبـاری دەرەوەی ئێـران، وێـڕای ڕێـزی بـۆ باڵوێزخانـەی یـەکێتیی سۆڤیەت لە تاران، هەر سەبارەت بە یاداشتی ژمارە ٦٣١٨ لە ١٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥دا بـە شـانازییەوە ڕادەگەیـەنێ: دەوڵـەتی ئێـران تـا ڕاگەیانـدنی کۆبوونـەوەی کۆنفرانـسی مۆسـکۆی وەزیرانـی کاروبـاری دەرەوەی سـێ دەوڵەتـە زلهێزەکـە، لـەڕێی

---

[1] هەمان سەرچاوە، فۆندی سکرتاریەتی مۆڵەتۆڤ، ئۆ٢، دە٥، پ١٦، ل٢٠.

باڵوێزی خۆیەوە لە مۆسکۆ، پێشنیاری بە دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەت کردووە کە سەرۆك وەزیران و وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران چاویان بە ڕێبەرانی یەکێتیی سۆڤیەت بکەوێ، سەر لە مۆسکۆیش بدەن بۆ پەرەپێدان و بەهێزکردنی پێوەندیی دۆستانەی نێوان هەردوولا. لەکاتێکدا کۆبوونەوەی وەزیرانی کاروباری دەرەوەی سێ زلهێز لە مۆسکۆ ڕاگەیەندراو بووە مایەی خۆشحاڵیی ئێمە، دووبارە بە باڵوێزی ئێران ڕاگەیەندرا کە ڕێ ناکەوێ سەرۆك وەزیران و وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران لەم کاتەدا بگەنە مۆسکۆ. بەڵام دەوڵەتی ئێران پێی لەسەر ئەوە داگرتبوو کە بلێ کێشەی ئێران لە کۆنفرانسی وەزیرانی کاروباری دەرەوەی سێ زلهێزدا لە مۆسکۆ بخرێتە ناو پرۆگرامی کۆنفرانس، سەبارەت بە کێشەیەکیش کە بە وردی لە یادداشتی ژمارە ٦٣١٨ی لە ١٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥دا باس کراوە، دەستبەجێ بڕیاری لێ بدرێ.

ئاشکرایە بەپێی خاڵی شەشەمی بەیاننامەی سێ لایەنەی ٢٩ی کانوونی دووەم (جەنیوەر)ی ١٩٤٥ کە لەنێوان ئێران لەلایەك و یەکێتیی سۆڤیەت و ئینگلیز لەلایەکی دیکەوە بەستراوە، ئەگەر کۆنفرانسی وەزیرانی دەرەوە بیەوێ جگە لە کێشەی دەرچوونی تەواوی هێزەکانی بێگانە لە هەموو خاکی ئێران، کە دەوڵەتی ئێران داواکاری دەستبەجێی جێبەجێکردنی ئەم بڕیارەیە، یا ئەگەر بڕیارە کێشەیەکی دیکە سەبارەت بە ئێران لە کۆنفرانسەکەدا باس بکرێ و بڕیاری لەبارەوە بدرێ، مەرجە بە ئاگاداری و ئامۆژگاریی دەوڵەتی ئێران بێ؛ نابێ هیچ بڕیارێك بدرێ، ئەگەر لەگەڵ پەیماننامەی سێقۆڵیی ڕۆژی ٢٩ی کانوونی دووەمی ١٩٤٣دا جووت نەیەتەوە[1].

مۆسکۆ، ١٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥

**بەڕێز سیر ئارچی باڵد کلارك کێڕ**

**باڵوێزی بریتانیا لە مۆسکۆ:**

نامەکەی ئێوەم سەبارەت بە پێشنیاری دەوڵەتی بریتانیا لەبارەی پلانی دەرچوونی هێزەکانی بریتانیا و سۆڤیەتەوە لە ئێران لە ١٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥دا، بەدەست گەیشت.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٢٣-٢٤.

لەم بارەوە، واتە سەبارەت بە پێشنیارەکەی دەوڵەتی ئێوە، من هەر لەسەر بریارو بۆچوونی پێشووم کە ڕێکەوتی ٣٠ی ئەیلوولی ئەمساڵ (١٩٤٥) لە نامەکەمدا نووسیومن و ئەمەیە:

لەوانەیە لە کۆتایی ماوەی دیاریکراودا، واتە دەورووبەری مانگی شوبات (فێبرەوەری)، ئەگەر پێویست بێ تاووتوێی ئەم پرسیارە بکرێ. لەم کاتەدا من هیچ بە پێویستی نازانم ئەم پرسیارە تاووتوێ بکرێ[1].

لەگەڵ ڕێزو سوپاسمدا

مۆلەتۆڤ

بۆ هاوڕێیان نێردراوە:

- ستالین
- بێریا
- مالینکۆڤ
- میکۆیان
- ویشینکی
- دیکانزوڤ
- سیلین
- بەشی دووەمی ئەوروپاو بەشی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی یەکێتیی سۆڤیەت.

بۆ هاوڕێ مۆلەتۆڤ ڤ. م

**سەبارەت بە ڕووداوەکانی ئازەربایجانی ئێران و**

**دەرچوونی هێزە هاوپەیمانەکان لە ئێران:**

پێشنیاری ئەمریکاو ئینگلیز بۆ ئەوەیە کە دەرچوونی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئێران لەبەر ڕووداوەکانی ئازەربایجانی ئێران و بە داخوازیی ئێران، لە کۆنفرانسی وەزیرانی کاروباری دەرەوەی سێ زلهێزدا لە مۆسکۆ تاووتوێ دەکرێ. هەر بۆیە لە

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٤٣.

یاداشتنامەی ٢٦ی تشرینی دووەمی ئەمساڵی دەوڵەتی ئێراندا بۆ باڵوێزەکانی ئەمریکا و ئینگلیزو سۆڤیەت، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران داوای لە شوورای هاوپەیمانان کردووە ڕێ بە هاتوچۆی سوپای ئێران لەو ناوچەیەدا بدرێ. سەقامگیرکردنی هێمنیو ئارامیو بەڕێوەبردنی کاروباری ئاسایی دەوڵەت لە ئازەربایجانی ئێران.

دواتر هەروەك هاوڕێ یاکۆبۆڤ لە برووسکەی ١١ی کانوونی یەکەمی ئەمساڵدا ڕای گەیاندووە: حەکیمی سەرۆك وەزیرانی ئێران لە وتوویژی خۆیدا لەگەڵ ڕۆژنامەنووسانی ئینگلیزدا لە تاران گوتوویە: ((چارەسەری کێشەکە)) [مەبەست ئازەربایجانە] لەوەدایە کە هێزی هاوپەیمانان بە زووترین کات خاکی ئێران بەجێ بهێڵن. لە وەڵامی پرسیارێکی دیکەدا کە ئایا دەوڵەتی ئێران دەیەوێ داوا لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بکات کۆمسیۆنێك بۆ لێکۆڵینەوەی بارودۆخی ئێستای ئێران ڕەوانەی ئەم وڵاتە بکات؟ حەکیمی گوتوویە: دەوڵەتی ئێران هەوڵ دەدات ئەم کێشەیە بە وتوویژکردن لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا چارەسەر بکات. لە هەمان کاتیشدا دەوڵەتی ئێران پێی خۆشە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەم بارەوە هەوڵێك بدات.

بەم جۆرە دەرچوونی هێزی هاوپەیمانان لە ئێران لەلایەن بێرنسو بۆینەوە، بە پشتبەستن بەو یاداشتنامەیەی سەرەوەی دەوڵەتی ئێرانو هێندەی بەستە بە ڕووداوەکانی ئازەربایجانی ئێرانەوە، پێشکەشی کۆنفرانسی مۆسکۆ دەکرێ. لەم بارەوە بێرنسو بۆین هەروەك دیارە، نەك تەنیا پێ لەسەر دەرچوونی دەستبەجێی هێزەکانی هاوپەیمان لە ئێران دادەگرن، بەڵکوو داوا دەکەن هێزەکانی ئێران ڕەوانەی ئازەربایجانیش بکرێ. هەروەها لەوانەیە داوای ڕەوانەکردنی کۆمسیۆنێکی تایبەتی هاوپەیمانانیش بۆ ناوچەکە بکرێ بۆ لێکۆڵینەوەی بارودۆخی ئازەربایجان.

پێم وایە پێویستە:

١- کێشەی لێکۆڵینەوەی دەرچوونی هێزەکانی هاوپەیمانان لە ئێران، لە دەستووری کاری کۆنفرانسی سێ وەزیری دەرەوەی سۆڤیەتو ئەمریکاو

ئینگلیـزدا لـه مۆسـکۆ لابـبرێ. ئەگـەر ئـەمریکاو ئینگلیـز پێـشنیارەکەی ئێمـە سـەبارەت بـە دەرچـوونی هێزەکـانی ئینگلیـزو ئـەمریکا لـە چینو یۆنـان پەسـند نەکەن، ئەوکاتە ئێمە دەتوانین پشت بەو پەیماننامەیە ببەستین کە لە نێوان ئێمەو ئینگلیزو ئێراندا (مانگی ئەیلوول لە لەندەن) سەبارەت بە دەرچوونی هێزەکانی سۆڤیەتو ئینگلیز لە ئێران ئیمزا کراوە.

٢- ئەگـەر هـەر کێـشەی دەرچـوونی هێزەکـانی هاوپـەیمان لـە ئێـران خرایـە بـەر باسو لێکۆڵینـەوە، ئێمـە دەتـوانین ئەوەنـدەی پێوەنـدیی بـە هەڵوێـستی بـۆینو بێرنـسەوە هەیـە سـەبارەت بـە دەرچـوونی هێـزی هاوپـەیمانان لـە ئێـران، داوای دەرچوونی هێزەکانی ئەمریکاو ئینگلیز لە چینو یۆنان بکەین، یا دەکرێ خۆمـان لـە هـەر جـۆرە بەرپرسـێتیو بـەڵێنێکی نـوێی تایبـەت بـە دەرچـوونی هێـزی هاوپەیمانان لە ئێران بپارێزینو پەسندی نەکەین (بڕوانە: پاشکۆی ژمارە ١)، یا تاڕادەیەك پاشەکشە بکەین (بڕوانە پاشکۆی ژمارە ٢)و ڕازی بین بە دەرچوونی هێزی هاوپەیمانان لە ئێران، ((گەر دەرفەت هەبێ دەرچوونی هێزەکان لە ئێران پێش بخرێ)).

٣- لەوانەیە پێشنیارەکەی بۆینو بێرنس سەبارەت بە هەڵ ناردنی هێزێکی نوێی ئێران بۆ ئازەربایجان باس بکرێ، هەروەك چۆن لە نامەکانی ئێوەدا بۆ گاری مەن لە ١٩٤٥/١١/٢٩داو بۆ کیێر لە ١٩٤٥/١١/٣٠دا هاتووە.

[واتە لەم نامانەدا هاتووە کە ناردنی هێزی نوێی ئێران بۆ ئازەربایجان، نابێتـە هـۆی کۆتـایی پێهێنـانی تێکهەڵـچوونو خوێنڕشـتن، دواتـر یـەکێتیی سـۆڤیەت ناچارە هێـزی دیکـە بـە مەبەسـتی سـەقامگیرکردنی ئـارامیو ئاسایش بنێرێتـە ناوچەکە].

٤- لەوانەیـە پێـشنیاری بـۆینو بێـرنس سـەبارەت بـە نـاردنی کۆمیـسیۆنێکی تایبەتی هاوپەیمانان بۆ ئێران بۆ لێکۆڵینـەوەی بارودۆخەکە، بخرێتە بـەر باسو لێکۆڵینـەوەی کۆنفرانـسەکە. دەبـێ بگـوترێ ئەمـە دەسـتێوەردانی بـارودۆخی ناوخۆی ئێرانە (وەك دژە پێشنیارێك پەسند بکرێ، هـەروەك لـە پاشکۆی ژمارە ٣دا هاتووە، یا ئەو داوایەی کە ٢٦ی تشرینی دووەمی ١٩٤٥ وەزارەتی کاروباری

دەرەوەی ئێران لە شووورای کۆنفرانسی سێ زلهێزی کردووە لە مۆسکۆ (بڕوانە: پاشکۆی ژمارە ٤)[1].

سیلین. م

١٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥

ژمارە ١١٣٢ KB ژمارە

شەش کۆپی نێرراوە بۆ هاوڕێیان:

- مۆلەتۆڤ
- ویشینسکی
- دیکانزۆڤ
- سیلین
- بەشی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت.

**پاشکۆی ژمارە ٤**

**یاداشتنامەی ژمارە ١٩٤٥ی ڕیکەوتی ٢٤ی تشرینی دووەمی ١٩٥٤**

**لە وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێرانەوە**

**بۆ باڵوێزخانەی سۆڤیەت لە ئێران:**

وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران بە ڕێزو سوپاسەوە بە باڵوێزخانەی یەکێتیی سۆڤیەت ڕادەگەیەنێ: وەك ئاشکرایە چەند کەسێك لە ئوستانەکانی ٣و ٤ی ئازەربایجان تاقمێکیان پێك هێناوەو کەوتوونەتە هەراو هوریا، تەنانەت بیروڕای خۆیان لە چەند بانگەوازێکدا بڵاو کردوەتەوەو باروودۆخێکی ئەوتۆیان خوڵقاندووە کە پێچەوانەی یاسای بنچینەیی و هێمنی و ئاسایشی دانیشتوانی ئەم وڵاتەیە. کردەوەی بێشەرمانەی ئەوانە ڕۆژبەڕۆژ ئارامیی ناوچەکە دەخاتە مەترسییەوە.

نوێنەرانی ئەم تاقمە لە زۆر جێگا دژ بە کاربەدەستانی پاراستنی ئاسایش، بانگەوازی خەڵکیان کردووە، چەند ناوەندێکیان داگیر کردووەو هاتوچۆی ئاسایی‌یان لە ڕێگەکاندا شێواندووە. ئەم کردەوانەو تێکچوونی پێوەندیی تەلەفۆنی و تەلگرافی

---

[1] هەمان سەرچاوە، سکرتایەتی مۆلەتۆڤ، ئۆ١، د٣٣، پ٤٦٦، ل١١، ١٢.

بـه دەوڵـەتی ناوەندییـەوە لەگـەڵ ئـەم ناوچـانەدا، بوونەتـە مایـەی نەگەیـشتنی دەنگوباسـی فەرمانبـەرانی ناوچـەکە. هـەر بۆیـە دەوڵـەت ناتوانـێ بـە پێـی پێویـست فەرمان بە فەرمانبەرانی خۆی بدات، چونکە لەو بڕوایەدایە جێبەجێ ناکرێ.

دەوڵەتی ئێران پێی وایە داخوازیی ئەو دەستەو تاقمانەو پارتێکی ئەم وڵاتـە گـەر دژی دەوڵـەت و پێچەوانەی یاسای بنچینەیی ئێران نـەبێ، دەکرێ لێـی بکۆڵرێتـەوە. دەکرێ هەلومەرجێکی لەبار پێك بێ، بۆیە دەبێ دەوڵەتی ناوەندی سەقامگیرکردنی ئارامی و ئاسایش، ڕێوشوێنی بەرانبەر بە کەسانی دژ بە شکۆمەندیو کەرامەتی ئـەم وڵاتە دابنێ. هەروەها هێزەکانی دەوڵەتی ناوەندی بۆ بەرژەوەندی دانیشتوانی ئێران دەست بەکار بن بۆ جێگیرکردنی هێمنی و ژیانی ئاسایی لە وڵاتدا. دەوڵەتی شاهانەی ئێران، بەپێی پێوەندیی دۆستایەتیی خۆی لەگەڵ هاوپەیمانانی مەزندا پشت بەستوو بە پەیماننامـەی سـەرۆکەکانی سـێ زلهێـز لـە کۆنفرانـسی تارانـدا، کـە "چەرچـل"ی سەرۆك وەزیرانـی بریتانیا و "ڕۆزڤێلت"ی سەرۆکی ئـەمریکاو" جەنـەڕاڵ ستالین"ی سـەرۆکی یـەکێتیی سـۆڤیەت مۆریـان کـردووە، هێزەکـانی هاوپـەیمانی ئێـران کـە تائێستایش لـەناو خـاکی ئێراندان، هـیچ مافێکیـان نییـە دەسـت لـە کاروبـاری ئێـران وەربـدەن. ئێمـە چاوەڕێی ئـەو هـەنگاوە یاساییانەی دەوڵـەتی ئێـران لـەوان دەکـەین، هەروەها چاوەڕێی ئەو ئامۆژگاریانەین کە هەرسێ زلهێزەکە بۆ گێڕانەوەی هێمنی و ئاسایـشی ئـەم دوو ئوسـتانە یارمـەتیی ئێرانـی پـێدەدەن. گومـان لـەوەدا نییـە کـە دەوڵەتی ئێران پێویستیی بە ناردنی هێزی زیاتر هەیە، بۆ بەهێزکردنی پادگانەکانی.

دەوڵـەتی شـاهانەی ئێـران مەرجـە دەسـتی ئاواڵـە بـێ لـە ناوچـەکانی ئێرانـدا بـۆ جێبەجێکردنی ئـەم ئەرکـە، تـا بتوانـێ بـەر بـە کـردەوەی دوژمنانەو یـاخیبوونی ئـەو کەسانە بگرێ. لەلایەکی دیکەوە، ئەم تاقمانـە دەیانـەوێ بـەم زوانـە لـە ئوسـتانەکانی ۳و ٤دا دەسـت بکـەن بـە هەنـدێ کـردەوەی دژ بـە یاسـای بنـچینەیی ئێـران. بۆیـە پێویستە هاوپەیمانان ئاگاداری ئەم خاڵە گرنگە بن و بەپەلە لەم کێشەیە بکۆڵنەوە.

ئێمە داوا لەدام‌ودەزگا بەرپرسەکان و دەوڵـەتانی هاوپـەیمانی دۆسـت دەکـەین لـەم بـارەوە لـەکوێ و چـۆن پێویـست بـێ، هاوکـاریی دەوڵـەتی ئێـران بکـەن، تـا کێـشەکان چارەسەر بکرێن.

یاداشتنامەیەك نێردراوە بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکاو ئینگلیز لە تاران. وێنەی ئەم یاداشتنامەیە بە باڵوێزخانەکانی دەوڵەتانی فەڕانسەو چین لە تاران دراوە[1].

**ڕاگەیاندنی شای ئێران**

لە هەواڵدەری "تاس"ـەوە- تاران، ١٩٤٥/١٢/٧:

دەسەڵاتدارانی ئێران جارێ بەتوندی دژ بە بزووتنەوەی ئازەربایجان ناجووڵێنەوە، دەیانەوێ یاری بە کات بکەن. واتە تا ئەودەمەی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئێرانن، دەست بەکار نابن، بەڵام بە دەرچوونی ئەو هێزانە، دەکەونە سەرکوتکردنی نەك هەر دیموکراتەکانی ئازەربایجان، بەڵکوو دژ بە هەموو هێزە ئازادیخوازەکانی ئێران دەبزوونەوە.

لە وتەکانی ڕۆژی ١٩٤٥/١٠/٢٤ی شای ئێراندا دیارە کە گوتوویە: جارێ ئێمە ئەو بوارەمان نییە سزای خۆفرۆشەکان بدەین، بەڵام کاتی خۆی دێ کە هیچ ڕەحمێکیان پێ ناکەین[2].

[ئەم وتەیەی شا هەڕەشەیەکی ئاشکرایە کە پاش دەرچوونی هێزەکانی سۆڤیەت ڕژێم خۆی ئامادە دەکات، بکەوێتە سزادانی هێزە دیموکراتخوازەکانی ئێران لە سەرانسەری ئێران‌و بەتایبەت کوردستان‌و ئازەربایجان. واتە بەڵێنی بەڕێوەبردنی ڕیفۆرم لە ئێران یا چارەسەرکردنی کێشەی ئازەربایجان‌و جێبەجێکردنی بەندەکانی یاسای بنچینەیی ئێران‌و... هەموویان خستە بەر پرسیار. بۆچی دەسەڵاتدارانی سۆڤیەت‌و ڕابەرانی کوردو ئازەربایجان‌و هێزەکانی دیکەی ئێران بڕیاری خۆبەدەستەوەدان بدەن، مادام نیازی شا تۆڵەسەندنەوەیە لە هەموان؟!- هەورامی]

**لە کۆبونەوەی ئەنجومەنی ئێران**

١٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥

"سەدری قازی"ی نوێنەری مەهاباد، پێش دەست پێکردنەوەی کۆبوونەوەی ڕەسمیی ئەنجومەن داوای لە دەوڵەت کرد پارەی ئەو تووتنەی وا لە جووتیارانی

---

[1] هەمان سەرچاوە، سکرتاریەتی موڵەتۆڤ، ئۆ٧، د٣٣، پ٤٦٦، ل١٦-١٨.

[2] هەمان سەرچاوە، ئۆ٦، د٤٢، پ٥٠، ل٤.

مەهابادی کڕیوە، بداتەوە. وەزیری دارایی ئێرانیش لە وەڵامدا گوتی: دەوڵەت پارەی نییە، بۆچی پێویستە ماڵیات زیاتر لە خەڵك کۆبکرێتەوە تا کێشەی ئەوتۆی پێ چارەسەر بکرێ‌و پارەی توتنیش بدرێ؟ دەبێ ئەنجومەنی ئێران گەلاڵەنامەیەك ئاماد بکات لەوبارەیەوە کە ماڵیاتی زۆرتر لە داهاتەکان کۆبکرێتەوە[1].

[پارەی ئەو تووتنەی کە بە دەوڵەتی ئێران دراوە، یا بەنرخێکی کەم پێی فرۆشراوە، نەدراوە. داهاتی ئەودەمەی جووتیارانی ناوچەی موکریان‌و بەگشتی داهاتی بزووتنەوەی کورد لە ناوچەکەدا زیاتر هەر تووتن بووە. پاشان کە بەرهەمی دووسێ ساڵیش بە سۆڤیەت فرۆشراوە، ئەوانیش پارەکەیان نەداوە. لە جێگەیەکی دیکەدا بەڵگەنامەیەك دەری دەخات قازی محەمەد داوای پارەی ئەو تووتنەی لە دەسەلاتدارانی سۆڤیەت کردووە کە نەیانداوە، بەگوێرەی مێژووی بەڵگەکە، دیارە ئەو پارەیەش هەر خوراوە- هەورامی].

**بڕیاری "درەخشانی"ی**
**سەرلەشکر سەبارەت بە پادگانی تەورێز:**

بڕیاری ئەفسەرە پایەبەرزەکانی پادگانی تەورێز بۆ ڕێگرتن لە خوێنڕشتن‌و براکوژی‌و بەرگری لە زەرەرو زیان گەیاندن بە دەوڵەت‌و دانیشتوانی ناوچەکە، داوا لە تەواوی سەربازو دەرەجەدارو ئەفسەرو فەرمانبەرانی پادگانی تەورێز دەکرێ چەکەکانیان دابنێن، بەپێی بڕیاری فەرمانده‌ی پادگانی تەورێز بجووڵێنەوە.

ژەنەڕاڵ درەخشانی
فەرماندەی لەشکری ئازەربایجان
١٩٤٥/١٢/١٧

**ڕێککەوتننامەی دەوڵەتی ئازەربایجان‌و ژەنەڕاڵ درەخشانی**
**فەرماندەی لەشکری سێی ئازەربایجان:**

بەپێی بڕیاری ئەنجومەن سەبارەت بە پاراستنی ئازەربایجان‌و بۆ پێشگیری لە هەر خراپ حاڵیبوونێك‌و پاراستنی هێمنی‌و ئارامیی ئازەربایجان‌و بەرگریکردن لە

---

[1] هەمان سەرچاوە، نۆ٢، د١٦، پ٢٦، ل٢٨.

براكوژی، لە ئەنجامی وتوویژێکی زۆرو ئاڵوگۆڕی بیرو بۆچووندا لەم بارەوە لەگەڵ فەرماندەی لەشکری سێی ئازەربایجاندا کە چەند ڕۆژێك درێژەی کێشا، ڕۆژی پێنجشەممە ١٩٤٥/١٢/١٣ سەعات ٣٠,٢٠ ژەنەڕاڵ درەخشانی ئامادە بوو پادگانی تەورێزو پێگەکانی دەوروبەری تەسلیم بن‌و چەك دابنێن‌و هاوکاری بکەن. ڕێککەوتننامەکە لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە بوو:

١- هەردوولا نوێنەرانی خۆیان بۆ ئەم مەبەستە دیاری بکەن، ژەنەڕاڵ درەخشانی لەلایەن پادگانی تەورێزەوەو سەیید جەعفەری پیشەوەری لەلایەن دەوڵەتی ئازەربایجانەوە، هەردوکیان ئەم ڕێککەوتننامەیەیان مۆر کرد.

٢- هیچ کەس لە لەشکرو فەرمانبەرانی پادگانی تەورێز، تا دەرچوونی بڕیاری دیکە، نابێ لە پادگان بێتە دەر، دەوڵەتی ئازەربایجان ژیانیان مسۆگەر دەکات.

٣- دەبێ هەموو چەك‌و تەقەمەنییەك لە جبەخانەکاندا کۆبکرێنەوە، دەوڵەتی ئازەربایجانیش ئەرکی پاراستنی ئەو جبەخانانە دەگرێتە ئەستۆ.

٤- هەر ئەفسەرێك دەتوانێ بە داخوازی‌و ئارەزووی خۆی بگەڕێتەوە بۆ شوێنی لەدایکبوونی خۆی، یا هەر جێگایەکی دیکە بیەوێ لێی بژی، دەوڵەتی ئازەربایجان ئامادەیە بەپێی توانا خەرجیی سەفەرەکەیان بکێشێ.

٥- ئەو ئەفسەرانەی کە دەیانەوێ لە ڕیزەکانی سوپای ئازەربایجاندا خزمەت بکەن، دەوڵەتی ئازەربایجان ئامادەیە، دوای سوێندخواردنی عەسکەریی ئەو ئەفسەرانە، وەریان بگرێ‌و مووچەو ژیانیان بۆ دابین بکات.

٦- دوای سوێندخواردن بە سەربازو دەرەجەدارو ئەفسەرانی لەشکری تەورێز، چەکەکانیان پێ دەدرێتەوەو دەتوانن درێژە بە خزمەتی عەسکەریی خۆیان بدەن.

٧- ئەم ڕێککەوتنامەیە بە دوو دانە دوای ئیمزا کردنی نوێنەرانی هەردوولا ئاڵوگۆڕ دەکرێ.

| ژەنەڕاڵ درەخشانی | سەیید جەعفەری پیشەوەری[1] |
|---|---|
| فەرماندەی ٣ی ئازەربایجان | سەرۆکی شوورای وەزیرانی ئازەربایجان |

---

[1] هەمان سەرچاوە، ئۆ٢، د١٦، پ٢٦، ل٢٧-٣٨.

هەواڵدەری تاس لە تەوریز بەشێك لە وتاری پیشەوەریی لە ژمارەی ڕۆژی ٢٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥ی ڕۆژنامەی "ئازەربایجان"دا سەبارەت بە چەککردنی پادگانی تەوریزو درەخشانی وەرگرتووە، کە بەم جۆرەیە: دەرهەق بە گرتنی ژەنەڕاڵ درەخشانی و گرووپێکی ئەفسەری پادگانی تەوریز، دەبێ بگوترێ بەو چەشنە نییەو درەخشانی بە مەیلی خۆی تەسلیم نەبوە، بەڵکوو سەربازو ئەفسەرەکانی ئامادە نەبوون تەقە لە خەڵك بکەن. ئێستا ڕژێمی تاران کە درەخشانیی گرتووە، نیشانەی ئەوەیە ڕژێم ئامادەی هەموو تاوانێکە. ئاشکرایە ئەگەر ئێمە دەوڵەتی خۆمان نەهێنایەو هێزی لەشکری خۆمان ڕێك نەخستایە، تاران دەیتوانی ئەو دەسکەوتەمان لێ بسەنێتەوە.

ئێمە زۆر جار دانمان بە یەکێتی و سەروەریی ئێراندا دەناو دەنێین، بەڵام تاران لە هەوڵی خەوشدارکردنی ئەم سەروەرییەی ئێراندایەو هەمو ڕۆژێ درۆیەکمان بۆ هەڵدەبەستن و پێمان دەڵێن تورکی نوێن. ئەگەر بێتو وا بەردەوام بن، ئێمە ناچار دەبین جیا ببینەوەو دەوڵەتێکی سەربەخۆ پێك بهێنین. ئێمە هەر ئەوەمان بۆ ماوەتەوە کە بڵێین: شتی خۆتان بۆ خۆتان و شتی خۆمان بۆ خۆمان، لێمان گەڕێن بەپێی ڕێوڕەسمی خۆمان ماڵوحاڵی خۆمان بەڕێوە بەرین[1].

[جگە لەوەی کە فیرقەی دیموکرات توانیی دەست بەسەر هەموو پێگەو پادگانەکان (سەبازخانە)و(٨٠) چەك و سوپای ئێراندا بگرێ، ناوەندەکانی پۆلیس و ژاندامری و... نەبێ، حیزبی توودەی ئێران بە ڕێکخراوو لایەنگرانی نیزامیی خۆیەوە لەناو سوپای ئێراندا یارمەتییەکی زۆری دیموکراتەکانی ئازەربایجانی دا، دەیان ئەفسەرو پسپۆڕی لەشکری نارده ئازەربایجان بۆ بارهێنان و پەروەردەکردنی هێزی لەشکریی ئازەربایجان و یارمەتییەکی بەرچاوی ئازەربایجانی دا. هێزەکانی سۆڤیەت لە ئازەربایجان کە ژمارەیەکی زۆریان بە ڕەگەز خەڵکی ئازەربایجانی سۆڤیەت بوون، بە هەموو توانایانەوە لە خزمەتی دامودەزگاکانی ئازەربایجاندا بوون، بەتایبەت بارهێنان و مەشق پێکردنی هێزەکانی ئازەربایجان. کەواتە پێگەو جێگاو هێزی

[1] هەمان سەرچاوە، ئۆ٦، د٤٣، پ٥١، ل١.

لەشکریی ئازەربایجانیان زۆر بەهێز کردبوو. بە بڕوای من هێزی لەشکری ئازەربایجان (بە سوپاو هێزی فیدایی و بەرگریی میللییەوە)، بەتایبەت لە ڕووی ورەو چەک و تەقەمەنییەوە، گەلێك لە سوپای ئێران باشتر بوو. بەڵام دواتر کە چەک و تەقەمەنییان لێ سەندرایەوە، بەو جۆرە دەست و پێیان بەستن. ئەمە بابەتێکی دیکەیەوە لێرەدا باسی ناکەین.

کوردستان، بە پێچەوانەی ئازەربایجانەوە، نەك تەنیا پادگان و پێگەکانی لەشکری ئێرانی تێدا چەك نەکران و دەسکەوتێکی چەك و تەقەمەنی نەبوو، بگرە هیچ لەشکرێکی ئێرانی دەستی بۆ نەبراو هیچ شارێکی کوردستانیش لە پێگەو هێزەکانی ئێران پاك نەکرانەوە. کۆمار، ئەو شارو ناوچانەی بەدەستەوە بوون کە پێش ڕاگەیاندنی کۆمار لەلایەن خەڵکەوە ئازاد کرابوون، واتە مەهابادو بۆکان و نەغەدەو شنۆ. هەوڵی ئازادکردنی تەنانەت سەقزو سەردەشت و بانەیش نەدرا کە پێگەو پادگانی هێزەکانی لەشکری ئێرانیان لێ بوو و هەمیشە هەڕەشەیان لە کۆماری مەهاباد دەکرد. کەچی ئازەرییەکان بە یەکجاری دامودەزگاکانی دەوڵەتی ئێرانیان، بەتایبەت دەسەڵات و پێگەکانی لەشکری، پێچایەوە. کورد بە پێچەوانەی ئازەرییەوە چەك و شتی وای دەست نەکەوت، نە توودەو سۆڤیەت بە چەك و تەقەمەنی و پسپۆڕی لەشکری هاوکارییان کرد، نە کوردیش لەلایەن ئەوانەوە هان درا وەك ئازەربایجان کۆنترۆڵی شارەکانی کوردستان بکەن. دواتر بەوردی ئاماژە بەو کێشانە دەکەین کە کورد پێش ماوەی زیاتر لە سێ ساڵ، کاتێك هێشتا بزووتنەوەی ئازەربایجان سەری هەڵنەدابوو، حیزبی دیموکراتی کوردستان ڕێك نەخرابوو، هەوڵی ئازادکردنی شارەکانی کوردستانی دابوو، بەتایبەت ورمێ کە هەموو جارێ سۆڤیەتیەکان دەبوونە کۆسپ و نەیاندەهێشت. بەڵام ئازەرییەکان کە چەند هەفتەیەك بەسەر دامەزراندنی حیزبەکەیاندا تێنەپەڕیبوو، نەك هەر بواریان پێ درا، بەڵکوو هاوکاریشیان کردن. گومان لەوەدا نییە کە ڕێبەرانی ئازەربایجان بە ڕەزامەندیی سۆڤیەت کەوتنە ئازادکردنی شارەکانی ئازەربایجان و دەست بەسەراگرتنی پادگان و پێگەکانی لەشکری ئێران. بە پێچەوانەوە، سۆڤیەت ڕێی نەدا کورد لە بەرەی سەقزو بۆکانیش بجوڵێ، بگرە هەڕەشەی لێ کرد کە نابێ هەر بیریشی لێ بکاتەوەو بواری بە پادگان و

پێگـەکانی لەشـکری ئێـران دا لـە سـەقزو سەردەشـتو بانـە خۆیـان بـەهێز بکـەنو خواردنو چەکو تفاقیشیان پێبگات.

مەبەسـتمە لێـرەدا ئامـاژە بـەو خاڵـە گرنگـە بکـەم کـە ئازەریـەکان لـە دەسـت بەسـەراگرتن یـا ئـازادکردنی شـارەکانی ئازەربایجانـدا، چەکو تەقەمەنییـەکی زۆریـان دەسـت کـەوت؛ هێـزی لەشـکری ئازەربایجانیـان پـێ دامەزرانـدو بـەوە کێـشەی ئازەربایجانیـان لـە ئاسـتی ئێرانو سیاسـەتی نێودەوڵەتیـدا گـەورەتر کـردو حیـسابی زۆری بۆ کرا. بەڵام کورد کێشەکەی لەچاو کێشەی ئازەربایجانـدا لاوازتـرو بچووکتر بوو. لەم بارەوە پرسیاری زۆر دەکرێ: بۆچی سۆڤیەت یا سەرکردایەتیی ئازەربایجان کـە هاوپـەیمان بـوو، هـەوڵی نـەدا یـا هـانی کـوردی نـەدا یـان هاوکـاریی بزووتنـەوەی کوردی نەکرد تا شارەکانی کوردستان ئازاد بکەن؟!]

### چەند وێنەیەکی چالاکیی کۆڕو کۆمەڵو ناسراوان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ئازەربایجان:

ڕۆژنامـەی" ایـران" لـە ژمـارەی ڕۆژی ۱۹٤٥/۱۱/۲۸دا ڕایگەیانـدووە: نوێنـەرانی ئەنجومـەنی ئێـران کـە لای خـوارەوە ناویـان هـاتووە، بـۆ ئەنـدامێتیی کۆمـسیۆنی کاروباری ئازەربایجان هەڵبژێردراون:

۱- مالیکی مەدەنی نیقابەت لە فراکسیۆنی (میهن).

۲- ئەسکەندەریو فەرمانفەرمایان لە فراکسیۆنی (ازادی).

۳- شەریعەت زادەو حیشمەتی لە فراکسیۆنی (اتحادیە ملی).

٤- سیقەتول ئیسلامیو سەمسام لە فراکسیۆنی (دیموکرات).

٥- دکتور کەشاوەرزو شەهاب لە فراکسیۆنی (توودە).

٦- مەسعوودیو دکتۆر عەبدو لە فراکسیۆنی (مستقل).

۷- دکتور موسەددیقو دکتور شەفەق لە کەسانی سەربەخۆ.

۸- بـەهۆی بەشـدارنەبوونی زۆربـەی ئەنـدامانی فراکـسیۆنی (ملـی)یـەوە، هەڵبژاردنی نوێنەرانیان دواخرا.

**کۆبونەوەی ئەنجومەنی ئێران**

**٢٢ی تشرینی دووەمی ١٩٤٥:**

**بانگەوازی گرووپێکی نوێنەری ئەنجومەنی ئێران لە ئازەربایجان بۆ "حەکیمی"ی سەرۆك وەزیران**

**نابراوان داوایان لە حەکیمی سەرۆك وەزیران کردووە سێ دەستەی نوێنەرایەتی بۆ تاووتوێکردنی کێشەی ئازەربایجان ڕەوانەی مۆسکۆو لەندەن و واشنگتۆن بکرێ.**

**حەکیمی سەرۆك وەزیران لە وەڵامی ئەم پێشنیارەدا ڕایگەیاندووە کە بەئومێدە سەفەری ئەم دەستەیە بۆ ڕووسیا سەربکەوێ، پێی وایە کێشەی ئازەربایجان بە گەیشتنی ئەم دەستەی نوێنەرایەتییە لەگەڵ ڕووسیادا چارەسەر بکرێ[١].**

**هەڵوێستی "بەرەی ئازادیی ئێران"**
**سەبارەت بە ڕووداوەکانی ئازەربایجان:**

**[بەرەی ئازادی هاوینی ١٩٤٣ لە ژمارەیەکی ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەی ئێران: وەك ( رهبر، مردم، اژیر، دماوند، ازادگان، ظفر، پروش، ندای حقیقت، شهباز، خاور نو، ازربایجان، راستی، توفیق و... پێك هات- هەورامی]**

**ڕۆژنامەکانی "داد"و "فرمان"، ١٩٤٥/١٢/٧**

**ئەم دوو ڕۆژنامەیە بەیاننامەی (بەرەی ئازادی- جبهە ازادی)ی کە ژمارەیەکی زۆری ڕۆژنامە دیموکراتیەکانی ئێران دەگرێتە خۆی، سەبارەت بە ڕووداوەکانی ئازەربایجان بڵاو کردووەتەوە:**

**لە بەیاننامەکەی (بەرەی ئازادی)دا هاتووە: بەرەی ئازادی هەروەك زۆر جار ڕایگەیاندووە: دەسەڵاتدارانی سەرەوەی ئێرانی ئاگادار کردووەتەوە کە ئەم هەموو وێرانکاری و کێشەو شەرمەزاری و زوڵم و زۆرە لە ئێران دواڕۆژێکی خراپیان بۆ گەلی ئێران بەدواوە دەبێ. ڕووداوەکانی ئازەربایجان نموونەیەکن. ئەمڕۆ کۆنەپەرستان فرمێسکی تیمساحی بۆ دەڕێژن و دەستیان داوەتە بەدناوکردنی ئازەربایجان، هەروەك**

---

[١] هەمان سەرچاوە، ئۆ٦، د٤٢، پ٥٠، ل٢٤.

پێگەکانی لەشکری ئێران دا لە سەقزو سەردەشتو بانە خۆیان بەهێز بکەنو خواردنو چەكو تفاقیشیان پێبگات.

مەبەستمە لێرەدا ئاماژە بەو خاڵە گرنگە بکەم کە ئازەریەکان لە دەست بەسەراگرتن یا ئازادکردنی شارەکانی ئازەربایجاندا، چەكو تەقەمەنییەکی زۆریان دەست کەوت؛ هێزی لەشکری ئازەربایجانیان پێ دامەزراندو بەوە کێشەی ئازەربایجانیان لە ئاستی ئێرانو سیاسەتی نێودەوڵەتیدا گەورەتر کردو حیسابی زۆری بۆ کرا. بەڵام کورد کێشەکەی لەچاو کێشەی ئازەربایجاندا لاوازترو بچووکتر بوو. لەم بارەوە پرسیاری زۆر دەکرێ: بۆچی سۆڤیەت یا سەرکردایەتیی ئازەربایجان کە هاوپەیمان بوو، هەوڵی نەدا یا هانی کوردی نەدا یان هاوکاریی بزووتنەوەی کوردی نەکرد تا شارەکانی کوردستان ئازاد بکەن؟!]

**چەند وێنەیەکی چالاکیی کۆڕو کۆمەڵو ناسراوان**
**بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ئازەربایجان:**

ڕۆژنامەی" ایران" لە ژمارەی ڕۆژی ٢٨/١١/١٩٤٥دا ڕایگەیاندووە: نوێنەرانی ئەنجومەنی ئێران کە لای خوارەوە ناویان هاتووە، بۆ ئەندامێتیی کۆمسیۆنی کاروباری ئازەربایجان هەڵبژێردراون:

١- مالیکی مەدەنی نیقابەت لە فراکسیۆنی (میهن).

٢- ئەسکەندەرىو فەرمانفەرمایان لە فراکسیۆنی (ازادی).

٣- شەریعەت زادەو حیشمەتی لە فراکسیۆنی (اتحادیه ملی).

٤- سیقەتول ئیسلامیو سەمسام لە فراکسیۆنی (دیموکرات).

٥- دکتور کەشاوەرزو شەهاب لە فراکسیۆنی (توودە).

٦- مەسعوودىو دکتۆر عەبدو لە فراکسیۆنی (مستقل).

٧- دکتور موسەددیقو دکتور شەفەق لە کەسانی سەربەخۆ.

٨- بەهۆی بەشدارنەبوونی زۆربەی ئەندامانی فراکسیۆنی (ملی)یەوە، هەڵبژاردنی نوێنەرانیان دواخرا.

**کۆبونەوەی ئەنجومەنی ئێران**

**٢٢ی تشرینی دووەمی ١٩٤٥:**

**بانگەوازی گرووپێکی نوێنەری ئەنجومەنی ئێران لە ئازەربایجان بۆ "حەکیمی"ی سەرۆك وەزیران**

نابراوان داوایان لە حەکیمی سەرۆك وەزیران کردووە سێ دەستەی نوێنەرایەتی بۆ تاووتوێکردنی کێشەی ئازەربایجان ڕەوانەی مۆسکۆو لەندەن و واشنگتۆن بکرێ.

حەکیمی سەرۆك وەزیران لە وەلامی ئەم پێشنیارەدا ڕایگەیاندووە کە بەئومێدە سەفەری ئەم دەستەیە بۆ ڕووسیا سەربکەوێ، پێی وایە کێشەی ئازەربایجان بە گەیشتنی ئەم دەستەی نوێنەرایەتییە لەگەڵ ڕووسیادا چارەسەر بکرێ[1].

**هەڵوێستی "بەرەی ئازادیی ئێران"**
**سەبارەت بە ڕووداوەکانی ئازەربایجان:**

[بەرەی ئازادی هاوینی ١٩٤٣ لە ژمارەیەکی ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەی ئێران: وەك ( رهبر، مردم، اژیر، دماوند، ازادگان، ظفر، پروش، ندای حقیقت، شهباز، خاور نو، ازربایجان، راستی، توفیق و... پێك هات– هەورامی]

ڕۆژنامەکانی "داد"و "فرمان"، ١٩٤٥/١٢/٧

ئەم دوو ڕۆژنامەیە بەیاننامەی (بەرەی ئازادی– جبهه ازادی)ی کە ژمارەیەکی زۆری ڕۆژنامە دیموکراتیەکانی ئێران دەگرێتە خۆی، سەبارەت بە ڕووداوەکانی ئازەربایجان بڵاو کردووەتەوە:

لە بەیاننامەکەی (بەرەی ئازادی)دا هاتووە: بەرەی ئازادی هەروەك زۆر جار ڕایگەیاندووە: دەسەڵاتدارانی سەرەوەی ئێرانی ئاگادار کردووەتەوە کە ئەم هەموو وێرانکاری و کێشەو شەرمەزاری و زوڵم و زۆرە لە ئێران دواڕۆژێکی خراپیان بۆ گەلی ئێران بەدواوە دەبێ. ڕووداوەکانی ئازەربایجان نموونەیەکن. ئەمڕۆ کۆنەپەرستان فرمێسکی تیمساحی بۆ دەڕێژن و دەستیان داوەتە بەدناوکردنی ئازەربایجان، هەروەك

---

[1] هەمان سەرچاوە، ئۆ٦، د٤٢، پ٥٠، ل٢٤.

خۆیی دەبڕیوەو داوای کردووە لە خۆیدا ئازاد بێ. لەنگەرانی ڕایگەیاند: بزووتنەوەی ئەمڕۆی ئازەربایجان بە تەواوی ناوەڕۆکێکی یاسایی هەیە، چونکە ئازەریەکان چەند جارێك داوا ڕەواکانی خۆیان لە ئەنجومەنی ئێراندا خستووەتە بەرچاو، بەلام کاربەدەستانی دەسەلاتدار گوێیان لەم داواکاریانە نەبوە. بۆیە بزووتنەوەی ئازەربایجان ڕەنگدانەوەو ئەنجامی ئەو سیاسەتەی دەوڵەتە. ئەمڕۆ ئازەربایجانیەکان داوای سێ بەشی مافە ڕەواکانی خۆیان دەکەن. پاش قسەکانی موسەددیق کۆمیسیۆنێك هەڵبژێردرا، داواکانی گەلی ئێرانی بەم جۆرەی لای خوارەوە خستە بەرچاوی دەوڵەت و ئەنجومەن:

١- لابردنی ئەو یاسایانەی کە دژ بە یاسای بنچینەیی ئێرانن، لەوانە یاسای دواخستنی هەڵبژاردنی ئەنجومەن.

٢- بەپەلە هەنگاو بنرێ بۆ نەهێشتنی خراپ لێکحالیبوونی نێوان ئێران و سۆڤیەت، هەروەها وازهێنان و خۆلادان لەو ڕاگەیاندنانەی کە پێوەندییان بە کێشەی نێونەتەوەییەکانەوە هەیەو لەوانەیە زیان بەو پێوەندییانە بگەیەنن.

٣- ئالوگۆڕی کابینەی دەوڵەت یا دەست لە کارکێشانەوەی.

٤- دەستبەجێ حکوومەتی عەسکەری لە تاران هەڵوەشێنرێتەوە، داخستنی ڕۆژنامەو بارەگای پارتەکان هەڵبگیرێن. پاککردنەوەی دەزگاکانی دەوڵەت لەو کەسانەی کە پێوەندیی دەوڵەت بە پارتە سیاسیەکان و دەوڵەتانی هاوسێوە تێك دەدەن.

٥- چاوخشاندنەوە بە ڕێبازی سیاسی و بەرنامەی ئابووریی دەوڵەتدا، ڕیفۆڕم بەپێی بەرژەوەندەکانی گەلی ئێران بکرێ.

٦- ناردنی دەستەی نوێنەرایەتی بۆ مۆسکۆو ئازەربایجان، بە مەبەستی سەقامگیرکردنی پێوەندیی دۆستانە. دەستەی ناوبراو لە کەسانی نیشتمانپەروەر پێك بێ، لەوانەی وا لە ٢٤ سالی ڕابردوودا بەدناو نین.

٧- ڕێکخستنی دادگای سەربەخۆ، بۆ موحاکەمەکردن و سزادانی ئەو کەسانەی کە تاوانیان بەرانبەر بە دەوڵەت و کۆمەڵگا کردووە.

٨- ڕێکخستنی ئەنجومەنەکانی ئەیالەتی و ویلایەتی لە سەرانسەری ئێراندا.

٩- نابێ دامودەزگاکان دەست لە کاروباری سیاسی و کۆمەڵایەتی وەربدەن و پێوەندیی خەڵک و دەوڵەت تێک بدەن. دەسەڵات و ئەرکی ئەم دامودەزگایانە بەپێی یاسای بنچینەیی ئێران سنووردار بکرێن.

**وتوویژی ڕۆژنامەی "یغما"**
**لەگەڵ شێخ محەمەد حەسەنی**
**ڕێبەری ئاینیی بەناوبانگی ئازەربایجان‌دا**
**١٩٤٥/١٢/٢٥:**

شێخ محەمەد حەسەن ئێستا لە تەوریز دەژی و موریدی زۆری هەم لە ئازەربایجان و هەم لە تاران هەن، تەمەنی ٨٦ ساڵە.

شێخ لە وەڵامی پرسیارێکدا دەربارەی ڕووداوەکانی ئەم دواییە، گوتی: بزووتنەوەیەکی ئەوتۆ پێویستە لە هەموو شوێنێکدا بەرپابێ، چونکە جووتیاران چیتر ناتوانن بۆ هەتاهەتایە چاو لە تاڵان و چەوساندنەوەی چەند موڵکدارێك بپۆشن کە لە تاران دەژین، ناتوانن چیتر لەو بارودۆخەدا بژین کە دەسەڵاتی ناوەندی هیچ پێویستی و داواکارییەکی ئەم خەڵکەی تێدا جێبەجێ ناکات. دەستەیەك کە خۆیان بە نوێنەری ئەنجومەن دادەنێن، تەنیا بەرژەوەندی خۆیانیان لەبەر چاوە وەك لەوەی نوێنەری خەڵك بن.

سەبارەت بە کێشەی زمان لە ئازەربایجان، شێخ گوتی: دەبێ بوار بە خەڵك بدرێ تا بەو زمانە بدوێن کە خۆیان پێیان باشە. بەڵام لەبارەی گۆڕینی زمانی دەوڵەتی و زمانی دامودەزگاکانی دەوڵەتەوە، شێخ گوتی: لەم کاتەدا ئەوە هەڵەیە. هەروەها شێخ گوتی ژمارەیەکی زۆری بەشدارانی بزووتنەوەی ئازەربایجان دەناسێ، ئەوانە مرۆڤی پاك و ڕووناکبیرن. ئەگەر دەوڵەت سیاسەتی خۆی نەگۆڕێ، ئەوا تەواوی ئێران بەبێ ئازەربایجانیش ڕادەپەڕن.

شێخ لە وەڵامی پرسیارێکدا کە ئایا ئامادەیە سیاسەتی دەوڵەتی ناوەندی بەپێی یاسای ئیسلامی پەسند بکات، بە تووڕەییەوە گوتی: نا. هەروەها شێخ فەناتیزم (توندڕەوی)ی ئیسلامیی بە شێوەی خۆئازاردان مەحکووم کرد...

وەك لەم چەند بەڵگەنامە نووسراوەی ئێراندا دەردەکەوێ، فراکسیۆنەکانی ئەنجومەنی ئێران و ژمارەیەکی نوێنەرانی ئەنجومەنی ئێران و بەرەی ئازادی کە لە چەند ڕۆژنامەی ئێران پێك دێ، هەروەها نوێنەرانی ئازەربایجان لە ئەنجومەنی ئێراندا یا پیاوێکی دینی و بەناوبانگی ئازەربایجان وەك شێخ محەمەد حەسەن، ئەمانەو زۆر کەسایەتی و ڕۆژنامەنووسی دیکە هەوڵی زۆریان داوە کێشەی ئازەربایجان چارەسەر بکرێ، خوازیاری جێبەجێکردنی یاسای بنچینەیی ئێران و بەڕێوەچوونی هێندێ ڕیفۆڕمن لە سەرانسەری ئێرانداو گوشارێکی زۆریان خستووەتە سەر دەسەڵاتدارانی ئێران.

سەرباری ئەوە، هەوڵی سۆڤیەت لەناو پارتەکانی کۆمۆنیستی و سەندیکاکانی کرێکاریی جیهاندا زیاتر کێشەی ئازەربایجانی بردە پێش، بووە مایەی هاودەردی و پشتیوانییان لە خەباتی گەلی ئازەربایجان، لەکاتێکدا سۆڤیەت شتێکی وەهای بۆ کورد نەکرد.

خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە حەکیمی سەرۆك وەزیرانی ئێران زۆر کەوتوەتە بەر پەلاماری سۆڤیەت و توودەییەکان، تا دواجار لابراوەو قەوام بووە بە سەرۆك وەزیران. وەڵامی پێشنیاری نوێنەرانی ئەنجومەنی ئێران ئەوەیە کە سێ دەستەی نوێنەرایەتی پێك بهێنرێ بۆ چارەسەری کێشەی ئازەربایجان و ڕەوانەی مۆسکۆو لەندەن و واشنگتۆن بکرێن. حەکیمی بە ئومێد بووە کێشەکە لەنێوان مۆسکۆو تاراندا چارەسەر بکرێ، چونکە کێشەکە پێوەندیی بە سۆڤیەتەوە هەیە، واتا ناردنی دەستەی نوێنەرایەتیی بۆ لەندەن و واشنگتۆن پێ پێویست نەبوە.

**کورتەی وتوویژی قەوامول سەڵتەنە لەگەڵ ڕۆژنامەی "دەیلی تەلگراف"دا وەرگێڕاوی ڕۆژنامەی "دەریا"، ١٩٤٥/١٢/١٧:**

قەوام، سەبارەت بە ڕووداوەکانی باکووری ئێران، ڕایگەیاند: دەبێ بزانرێ هۆی چییە زۆربەی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە ڕازی نین؟ گەر ئەم بزووتنەوەیە لەلایەن یەکێتیی سۆڤیەتەوە پشتیوانیی مەعنەویی لێ دەکرێ، بەو مانایەیە کە ئەوە هەڵوێستێکی گشتیی هاوپەیمانانە، دەیانەوێ دیموکراسی لە سەرتاسەری ئێراندا بڵاو ببێتەوە.

قەوام سەبارەت بە ناردنی سوپا بۆ ئەو ناوچانە، گوتی: تا لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا ڕێك نەکەوتنایەو بەو بارەوە تێگەیشتنی تەواو لەنێواندا نەبوایە، نەدەبوو سوپای ئێران ڕەوانەی ئەو ناوچانە بکرێ، چونکە جگە لەو ڕێگەیە ڕێگەی دیکەیش هەیە بۆ چارەسەری کێشەی ئازەربایجان.

قەوام ڕایگەیاند گەر دەسەڵات وەربگرێ، دەستبەجێ ڕیفۆڕمی کۆمەڵایەتی دەکات بۆ باشترکردنی ژیانی کرێکاران و جووتیارانی ئێران، کێشەی نێوان جووتیار و خاوەن زەوی چارەسەر دەکات و دەکەوێتە سزادانی دزو تاڵانچییان. سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوە، گوتی: مەبەستی سەرەکیی من ڕەچاوکردنی سیاسەتێکی بێلایەنانەو ڕاگرتنی هاوسەنگیی هێزە.

ناوبراو گوتی: پێوەندیی دۆستانەی ئێمە لەگەڵ سێ زلهێزە هاوپەیمانەکە (ئەمریکا ئینگلیزو سۆڤیەت)دا بەستراوەتەوە بەوەی کە ئەوان تا چ ڕادەیەك ڕێز لە سەربەخۆیی و سەروەری و یەکپارچەیی خاکی ئێران دەگرن. بە پێچەوانەی ڕابردووەوە، نابێ هاوپەیمانەکان دەست لە کاروباری ناوخۆی ئێران وەربدەن، تا گەلی ئێران بتوانێ لە سایەی یارمەتیی مەعنەویی هاوپەیماندا بە ئامانجەکانی نیشتمانیی خۆی بگات و سەرکەوتن بەدەست بهێنێ.

قەوامول سەڵتەنە گوتی: سیاسەتی ئاژاوەگێڕانەی دژی سۆڤیەتی لە ئێران، هەلومەرجی ئاڵۆزو قەیرانی ئەمڕۆی ئێرانی بەدواوە بووە. سەبارەت بە ڕووداوەکانی ئێران، پاش تەواوبوونی خولی چواردەهەمی ئەنجومەنی ئێران، قەوام گوتی: نابێ یاسای بنچینەیی ئێران ژێرپێ بنرێ، دەبێ جێبەجێ بکرێ و نابێ بگۆڕدرێ. ئەو یاسایەش کە سەبارەت بە قەدەغەکردنی هەڵبژاردن پەسند کراوە، بەبێ لێکۆڵینەوە بووە.

قەوام گوتی: من هەمیشە بەپێی یاسای بنچینەیی (دەستوور)ی ئەنجومەنی ئێران کارم کردووە، ڕێز لە یاساو ئەنجومەنی ئێران دەگرم.

ڕۆژنامەی "ئازادگان" ، ١٩٤٥/١٢/١٣

لە چەند ژمارەیەکدا بە چەند گوتارێك بەتوندی پشتگیری لە قەوام دەکات، نەیاری تاقمی "سەیید زیائەددین"ی دزو بەرتیلخۆرو دژ بە مانەوەی کابینەکەی

"حەكیمی" نووسیویە: قەوام كەسێكی نەترس و پاكەو هەموان دەیناسن، ئەو بە ئامۆژگاری و پێشنیاری ئەمو ئەو ڕەفتار ناكات، یا بە قسەی ئەمو ئەو ناجوولێتەوە، دەڵێ: ئەگەر قەوام ١٩٣٣ دەسەلاتی بەدەستەوە گرتبایە، ئەوا تاقمو دەستە لەناو سوپای ئێراندا دروست نەدەبوو، لەوانەبوو ڕووداوەكانی خۆراسان و ئازەربایجانی ئێران ڕوویان نەدابایە. ڕۆژنامەی "ئازادگان"هەواڵی كوشتنی محەمەد تەقیخانی پەسیان بەدەستی قەوام كە تاقمی زیائەددین جەختی لەسەر دەكەنەوە، بەدرۆ دەخاتەوە. هەروەها نووسیویە: ڕووداوەكانی ١٧ی ئازەری ١٩٤٣ تاوانی قەوام نەبوە، بەڵكوو نەیارەكانی تاوانبارن و مەبەستیان ئەوە بوو لەسەر دەسەلات لای ببەن.

[قەوام پێش هاتنە سەر حوكم، یەكەم جار نەبوو وتووێژێكی لەو بابەتە نەكات و خۆی نەك تەنیا بە لایەنگری ڕیفۆرم و دیموكراتی و چەسپاندنی یاساو چارەسەری كێشەكانی ناوخۆ دانەنێ، بەڵكوو بەڵێنی ئەوەیش نەدات كە ئەگەر دەسەلاتی وەرگرت دەكەوێتە جێبەجێكردنیان، تەنانەت سۆڤیەتیش ڕازی بكات كێشەی كرێكاران و جووتیاران كە زۆربەی دانیشتوانی ئێران پێك دەهێنن، چارەسەر بكات. وتنەوەی وشەی كرێكارو جووتیار لەلایەن قەوامەوە، بە هەڵكەوت نەبوەو بۆ مەبەستێكی تایبەت بووە، واتای بەدەست هێنانی پشتیوانیی توودەو سۆڤیەتی هەبوە. "قەوام"ی یەكێك لە گەورەترین دەوڵەمەندانی خاوەن موڵك و گەورەترین تالانكەرانی سامانی گەلانی ئێران بەدرێژایی ماوەی ئوستانداری و وەزیری و سەرۆك وەزیرانیی كە ئەو پۆستانەی زیاتر لە بیست ساڵ بەدەستەوە بوون، سەرباری دزی، یەكێك بووە لە سەركوتكەرانی بزووتنەوە ڕزگاریخوازەكانی ئێران، بەتایبەت بزووتنەوەكانی كورد. ئەمڕۆكە قەوام بە باسكردنی ڕیفۆرم و دیموكراسی، بووەتە دڵسۆزی چینی چەوساوەی كۆمەڵگای ئێران. ڕۆژنامەو چاپەمەنیەكانی دیكەی ئێران، بەتایبەت ئەوانەیان كە سەر بە توودەو لایەنگری سۆڤیەت و نوێنەرانی ناسیۆنال شۆڤێنیەكانی ئێران بوون، بە لایەنگرییان لە قەوام زەمینەی لابردنی كابینەی "حەكیمی"یان بەتەواوی خۆش كرد. قەوام لە سایەی سەری ئەوانەوە هاتە سەر كورسیی حوكم، زۆری پێنەچوو بووە سەرۆك وەزیران و سەری لە مۆسكۆ دا؛ بەڵێنی جێبەجێكردنی ڕیفۆرم لە ئێران و بەستنی پەیماننامەی نەوت لەنێوان

سۆڤیەت و ئێرانداو چارەسەری کێشەی ئازەربایجان و گەلێك بەڵێنی دیکەی دا، بەڵام هیچ کامیانی جێبەجێی نەکرد. قەوام، ئەگەر لایەنگری یاساو جێبەجێکردنی یاسای بنچینەیی ئێران بووە، بۆچی لەماوەی دەسەڵاتداریێتیی خۆیدا کە چەند جارێکی تێدا بووەتە سەرۆك وەزیران، جێبەجێی نەکرد؟ یا کە چەند جار سەرۆك وەزیران یا وەزیری کاروباری دەرەوەو بگرە وەزیری ناوخۆیش بووە، بۆچی سیاسەتی بێلایەنیی خۆی و دەوڵەتەکەی بەرامبەر بە زلهێزەکان ڕەچاو نەکردووە؟ قەوام هیچ کاتێك، چ بە کردەوەو چ بە ئاشکرا، لایەنگریی خۆیی لە ئەمریکا نەشاردووەتەوە. پێوەندیی نێوان سۆڤیەت و ئێران لە سەردەمی ئەودا ئاڵۆزتر بووە، هیچ کاتێك کارێکی نەکردووە بۆ ئاساییکردنەوەی پەیوەندیەکانی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە. قەوام ئەگەر دانی پێدا دەنێ هۆی سەرەکیی ڕووداوەکانی باکووری ئێران کە دانیشتوانی دژی دەوڵەتی ناوەندی ڕاپەڕیون، ئەوەیە دەوڵەتی ناوەندی کێشەکانی ئەو ناوچانەی چارەسەر نەکردووە، ئەگەر ئەوکاتەی وەزیری ناوخۆی ئێران بووە (لە هەمان کاتدا سەرۆك وەزیرانیش بووە)، بۆچی ئەو کێشانەی چارەسەر نەکردووە، تا نەتەقنەوە؛ بۆ وێنە، لای لە داواکانی گەلی کوردو دواتر گەلی ئازەرو گەلانی دیکە نەکردوەتەوە. سەرباری ئەوە، هێزەکانی ئێران زیاتر لە سی ساڵە داوای جێبەجێکردنی یاسای بنچینەیی ئێرانیان کردووە.

سۆڤیەت و توودەو چاپەمەنیە لایەنگرەکانیان، نەك هەر نەدەبوو بڕوا بە درۆو دەلەسەی قەوام بکەن، بەڵکوو نەدەبوو پشتگیری لە گەڕانەوەی قەوام بکەن بۆ سەر دەسەڵات. قەوام کەسێك نییە چەند جارێك تاقی نەکرابێتەوە. پێش ئەوەی کێشەی ئازەربایجان لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا سەر هەڵبدات، چوار ساڵی ڕەبەق بوو کێشەی کوردستان لەبەردەم دەسەڵاتدارانی ئێراندا بوو، بەتایبەت کە قەوام چەند جار بوو بە سەرۆك وەزیرو چارەسەری نەکرد. هەر ئەو کەسە بوو کە دەیویست (تەنانەت دوای پەیماننامە مۆرکردنیش) دەرهێنانی نەوتی ناوچەکانی سەر سنووری سۆڤیەت، لە سنووری ئەفغانستانەوە تا تورکیا، سەرلەبەر بدا بە ئەمریکاو.... سۆڤیەت چۆن ئامۆژگاریی توودەو قازی محەمەدو پیشەوەریی کرد پشتگیریی قەوام بکەن (بڕوانە نامەکەی ستالین بۆ پێشەوەری و چاپەمەنیەکانی ئەو سەردەمەی توودەو وتەکانی قازی محەمەدو پیشەوەری لەسەر قەوام).

خالّی هەر گرنگ لە وتوویّژی قەوامدا ئەوەیە کە بە هەواڵدەری "دەیلی تلگراف"ی گوتووە: تا ڕێککەوتن و تێگەیشتنێکی گشتی و تەواو لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا نەبێ، سوپای ئێران ڕەوانەی ئازەربایجان ناکرێ. واتە بە ڕێگەی عەسکەری کێشەی باکوور (ئازەربایجان و کوردستان) چارەسەر ناکرێ. جگە لەوە، قەوامی دیموکرات و ئاشتیخواز گوتوویە: ڕێگەیەکی دیکە (نەك ڕێگەی عەسکەری) بۆ چارەسەری کێشەی ئازەربایجان هەیە، واتە لەڕێی وتوویّژەوە دەبێ. دیارە دەوڵەت تا بەڵێن لە سۆڤیەت وەرنەگرێ، ناتوانێ بە هیچ شێوەیەك کێشەکانی باکووری ئێران چارەسەر بکات. هەروایش کەوتەوە، بەڵێنی دانی نەوت بە سۆڤیەت دراو پەیمانەکە بەسترا، سۆڤیەتیش فەرمانی بە ئازەربایجان و کوردستان دا بەرگری نەکەن و خۆ بەدەستەوە بدەن و ڕێگە خۆش بکەن بۆ گەڕانەوەی دەسەڵاتی ئێران بۆ ئەو دوو هەرێمە. قەوام و هاوبیرانی لەو بڕوایەدا بوون بەبێ ڕازیکردنی سۆڤیەت ئێران وەك جاران ناتوانێ دەست بەسەر ئەو دوو هەرێمەدا بگرێتەوە. لێرەدا هەڕەشەکانی قەوام لە ڕاگەیاندن و بەیاننامەکانیدا دوا دەخەین بۆ ئەوکاتەی کە قەوام بڕیار دەدات هێرش بکرێتە سەر ئازەربایجان و کوردستان- هەورامی]

**لێدوانی باڵوێزی ئێران لە واشنگتۆن و**
**نامەی شای ئێران بۆ تروومان:**

تاس- واشنگتۆن، ١٩٤٥/١٢/١

"حسین عەلا"ی باڵوێزی ئێران لە ئەمریکا ٢٩ی تشرینی دووەمی ١٩٤٥ بڕوانامەی خۆی پێشکەشی "تروومان"ی سەرۆك وەزیرانی ئەمریکا کرد. دواتر ناوبراو لە چاوپێکەتنێکی ڕۆژنامەوانیدا ڕایگەیاند: تروومانی لە وەڵامی یاداشتنامەکەی دەوڵەتی ئێران بۆ یەکێتیی سۆڤیەت ئاگادار کردووەتەوە وا کە سۆڤیەت ڕایگەیاندووە ناردنی هێزەکانی ئێران بۆ ئازەربایجان دەبێتە هۆی خوێنڕشتن.

هەر لەبەر ئەوە پێویست دەکات یەکێتیی سۆڤیەت هێزەکانی خۆی لە ئێران زیاد بکات. بەمجۆرە یەکێتیی سۆڤیەت بە ناردنی هێزی زیاتر هەڕەشەمان لێ دەکات، لەکاتێکدا ئەو مافەی نییە. هەروەها حوسێن عەلا ڕایگەیاند لە چاوپێکەوتنەکەیدا لەگەڵ تروومان‌دا، نامەی شای ئێرانی داوە. سەرۆك کۆماری ئەمریکا ناوبراو کاتی

چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ تروومانداه گوتی: ئێستا هیوای مرۆڤایەتی بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتیی جیهانی لەچاو پاش دووەم جەنگی جیهانیدا گەلێ زیاترە. لەبەر ئەوە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بێلایەن نییە بەرامبەر بە کاروباری جیهانیو چالاکانە لە ڕیکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکاندا هەڵدەسوڕێ. گوتی: دۆستایەتیی ئاسایيو باوی نێوان ئێرانو ئەمریکا، کراوە بە قوربانی هەوڵێکی زۆر بەهێز. ئێران لە خزمەتدا وەك پردی سەرکەوتن وا بووە، کەلوپەلو چەكو تەقەمەنییەکی زۆری ئەمریکاو ئینگلیز لە ڕێی ئەم وڵاتەوە گەیشتوونەتە یەکێتیی سۆڤیەت. بەم جۆرە شکستی فاشیزمی دوژمنی هەموانی خێراتر کردووە. بەیاننامەی تاران بەشداریو دەوری ئێرانی لە شەڕدا سەلماندووەو بەڵێنی هاوکاریی ئابووریی تێدا بە ئێران داوە لەدوای شەڕ. هاوپەیمانان، واتە هەرسێ زلهێزەکە، سەربەخۆیيو سەروەریی ئێرانیان مسۆگەر کردووە.

عەلا گوتی: ئێران بڕوای بە جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی کۆنفرانسی تاران هەیە. خاکی ئێران لە هێزی وڵاتانی بێگانە پاك دەکرێتەوەو چیتر بیانووی مانەوەیان لە ئێران نەماوە. ئامانجو مەبەستمان لە کانگای دڵەوە ئەوەیە بە ئاشتيو دۆستانە لەگەڵ هاوسێکانماندا بژین. هەروەها دەمانەوێ، بۆ کەڵك سامانی خاکی ئێران وەربگرینو بەرزی بکەینەوەو ئێران بەرەودیموکراسی ببەینو پێشی بخەین.

حوسێنی عەلا گوتی: هاوکاریی نێوان ئێرانو ئەمریکا لە سەردەمی ئاشتيو چوارچێوەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکاندا قازانجی بۆ هەردوولا دەبێ. پێوەندیی ڕاستەقینەو دۆستایەتیی نێوان ئەمریکاو ئێران، هێمنيو پێشکەوتنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان بەدواوە دەبێ. واتە ئەو ناوچانەی وا پڕ ئاڵۆزینو بەردەوام ئەڵقەی پێوەندیی وڵاتانی جیهانن، لەوانەیە بەردەوام ڕووداوی چاوەڕواننەکراویان تێدا ڕوو بدات.

تروومان لە وەڵامی وتەکانی عەلادا گوتی: زۆر سوپاس بۆ بڕواو متمانەی ئێوە بە ئێمە و هەوڵی وڵاتەکان بۆ چەسپاندنی هێمنيو ئاسایشی جیهان. پێم وایە ئێرانیش هێزو وزەی خۆی بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزە دەخاتە گەڕ، هەروەك چۆن لە دووەم جەنگی جیهانیدا یارمەتیی پێشکەش کرد. مایەی خۆشحاڵییە کە ئێران بووەتە میوانداری یەکێ لە کۆنفرانسە مێژووییە گەورەکانی سێ زلهێزی سەردەمی دووەم جەنگی

جیهانی، دەورێکی باشی لە سەرکەوتنی وڵاتانی یەکگرتووی دژ بە فاشیزمدا بینیوە. ئێران سیستمی ڕێگەوبان و گواستنەوەی خستووەتە خزمەتی هێزە هاوپەیمانەکان. لەو بڕوایەدام دۆستایەتیی نێوان هەردوو دەوڵەت کە چەند ساڵە بەردەوامە، لەسەر بناغەی بەرژەوەندەکانی هەردوو گەلی ئێران و ئەمریکا بەردەوام دەبێ.

حوسێن عەلا وێنەی نامەی شا بۆ تروومانی دا بە ڕۆژنامەنووسان، ئەوە شتێکی بێوێنە بوو. بەم کارەی، چواچێوەی هەموو نەریتی دیپلۆماسی و نهێنکاریی وەلانا. شا نامەکەی ١٠ی ئەیلوولی ١٩٤٥ لە کۆشکی سەعدئاباد بۆ تروومان نووسیوە. گوتوویە:

((سەرۆك کۆماری بەڕێزی ئەمریکا

بەبۆنەی دیاریکردنی یەکەم باڵوێزی ئێرانەوە لە وڵاتی ئێوە، ئەمە بە دەرفەتێکی باش دەزانم بەم بۆنەوە گەرمترین سڵاوو هیوای سەرکەوتنتان بۆ بنێرم و لە ناخی دڵەوە هەستی پاکی گەلی ئێرانتان پێ ڕابگەیەنم. هەڵبژاردنی حوسێنی عەلا وەزیری دەرباری شا بۆ پۆستی گرنگی باڵوێزی ئێران لە وڵاتەکەتان، نیشانەی نیازپاکی و ئاواتەخوازی بەستنی پێوەندییەکی تەواو و دوولایەنە بوو لەسەر بناغەی بڕواو هاوکاریی دووقۆڵیی دەوڵەتی ئێران لەگەڵ ئەمریکادا. لەوکاتەوە کە ئێمەو ئێوە پێوەندیی دیپلۆماسیی ئاساییمان هەبوە، شەست ساڵ تێپەڕ بووە. چل ساڵ بەر لە ئێستا، ئێران بە مەبەستی ڕێکوپێکردنی سیستمی دارایی خۆی، داوای لە وڵاتە یەکگرتوەکان کرد بە ناردنی ڕاوێژکاری پسپۆڕی دارایی هاوکاریی ئێران بکات. لەوکاتەوە تائێستا پێوەندیی دوولایەنەمان و تێگەیشتن و دۆستایەتیی نێوان هەردوو وڵات هەروا بەردەوامن و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پەرە بەم پێوەندییە دەدرێ و بەهێزتر دەکرێ. ئێمە هەمیشە نوێنەرانی ئێوەمان لە ئێران وەك سمبولی یەکسانی و نیازپاکی چاو لێ کردووە. سەردانی سەرۆك کۆماری خوالێخۆشبووی ئەمریکا لە ١٩٤٣دا بۆ ئێران، بوو بە مایەی شانازیی ئێمەو سەرکەوتنی پێوەندییەکانمان لەگەڵ کۆمەڵگای جیهانیدا. ئێمە ئەمەکباری ئەم مرۆڤە ناودارە، هەروەها هێزی مەعنەوی و دووربینیی ئەو کەسایەتیە بەرزەین. کۆچی دواییی ئەو مرۆڤە زیانێکی گەورە بوو بۆ هەموو دنیا. ئێمە بۆ هەمیشە ئەو ڕۆژانە لەیاد ناکەین کە خوالێخۆشبوو لەناوماندا بوو، ئەو ڕۆژانەی کە لە وڵاتی ئێمە پلانی سەرکەوتن بەسەر فاشیزمدا لەگەڵ هاوپەیماناندا دادەڕێژرا.

هەروەها بە سوپاس و پێزانینەوە ئەوە لەبیر ناکەین کە لە بەڵگەنامەکانی سەرۆکەکانی دەوڵەتە زلهێزەکاندا دان بە دەورو قوربانیدانی ئێراندا نراوە، کە دژ بە فاشیزم بەشداریی خەباتی کردووەو لە سایەی خوداوە بووە هۆی سەرکەوتن. هەروەها ئیمزاکردنی ئەو بەڵگەنامەیە لەبیر ناکەین کە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا سەروەری و یەکپارچەیی خاکی ئێرانی تێدا دەستەبەر کردووە. هەروەك بەڕێزتان ئاگادارن ئێران لەم شەڕەی دوایی جیهاندا بە هەموو تواناو وزەیەکیەوە کەوتە یارمەتیدانی هاوپەیمانان. ئێران بۆ سەرکەوتن بەسەر زوڵم و زۆرو نابەرامبەریدا، دەوری خۆی بینی و زیانیشی لێ کەوت. ئێستا کە سەرکەوتن بەدەست هاتووە، گەلی ئێران هەروەك گەلانی دیکەی جیهان چاوەڕوانی ڕۆژانی باشترەو هیواداره لە چوارچێوەی وڵاتەکەی خۆیدا بە هێمنی بژی و بە ئومێدە گوزەرانی دانیشتوان و پێشکەوتنی وڵاتەکەی مسۆگەر بکات. گەلی ئێران چاوەڕێیە ئەو هەوڵەی کە لەم پێناوەدا داویەتی و ئەو زیانەی کە لێی کەوتووە، بەفیڕۆ نەچووبن، چاوەڕێی هاوکاری و یارمەتیی هاوپەیمانانە، بەتایبەت وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا.

سەرۆك کۆماری بەڕێز

دەرفەتم بدەنێ ڕابگەیەنم گەلی ئێران و خۆیشم هەستێکی قووڵی دۆستانەمان بەرامبەر بە بەڕێزتان و گەلی ئەمریکا هەیە. ئەم هەستە ڕەگ و ڕیشەی لە دڵی ئێمەدایە. هەروەها پێم خۆشە ئەو ڕاستییە بڵێم کە دووربینی و سیاسەتی خێرخوازانەی دەوڵەتەکەتان کە بە سەرۆکایەتیی ئێوەو لە سایەی هونەرو ژیری و توانای سەرکەوتوانەی ئێوەوە بەڕێ دەچێ، مایەی خۆشحاڵی و ڕەزامەندیی ئێمەیەو بڕوای تەواومان هەیە کە ئەم سیاسەتە ئاشتی لە سەرانسەری جیهاندا سەقامگیر دەکات. دیسانەوە بەم بۆنەوە دەمەوێ هیوای لەش‌ساغی و بەختەوەری بۆ ئێوەی بەڕێزو پێشکەوتن و خۆڕاگری بۆ گەلی ئازادیخوازی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بخوازم.

دڵسۆزتان: محەمەد ڕەزا پەهلەوی))

هەروەها حوسێنی عەلا وێنەی دوو یاداشتی کە لە ٢٧ی تشرینی دووەمی ١٩٤٥ دراوە بە بێرنس، خستوەتە بەردەستی ڕۆژنامەنووس و هەوڵنێرەکان، بایەخێکی زۆری تێدا داوە بە یادداشتەکەی بیرنس کە ٢٤ی تشرینی دووەمی ١٩٤٥ بۆ یەکێتیی

سۆڤیەتی ناردووە، گوتوویە: تەواوی گەلانی ئازادیخوازو ئاشتخوازی جیهان پێشوازی لەم یادداشتە دەکەن.

لە یادداشتەکەی "بێرنس"دا، دەوڵەتی ئەمریکا جەخت دەکاتە سەر بەدیهێنانی ئەو ئامانج و پرنسیپە بەرزانەی کە لە دووەم جەنگی جیهانیدا خەباتیان لەپێناودا بۆ کراوە، واتە بۆ یەکسانی و ئاشتی لە جیهاندا. هەروەها نووسراوە: ((ئاژاوەو کردەوەی نایاسایی لە ئازەربایجان و زەنجان و... پەرە دەسێنێ، یاخیبوون بە خێرایی بەرەو تاران لە پێشڕەویدایەو بارودۆخی ئەوێ زۆر ئاڵۆزە))، چالاکیی سەربازانی سوور لە تاران بەدی دەکرێ، ((سەرەڕای ڕاگەیاندنی ڕەسمیی دەوڵەتی سۆڤیەت کە سوپای سوور لە تاران کشاوەتەوە)). گوایە ئەم وتانە لە ڕاگەیاندنی وەزیری ناوخۆی ئێرانەوە وەرگیراون و... حوسێنی عەلا لە یاداشتی دووەمیدا هیواداره کە بێرنس بەردەوام چاودێریی ڕووداوەکانی ئێران بکات بۆ چارەسەی کێشەی ئێران و هێمنیی ئەم وڵاتە کە تەنیا بە دەرچوونی هێزە هاوپەیمانەکان بەدی دێ. هیواداره کەڵك لە دەوری خۆی وەربگرێ[1].

**ڕاگەیاندنە ئاژاوەگێڕانەکەی چاپەمەنیی ئەمریکا**

**سەبارەت بە بارودۆخی ئێران:**

هەواڵنێری تاس– نیویۆرك، ١٩٤٥/١٢/٢٣

زۆربەی چاپەمەنیەکانی ئەمریکا سەبارەت بە ڕووداوەکانی ئێران، لە نووسینەکانیاندا سەرزەنشتی یەکێتیی سۆڤیەت دەکەن و دەنووسن: کردەوەکانی سۆڤیەت پێچەوانەی بەیاننامەی کۆنفرانسەی تاران و ئەتلانتیکە، سەرکەوتنی کۆبوونەوەی مۆسکۆیان خستوەتە مەترسییەوە.

ڕۆژنامەی "ئینکۆ ئایرێر" کە لە فیلادلفیا دەردەچێ، نووسیویە: بێرنس دەبێ بەتوندی دژ بە (ئیمپریالیزمی نەوتخۆر)ی یەکێتیی سۆڤیەت بوەستێتەوە، چونکە ئەو سیاسەتەی سۆڤیەت هەڕەشەیە لە ڕاگرتن یا تێکدانی کۆبوونەوەی مۆسکۆ. ڕووداوەکانی ئازەربایجان پێویستییان بە دەستێوەردانی خێرای ڕێکخراوی نەتەوە

---

[1] هەمان سەرچاوە، ئۆ٦، د٤٢، پ٥٠، ل٥٥–٥٩.

یەکگرتوەکانە، هەڵگرتنی بەپەلەی ئەو کێشەیەیە کە پێوەندیی بە هەلومەجی جیهانەوە هەیە.

توێژەرەوەی ڕۆژنامەی "واشنگتۆن پۆست" نووسیویە: بارودۆخی ئێران مەترسیی بۆ کۆبوونەوەی مۆسکۆ هەیە، "نوڤیر"ی نووسەری وتارەکە نووسیویە: ئەگەر یەکێتیی سۆڤیەت لەو بەڵێنەی خۆی کە لە کۆنفرانسەکانی تاران و سان فرانسیکۆدا داونی، پەشیمان ببێتەوە، کۆبوونەوەی مۆسکۆ دەخاتە چاڵی مەرگەوە. نوڤیر نووسیویە: لەوانەیە بەبێ هەبوونی سوپای سۆڤیەت، ڕاپەڕین لە ئێران ڕووی دابایە، چونکە بەڕێوەبەرێتییەکی خراپ و ئاڵۆزی باری ئابووری و زوڵم و زۆر لەم وڵاتەدا هەن. بەڵام ئاشکرایە، لەبەر ئەوەی سوپای سۆڤیەت لەئارادا بووە، دەوری لە ڕاپەڕینەکەدا هەبوە.

هەواڵنێری ڕۆژنامەی" نیویۆرک تایمز" لە لەندەن نووسیویە: بەپێی هەواڵێک کە لە سەرچاوەیەکی بڕواپێکراوەوە بە دەستی گەیشتووە: دەستەیەک لە کوردەکان لە باکۆ دەخوێنن و ئێستا لە ئازەربایجانی ئێرانن. پێدەچێ پروپاگەندەی ئەو خوێندکارانە لەناو کوردەکانی تورکیاو عیراقدا ببێتە مایەی پەرۆشیی بەغداو ئەنقەرە[1].

**لێدوانی "حوسێنی عەلا"ی باڵوێزی ئێران**

**لە واشنگتۆن:**

**تاس– واشنگتۆن، ١٩٤٥/١١/١٩**

"حوسێنی عەلا" باڵوێزی ئێران لە ئەمریکا، دوای کۆبوونەوەی لەگەڵ بێرنس وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمریکادا، لە وتووێژێکی ڕۆژنامەنوسیدا ڕایگەیاند: بارودۆخی باکووری ئێرانی لەگەڵ "بێرنس"دا تاووتوێ کردووە، پێی وایە سۆڤیەت بەرپرسی ئەم ڕووداوەیە. هەروەها گوتی: ئەگەرچی هیچ هەواڵێکی ڕەسمیم لەم بارەوە پێنەگەیشتووە، بەڵام ڕاگەیاندنی چاپەمەنیەکان مایەی پەرۆشی و مەترسییە. گوتی: بارودۆخی ئێران وا دەخوازێ ئاشکرا بکرێ، ((ئەو بەناو ڕاپەڕینە هەستی گەلی ئێران دەرنابڕێ))، ((ڕاپەڕینەکە دەستکردەو بە دەسیسە سەری هەڵداوە))، ((ئێران دەیەوێ پێوەندیی دۆستانەی لەگەڵ هاوسێ بەهێزەکەی باکووردا هەبێ))،

---

[1] هەمان سەرچاوە، نۆ٦، د٤٢، پ٥٠، ل٠–٩.

که مەبەستی یەکێتیی سۆڤیەتە. هەروەها لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: شای ئێران هەمیشە بەئارام بووە، ئێران سوورە لەسەر دەرچوونی هێزی بێگانە لە وڵاتەکەیدا، تا تێکهەڵچوونی وای تێدا بەرپا نەبێ لەوانە کە ئەمڕۆ باسی لێوە دەکرێ. بەهۆی بوونی هێزی بێگانەوە لە باکووری ئێران، سنوورەکانی وڵات ئاواڵەن بۆ هاتنی هەر گرووپ و تاقمێك لە قەفقازەوە. عەلا گوتی: هەمیشە تەورێزو ئازەربایجان وەفاداری دەوڵەتی ئێران بوون، تەنانەت ناکرێ باسی سێبەری ڕاپەڕینەکەی تەورێز دژی ناوەند بکرێ و بچێتە ژێر سایەی دەوڵەتێکی دیکەوە.

حوسێنی عەلا گوتی: ئێران هەوڵی داوە پێوەندیی دۆستانەی بە یەکێتیی سۆڤیەتەوە هەبێ، گوتی ئێران (پردی سەرکەوتن) بووە، لەڕێی ئەو پردەوە پێویستیەکانی جەنگ گەیەنراونەتە ناو خاکی سۆڤیەت و بوونەتە هۆی سەرکەوتنی یەکێتیی سۆڤیەت بەسەر ئەڵمانیای نازیدا. جگە لە پەیماننامەی سێ لایەنە، بڵاوکراوەی ئەتلانتیك و بەیاننامەی تاران کە سەربەخۆیی ئێرانیان بە ڕەسمی ناسیوەو ڕێزیان لە ئێران ناوە. عەلا گوتی: گەرچی ڕۆژی ٢ی مارتی ١٩٤٦ دوایین وادەی دەرچوونی هێزەکانی بێگانەیە لە ئێران، بەڵام هێزەکانی ئینگلیزو یەکێتیی سۆڤیەت دەتوانن پێش وادەی دیاریکراو ئێران بەجێبهێڵن، چونکە هیچ پاکانەیەك بۆ مانەوەیان لە گۆڕێدا نییە[1].

**ئاژانسی "ڕۆیتەر" سەبارەت بە ڕووداوەکانی ئێران:**

**تاس- لەندەن، ٣٠/١١/ ١٩٤٥**

ئاژانسی ڕۆیتەر لە زمانی لێکۆڵەرەوەی دیپلۆماسیی "سیلوین مانژوە" ناوی خۆیەوە، دەڵێ: "تەقیزادە"ی باڵوێزی ئێران لە لەندەن ئێوارەی ئەمڕۆ سەری لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی بریتانیا داوە، چاوی بە "بوین" کەوتووە، تا لە دوا ڕووداوەکانی ئێران ئاگاداری بکاتەوە. نوێنەرانی ئێران لە لەندەن بە دوورودرێژی هەواڵی تێهەڵچوونەکانی ئەم دواییانەی ئێرانیان پێگەیشتووە، بەدەمی گەیاندوویانەتە وەزیری کاروباری دەرەوەی بریتانیا. هەموو تێکهەڵچوونەکان

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٠-١٠٥.

پێوەندییان بە ئەندامانی حیزبی دیموکراتی ئازەربایجانەوە هەیە، کە سەر بە پارتی کۆمۆنیستی ئێرانن، واتە حیزبی توودە. ئەگەر دەوڵەتی ئێران دەرفەتی ڕەوانەکردنی سوپاو ژاندارمریی بۆ ئەو ناوچەیە هەبوایە بۆ گێڕانەوەی هێمنی و ئاسایش، ئەوا بە ئاسانی بەسەر ئەو تێکهەڵچوونانەدا زاڵ دەبوو. باردۆخەکە بە جۆرێکە یەکێتیی سۆڤیەت ڕێنادات سوپای ئێران بە ئەرکی نیشتمانیی خۆی ڕابگات. دەوڵەتی ئێران بە هیوایە هاوپەیمانەکانی خۆی، واتە یەکێتیی سۆڤیەت، کۆنترۆڵی نوێنەرانی عەسکەریی خۆی لە ئێران بکات و ئاگاداریان بکاتەوە کە ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ دەست نەخەنە بەر ناردنی هێزەکانی ئێران بۆ ناوچەکە بە مەبەستی سەقامگیرکردنی بارودۆخی ئەو ناوچانە.

تەقیزادە بە لێکۆڵەرەوەی ئاژانسی ڕۆیتەری ڕاگەیاندووە: ((ئەو ڕاستییەی کە ئێمە ئازادانە ناتوانین سوپای خۆمان بۆ ناوچەکانی وڵاتەکەمان بنێرین، دەبێ بزانرێ پێچەوانەی پەیماننامەی (١٩٤٣)یە. کۆمەڵانی خەڵکی ئێرن زۆر پەرۆشی ڕووداوەکانی ئەم دواییەی باکووری ئێرانن. جگە لەوە، لە کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەی ئەمریکاو ئینگلیزو سۆڤیەتدا لە لەندەن، لەنێوان "مۆلەتۆڤ"ی وەزیری کاروباری دەرەوەی سۆڤیەت و "بۆین"ی وەزیری دەرەوەی بریتانیادا، کە قسەیان سەبارەت بە دەرچوونی هێزەکانیان لە ئێران کردووە، بووەتە مایەی خۆشحاڵی و هیوای تاران بەوەی ئەو هاوپەیمانانەی ئێران هێزەکانی خۆیان بەپێی پەیماننامەکەی نێوانیان لە ئێران دەبەنە دەرێ و بەڵێنی خۆیان بەجێ دەهێنن[1].

هەواڵنێری تاس- لەندەن ١٩٤٥/١١/٣١

بەپێی ڕاگەیاندنی ئاژانسی ڕۆیتەر، فەرمانبەرانی ئێرانی لیستی تێکهەڵچوون و ڕووداوەکانیان وەك لای خوارەوە ئامادە کردووە.

١- هەشتا کەسی لایەنگری حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان لە ١٩٤٥/١١/١٤دا هێرشیان کردوەتە سەر دوو ماشێنی باری لەنزیکی شاری میانە (نێوان تاران و

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٠٥-١٠٦.

تەورێن)و پەلاماری شاریان داوەو ژاندارمو پاسەوانەکانی ڕێگەی شەمەندەفەریان چەك کردووە، مووچەخۆرانی مەدەنیی دەوڵەتیان لەو شارە گرتووە.

٢- ئاژاوەگێڕی بەناوبانگ "کەبیری" هاوکارو لایەنگرانی خۆیی لەنزیکی مەراغە پڕچەك کردووە، هێرشیان کردووەتە سەر عەجەب شیرو ژاندارمەکانی ئەوێیان گەمارۆ داوەو چەکیان کردوون.

٣- ژاندامەکانی ئێران لە گەلکەند ئاژاوەگێڕەکانیان دەستگیر کردوونو بۆ مەرغەیان بردوون، بەڵام ئەوانە لەلایەن سۆڤیەتیەکانەوە ئازاد کراون. وەك ڕادەگەینن، کەبیری هێز کۆ دەکاتەوەو چەکداریان دەکات تا هێرش بکاتە سەر مەراغە.

٤- ڕێنادەن بە پۆلیس لە تەورێز ئەرکی خۆیان جێبەجێ بکەن.

٥- سەرکردە کوردەکان دژ بە دەوڵەتی ناوەندی کەوتوونەتە چالاکی، بڕێکی زۆر کاغەزی ڕۆژنامەیان لە ڕووسەکان وەرگرتووە.

٦- دابینکردنو ناردنی کەلوپەلو خۆراکەمەنی بۆ ناوچەکانی باکووری ئێران ڕاگیراون.

٧- ئەو ئێرانیانەی کە لە (سنە) دەژین، تەنیا بە مۆڵەتی ڕووسەکان دەتوانن سەفەرو هاتوچۆ بکەن.

٨- کۆسپ دەخرێتە بەر کاربەدەستانی ئێرانی لە ناوچەکانی باکۆ. ماوەیەك لەمەوبەر ئوستانداری ئازەربایجان کە لەلایەن دەوڵەتەوە دیاری کرابوو، ڕووسەکان پێی ڕازی نەبوون.

٩- ئەو ئێرانیانەی کە لە باکووری ئێران دەژین، دوور دەخرێنەوە بۆ باشووری وڵات. ڕووداوی لەم جۆرە زۆرن.

هەروەها باڵوێزی ئێران گوتی: دەوڵەتی ئێران زۆر دەمێکە دانی بەخۆیدا گرتووە، تەنانەت ناچار بووە یەکێتیی سۆڤیەت لەم ڕووداوانە ئاگادار بکاتەوە. بەم جۆرە دەوڵەتی ئێران خۆی لە ڕاگەیاندنو نارەزایی دوژمنانە پاراستووە، بەو هیوایە کە چارەسەری کێشەکە بە پێی پەیماننامەکە جێبەجێ بکرێ[١].

---

[١] هەمان سەرچاوە ل١٠٥-١٠٦.

**پرسیاری ولاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا**
**سەبارەت بە ڕووداوەکانی ئێران لە دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەت:**

ئاژانسی تاس- لەندەن، ٢٦//١١/١٩٤٥

وەك ئاژانسی ڕۆیتەر لە زمانی هەواڵنێری خۆیەوە لە واشنگتۆن ڕای گەیاندووە: دەوڵـەتی ئـەمریکا بـەپێی سەرچاوەیەکی بڕواپێکـراو لـە ٢٥ی تـشرینی دووەمـدا یاداشـتنامەیەکی داوە بـە دەوڵـەتی یـەکێتیی سـۆڤیەت، داوای لێ کـردووە زانیـاریو ڕوونکردنەوەی سەبارەت بە هەڵسوکەوتی سوپای سوور لـە باکووری ئێرانـدا بداتێ بەپێی پەیماننامەی سێ زلهێزەکە کە سەبارەت بە ئێران بەستوویانە. ئەم داواکارییە لە دەوڵەتی سۆڤیەت کراوە.

لە یاداشتنامەکەدا، دەوڵەتی ئەمریکا ئاماژەی بەوە کردووە کە پێویستە یەکێتیی سۆڤیەت واشنگتۆن لە ڕووداوەکانی باکووری ئێرانو ئازەربایجان ئاگادار بکاتەوە.

یاداشـتنامەکەی دەوڵـەتی ئـەمریکا لـە ١٩٤٥/١١/٢٣دا، دوای دوو چـاوپێکەوتنی "بێرنس"ی وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمریکا لەگەڵ " حوسێنی عـەلا"ی باڵوێزی ئێرانـدا لـە ئـەمریکا، بـۆ سـۆڤیەت نێـرراوە. عـەلا، وێنـەی یاداشـتنامەی وەزارەتـی کاروباری دەرەوەی ئێرانی بۆ سۆڤیەت داوە بە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا.

بـەپێی ئـەو زانیاریانـەی کـە هـەن، یاداشـتنامەکەی ئـەمریکا بـۆ سـۆڤیەت لـە چوارچێوەی داواکـاریو پرسـیارو ڕوونکردنـەوەدا نییـە، بـەڵکوو ئـەمریکا هـەنگاوی تونـدو دیپلۆماسـی بەرامبـەر بـە سـۆڤیەت دەنـێ، گـەر ڕووسـەکان دەسـت وەربدەنـە کاروباری سوپای ئێران کە لە تارانەوە نێردراوە بۆ ئێران[1].

**بارودۆخی ئێران لە چاپەمەنیەکانی ئەمریکادا:**

تاس-نیویورك، ١٩٤٥/١١/٢٨

گەرچـی زۆربـەی ڕۆژنامـەکانی ئـەمریکا درێـژە بـە هێرشـکردنە سـەر سـۆڤیەت دەدەن، بەڵام هێندێکیان هەوڵ دەدەن ڕاستیی ڕووداوەکان ڕوون بکەنەوە. بۆ نموونـە، "سـتیڤینس"ی هـەواڵنێری ڕۆژنامـەی "کرسـتیەن سـانیس مۆنیتـەر" نووسـیویە:

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٥-٣١.

ئاشکرایە ڕووداوەکانی ئەمڕۆی باکووری ئێران بە هاندانی یەکێتیی سۆڤیەتن، بەڵام زۆرینەی دانیشتوانی ناوچەکە پشتیوانی لە ڕاپەڕینەکە دەکەن. ئێران هەمیشە زۆرداران بەڕێوەیان بردووە، هیچ بایەخێکیان بە خەڵکی وڵاتەکە نەداوەو پشت گوێیان خستوون. بەڵام لەو ڕۆژەوە کە سوپای سوور هاتووەتە باکووری ئێران، زۆر لەو کێشانەی ڕابردوو چارەسەر کراون؛ سنوور بۆ دەسەڵاتی دەرەبەگە خاوەن موڵکەکان دانرا، دزی و بەرتیلخۆری کەم کرانەوە، مووچەو هەقدەست زیادکران و دابەشکردنی خۆراك باشتر کرا. سیاسەتی سۆڤیەت لەم ناوچانەدا زۆر کاریگەرو چالاك بوو. زۆر ئەستەمە دانیشتوانی ئەو ناوچانە ئەمڕۆکە دەستبەرداری دەسکەوتەکانی خۆیان بین. پێدەچێ، تەنانەت لە گشت ناوچەیەکی داگیرکراودا، بزووتنەوەیەکی سیاسیی وەك ئەوەی باکووری ئێران سەر هەڵبدات، بەڵام هەرچۆنێك بێ کۆمەڵانی خەڵکی تێدا بەشدارن و پشتیوانیی لێ دەکەن.

ڕۆژنامەی "ستار" کە لە (کازانس سیتی) دەردەچێ، نووسویە: پێدەچێ بوونی ڕووسەکان لەو ناوچانە، بووبێتە مایەی ئەم ڕاپەڕینە، ئەمەیش بەهۆی سیاسەتی دژی سۆڤیەتی ڕژێمی کۆنەپەرستی ئێرانەوە کە بەرهەڵستیی کاروباری ڕووسەکان و بوونیان لەو ناوچەیەدا دەکات.

بەپێی ڕاگەیاندنی تاس لە واشنگتۆن، ١٩٤٥/١٢/١٥ کاربەدەستانی ڕەسمیی دەوڵەتی ئەمریکا دەڵێن: ئێستا ژمارەی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئێران (٧٥) هەزار کەسە، هێزەکانی ئەمریکا لە (٦) هەزار کەمترن و لە باشووری– ڕۆژئاوای ئێرانن. هاوکات هێزەکانی ئێران بە ژاندارمرییەوە لە ئازەربایجان، بەوانەیشەوە کە لە ناوچەی قەزوین چاوەڕێی چوونە ئازەربایجانن، لە پێنج شەش کەس تێپەڕ ناکات. هەر ئەو سەرچاوانە ڕادەگەیەنن: هێزەکانی ئەمریکا تا ١٩٤٦/١/١ ئێران بەجێ دەهێڵن. پێویست بە بیرهێنانەوەیە کە ژمارەی هێزەکانی ئەمریکا لە ئێران، بەگشتی (٢٨) هەزار کەس بووە، ئێستا شەش هەزاریان ماوە[١].

---

[١] هەمان سەرچاوە، ئۆ٦، د٤٨، پ٥١، ل٠-١١٥.

کێشەی نەوت لەنێوان ئێران و سۆڤیەت و هەروەها ئینگلیزو ئەمریکادا، مێژوویەکی دوورودرێژی هەیە. مرخ خۆشکردنی ڕووسیا لە نەوتی ئێران هی پێش شۆڕشی ئۆکتوبەرە. ئێران بە گوشاری ڕووسیا ناچار کرا ئیمتیازی نەوتی باکووری ئێران بداتە کەسێکی ڕووسی بەناوی "خوشتاریا"ی (بە ڕەگەز خەڵکی جۆرجیا)وە، هاوکات نەوتی باشووری ئێرانیش درا بە کابرایەکی ئینگلیزی "دارسی" ناو.

وەك ئاشکرایەو لە زۆر سەرچاوەی مێژووییدا ئاماژەی پێکراوە، ئێران لە ١٩٠٧دا بەپێی پەیماننامەیەك کە لەنێوان ڕووسیای تزاری و ئینگلستاندا مۆر کرابوو، کرابوە سێ بەش (لە ١٩١٥دا). ئەم پەیماننامەیە لەنێوان ئەو دوو زلهێزەدا نوێ کرایەوە: واتە باکوور بۆ ڕووسیا، باشووریش بۆ ئینگلستان، ناوچەی نێوانیشیان بەڕواڵەت ناوچەیەکی بێلایەن بووە، دواتر ئەویش بەش کرا.

کاتی خۆی ناسرەددین شای قاجار گوتبووی: کاتێك دەمانەوێ ڕوو لە باکوور بکەین، ڕووسیای تزاری دژمانە، کاتێ دەمانەوێ ڕوو لە باشوور بکەین، ئینگلیزەکان ڕێگەمان نادەن. واتە شا لە وڵاتەکەی خۆیدا خاوەن دەسەڵات نییە. دەبوو بە مۆڵەت و ڕێنوێنیی ئەو دوو زلهێزە بجووڵایەتەوە. تا ساڵی ١٩١٧و شۆڕشی ئۆکتۆبەر هاوسەنگیی هێزەکان و ناوچەکانی بەرژەوەندی ڕووسیاو ئینگلیز لە ئێران ڕاگیرابوون.

کاتی دووەم جەنگی جیهانی و بگرە دوای شەڕیش، دەبوایە نەك هەر بەرژەوەندی سۆڤیەت و ئینگلیز بە تەنها، بەڵکوو بەرژەوەندی دوو زلهێزی دیکەیش، واتە ئەمریکاو ئەڵمانیا، لە ئێران لەبەرچاو بگیرایە (ئەڵمانیا بەهۆی شەڕەوە وەلانرا، سۆڤیەت و ئینگلیزو ئەمریکا مانەوە). بەڵام سۆڤیەت نەیهێشت و نەیویست نەیارانی بەرژەوەندی خۆیان لە ئێراندا بپارێزن، گەرچی هێشتا هاوپەیمان بوون و کێشەی شەڕ لەگەڵ ژاپۆنداو چارەنووسی ئەورووپاو وڵاتانی جیهان لەدوای شەڕ هەر نەبڕابووەوە. پێویستیمان بە هاوکاریی هەرسێ زلهێزەکە بوو تا چارەسەری کێشەکان بکرێ. بەڵام ململانێی سێ زلهێزەکە لە جیهان و ناوچەکەو بەتایبەت ئێراندا چارەسەری زۆر کێشەیان دژوارتر کرد، کەوتنە ڕقەبەرایەتی و بەربەرەکانێکردنی یەکتر، لەکاتێکدا سۆڤیەت دەستی بەسەر ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا گرتبوو و ڕۆژئاواییەکانیش دەیانویست لە ئێران و وڵاتانی تر تەنگ بە سۆڤیەت هەڵبچنن و

دەری بکەن و تۆڵەیشی لێ بسێننەوە، بەهۆی سیاسەتی ملهوڕانەو لەخۆباییانەی سۆڤیەتەوە لە ئاستی نێونەتەوەییدا، بەتایبەت لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات و ئێراندا کە دژ بە بەرژەوەندی ئینگلیزو ئەمریکا بوو. ئەنجام لە ئێران سەر نەکەوت و بووە مایەی دەرچوونی هێزەکانی سۆڤیەت. سەرباری ئەوە، کارێکی نەکرد بەرژەوەندی خۆی بپارێزێ، بە پێچەوانەوە ئینگلیزو ئەمریکای نەیاری بەرژەوەندی خۆیان پاراست و پارێزگارییان لە بوونی خۆیان کرد، بگرە ڕژێمی ئێرانیان کردە دوژمنی سۆڤیەت و پێگەیەکی ڕۆژئاوای دژ بە سۆڤیەت.

ئەگەر سیاسەتی سۆڤیەت سەردەمی بزووتنەوەی گێلان و پاش دووەم جەنگی جیهانی لە ئێران لەگەڵ یەکتردا بەراورد بکەین، سۆڤیەت لە هەردوو قۆناغەکەدا یەك مەبەستی هەبوە، ئەویش دەستخستنی نەوت بووە، ئەنجامی ئەو سیاسەتەی سۆڤیەت دەست وەردانە ناو کاروباری بزووتنەوە ڕزگاریخوازو دیموکراتیەکانی ئێران بوو، تا گوشار بخاتە سەر ڕژێمی ئێران و بە ئامانجەکانی خۆی بگات؛ بزووتنەوەکانی کردە کەرەستەی فرۆشتن و مامەڵە بە ئێران و ئەو پرنسیپ و بانگەوازانەی پێشێل کرد کە بۆ پشتگیریی بزووتنەوەکانی ڕزگاریخوازی گەلانی چەوساوەو ئازادی و دیموکراتی بانگەشەی بۆ دەکردن و...

ئەگەر سۆڤیەت سەردەمی شۆڕشی گێلان و دەمەزراندنی کۆماری گێلان مامەڵەی لەگەڵ ڕەزا خان و "قەوام"دا کردبێ، دوای دووەم جەنگی جیهانی لەگەڵ حەمە ڕەزاو "قەوام"دا کەوتەوە مامەڵە کردن. هەردوو سیاسەتەکەیش تراژیدیایەکی گەورەی بۆ گەلانی ئێران و بزووتنەوە دیموکراتیخوازەکان بەدواوە بوو. ئەگەر ئەو سەردەمە دەستیان خستە ناو کاروباری بزووتنەوەی جەنگەڵ و کوچك خان (ڕەنگ وبۆی لایەنگریی سۆڤیەتیان پێبەخشی، هێندێ هێزیان دژ بە کوچك خان پێك هێناو سەرەنجام لەڕێی ئەو هێزانەوە کودەتایان بەسەر کوچك خاندا کرد)، لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا دەستیان وەردایە ناو کاروباری بزووتنەوەی کورد، بەتایبەت ژێکاف و پاشان بە فەرمان قازی محەمەدیان دانا (هێشتا بزووتنەوەی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان پێك نەهاتبوو). دواتر ئەم دەستێوەردانەیان، بە پێکهێنانی بزووتنەوەی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان لەسەر حیسابی حیزبی توودەو حیزبی دیموکراتی کوردستان لەسەر حیسابی ژێکاف، پەرەی سەندو ئاشکرا بوو.

تەنانەت لەو سەردەمەیشدا (کوچك خانو چەند لایەنی دیکەی دەستەمۆی خۆیان لە کۆتایی بزووتنەوەی جەنگەڵدا)، وەك سەردەمی پاش دووەم جەنگی جیهانی، پیشەوەریو... هان دران خۆیان ئامادە بکەن، بۆ ئازادکردنی تارانو دەرکردنی ئیمپریالیزم. ئەو سەردەمە، دەبوو هێرشەکە لە گەیلانەوە دەست پێبکات، ئەمجارەیان دەبوو لە تەورێزەوە بێ.

ڕۆژئاواییەکان باش شارەزای ئەزموونی سەردەمی شۆڕشی (گێلان) بوون، پاش دووەم جەنگی جیهانی پەنایان بردە بەر هەمان سیاسەتو تاکتیكو فرۆفێڵی پێشوو، واتە زانییان بەڵشەویکەکان چۆنو بە چی خاو دەکرێنەوە. بەم جۆرە ئامۆژگاریی ڕژێمی تارانیان کرد لەگەڵ سۆڤیەتدا بکەوێتە وتووێژ، بە بەڵێنی نەوت هەم هێزەکەیان ببەنە دەر، هەم دەستبەرداری پشتیوانیی ئازەربایجانو کوردستان و تودەو گۆڕینی ڕژێم بن، ئەوکاتەیش نە هێرش دەکرێتە سەر تاران، نە شۆڕشی پرۆلیتاریا لەگۆڕێدا دەبێ و نە مەترسیی بەرهەڵستانیش لەئارادا دەمێنێتەوە.

هەڵسوکەوتو تاکتیکەکانی سۆڤیەت لە سەردەمی شۆڕشی گێلاندا، هەروەك هی ساڵانی ١٩٤٥و ١٩٤٦ وەها بوون، ئەودەم ڕێبەرانی سۆڤیەت بە سەرۆکایەتیی لینینو ستالینو میکۆیانو بەڕێوەبەرانی دیکە لە کاربەدەستانی حیزبیو دەوڵەتیی سۆڤیەت لە قەفقاز، جڵەوی بزووتنەوەکانیان بە پێکهێنانی ڕێکخراوی سیاسیو ناردنی هێندێ کەسی وەك پسپۆڕو کادری حیزبیو لەشکریو سیخوڕی دەگرتە دەست.

بەڕێوەبەرانی سۆڤیەت لە سەردەمی بزووتنەوەی جەنگەڵدا، جگە لە لینین کە نەمابوو، زۆربەیان بە سەرۆکایەتیی ستالین لە سەردەمی شەڕو دوای شەڕیشدا هەبوون، لەناو بزووتنەوەکەی ئازەربایجانیشدا وەك پیشەوەریو... سەردەمی گێلانو فیرقەی دیموکرات، بەڕێوەبەری سیاسەتی سۆڤیەت بوون لە سەرکردایەتی بزووتنەکەدا (پیشەوەری وەزیری ناوخۆی کۆماری گێلان بوو). سەردەمی شۆڕشی گێلانیش، کاتێك سوپای سۆڤیەت هەندێ ناوچەی ئێرانی داگیر کرد "وسووقول دەولە"ی سەرۆك وەزیرانی ئەوکاتەی ئێران (برای قەواموول سەڵتەنەی سەرۆك وەزیرانی ئێران لە ١٩٤٥و ١٩٤٦دا) سکاڵای ئێرانی بردە بەردەم کۆمەڵەی گەلان (عصبة الأمم)، داوای دەرچوونی سوپای سۆڤیەتی لە ئێران تێدا کرد.

کۆمەڵەی گەلان لە وەڵامدا بە ئێرانی ڕاگەیاند، لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەتدا بکەوێتە وتووێژ. سۆڤیەت بە پێچەوانەی ساڵی (١٩٤٦)ەوە ئەودەمە بیانووی هەبوو، لەبەر ئەوە گاردی سپی، واتە لایەنگرانی ڕووسیای تزاری بە هێزو بارگەیانەوە لە ناوچە سنووریەکانی ئێران لەگەڵ سۆڤیەتدا بوون، دەستدرێژییان دەکردە سەر خاکی سۆڤیەت، ئێرانو ئینگلیز یارمەتییان دەدان. داشناكو موساواتچییەکانیش لە ئێران زۆر بوون.

هەروەك ستالین دەیگوت، ساڵی ١٩٤٥ مەترسییان لەسەر نەوتی باکۆ هەبوو. لەلایەکی دیکەوە، ئینگلیزەکان ئەو سەردەمە هێزی سوپاییان لەو ناوچانەدا هەبوو، بە ئاشکرا دەستدرێژییان دەکردە سەر ناوچەکانی قەفقازو ئاسیای ناوەڕاستی سۆڤیەت. دواتر هەر لە ڕێی ئێرانەوە بوو هێرش کرایە سەر باکۆو شکستیان بە دەسەڵاتی سۆڤیەت هێناو ٢٦ کۆمیسێری باکۆیان گوللەباران کردو... .

واتە هاتنی سوپای سۆڤیەت بۆ ئێران بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ دوژمنەکانیدا بوو، هەروەها بۆ بەرگری لە خۆی بوو. سوپای ئێران هێشتا لە ئێران بوو، هەڕەشەو پیلانیان دژی سۆڤیەت دەگێڕا. بەڵام ساڵی ١٩٤٥ بە پێچەوانەوە، سۆڤیەت بیانووی بۆ هێشتنەوەی هێزەکانی نەبوو. سۆڤیەت لە سەردەمی شۆڕشی جەنگەڵدا لە ئێران نەچوە دەر، بەڵکوو بە هێزەکانی خۆیو بزووتنەوەی جەنگەڵەوە گوشاری خستە سەر ئێرانو مەرجو داخوازیەکانی خۆی بەسەر ئێراندا سەپاند. پاشان پەیماننامەی ١٩٢١یان پێکەوە مۆرکرد. وەك چۆن لە ١٩٤٦دا وازی لە بزووتنەوەی گێلان هێنا، ساڵی ١٩٤٦یش دەستبەرداری ئازەربایجانو کوردستان بوو.

سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٤٦دا، بە پێچەوانەی سەردەمی شۆڕشی گێلانەوە، نەیتوانی جێ‌پێ بە ئینگلیزو ئەمریکای نەیاری خۆی لە ئێران لەق بکات. بۆ نموونە، ئەودەمە پەیماننامەی ١٩١٩ی ئێرانو ئینگلیزی هەڵوەشاندەوەو نەیهێشت ئەنجومەنی ئێران پەسندی بکات. ژمارەیەکی زۆری ئینگلیز لەسەر داخوازیی سۆڤیەت لە ئێران دەرکران.

هەر ئەو سەردەمە، وەك سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیو دوای جەنگیش، ئینگلیزەکان بەرامبەر بە کۆماری گێلان کە سۆڤیەت پشتیوانی بوو و پێکی هێنابوو، کەوتنە چەکدارکردنی عەشایرەکانی باشوورو باشووری ڕۆژئاوای ئێران، بەتایبەت بەختیاریەکان. هەر ئەو سیاسەتەشیان لە ماوەی جەنگو دوای جەنگدا پێڕەو کرد،

بە سازکردنی (یەکێتیی عەشایری ئێران) بەرامبەر بە کوردستان و ئازەربایجان.
"ئەحمەد قەوام"یش، واتە قەوامول سەڵتەنە، ئەوەدەمە لە ٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٣١دا بووە سەرۆك وەزیرانی ئێران، هەروەك سالانی ١٩٤٥و ١٩٤٦ کە بە ڕاسپاردەی ئەمریکیەکان بووە سەرۆك وەزیری ئێران و بۆ فریودانی سۆڤیەت دەستی دایە هەندێ کار کە بە دڵی سۆڤیەت و داخوازیی ئەو بوو. ساڵی ١٩٤١، هەروەك ساڵی ١٩٢١، هەندێ گەڵاڵەنامەو ڕاگەیاندنی ڕەسمی لەلایەن کاربەدەستانی ئێران و نوێنەرانی پەرلەمانەوە هاتە کایەوە، وەك ئەوەی نەوتی ئێران بەبێ پەسندکردنی ئەنجومە نادرێ بە هیچ وڵاتێك، واتە ئەگەر دەوڵەتی ئێران پەیمانیش ببەستێ، ئەوا ئەنجومەنی ئێران دەتوانێ پەسندی نەکات.

نابێ لەبیرمان بچێتەوە، قەوام کە دەرهێنانی نەوتی ناوچەکانی باکووری ئێرانی (هەر هەمان ئەو ناوچانەی وا بۆ سۆڤیەتی داوا کردبوون)، واتە ناوچەکانی ئازەربایجان و گیلان و مازەندەران و ئاسترابادو خۆراسان، دابوو بە ئەمریکیەکان، پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەر درابوون بە خوشتاریای ڕووسی. پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەریش، سۆڤیەت و دواتر ڕووسیا تا ئەمڕۆ هەر داوای دەکەن. سۆڤیەت، پاش شۆڕشی ١٩١٧، بەڕواڵەت دەستی هەڵگرت و کشایەوە لە سامانی ڕووسیاو ئەو پەیماننامانەی کە ڕووسیای تزاری بەسەر ئێرانیدا سەپاند بوون، هەروەها لەو قەرزانە کە پێشتر ڕووسیا بە ئێرانی بەخشیبوو؛ ئامادەیی خۆیی بۆ هاوکاریی ئێران و سەروەری و یەکپارچەیی خاکەکەی و سەربەخۆیی ئەو وڵاتە ڕاگەیاند، مەبەستی بوو ئێرانی لەدەست دەرنەچێ و لە چنگی ڕۆژئاوای دەربێنێتەوە. هاوکات ئۆپۆزیسیۆنی سۆڤیەت، واتە گاردی سپی و داشناکەکانی ئەرمەنستان و موساواتچییەکانی ئازەربایجان، دەربکات.

بەلام ئێران وەك بەلشەویکەکان چاوەڕوان بوون، بەدڵی ئەوانی نەکرد. وەك دەرکەوت بەرژەوەندی ئینگلیز لە نەوتی باشووری ئێراندا پارێزراو بوو. ئەمریکایش جێ‌پێی خۆیی قایم کردبوو، قەوامول سەڵتەنە ساڵی ١٩٤٤-وەك ١٩٢١- بەڵێنی نەوتی باکووری ئێرانی بە ئەمریکیەکان دابوو. سۆڤیەت بەپەلە کەوتە ناردنی نوێنەری خۆی و

پەرۆشیو ناڕەزایی دەوڵەتەکەی لەم بارەوە بە کاربەدەستانی ئێران ڕاگەیاند، هەتا بە نیازی هەمیشەیی خۆی، داوای دەرهێنانی نەوتی ئەو ناوچەیەی بۆ خۆی کرد.

بەڵام دەوڵەتی ئێران ئامادەیی خۆی بۆ جێبەجێکردنی داخوازیی لەمێژینەی سۆڤیەت دەرنەبڕی. سەرنجام دەوڵەتی سۆڤیەت بە ئاگادارکردنەوەیەکی توند ڕایگەیاند: نەوتی باکووری ئێران بەپێی پەیماننامەی ١٩٢١ی نێوان سۆڤیەتو ئێران نابێ بدرێتە وڵاتێکی سێیەم. وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێرانیش کە بە پشتگیریی ئەمریکا بۆ دەوڵەتەکەی دڵخۆش بوو، ڕایگەیاند: پەیماننامەی ناوبراو داخوازیە نوێیەکانی سۆڤیەت ناگرێتەوە. جگە لەوە، پەیمانی نەوتی خۆشتاریا (ڕووسیا)و ئێران کە لەلایەن ئەنجومەنی ئێرانەوە مۆر کراوە، هیچ پێوەندییەکی بە پەیماننامەی ئێرانو ڕووسیاوە نییە.

هۆکاری کێشەی نێوان سۆڤیەتو ئێران لە سەروبەندی بزووتنەوەی گێلاندا، پشتگیریی سۆڤیەت بوو لە بزووتنەوەکە. ئێرانیش پەسندکردنو بەجێهێنانی پەیماننامەی نەوتی نێوان خۆیو ئەمریکای ڕاگەیاند. بەم جۆرە سۆڤیەت هێزەکانی خۆی لە ئێران بردە دەرێ، ئەمەیش پاش چوونە دەری هێزەکانی ئینگلیز لە ئێران.

هەلومەرجی پاش دووەم جەنگی جیهانیو کێشەی کۆماری گێلان، هەروەك هەلومەرجی ئازەربایجانو کوردستان بوو. پاش دووەم جەنگی جیهانی ڕێگەچارە نەبوو، بە هێرشی هێزەکانی ئێران بە سەرۆکایەتیی ڕەزاخانو بە دەستووری قەوامول سەڵتەنەی سەرۆك وەزیر -وەك ساڵی ١٩٤٦- هەر بەدەستی کوڕەکەی ڕەزاخانو قەوامی سەرۆك وەزیر دەستی پێکردو کۆتایی هات. پیشەوەری ئەوکاتە (سەردەمی کۆماری گیلان) ماوەیەك لە کابینەی کۆماری ساوای گێلاندا وەزیری ناوخۆ بوو، لەبری ئەزموون وەرگرتن لە کۆماری گێلان، ساڵی ١٩٤٦ دووبارە بە هەمان دەستو هەمان شێوە دۆڕاندی (جگە لە پیشەوەری، "شەبوستەری"ی سەرۆکی ئەنجومەنی ئازەربایجانیش نەك هەر لە بزووتنەوەکەی گێلاندا، بەڵکوو لە بزووتنەوەی خەیابانیشدا بەشدار بوو). مەبەستم ئەوەیە پیشەوەریو شەبوستەریو بەگشتی سەرکردەکانی ئازەربایجان، وەك قازی محەمەدو سەرکردەکانی دیکەی کورد، بێئەزموون نەبوون. قازی محەمەد وەك ئەوان سێ جار سۆڤیەتی تاقی نەکردبوەو قەوامی بەباشی نەناسیبوو.

خاڵێکی دیکەی لەقبوونی سیاسەت و بەرژەوەندەکانی سۆڤیەت، ئەوەبوو کە سەرۆك وەزیرە یەك لەدوای یەکەکانی ئێران تا قەوامول سەڵتەنەو ژمارەیەك لە وەزیرو ئەفسەری پایەبەرزی بە ئاشکراو ناڕاستەوخۆ کەوتنە بەر پەلاماری سۆڤیەت. زۆربەی نوێنەرانی ئەنجومەنیش کە ڕێگەچارەی وتوویژو ڕێککەوتنی هەردوو دەوڵەتی سۆڤیەت و ئێرانیان پێئاڵۆز بوو، چونکە بوارێکی نەهێشتەوە بۆ ئەو کاربەدەستانەی کە سەر بە ئینگلیز یا ئەمریکا بوون، دەوریان هەبێ لە دابەشکردنی بەرژەوەندەکانی هەرسێ دەوڵەتی زلهێزدا لە ئێران، بەتایبەت بە قازانجی سۆڤیەت و ئاساییکردنەوەی پێوەندیی دوو وڵاتی هاوسێ. دژایەتیی تەواوی ئەو کەسانە لەلایەن سۆڤیەتەوە، دژایەتیی ڕاستەوخۆی ئینگلیزو ئەمریکا بوو. ئەوانە بەرەیەکیان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئێراندا دژ بە سۆڤیەت پێك هێنا (سەرباری ململانێ و ناکۆکیی نێوان ئینگلیزو ئەمریکا لە ئێران و جیهان). ڕاستییەکەی ئەوەیە نە پێوەندیی ڕابردووی ئێران–سۆڤیەت و نە ئەنجومەن و شووڕای وەزیران و ئەفسەرە گەورەکانی سوپای ئێران و نە ئەمریکاو ئینگلیزو کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، بەتایبەت ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە بەرامبەر بە سۆڤیەت لەیەك ڕیزدا بوون، زەمینەی تێشکانی سیاسەتی سۆڤیەتیان لە ئێران خۆش کردبوو.

دەسەڵاتدارانی سۆڤیەت دەبوو پێشبینیی ئەو گەلەکۆمەیەیان بکردایەو بیانزانیایە سەرکەوتنی خۆیان مەحاڵە. لەبری ئەو هەموو هەوڵ و تەقەلایەی کە لەپێناوی نەوتدا بە خەرجیان دا، دەبوو زیاتر بە کێشەی ناوخۆی ئێران و ئازادیە دیموکراتیەکان و چارەسەرکردنی کێشەی ئازەربایجان و کوردستانەوە خەریك بوونایە. بێگومان ئەم کێشانە بەبێ بڕیارێکی هاوبەش لەگەڵ ئینگلیزو ئەمریکادا چارەسەر نەدەکران. سۆڤیەت بەڵگەنامەکانی کۆنفرانسی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥ی بەدەستەوە بوو کە ئینگلیز پێشنیارو ئەمریکا پشتیوانیی لێ کرد. دەبوو داوای جێبەجێکردنی کردبایە، نەك هەر پێی لەسەر کێشەی ئازەربایجان و نەوت داگرتبایە.

ئەی گەلانی چەوساوەی وەك بەلووچ و تورکمەن و عەرەب چی! لەلایەکی دیکەوە، ئایا دەکرا بەرژەوەندی ئەمریکاو ئینگلیز لەبەرچاو نەگیرێ و هەر هەڵپەی خۆت بێ؟ ئایا ڕەچاونەکردنی بەرژەوەندەکانی ئینگلیزو ئەمریکا کە تا دوێنێ هاوپەیمان بوون،

نەك هەر لەبارەی کێشەی ئێران، بەڵکوو کێشەکانی دیکەی جیهانەوە، زەمینەی پێك نەهاتن پێشبینی نەکرابوو. مانەوەی هێزەکانی ئێران تەنیا لە قازانجی دارودەستەی شاو دەسەڵاتدارانی کۆنەپەرستی ئێراندا بوو. هەر بەهۆی مانەوەی هێزەکانی سۆڤیەتەوە بوو، ئێران بە یەکجارەکی خۆی خستە باوەشی ڕۆژئاواوە، بە هاوکاریی دارایی و دیپلۆماسی و سوپای ڕۆژئاوا توانیی خۆی لە گشت قەیرانێك دەرباز بکات، لە حاڵەتی خۆپاراستنەوە کەوتە پەلامارو هێرشبردن و سەرکوتکردنی هێزە بەرهەڵستەکان، بەتایبەت لە کوردستان و ئازەربایجان. ئێران و ڕۆژئاوا زۆر باش دەیانزانی درەنگ یا زوو هێزەکانی سۆڤیەت ئێران بەجێدەهێڵن.

سۆڤیەت ڕایگەیاندبوو هیچ تەماع و داوایەکی لەسەر خاکی ئێران نییەو هێزەکانی خۆی دەباتە دەرێ، مەبەستیشی پاراستن یا چارەسەری کێشەی ئازەربایجان و کوردستان نییە، بەڵکوو هەر بەستنی پەیماننامەی نەوتە. ئەو خزمەتەی کە سۆڤیەت لە هەقی ئازەربایجان و کوردستاندا بۆ ئێرانی کرد، ڕژێمی ئێران خۆی پێی نەدەکرا، ئەگەر پێشی بکرایە چەندین ساڵی دەخایاندو خەرجییەکی زۆری گەرەك بوو، سەرباری زیانی ماددی و مەعنەوی. واتە سۆڤیەت لە قۆناغی یەکەمدا بۆ ئەوەی نەوتەکەی دەست بکەوێ، جگە لەوەی کە چەکی قورس و تەقەمەنیەکانی هێزی ئازەربایجانی لەسەر داخوازیی ئێران لێ سەندنەوە، ناچاریشی کردن واز لە پاراستنی بهێنن. ئێران چەند ساڵ بوو، ئەگەر ئازەرییەکان چەك و تەقەمەنییان بەدەستەوە بمایە، نەیدەتوانی بەرگرییان تێك بشکێنێ. ئەوسا ڕژێم ناچار دەبوو داخوازیەکانیان لە چوارچێوەی یاسای بنچینەیی ئێراندا جێبەجێ بکات، یا پەیماننامەی مۆرکراوی نێوان تاران و تەورێز بەجێ بهێنێ، یان بە ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی، شۆڕشی لە ئێران کۆتایی پێ دەهات.

دانی ئیمتیازی نەوتی باکووری ئێران بە سۆڤیەت، بۆ ڕژێمی تاران تەکلیفێکی ئەوەندە گەورە نەبوو، زیانێکیشی نەبوو، بەڵکوو بە پێچەوانەوە، بەستنی ئەو پەیماننامەیە لەگەڵ سۆڤیەتدا سوودی زیاتری بۆ ئێران وەك ئەوەی لەگەڵ ڕۆژاوادا هەبوو. واتە خەرجیی دەرهێنان و گواستنەوەو... بەڵکوو پەرۆشیی ئێران بە بیانووی مانەوەی سوپای سۆڤیەتەوە لە ئێران و کێشەی نەوت، هەر بۆ کۆتایی هێنان بوو بە

